ئیبن قەییمی جەوزییە

# تووێشووی ئارامگران و سوپاسگوزاران

## (عدة الصابرين وذخيرة الشاكرين)



نووسینی
پێشەوا شەمسەدین موحەممەدی کوڕی ئەبی بەکر
(ئیبن قەییمی جەوزییە)
(691- 751)ک

تەخریجکردنی فەرموودەکان و تەعلیقی:
یوسف علی بدیوی

وەرگێڕانی: عبدالله گەرمیانی

چاپی یەکەم

# تووێشووی

# ئارامگران و سوپاسگوزاران

## ( عـدة الصـابـرين وذخيرة الشـاكـرين )

نووسینی

پێشەوا شەمسەدین موحەممەدی کوڕی ئەبی بەکر

( ئیبن قەییمی جەوزییە )

( ٦٩١- ٧٥١ )ك

تەخریجکردنی فەرموودەکان و تەعلیقی : یوسف علی بدیوی

وەرگێڕانی : عبدالله گەرمیانی

بسم الله الرحمن الرحيم

# تووێشووی ئارامگران و سوپاسگوزاران

**ناوی نووسەر**

شەمسەدین موحەممەد لەبی بەکر

**ناوی وەرگێڕ:**

عبدالله گەرمیانی

**نۆبەی چاپ:**

یەکەم ٢٠١٩ زاینی

**بلأوکردنەوەی:**

کتێبخانەی ئیشك

**شوێنی چاپ دیزاین:**

چاپخانەی ڕێ نوێ

**تیراژ:** ١٠٠٠ دانە

**نرخ:** ١٢٠٠٠

**لە بەڕێوبەرایەتی کتێبخانە گشتی یەکان / هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (١٩٥٤) ساڵی ٢٠١٨ ی پێدراوە**

# پێشەکی وەرگێڕ

بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ خوای گەورە، لەسەر هەر نیعمەتێك کە پێی بەخشیوین، لەوانەی هەستی پێ دەکەین و لەوانەشی هەستی پێ ناکەین و لەزانستی پیرۆزی خۆیدایە، ئێمەی مرۆڤ زۆرێك قەرزداری خوای گەورەین، کەچی بەدەگمەن هەست بەو قەرزدارییە دەکەین و بەدنمەکیی بووەتە سرووشتی دیاری ئێمەی مرۆڤی ئەم سەردەمە، لەو هەموو شتەی خوای گەورە پێی داوین هەر گلەیی دەکەین و لەناڕەزایی ناوەستین، بەبینینی هەژارێك، کزۆڵیی لێقەوماو و دەربەدەرێك رانەچەڵەکێین و کڕنۆشێکی سوپاسگوزاریی بۆ خوا نابەین، وا هەست دەکەین خوا قەرزداری ئێمەیە پەنا بەخوا!

ئێمەی مرۆڤ بەجۆرێك سەرمان لەخۆمان شێواندووەو بەجۆرێك سەرگەردان بووین تامی ژیانی دونیاو قیامەتمان لەدەست داوە، هەژارەکانمان بێ قەناعەتن وەك ئەوەی تەمەنی مرۆڤ هەر ئەم دونیایە بێ و شوێنێکی تر نەبێ بۆ پاداشتدانەوە، دەوڵەمەندەکانیشمان بەجۆرێك دەژین و کەیف دەکەن وەك ئەوەی دەوڵەمەندو دەسەڵاتدارێکیان نەبینی بێ دەسەڵات و سەروەتی بێ مەزندەی بەجێهێشتبێ و بووبێتە میوانی گۆڕ و نەبووبێتە خۆڵ!

ئاخۆ ئێمە تاوەکو کەی بیر ناکەینەوەو ژیر نابین؟! ئەم کتێبەی زانای پایەبەرز(ئیبن قەییمی جەوزییە)ش هەر ئەوەمان پێ دەڵێ، گەر هەژارین با چێژ لەخۆڕاگریی ببینین و قەناعەتمان بۆ دروست بێ، چونکە قانیع بوون مایەی رزگاربوونە لەزۆرێك کێشەو سەرئێشەی ژیان، گەر دەوڵەمەندیشین با مافی خوای لێ دەربکەین، لەسەرچاوەی حەڵاڵ و پاکیشەوە سەروەتمان پەیدا بکەین،

چونکە دونیا بۆ هیچ هەژار و دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارو هیچ پادشایەك بەردەوام نەبووە، سەرفرازیی بۆ ئەوەیان بووە باوەڕدارانە ژیاوەو شوێنی خۆی و مافی خوای زانیووە.

ناونیشانە عەرەبییەکەی( عدة الصابرين وذخيرة الشاكرين )ە، لەکوردییەکەدا لەسەر پێشنیاری بەڕێز خاوەن ناوەندی بڵاوکار بۆ ئەوەی ناونیشانەکەی لەزمانی وەرگێڕدراودا جوان دەرکەوێ کردوومانەتە( تووێشووی ئارامگری و سوپاسگوزاریی ).

ئەم کتێبە تەخریجی فەرموودەکان و شیکردنەوەی هەندێ وشەی نامۆی بۆ کراوە لەلایەن بەڕێز( يوسف علي بديوي )، لەکاتی وەرگێڕانیشدا گەر هەندێ ناڕوونییم هاتبێتە ڕێ لەهەندێ وشەدا،ئەوە گەڕاومەتەوە بۆ هەمان کتێب کە لەلایەن( إسماعيل بن غازي مرحبا )ەوە لێکۆڵینەوە کراوەو شێخ( بكر بن عبدالله أبو زَيد ) سەرپەرشتییکردووەو لەپەراوێزی ئەو کتێبەدا روونکردنەوەی باش هاتووە.

گرنگیی ئەم کتێبە تەخریج کراوە لەوەدایە حوکمی فەرموودەکانی روونکردووەتەوە، گەر فەرموودەیەکی لاوازت بێتەڕێ ئەوە صەحیحێکیش هەیە دڵئارامت بکاتەوە.

لەهەندێ شوێندا وشەی( متروك )ت دێتەڕێ، واتا( وازلێهێنراو- پەراوێزخراو- بێ کەڵك )، ( منكر )کەسی گێڕەرەوە لاوازە، (باطل)واتا:بەدرۆوە هەڵبەستراوە،(واه)،واتا: گێڕەرەوە لاوازە، یان ئەزبەردەکردنی وێران بووە.

مەرفوع،فەرموودەیەکە رشتەی گێڕانەوەی بەرزکرابێتەوە بۆلای پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم )، مورسەلیش بەو فەرموودانە دەوترێت کە لەڕشتەی

گێڕانەوەدا هیچ هاوەڵێك ناوی نەهاتووە. ( معضل ): دوو کەسی یەك بەدوای یەکی تێدا پچڕاوە.

لەهەندێ شوێندا هاتووە کە لەڕشتەی گێڕانەوەدا پچڕان هەیە، واتا:ناوی هاوەڵێ یان یەکێك لەچینەکان نەماوە.

بۆیە داواکارم لەخوای گەورە، بەم وەرگێڕانە پاداشتی قیامەتم بداتەوەو نییەتمان ساغ و دوور لەهەر شتێك بێ ببێتەهۆی زیانی دونیاو قیامەتمان، ئێوەی خوێنەری بەڕێزیش لەدوعای خێرتان بێ بەشمان نەکەن و لەهەر کەم و کوڕییەك هەبێ ئاگادارمان بکەنەوە خۆشحاڵ ئەبین.

وصلی الله علی محمد وعلی آله وصحبه وسلم

عبدالله فازڵ حەسەن( عبدالله گەرمیانی )

رزگاری( صمود )٣٠/ ٦/ ٢٠١٧

Abdullagermiyani@yahoo.com

# پێشەکی لێکۆڵەر

بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

إن الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد ألا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾ ( آل عمران :١٠٢).

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً ﴾ ( النساء: ١).

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً * يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً ﴾ ( الأحزاب: ٧٠-٧١ ).

أما بعد:

ئەم کتێبە کۆکەرەوەیەی( عدة الصابرين وذخيرة الشاكرين )، نووسینی شێخی ئیسلام و موسڵمانانە، پێشەواو موجاهیدو ئەو زانایەی کە دەگمەنە نمونەو هاوشێوەی ببینین، بێ وێنەیە، نیشانەیەکە بەپەنجەی دەست ئاماژەی بۆ دەکرێت. شەرعناس و موفتی و فەرموودەناس و موجتەهید، ئەبو عبداللـە، شەمسەدینی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبی بەکری ئەلزورعی، پاشان ئەلدیمەشقی، ناسراو بەئیبن قەییم ئەلجەوزیە، بەڕەحمەت بێ لەحەوتی مانگی سەفەری خێر لەساڵی( ٦٩١کۆچی )لەدایك بووە، لای زۆرێك زانا زانستی وەرگرتووە، لەوانە:

١- سەرپەرشتیارو راگری ئەلجەوزییە( قیم الجوزیة )ی باوکی بەڕەحمەت بێ.

٢- شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە بەڕەحمەت بێ.

لەخوێندکارەکانیشی ئەمانە بوون:

١- ئیبن رەجەبی حەنبەلی بەڕەحمەت بێ.

٢- ئیبن کەثیر بەڕەحمەت بێ.

٣- ئەلحافیظی ذەهەبی بەڕەحمەت بێ.

٤- ئیبن عەبدولهادی بەڕەحمەت بێ.

زۆرێك زانا ستایش و پیاهەڵدانیان کردووە:

ئیبن کەثیر بەڕەحمەت بێ ئەڵێ:(( گوێبیستی فەرموودە بووەو بەزانستەوە سەرقاڵ بووە، لەزۆرێك زانستدا لێهاتووە بووە، بەتایبەت لەزانستی تەفسیرو فەرموودەدا )).

ئیبن رەجەب بەڕەحمەت بێ ئەڵێ:(( لەمەزهەبدا شەرعی وەرگرتووەو پێگەیشتووەو فەتوای داوە، لەزانستەکانی ئیسلامدا شارەزابووە، شارەزای تەفسیر بووەو لەوەدا کەس شانی لەشانی نەداوە، هەروەها لەبنەماکانی ئایینیشدا، بەڕەحمەت بێ خواپەرست و خاوەن شەونوێژ بووەو لەنوێژدا زۆر ماوەتەوە )).

لەدانراوەکانی:

١- ( اجتماع الجیوش الإسلامیة علی غزو المعطلة والجهمیة ).

٢- أحکام أهل الذمة.

٣- إعلام الموقعین عن رب العالمین.

٤- إغاثة اللهفان من مصائد الشيطان.

٥- بدائع الفوائد.

٦- تحفة المودود في أحكام المولود.

٧- الجواب الكافي( لێكۆڵینەوەیم كردووەو لەلایەن خانەی "ابن كثير"ەوە چاپكراوە بەناونیشانی: الداء والدواء ).

٨- الروح ( لێكۆڵینەوەیم كردووەو لەلایەن خانەی "ابن كثير"ەوە چاپكراوە ).

٩- روضة المحبين. ( لێكۆڵینەوەیم كردووەو لەلایەن خانەی "ابن كثير"ەوە چاپكراوە ).

١٠- الفوائد( لێكۆڵینەوەیم كردووەو لەلایەن خانەی "ابن كثير"ەوە چاپكراوە).

١١- مفتاح دار السعادة.

١٢- الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة.

١٣- طريق الهجرتين وباب السعادتين. ( لێكۆڵینەوەیم كردووەو لەلایەن خانەی "ابن كثير"ەوە چاپكراوە ).

١٤- محبة الله عز وجل.( لەكتێبەكانی ئیبن ئەلقەییم كۆمكردووەتەوەو لەلایەن خانەی ئەلیەمامەوە لەدیمەشق چاپكراوە).

١٥- مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين.

ئەوەی لەلێکۆڵینەوەی ئەم کتێبەدا من کردبێتم:

١- رێکخستن و تۆکمەکردنی دەقی کتێبەکەو چاککردنی ئەوەی لەچاپەکاندا شێوێندراوەو لێی لادراوە.

٢- شیکردنەوەی وشە نامۆکان.

٣- تـــەخریجکردنی فـــەرموودەو وتـــەکان و روونکردنـــەوەی پلـــەکانیان بەگەڕانەوە بۆ قسەی زانایان لەو بارەیـەوە، نمونـەی ئـەلحافـیظ ئـیبن حەجـەرو هەندێ پسپۆڕی ئەم سەردەمەی خۆمان.

٤- باسکردنی ژیاننامەی هەندێ زانا کە لێرەدا ناویان هاتووە.

ئومێدمە خوای گەورە بەم کتێبە دەوڵەمەندنمان بکات بـەزانیاری، وصـلی الله علی نبینا محمد وعلی آله وصحبه وسلم.

یوسف

بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

تەنیا پشت بەو دەبەستین

# پێشەکی دانەر

تەنیا سوپاس و ستایش بۆ خوای خاوەن سیفەتی الصبور الشکور، العلي الکبیر، السمیع البصیر، العلیم القدیر، کە توانای ئەو هەموو مەخلوقاتی گرتووەتەوەو ویستی ئەو هاتووەتەدی لەدروستکراوەکانیدا بەبەڕێوەبردنی کاروبارەکان و بانگەوازی ئەو بۆ ڕۆژی قیامەتی بەڵێن پێدراو بەگوێی مردووانـدا دراوە، قەدەرو مردنی هەموو دروستکراوانی دیاریی کردووەو کارو کردەوەیانی نووسیووەتەوەو رزق و ڕۆزی و سەروەت و سامانی لەنێوانیاندا دابەش کردووە، مردن و ژیانی دروست کردووە تاوەکو تاقیان بکاتەوە کامەیان کاروکردەوەیان باشترینەو هەر خۆیشی ( العزیز الغفور، القاهر القادر )ە، هەموو سەختییەك بۆ خوای گەورە سووك و ئاسانە، ئەو پشتیوان و سەرخەرو باشترین دۆست و سەرخەرە

﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ لَهُ ٱلْمُلْكُ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٌ ۝١ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٞ وَمِنكُم مُّؤْمِنٞ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ۝٢ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ۝٣ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ۝٤ ﴾ ( التغابن: ١ – ٤ )

واتا: ستایشی خوا دەکات ئەوەی لەئاسمانەکان و زەوی دایە دەسەڵاتی تەواو بۆ ئەوە وە هەرچی ستایش هەیە هەمووی بۆ ئەوە، وە ئەوە بەسەر هەموو شتێکدا بە دەسەڵاتە. خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی دروست کردووە ئینجا

هەندێکتان بێ باوەڕو هەندێکی تریشتان باوەڕدارن وە خوا بینایە بەهەر شتێك کە ئەنجامی دەدەن. خوا ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە بەحەق و ڕاستی لە جوانترین شێوەشدا وێنەی کێشاون وە سەرئەنجام هەر بۆ لای ئەوە. هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە خوا دەیزانێ وە شارەزایە بەوەی دەیشارنەوە وە بەوەی ئاشکرای دەکەن وە خوا زانایە بەوەی لە ناو دڵ و دەرووندایە[1].

وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريكَ له، واتا: شایەتیی ئەدەم هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە جگە الله کە هیچ هاوبەشێکی نییە، خوایەکە بەرزترە لەوەی هاوشێوەو هاوتاو هاوبەشی بۆ دابنێین، پیرۆزترە لەوەی سیفەت لەکارخەرە مولحیدەکان ئەیڵێن و پاك و پیرۆز راگیراوە لەوەی بەدروستکراوان بشوبهێنرێت، هیچ شتێك نمونەو هاوشێوەی خوای گەورە نییە، ( السميع البصير ) بیسەرو بینەرە.

وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، شایەتییش ئەدەم موحەممەد بەندەو نێردراوی خۆیەتی، باشترینی نێو بەندەکان و هەڵبژاردەترینیانە، دەستپاکی وەحییە، نێردراوی نێوان خۆی و بەندەکانێتی، موحەممەد لەهەموو بەندەکانی تر باشتر خوای ناسیووە، لەهەموویان زیاتر ترسی خوای هەبووە، دڵسۆزترو ئامۆژگاریکارترە بۆ ئوممەتەکەی و بەئارامترینە بۆ بڕیاری خواو سوپاسگوزارترینە بۆ نیعمەتەکانی و باشترین وەسیلەیەك بەکاردەهێنێ بۆ نزیکبوونەوە لەخوای گەورە، بەرزترین پلەو پایەی نێو بەندەکانی هەیە لای خوای گەورە، گەورەترین ڕێزو پایەو فراوانترین تکای هەیە لای خوای مەزن.

---

[1] - تێبینی: ڕاڤەی ئایەتە پیرۆزەکان لە(پوختەی تەفسیری قورئان)ەوە وەرگیراوە– وەرگێڕ.

خوای گەورە، موحەممەدی پەیامبەری ناردووە بەبانگەوازکار بۆ بەهەشت و باوەڕهێنان، پەیامبەریش بۆ ڕەزامەندیی خوای گەورە هەوڵ و تێکۆشانی کردووەو بەچاکەکاریی فەرمانی داوەو لەخراپەکارییش ڕێگریی کردووە، پەیامەکانی خوای پەروەردگاری گەیاندووە، بەفەرمانەکانی خوا ڕاچەنیووەو لەڕەزامەندیی خوای گەورەدا ئارامگرییەکی هەبووە هیچ مرۆڤێکی تر توانای ئەو ئارامگرییەی نەبووە، بەباشترین شێوە ئارامگری و سوپاسگوزاریی بۆ خوای گەورە هەبووە تائەوەی ڕازی بوونی خوای گەورەی بەدەستهێناوەو لەپێگەی ئارامگرییدا بەجۆرێك دامەزراو بووە هیچ یەك لەئارامگران پێی نەگەیشتووەو لەپلەی سوپاسگوزرانیشدا گەیشتووەتە سەرەوەی پلەی هەموو سوپاسگوزاران، بۆیە خوای گەورەو فریشتەکان و پەیامبەران و تەواوی باوەڕداران ستایشیان کردووە، تەنیا ئەویشی تایبەت کردووە بەئالأی سوپاگوزاران، ئەوە ئادەم و پەیامبەرانە لەژێر ئالأی ئەودان، سوپاس و ستایش( الحمد )بووەتە دەستپێکی پەرتووکەکەی، ئەو( الحمد )ەی کە خوای گەورە دایبەزاندووەو بەئێمە گەیشتووە، لەتەورات و ئینجیلیشدا و کردوویەتییە کۆتا داواو تکای ئەوانەی لەسەر دەستی ئەو هیدایەتیان وەرگرتووە، ئوممەتەکەی ناونراوە ستایشکاران( الحمَّادين )پێش ئەوەی بیانهێنێتە دونیاوە، لەبەرئەوەی لەخۆشی و ناخۆشییدا سوپاس و ستایشی دەکەن، ئەوانی گێڕاوە بەلەپێشترینی نێو نەتەوەکان بۆ گەیشتنە پاداشت و سزا، بۆیە نزیکترین کەسێك بەئالأی ئەو پەیامبەرە، ئەو کەسانەن کە زۆر ستایش و یادی خوا دەکەن، پلە

بەرزترینیشیان ئەوانەن زۆرتر ئارامگرو ستایشکارن، بۆیە خوای گەورەو فریشتەو پەیامبەران و تەواوی باوەڕداران سڵاواتیان لەدیار داوە، پەیامبەریش خوای بەتاقانە راگرت و بەو جۆرەش ناساندی و بانگەوازی بۆ کرد.

پاشان: بێگومان خوای گەورە ئارامگریی گێڕاوە بەئەسپێك نەخلیسکێ و بەشمشێرێك کول نەبێ، سەرباز گەلێك تێکنەشکێن، بەقەڵایەك هەرگیز کاول و کون نەکرێ، بۆیە ئارامگری و سەرکەوتن دووانەیەکی لەیەك دانەبڕاون.

رَضيعَي لِبانٍ ثدي أُمٍّ تقاسما بِأسحم داج عوض لا نتفرق[1]

واتا: من و تۆ لەپەیمان و بەڵێندا وەك دوو شیرەخۆری یەك دایکین، هەرگیز لەیەك جیانابینەوەو دانابڕێین.

بۆیە سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگری و خۆشیی لەگەڵ ناخۆشی و سەختیی لەگەڵ دەروازەی خۆشییدا، سەرکەوتنی زیاترە بۆ خاوەنەکەی زیاتر لەو پیاوانەی هیچ ئامادەسازییەکیان نییە، شوێنی سەرکەوتن بەئارامگرییەوە وەك شوێنی سەر وایە بەجەستەوە.

خوای گەورەو بەئەمەك و راستگۆ، لەکتێبەکەیدا ئەوەی دەستەبەر کردووە کە باشترین پاداشتیان پێ بدات، هەواڵی پێداون کە لەگەڵیاندایە بەرێنیشاندەرێتیی کردن و سەرخستن، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ٤٦ ﴾ الأنفال: ٤٦ ، واتا: خۆ ڕاگرین بەڕاستی خوا لەگەڵ خۆڕاگراندایە.

---

[1] – ديوان الأعشى (ص١٥٠).

بۆیــە ئــارامگران بــەم لەگەڵدابوونــە خواییــە، خێــری دونیــاو ئاخیرەتیــان بەدەستهێناوەو نازو نیعمەتی دیارو نادیاری خوای گەورەیان دەستخستووە.

خوای گەورە پێشەوایەتیکردنی لەئاییندا، بەئارامگری و یەقینەوە پەیوەست کردووەو ئەفــەرمووێ: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ السجدة: ٢٤، واتا: لەنێو ئەوانــدا پێشــەوایانێکمان دانــا ڕێنمونی خەڵکیان دەکرد بەفرمانی ئێمە کاتێ خۆیان گرت و لەئایەتــەکانی ئێمــە دڵنیابوون(باوەڕی پتەویان هێنا).

هەروەها هەواڵی داوە کە ئارامگری، باشترین شتێکە بۆ ئارامگران و بەسـوێند جــەختی لەســەر کردووەتــەوەو ئەفــەرمووێ: ﴿ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ ﴾ النحل: ١٢٦ ، واتا: ئەگــەر تۆڵــەتان ســەندەوە،ئەوە بەئەنــدازەی ئــەو ســتەمەی دژتــان کــراوە تۆڵــە بکەنەوە وە ئەگەر ئارام بگرن ئەوە باشترە بۆ ئارام گران.

هەروەك هەواڵی داوە کە باوەڕدار بەخۆڕاگری و لەخواترسانەوە فێڵ و پیلانی دوژمن زیانی لێ نادات ئەگەرچی دوژمنێکی زاڵیش بێ: ﴿ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿١٢٠﴾ ﴾ آل عمران: ١٢٠ ، واتــا: ئەگەر ئارامبگرن و تەقواتان هەبێ ئەوا هیچ لــە فێڵــەکانیان زیانتــان لــێ نــادات و خوای گەورە بەو کارەی دەیکەین تواناداره.

لەبارەی پەیامبەری خــۆی، یوســفی راستگۆشــەوە هــەواڵی داوە، کــە یوســف بەهۆی ئارامگری و لەخواترسانەوە بەپێگەی شــکۆمەندی و دەســەلات گەیشــت و ئــــــەفەرمووێ: ﴿ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ

﴿٩٠﴾ یوسف: ٩٠ ، واتا: بەڕاستی هەرکەس خۆی بپارێزێ و دان بەخۆیدا بگرێ ئەوسا بەڕاستی خوا پاداشتی چاکەکاران ون ناکات.

سەرفرازیی بەئارامگری و لەخواترسانەوە پەیوەست کردووەو موسڵمانانی لەوەدا ئاگادار کردووەتەوەو ئەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾ ﴾ آل عمران: ٢٠٠، واتا: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە خۆ گربن و لەخۆگری دوژمن خۆگرترین و لەسەنگەردا ئێشك بگرن و لەخوا بترسن بۆ ئەوەی رزگاربن.

لەبارەی ئەوانەی کە خوای گەورە خۆشیان ئەوێ و بۆ بڕەودان و هاندان(الترغیب والترهیب) فەرموویەتی: ﴿ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ ﴾ آل عمران: ١٤٦ ، واتا: خوا خۆڕاگرانی خۆش دەوێت.

خوای گەورە بەسێ شت موژدەی بەئارامگران داوە، هەریەك لەو سێ شتە باشترە لەوەی دونیا ویستان بۆ دونیا ئیرەیی بەیەکتر دەبەن، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ ( البقرة: ١٥٥ – ١٥٧ )

واتا: جا مژدە بدە بەخۆڕاگران. ئەوانەی کە لەگەڵ دووچاری سەختی یەك بوون دەڵێن ئێمە هەر هی خواین و هەر بۆلای ئەو دەگەڕێینەوە. ئا ئەوانە دروودوو بەزەیی بەسەر ئەواندا دەبارێ لە لایەن پەروەردگاریانەوە و ئەوانە ئەو کەسانەن هیدایەتیان وەرگرتووە.

ئامۆژگـاریی بەندەكانیشـی كـردووە بـەئارامگری و نوێـژەوە پشـت ببەسـتن بەرانبـەر ناخۆشـی و ناڕەحەتییـەكانی دونیـاو ئەركـەكانی ئـایین و ئەفـەرمووێ: ﴿وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ﴾ البقـرة: ٤٥، واتـا: پـەنا ببەنـە بـەر ئـارام گـرتن و نوێـژ(بۆ گەیشـتن بـە مەبەسـت) وە بێگومـان نوێژ(ئەركێكی)گەورەو گرانـە مەگـەر لای ئەوانـە نـەبێ كـە لـەخوا ئەترسـن واتـە خۆیان بەزل نازانن.

بردنـەوەی بەهەشـت و رزگـاربوون لەدۆزەخیشـی تـەنیا كردووەتـە شانسـی ئـــارامگران و ئەفــەرمووێ: ﴿ إِنِّي جَزَيۡتُهُمُ ٱلۡيَوۡمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ١١١ ﴾ المؤمنــون: ١١١، واتا:بێگومــان ئــەمڕۆ پاداشــتم داونەتــەوە بــەهۆی خۆگرییانەوە بەڕاستی هەر ئەوانن سەركەوتوو.

هەواڵیشی داوە كە ویستی پاداشتی خۆی و دووركرتن لەدونیاو جوانییەكانی، تەنیا بـاوەڕدارە ئارامگرەكـان بەدەسـتی دەهێـنن، ئەفـەرمووێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗاۚ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ٨٠ ﴾ القصص: ٨٠، واتا:ئەوانەی كە زانستیان پـێ درابـوو وتیـان هاوار بۆ ئێوە پاداشتی خوا( لە ڕۆژی دواییدا ) لەوە چاكترە بـۆ ئـەو كەسـانەی بڕوایـان هێنـاوەو كـردەوەی چـاكیان كـردووە وە كـەس ئەو(ووتـەی زانایانـە) وەرناگرێ جگە لە خۆڕاگران.

هەروەها هەواڵی داوە، بەباشە وەلأمدانەوەی خراپەی خەڵك وەها لەخراپەكار دەكات ببێتە دۆستێكی گیانی بـەگیانی و ئەفـەرمووێ: ﴿ وَلَا تَسۡتَوِي ٱلۡحَسَنَةُ

وَلَا ٱلسَّيِّئَةُۚ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ ﴿٣٤﴾ ﴾ فصلت: ٣٤، واتا: چاكەو خراپە چوون یەك نین بە چاكترین شێوە وەلامی(خراپە)بدەرەوە ئەوسا كەسێ كە لە نێوان و تۆ و ئەودا دوژمنایەتی هەیە وەك دۆستێكی دڵسۆز و گیانی بە گیانی لێ دێت.

ئەم ڕەوشت و خەسلەتەش تەنیا بۆ ئەوانەیە كە خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرمووێت:﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ﴿٣٥﴾ ﴾ فصلت: ٣٥، واتا: بەم ئاستەنگە ناكات كەسانێ نەبێ كە خۆ ڕادەگرن و بەئارامن وە پێ ی ناگات مەگەر كەسێ خاوەنی بەشی هەر گەورە بێت لە پاداشت.

خوای گەورە بەسوێند هەواڵی داوەو دووپاتی كردووەتەوە:﴿ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ﴿٣﴾ ﴾ ( العصر: ٢ – ٣ )

واتا: بێگومان هەموو خەڵكی لە زیاندایە. مەگەر ئەوانەی كە بڕوایان هێنابێ و كردەوە چاكەكانیان كردبێ وە ئامۆژگاری یەكتریان كردبێ بە ئایینی ڕاست وە ئامۆژگاری یەكتریان كردبێ بە ئارام گرتن.

دروستكراوانی خۆی كردووەتە دوو بەشەوە: هاوەڵانی دەستە ڕاست و هاوەڵانی دەستە چەپ، هاوەڵانی دەستە ڕاستی تایبەت كردووە بەئامۆژگاریكردن و پابەندبوون بەئارامگری و بەزەیی، ئایەت و نیشانەكانی تایبەت كردوون بۆ ئارامگران و سوپاسگوزاران و بەو شانسە زۆرە تایبەتی كردوون، لەچوار ئایەتی قورئانەكەیدا فەرموویەتی:﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ

﴿ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ ۝٥ ﴾ إبراهيم: ٥، واتا: بەڕاستی لەو(بیر خستنەوە)دا پەندو بەڵگەی زۆر هەیە بۆ هەموو خۆڕاگرێکی سوپاس گوزار.

هەر لەسورەتی ئیبراهیم ئایەتی:٥ و سورەتی( سبأ: ١٩، لقمان: ٣١، الشوری:٣٣ ).

لێخۆشبوون و پاداشتی بەکاری چاکەو ئارامگرییەوە پەیوەست کردووە، بۆ هەرکەسێکی ئاسان کردبێ ئاسان بووە، فەرموویەتی:﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ۝١١ ﴾ هود: ١١، واتا: جگە لەوانەی کە ئارام و خۆگر بوون و کردەوە چاکەکانیان بەجێ هێنا ئەوانە بۆیان هەیە لێبووردن و پاداشتی گەورە.

هەواڵی داوە کە ئارامگری و لێخۆشبوون یەکێکن لەو کارە گرنگانەی کە بۆ خاوەنەکانیان بەبازرگانییەکی زیان نەکردوو دادەنرێن و ئەفەرمووێ:﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ۝٤٣ ﴾ الشوری: ٤٣، واتا: هەر کەس خۆگر و لێبوردەبێ بەڕاستی ئەمە لە کارە پڕ بایەخ و پەسەندەکانە.

فەرمانی بەپەیامبەرەکەی داوە بۆ بڕیارەکانی ئارامگربێ و ئارامگرییەکەی بەوەوە بێ، بەوەش هەموو کۆست و ناخۆشییەکان کەم دەبنەوەو ئەفەرمووێ: ﴿ وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ۝٤٨ ﴾ الطور: ٤٨، واتا:ئارام بگرە بۆ بڕیاری پەروەردگارت ئەوسا بێگومان تۆ لە ژێر چاودێری ئێمەدایت هەر کاتێ(لەخەو)هەستایت تەسبیحات بکە بە ستایشی پەروەردگارت.

هەروەها فەرموویەتی:

﴿ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ (النحل: ١٢٧ – ١٢٨)

**واتــا: ئــەی موحەممەد(صــلی الله علیــە وســلم)دان بەخۆتــدا بگــرە ئــارام گرتنەکەشــت هــەر بە(یارمەتی)خوایــەو خەفــەتیان بــۆ مــەخۆ و بــەو فێــڵ و پیلانانەش دەیکەن دڵ تەنگ مەبە. بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەوانەیە کە خۆیان پاراستووە(لە تاوان) هەروەها ئەوانەش کە چاکەکارن.**

**ئــارامگریی مــێخ و کۆڵەکــەی بــاوەڕدارە، باوەڕدارەکــە دەگــەڕێ و دواتــر دەگەڕێتەوە لای ئەو مێخ و کۆڵەکەیە و باوەڕی بەوەوە دەبەستێتەوەو پشتی پێ دەبەستێت، باوەڕ(ئیمان)ی نییە ئەو کەسەی ئارامگریی نەبێ، بەڵام ئەگەر باوەڕەکــە لاواز بــێ و بەکــەمترین شــتێك کەســەکە خــوا بپەرســتێ، ئەگــەر خۆشییەکی هاتەڕێ دڵئارام ئەبێ و ئەگەریش تووشی فیتنــەو تاقیکردنەوەیــەکی ناخۆشــیش هــات هەڵدەگەڕێتــەوەو دونیــاو ئــاخیرەت زیــان ئــەکات و دۆڕان دەچنێتەوە.**

**بۆیــە باشــترین ژیانێــك، ئــەو ژیانەیــە کــە بەختــەوەران بــەئارامگرییان پێــی گەیشتن و بەسوپاسگوزارییان بەبــەرزترین پلــە گەیشــتن، لــەنێوان هــەردوو بــاڵی ئارامگری و سوپاسگوزارییدا بــۆ بەهەشــت بەڕێکــەوتن، ئــەوەش فــەزڵ و منــەتی خوایە بیەوێ بەهەرکەسێکی دەدات و خوایە خاوەن فەزڵی مەزن.**

## ڕوونکردنەوەی هۆکاری نووسینەوەی ئەم کتێبە

لەبەرئــەوەی ئیمــان دوو بەشــە: بەشــێکی ئــارامگری و بەشــێکی تــری سوپاسگوزارییە، ئـەوە مافـە بەسـەر هەرکەسێکەوە کـە ئامۆژگـاریی دەروونـی خۆی کردبێ و رزگاربوون و بەختەوەریی خۆی بووێ و،ئەم دوو بنەما رەسـەن و مەزنە لەبیرنەکات و لێی لانەدات و ڕۆیشتنی بەرەو خوای گەورە لەنێوان ئەو دوو رێگەیـەبێ تـاوەکو لـەڕۆژی گەیشـتنەوە و چـاوپێکەوتنی خـوای گـەورە، خـوای گەورە بیخاتە تەك باشترین مەخلوقەکانی خۆی.

لەبــەر ئەوپــەڕی پێویســتیی ئــارامگری و سوپاســگوزاریی، ئــەم کتێبــە نووسراوەتەوە، بۆ روونکردنەوەی ئەوەی خۆشبەختیی دونیاو ئـاخیرەت لەسـەر ئەو دوو شتە وەستاوەتەوە، بۆیـە کتێبێکـە کۆکـەرەوەی هـەموو سـوودەکانە و بەسوود گەلێکەوە هاتووە شیاوی ئەوەیە بەپەنجـە و دانـەکان توونـد گـازی لـێ بگـیردرێ و دەسـتبەرداریی لـێ نـەکرێت، چـێژ بەخشـە بـۆ خوێنـەرو روون و راشـکاوانەیە بـۆ ئـەو کەسـەی تەماشـای دەکـات و دڵـدەرەوەی خەفـەتباران و بەئاگاهێنەرەوەی کەمتەرخەمان و هاندەری کۆششکارانە، بیرۆکەو باسی خۆشی تێدایــە لەڕاڤــەی قورئــان و فــەرموودە، بەباســکردنی سەرچــاوەی خــۆی و شوێنەواری پێشین و گەڕاندنەوەی قسـەکە بـۆ بێژەرەکـەی و باسـکردنی بابـەت گەلێکی فیقهیی جوان و شیرین بەبەڵگـەی بڕیـار دراو و قسـە و باسـی دانسـقەی هەڵسوکەوتی رەوشتیی، کە بۆ ئەوانە شەراوە نین کە بیردەکەنـەوەو مێشـکیان دەخەنە کار.

تیایــدا باســکراوە لــەجۆرو بەشــەکانی ئــارامگری و سوپاســگوزاری و یەکلاکردنــەوەی فەزڵـداربوونی نێـوان دەوڵەمەنـدێکی سوپاسـگوزارو هـەژارێکی

ئـارامگر، هـەروەها باسـکردنی حەقیقـەتی دونیـاو نمونـەکانی خـوای گـەورەو پەیامبەرەکەی و پێشینی چاکەکار لەسەر دونیـاو قسـەکردن لەسـەر ئـەو پەنـدو نمونانەو بەراوردکردنی بەحەقیقەتی حاڵ، باسـکردنی ئـەوەی لـەدونیادا جێگـەی سەرزەنشـتییەو ئەوەشـی کـە جێگـەی ستایشـکردنەو ئـەوەی مـرۆڤ لـەخوا نزیکدەخاتـەوەو ئەوەشـی مـرۆڤ لـەخوا دووردەخاتـەوە، کامەیـە مـرۆڤ پێیـەوە بەدبەخت دەبیٚ و کامەیە مرۆڤ بەهۆیەوە بەختـەوەر دەبیٚ، تـاوەکو زۆرێك لـەو سوودانەی تر کە ئەم کتێبە لەخۆیانی گرتووە.

بێگومـان ئـەوە منـەتێکی تـەواوی خـوای گەورەیـە بـۆ سـەر بەنـدەی خـۆی، بەخشینێکە لەبەخشینەکانی، کتێبێکە شیاوی پادشـاو میرەکـان و دەوڵەمەنـدو هەژاران و صۆفی و شەرعناسـانە، مرۆڤـی دانیشـتوو بەرێدەخات و دڵـدەرەوەی رێبواری رێگەیەو رێبوار بەشوێنی مەبەست ئاگادار دەکاتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەمـە هـەوڵێکی کـەم و توانـای رەشـوڕووتێکە، لـەم کتێبـەدا لەدەرو بەلایەك ئاگاداریی داوە ئەگەرچی خۆیشـی لـەو دەردەدارانەیـەو وەسـفی چارەسەریشـی کـردووە ئەگەرچـی خۆیشـی بـەهۆی نـەزانی و سـتەمکردنییەوە توانـــای خواردنـــەوەی نییـــە، تکـــای لەبەخشـــندەترینی بەخشـــندەکاران و بەبەزەییترین بەبەزەییانە لێیخۆشبیٚ کە ئامۆژگاریی بەندە باوەڕدارەکانی ئـەوی کردووە.

هەرچـی لـەم کتێبـەدا دروسـت و راسـت بـیٚ، ئـەوە تـەنیا لای خـواوە بـووەو ستایشکراو و پشت پیٚ بەستراوە، گەر هەڵەیـەکیش هـەبیٚ لەدانـەرو شـەیتانەوە سەرچاوەی گرتووەو خواو پەیامبەرەکەی لێی بەدوورن.

ئەمە شمەك و دەسكەوتێكی كەمە پێشكەشی تۆ دەكرێت، بۆ خوێنەری دەسكەوت و بۆ دانەریشی زیانە، بەرەنجامی بیرو كاری خۆیەتی پێشكەشت دەكرێت.

كردوومەتە بیست و چوار تەوەرەوەو كۆتاییەكیشی هەیە:

تەوەری یەكەم: لەبارەی واتای ئارامگرییەوە(الصبر)لەڕووی زمانەوەانی و دارێژانەكانییەوە.

تەوەری دووەم: حەقیقەتی ئارامگری و قسەی خەڵك لەو بارەیەوە.

تەوەری سێیەم: لەڕوونكردنەوەی ناوەكانی ئارامگری و ئەوانەی بەوەوە پەیوەستن.

تەوەری چوارەم: لەجیاوازیی نێوان الصبر والتصبر و الاصطبار و المصابرة.

تەوەری پێنجەم: لەبەشەكانی ئارامگری بەپێی شوێنی خۆی.

تەوەری شەشەم: لەبارەی بەشەكانییەوە بەپێی جیاوازیی بەهێزی و لاوازییەوەی لە بەرەنگاریكردنی سوپای هەواو ئارەزوودا، هەروەها بۆ توانابوونی لەبەرەنگاربوونەوەیدا.

تەوەری حەوتەم: لەڕوونكردنەوەی بەشەكانی بەپێی ئەوانەی پێوەی پەیوەستن.

تەوەری هەشتەم: لەڕوونكردنەوەی بەشەكانی بەپێی پەیوەست بوونی بەپێنج حوكمەكەوە.

تەوەری نۆیەم: لەڕوونكردنەوەی جیاوازیی پلەكانی ئارامگری.

تەوەری دەیەم: لەبارەی جیاوازیی نێوان ئارامگرییەوە بۆ باش و سەرزەنشتكراو.

تەوەری یانزەیەم: لەجیاوازیی نێوان ئارامگریی مرۆڤی بەڕێزو مرۆڤی بیٚ ڕێز.

تەوەری دوانزەیەم: ئەو هۆکارانەی یارمەتیی بەهێزکردنی ئارامگریین.

تەوەری سیانزەیەم: لەڕوونکردنەوەی ئەوەی هیچ بارودۆخێك نییە مرۆڤ پێویستیی بەئارامگریی نەبیٚ.

تەوەری چواردەیەم: لەڕوونکردنەوەی سەختترین ئارامگریی لەسەر دەروونەکان.

تەوەری پانزەیەم: باسکردنی ئەوەی لەقورئانی پیرۆزدا لەباری ئارامگرییەوە هاتووە.

تەوەری شانزەیەم: باسکردنی ئەوەی لەدەقەکانی فەرموودەدا لەباری ئارامگرییەوە هاتووە.

تەوەری حەڤدەیەم: لەباسکردنی فەزڵی ئارامگریی کە هاوەڵان وتوویانە.

تەوەری هەژدەیەم: لەباسکردنی کاروبار گەلێکی پەیوەست بەکۆست و مەینەتیی لەگریان و لەخۆدان و سنگ داڕنین و نەریتی نەفامانەو هاوشێوەکانی تری.

تەوەری نۆزدەیەم: لەباسی ئەوەی ئارامگریی نیوەی ئیمانە، ئیمان دوو بەشە: بەشێکی ئارامگرییەو بەشەکەی دیکەی سوپاسگوزارییە.

تەوەری بیستەم: لەڕوونکردنەوەی ناکۆکیی خەڵك لەباشتردانانی ئارامگری و سوپاسگوزاری.

تەوەری بیست و یەك: لەبڕیاردانی نێوان ئەو دوو کۆمەڵەیەو یەکلاکردنەوەی باشتردانانی لایەکیان.

تەوەری بیست و دوو: لەجیاوازیی نێوان خەڵك ئاخۆ کامەیان باشترن: دەوڵەمەندێکی سوپاسگوزار یان هەژارێکی ئارامگر، کام لەو دوو بۆچوونە تەواوترە.

تەوەری بیست و سێ: باسکردنی ئەو بەڵگانەی هەژاران بۆ خۆیانیان وەرگرتووە لەقورئان و سوننەت و قسەی پێشینانی ئوممەت و ئیعتیبار.

تەوەری بیست و چوار: باسکردنی ئەو بەڵگانەی دەوڵەمەندان بۆ خۆیانیان وەرگرتووە لەقورئان و سوننەت و قسەی پێشینانی ئوممەت و ئیعتیبار.

تەوەری بیست و پێنج: روونکردنەوەی ئەوەی ئارامگری(الصبر) تێکەڵ بەسیفەتەکانی پەروەردگار بووە و پێیدەوترێ(الصبور الشکور).

ناوم لێناوە ئامادەسازیی ئارامگران و تووێشووی سوپاسگوزاران(عدة الصابرین وذخیرة الشاکرین)، تکام لەخوای گەورەیە ئەم کارەم دڵسۆزانە بۆ خۆی ئەنجام دابێ و قەرزداری رازیبوونی خۆیم بکات و سوودبەخشی بکات بۆ دانەر و نووسەرو خوێنەری، تکاو داوا دەبیسێ و وەڵامدەرەوەی تکاکارانە، ئەومان بەسە و باشترین تکا وەرگرو پشتیوانە.

***

## تەوەری یەکەم

## لەبارەی واتای ئارامگری( الصبر )لەڕووی زمانەوانی و داڕێژانەکانییەوە

بنچـــینەی وشـــەکە: ڕێگـــری و گـــرتن و گلدانەوەیـــە(المنع والحـــبس)، ئارامگری(الصـبر)دوورگرتنی دەروونـە لـەترس و شـپرزەیی بـوون، دوورگرتنـی زمانە لەگازندەکردن، دوورگرتنـی ئەندامـەکانی لاشـەیە لەلێـدانکردنی ڕوومـەت و سنگ دادڕین و هاوشێوەکانی تری.

ئەوترێ: صَبَرَ يَصْبِر صَبْراً، وصبر نفسه، واتا:دەروونی جڵەوگیر کرد(ڕاگرت)، پـــەروەردگاریش ئەفـــەرمووێت:﴿ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم ﴾ الكهف: ٢٨، واتا:خۆت ڕابگرە لەگەڵ ئەوانەی لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە.

عەنتەرەش[١] وتوویەتی:

فصبرتُ عارفة لذلك حرة ترسو إذا نفسُ الجبان تطلع

ئـەڵێ:دەروونی خـۆمم جڵـەوکردو شـارەزابوو بـەئارامگرتن و دامـەزراو بـوو، لەوکاتەی دەروونی مرۆڤی ترسنۆك نیازی هەڵهاتنی هەیە.

ئەوترێ: صـبرتُ فلانـا، ئەگـەر گـرتبێتم، وصـبَّرته: واتـا هـەڵمناو هـانم دا بـۆ ئارامگری.

---

[١] - عەنتەرەی کوڕی شـەدادی کـوڕی عـەمری کـوڕی موعاویـەی کـوڕی قـیرادی ئەلعەبسی، بـەناوبانگترین شۆرەسوارانی عەرەب بووە لەسەردەمی نەفامییدا، یەکێك بووە لەشاعیرانی چینی یەکـەم، جـوامێرترین و شکۆمەندترین کەسی نێو عەرەب بووە، بەزۆر توندو سەختبوونی بەسەرگەورە وەسفکراوە و لەشیعریشیدا بەناسکی و چێژ، دەورووبەری ساڵی٢٢ پ . ز مـردووە، بـۆ ژیاننامـەی بڕوانـە:((الأغـاني))(٨/ ٦٣٧) دێـڕە شیعرەکەشی لەدیوانەکەیدا لەلاپەڕە(٢٦٤)ە.

لــــەو فەرموودەیەشــــدا کــــە پیاوێــــك دەســــتگیرکراوەو ئــــەوی تــــر کوشــتوویەتی،هاتووە:((یُقتــل القاتــل ویُصْــبَر الصــابر))[1]،واتــا: بــۆ مــردن دەستگیرکراوەو راگیراوە، وصبرتُ الرجـل: واتـا راگـیراوە بـۆ کوشـتن، هـەروەها صبرته وأصبرته واتا: راگیراوە بۆ سوێند خواردن.

لەفەرموودەی سەحیحیشدا هاتووە:« مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينِ صَبْرٍ لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ عَنه مُعْرِض »[2]،واتا: هەرکەسێك بەسوێندی درۆوە ماڵی موسڵمانێك داگیربکات، کاتێـك دەگەڕێتـەوە بـۆ لای خـوای گـەورەو بـەخوا دەگاتەوە، خوای گەورە رووی لێ وەردەگێڕێ و لێی تووڕەیە.

لەفــەرموودەی ســوێند خواردنــدا هــاتووە:" وَلا تُصْــبِرْ يَمِينَــهُ حَتــى تُصْــبَرُ الأَيْمَــانُ"،واتا:بەسـوێندێکی گـەورە ناچـار بـوو بـواری بـۆ نەمایـەوە بـۆ سـوێند نەخواردن.

لەفەرموودەشدا هاتووە: (نهى عن المصـبورة)، واتـا نـەهی کـراوە لـەڕاگرتنی شەك مەڕو مریشك و بەستنەوەی و هێشتنەوەیان تا مرداربوونەوە.

کــرداری ئــەم وشــەیە:(صــبرت أصــبر) – بــالفتح في الماضــي والكســر في المستقبل بـۆ داهـاتووە ئەگـەر فەتحـەو کەسـرە بـێ – وأمـا (صـبرت أصـبر) – بالضم في المستقبل ، بەڵام ئەگەر بۆرە(ضمة)ی لەسەر بوو بۆ داهاتوو،بـەواتای لەئەستۆ گرتن و گرنتیی دێت(الكفالة)، والصبير: ئەو گرنتیکارەیـە کـە خـۆی بـۆ

---

[1] - عبـد الـرزاق في مصـنفه(١٧٨٩٢)والـدارقطني(٣/ ١٣٩– ١٤٠) ئیخراجیـان کـردووە،ئیبن حەجـەر ئـەڵێ: پیاوانی گێڕەرەوە متمانەدارن.

[2] - بوخاری(٦٦٧٦) و موسلیم(١٣٨)ئیخراجیـان کـردووە لەفەرموودەکـەی عبداللـەی کـوڕی مەسـعودەوە (خوای لێ رازیی بـێ)، فەرمایشـتی(وهـو عنـه معـرض) لای موسـلیم هەیـە لەفەرموودەکـەی وائیلـی کـوڕی حوجر(خوا لەهەردووکیان رازیی بێ).

بـژاردن راگرتووە،هـەروەها یـەکێك بڵـێ( اصـبرني )، واتـا: بمکـەرە گرنتیکـارو لەئەستۆ گر.

وتراوە بنچینەی وشەکە لەهێزو توونديیەوە هاتووە، يەکێك لەوانە خۆڕاگرتنە لەبەردەم دەرمانێکی ناسراو بەتاڵی و ناخۆش.

ئەصمەعیی وتوویەتی: گەر پیاوێك ڕووبەڕووی تەواوی سـەختییەك بوويـەوە، ئەوترێ: لەبەهێزی و توونديیەوەی بەسەرییەوە ڕووبەڕووی بوويەوە.

(الصُـبر)بەزەويـەکی پیتـدار دەوتـرێ لەبەرئـەوەی توونـدو بـەهێزە، بـەژنی سەربەستیش وتراوە(أُم صبّار)، هەروەها وتراوە ئەو قەومە کەوتوونەتە کـارێکی سەختەوە(أمر صبور)، هەروەها(صُبَارّة الشتاء) سەختیی زستان.

وتـراوە: لەکۆکردنـەوەو لەخۆگرتنـەوە وەرگـیراوە، مرۆڤـی ترسـاو و پەشـێو خــۆی کۆدەکاتــەوەو تــرس و پەشــێویی لــەخۆی دووردەخاتــەوە، (صُــبْرَةُ الطعام"کەڵەکەیەك خۆراك"، صبارة الحجارة"قوورسیی بەرد")یش هەیە.

سەلماوە کە (الصبر) سێ واتای هەیە: ڕێگری، سەختی، کۆکردنەوە.

ئەوترێ: صَبَر، کاتێك ئارامی گرت و پێویستی کرد بەئارامگرتن، اصـطبر: کـە دەستیخست و فێری بوو، صابر: کە ناکۆك و ڕکەبەرەکەی لەشوێنی ئارامگرتنـدا وەسـتاند، وصـبر نفسـە: واتــا خــۆی لەســەر ئـارامگرتن ڕاهێنــا: ناوەکـانی بکەریش(اسم الفاعل) ئەمانەن: صـابر، صَـبَّر، صَـبُر، مُصـابر، مُصْـطَبِر، مُصـابر کەسێکە ئارامی گرتووە، مُصْـطَبِر کەسـێکە خـۆی لەسـەر ئـارامگرتن ڕاهێنـاوە، هەرچی(صـبَّار و صـبُور) لەکێشـە سـیانەییەکانی موبالەغـەن، وەکـو: ضـرَّاب و ضَرُوب، خواش زاناترە.

***

## تەوەری دووەم

## لەبارەی حەقیقەتی ئارامگری و قسەی خەڵکی لەو بارەیەوە

لەتەوەری یەکەمدا لەڕووی زمانەوانییەوە باسمان لەبارەوە کرد، هەرچی حەقیقەتەکەشیێتی: خوڕەوشتێکی ڕێزدارانەی دەروونە کەسەکە ڕێگریی دەکات لەئەنجامدانی کارێك کە جوان و باش نییە، هێزێکە لەهێزەکانی دەروون و دەروونی پێ چاك و ڕێك دەبێت.

لەجونەیدی کوڕی موحەممەد[1] پرسیار کراوە وتوویەتی: خواردنەوەی تاڵییە بەبێ ڕووگرژکردن[2].

ذو النون ئەڵێ: دوورگرتنە لەشتە حەرام و پێچەوانەکان و ئارامگرتنە لەکاتی ناخۆشی و خۆ بەدەوڵەمەند دەرخستنە لەکاتی هەژارییدا[3].

وتراوە: ئارامگرتن(الصبر) واتا: بەئەدەب راوەستان لەگەڵ کۆست و ناخۆشییدا[4].

وتراوە: ڕۆچوونە لەئازارو ناخۆشییدا بێ دەرخستنی نارەزایی و گلەیی[5].

ئەبو عوسمان وتوویەتی: الصَّبَّار: کەسێکە خۆی راهێناوە بۆ پەلاماردانی ناخۆشییەکان[1].

---

[1] - جونەیدی کوڕی موحەممەدی کوڕی جونەیدی ئەلبەغدادیی ئەلخەزاز، ئەبو ئەلقاسمی ئەلنەهاوەندی، شێخی تایەفەی تەصەوف، ساڵی(٢٢٠ك)لەدایکبووە، یەکێك بووە لەزانا خواناسەکان، ساڵی(٢٩٨ك)مردووەو لەبەغدا نێژراوە لای گۆڕی ئەلسرپی ئەلسەقطیی خاڵۆی.

[2] - الرسالة القشيرية(ص١٨٣).

[3] – هەمان سەرچاوە(لا١٨٤).

[4] – هەمان سەرچاوە(لا١٨٤).

[5] – هەمان سەرچاوە(لا١٨٤).

وتراوە: الصبر(ئارامگری)، باش راوەستانە لەگەڵ ناخۆشییدا وەك باش و جوان راوەستان و مانەوە لەگەڵ خۆشییدا[2].

واتای ئەوەیە: مافی خوایە بەسەر بەندەوە لەخۆشی و ناخۆشییدا خوا بپەرستێ، لەکاتی خۆشییدا سوپاسگوزارو لەکاتی ناخۆشی و بەڵاشدا ئارامگربێ.

عەمری کوڕی عوسمانی ئەلمەککیی ئەڵێ: ئارامگریی واتا مانەوەو دامەزرابوون لەگەڵ خوای گەورەدا، بەپێشوازی و دڵفراوانییەوە پێشوازیی ناخۆشییەکانی بکەی[3]، واتا بەدڵفراوانییەوە رووبەڕووی ناخۆشیی ببیتەوە نەوەك بەدڵتەنگی و تووڕەیی و گلەیی و گازندە کردن.

ئەلخەواص ئەڵێ: ئارامگری،واتا: دامەزرابوون لەسەر بڕیارەکانی قورئان و فەرموودە[4].

رەویم ئەڵێ[5]:ئارامگری: وازهێنانە لەگازندەو گلەیی کردن[6]، مرۆڤ بەبوونی لەگەڵ ناخۆشییدا خۆشحاڵە.

کەسانی تر وتوویانە: ئارامگری، واتا پشت بەستن بەخوای گەورە[7].

---

[1] – هەمان سەرچاوە(ل١٨٤).

[2] – هەمان سەرچاوە(ل١٨٤).

[3] – الرسالة القشيرية(ص١٨٤).

[4] – الرسالة القشيرية(ص١٨٤).

[5] – رەویمی کوڕی ئەحمەدی کوڕی یەزید، صۆفییەکی بەناوبانگ و لەباشترین شێخەکانی بەغدا بووە، ساڵی٣٠٣ی کۆچیی مردووە.

[6] – الرسالة القشيرية(ص١٨٤).

[7] – هەمان سەرچاوە(ل١٨٤).

عەلیی کوڕی ئەبوتالیب(خوای لێ رازیی بێ)ئـەڵێ: ئارامگری(الصـبر)ولاخێکی پێ نەخلیسکاوە[1].

ئەبو موحەممەد ئەلجریریی ئەڵێ: ئارامگریی لەنێوان حاڵی خۆشی و ناخۆشی جیاوازیی ناکات و لەهەردوو حاڵەتدا کەسەکە ئارامە[2].

منـیش ئـەڵێم: ئەمـە لـەتوانای مرۆڤـدا نییـەو لەلایـەن خـواو پەیامبەریشـەوە فەرمانی وەهای بەسەردا نەدراوە، خوای گـەورە سرووشـتی مرۆڤـی وا راهێنـاوە ئـەو دوو حاڵەتـە جیـاواز دابنێـت، بـەڵام ئـەوەی لـەتوانای مرۆڤـدا بـێ ئەوەیـە، دەروونی لەترس و پەشێویی رابگرێ، ئەو دوو حاڵەتە وەك یەك نین، بـۆ بەنـدە رووبەری خۆشیی فراوانترە لەڕووبەری ئارامگرتن، هەروەك پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)لەپاڕانەوەی بەناوبانگدا فەرموویەتی:" إِنْ لَمْ يَكُنْ بِكَ غَضَـبٌ عَلَـيَّ فَلَا أُبَالِي، وَلَكِنَّ عَافِيَتَكَ هِيَ أَوْسَعُ لِي"[3]،واتا: ئەگەر تۆ لـەمن تـووڕە نـەبی ئـەوە مـن هـیچ خـەمێکم نییـە، بـەڵام ئـەو خۆشـییانەی تـۆ بـەمنی دەبەخشـی بـواری فراوانترن بۆ من.

ئەم پاڕانەوەیەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) دژ نییە لەگەڵ پاڕانەوەیەکی دیکەیدا کە دەفەرمووێت:" وَمَـا أُعْطِـيَ أَحَـدٌ عَطَـاءً هُـوَ خَيْـرٌ وَأَوْسَـعُ مِـنَ الصَّـبْرِ"[4]،واتا: هیچ خێرو چاکەیەك بەکەس نەدراوە لەئارامگریی باشتر و فراوانتربێ.

[1] – هەمان سەرچاوە(لا١٨٥).

[2] – هەمان سەرچاوە(لا١٨٥).

[3] - لاوازە، الطبراني له المعجم الكبير(١٣/ ٧٣/ ١٨١، الهيثمي له مجمع الزوائد(٦/ ٣٥)باسیکردووە.

[4] - بەشـێکە لەفەرموودەیـەکی ئـەبی سـەعیدی خودری(خـوای لـێ رازیـی بـێ)، بوخـاری(١٤٦٩) و موسلیم(١٠٥٣)ئیخراجیان کردووە.

بێگومان کە کۆست و ناخۆشیی بەسەر مرۆڤدا هات، هیچ شتێك لەئارامگرتن باشتر نییە بۆ بەندەکە، بەڵام لەپێش ئەوە خۆشیی فراوانترو باشترە.

ئەبو عەلیی ئەلدەقاق ئەڵێ: سنوورو ئاستی ئارامگری، ئەوەیە بەرانبەر قەدەر ناڕازیی نەبی.

بەڵام دەرخستنی ناخۆشییەکە بەبێ گازندەو گلەیی کردن لەگەڵ ئارامگرییدا دژ نییە، پەروەردگار لەچیرۆکی ئەیووبدا ئەڵێ: ﴿ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًاۚ ﴾ ص: ٤٤، واتا: بەڕاستی ئێمە ئەو(ئەیوب)مان بە خۆگر بینی. لەکاتێکدا فەرموویەتی: ﴿ مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ ﴾ الأنبیاء: ٨٣،[1] واتا: بەڕاستی من زیان و ئازار و نەخۆشی دووچارم بووە.

وتنی(دەرخستنی ئازارو مەینەتیی بەبێ گلەیی و گازندەکردن)، گازندەکردن دوو جۆرە:

**جۆرێکیان:** گازندەکردنە لای خوای گەورە، ئەمە دژ نییە لەگەڵ ئارامگرییدا هەروەکو یەعقوب وتوویەتی: ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٨٦ ﴾ یوسف: ٨٦، واتا: ووتی من باسی خەفەت و پەژارەم هەر لای خوا دەکەم وە من لە لایەن خواوە شتانێك دەزانم کە ئێوە نایزانن.

[1] - الرسالة القشیریة(ص١٨٨).

ئــەوەی کــە یــەعقوب وتــی، دژ نییــە لەگــەڵ ئــەم قســەیەی دیکەیــدا: ﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ﴾ یوسف: ١٨، واتــا: ووتــی جــا ئــارام دەگــرم بــەئارام گرتنێکــی جــوان و پەسەند.

هــەروەها ئــەوەی ئــەیوبیش وتوویــەتی: ﴿ مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ ﴾ الأنبيـاء: ٨٣،[1] لەکاتێکدا خــوای گــەورەش بــەئارامگریی وەســفی کــردووە. گــەورەی ئــارامگران سەلات و سەلامی خوای لەسەربێ فەرموویەتی: "اللَّهُمَّ أَشْكُو إِلَيْكَ ضَعْفَ قُوَّتِي، وَقِلَّةَ حِيلَتِي......."[2]، موساش سەلامی خوای لەسەربێ فەرموویەتی: « اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، وَإِلَيْكَ الْمُشْتَكَى، وَأَنْتَ الْمُسْتَعَانُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِك »، واتــا: خوایــە گیان سوپاس و ستایش تەنیا بۆ تۆیە، گازندەو گلەیی بۆلای تۆ دەهێنم و تــەنیا پشت بەتۆ دەبەستم و هەموو هێزو گۆڕانێك بە تۆ دەکرێ خوایە گیان.

**جۆری دووەم:** گازندەی مەینەتبار بــەزمانی حــاڵ دەریــدەبڕێ، ئەمــە لەگــەڵ ئارامگرییــدا کۆنابێتــەوە، بــەڵکو دژو هەڵوەشــێنەرەوەی ئارامگرییــە، وەك جیاوازیی نێوان گازندەو گازنــدەلاکراوە، پشــت بــەخوای گــەورە بــۆ ئــەم بابەتــە دەگەڕێینەوە لەتەوەری(کۆبوونەوەی گازندەو ئارامگری و جیابوونەوەیان).

وتــراوە: ئــارامگریی ئازایــەتیی دەروونــە، هــەر لێرەوەیــە وتــراوە: ئازایــەتیی ئارامگریی کات و ساتێکە.

ئــارامگری و تــرس دوو شــتی دژ بەیــەکن، بۆیــە بەرانبــەرو بــەراورد بەیــەکتر دەکــرێن، پــەروەردگار لــەبارەی دۆزەخییەکانــەوە ئەفــەرمووێ: ﴿ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ

---

[1] - الرسالة القشيرية(ص١٨٨).

[2] - لاوازە، کەمێك پێش ئێستا تەخریج کرا.

﴿أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾﴾ إبراهيم: ٢١، واتا: هاوارو ناڵە بکەین یان ئارام بگرین ڕزگار بوونمان نی یە(لەسزای)خوا.

ترس و نائارامیی دووانەو هاوتای دەستەوەستانییە، ئارامگرییش دووانەو ماددەی براوەییە، گەر لەترس و نائارامیی پرسیار بکرابایە: کێ باوکی تۆیە؟ ئەیووت: دەستەوەستانی و بێ توانایی، لەبراوەییش پرسیار بکرابایە: کێ باوکی تۆیە؟ ئەیووت: ئارامگری.

دەروون ولاّخی سواریی بەندەیە کە پێیەوە دەگاتە بەهەشت یان دۆزەخ، ئارامگریی بۆ دەروون وەك مێخ و کۆڵەکەی جڵەوگیریی وایە، ئەگەر ولاّخی سواریی رەشمەو کۆڵەکەی بەستنەوەی نەبێ، ویڵ و ون دەبێ.

لەوتارێکی حەجاجدا ئەوە پارێزراوە کە وتوویەتی: دەروونەکان رێگریی بکەن، چونکە دەروون بەشوێن هەموو خراپەیەکدا دەگەرێت، بەزەیی خوا بۆ ئەو کەسەی دەروونی خۆی جڵەوگیر دەکات و رایدەکێشێت بەرەولای گوێڕایەڵییکردنی خوای گەورەو لەسەرپێچییەکان دووریدەخاتەوە. ئارامگرتن لەسەر پیرۆزییەکانی خوا ئاسانترە لەئارامگرتن لەسەر سزاو ئەشکەنجەکانی.

منیش ئەڵێم: دەروون دوو هێزی هەیە: هێزی پێ هەڵگرتن و هێزی راگرتن، حەقیقەتی ئارامگریی ئەوەیە وەها بکات هێزی پێ هەڵگرتن بۆ شتی سوودبەخش بێ و هێزی راگرتنیشی دوورگرتن بێ لەشتێ زیانی لێ بدات.

خەڵکانێك هەن هێزی ئارامگرتنیان لەسەر کارێك سوودیان پێ بگەیەنێ بەهێزترە لەهێزی ئارامگرتنیان لەسەر شتی زیانەدەر، لەسەر سەختی و نارەحتیی خواپەرستیی ئارام دەگرن، بەلاّم ئارامگرنین لەسەر ویست و داواکارییە ئارەزووبازییەکانی دەروونیان کە داوای تاوانێکیان لێ دەکەن، هەر

لەنێو خەڵکیدا هەیە ئارمگرتنی لەسەر دوورگرتن لەتاوانەکان بەهێزترە لەئارامگرتنی لەسەر سەختیی خواپەرستی، هەیە بۆ کاری چاکەو بۆ خراپەش ئارامگریی نییە، باشترینیی خەڵکیی ئەوانەن کە بۆ هەردوو جۆرەکە ئارامگرن، بۆ ئەنجامدانی خواپەرستیی ئارامگرن و بۆ دوورگرتن لەتاوانیش هەر ئارامگرن.

زۆرێك خەڵکیی هەن ئارامگرن لەسەرماو گەرمادا شەونوێژ بکەن و باری سەختی ڕۆژووگرتن هەڵبگرن، بەڵام بەرانبەر ڕوانینێکی حەرام ئارامگر نیین، زۆرێك خەڵکییش هەن بەئارامن بەرانبەر ڕوانینی حەرام و لاکردنەوە بەلای وێنەکاندا، بەڵام ئارامگرییان نییە لەسەر ئەنجامدانی کاری چاکەو دوورگرتن لەخراپەو جیهادکردنی بێباوەڕو دووڕووان و بێ تواناترن لەوەی ئەو ئارامییەیان هەبێ، زۆربەیان لەیەکێك لەو دوولایەنە ئارامگرییان نییەو کەمیان هەن لەئەنجامدانی کارە باشەکان و دوورگرتن لەخراپەکان(لەو دوو شتەدا)ئارامگرییان هەبێ.

وتراوە: ئارامگریی دامەزراوبوونێکە عەقڵ و ئایین بەرانبەر دەکاتەوە بەرانبەر هەڵنانی ئارەزوو شەهوەت،واتا سرووشتی مرۆڤ بڕیاری ئەوە دەدات کە حەزی لێ هەیەو عەقڵ و ئایینە ئەوەی لێ ڕێگریی دەکات، هەمیشە لەنێوان ئەو دوو شتەدا شەڕێکی بەردەوام هەیە، شوێنی ئەو جەنگە دڵی مرۆڤ و ئارامگری و ئازایەتی و دامەزراوبوونە.

***

## تەوەری سێیەم

## لەڕوونکردنەوەی ناوەکانی ئارامگری و ئەوانەی پێوەی پەیوەستن

لەبەرئــەوەی ئــارامگریی جــوان: ئارامگرییــەکی دەروونیــی سەرپشــکانەیە بەرانبــەر پاڵنــەرەکانی ئارەزوویــەکی بێــزراو، ئــەوە پلــەو ناوەکانیشــی بــەپێی پەیوەستکراوەکانێتی.

بەئارام بوون لەبــەردەم ئــارەزووی داوێنێکــی حەرامدا، نــاونراوە داوێنپــاکی، دژەکەشی داوێنپیسی و بەدڕەوشتی و بەرەڵاییە.

ئەگەر لەبەردەم ئارەزووی سك و خێرا نەکردن بۆ خواردن و نەخواردنی شتــی پیس بێ، ناونراوە دەروون بەرزی و دەروون تێری، دژەکەشــی سووکی و پــیس خۆری و دەروون نزمییە.

ئەگــەر ئارامگرییەکــە بــۆ دەرنەخســتنی وشــەیەك بــێ کــە دەرخســتنی جــوان نییە،ئەوە ناونراوە نهێنیی پاراستن، دژەکەشــی دەنگــۆ بڵاوکردنــەوەو تۆمــەت و خراپەو جنێو و درۆ و قسەی سووك.

ئەگــەر ئارامگرییەکــە لەبــەردەم زیــاترکردنی بــژێویی بــێ، نــاونراوە دونیــا بەکەمگرتن(زوهد)، پێچەوانەکەشی هەڵپەکردن و پێداگری، ئەگــەر رازیبــوون بــێ بەبەشێکی دونیا، پێیدەوترێ قەناعەت، پێچەوانەکەشی هەڵپەکردن.

ئەگەر ئارامگرتن بێ لەبەرانبەر کارێکی تووڕەکردنــدا، نــاونراوە نــەرمونیانی، دژەکەشی خێرا هەڵچوون.

ئەگەر پەلەنەکردن بێ، ناونراوە بەڕێزی و دامەزرابوون، دژەکەشی هەڵەشە.

ئەگەر ئـارامگرتن بـێ لەبەرانبـەر ئـەوەی پێویسـتی بەهـەڵهاتن و راكـردن بـێ پێیدەوترێ ئازایەتی، دژەكەشی ترسنۆكی و دۆڕان.

ئەگەر ئارامگرتن بێ لەبەرانبـەر شـتێك تۆڵـەكردنی پێویسـت بـێ پێیـدەوترێ لێبووردن و لێخۆشبوون، دژەكەشی تۆڵەكردنەوەو سزادان.

ئەگەر ئارامگرتن بێ لەبەرانبەر خواردن و خواردنەوەیەكی پێویست لەكاتێكی دیاریكراودا، ئەوە پێیدەوترێت بەرۆژوو بوون.

ئەگەر ئارامگرتن بێ لەبەرانبەر پاڵنەری بێ توانایی و تەمبەڵی، ئەوە ناونراوە ژیری.

ئەگەر لەبەردەم ئەوەدابێ كـە بـۆ بـژێوی پێویسـت بـێ پشـت بەكەسـانی تـر ببەستی، بەئارام بی و خۆت ئەوە راپەڕێنی، ئەوە پێیدەوترێ جوامێری.

بۆیە ئەنجامدانی هەموو كارێـك و وازهێنـان لـەكار گـەلێك، نـاو گـەلێك هەیـەو تایبەت بەو كاروكردەوەیەن، نـاوی كۆكـەرەوەی هـەموویان ئارامگرییە(الصـبر)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە هەموو پەیوەستكارەكانی ئایین لەسەرەتاوە تاوەكو كۆتایی بەئارامگرییەوە پەیوەستن، ئەگەر لەنێوان هەردووكیدا یەكسانیی بكـرێ، پێیـدەوترێت دادپـەروەربوون و دژەكەشـی سـتەمكردنە، ناویشـی لـێ نـراوە سەماحەت ئەگەر بـەڕازیبوون و سەرپشـكییەوە ئـەرك و موبـاحی( ڕێگەپێـدراو ) ئەنجام دابێ، هەموو پێگەو كارەكانی ئایین بەو جۆرەیە.

***

# تەوەری چوارەم

## لەجیاوازیی نێوان ( الصبر والتصبر والاصطبار والمصابرة )

جیاوازیی نێوان ئەو ناوانە، بەپێی حاڵی بەندەکەیە لەدەروونی خۆی و لەگەڵ کەسانی تردا، ئەگەر دەروونی خۆی جڵەوگیر کرد بەرانبەر شتانێکی ناشیرین و ئەوە بۆی ببووە رەوشت و بەهرە پێیدەوترێت(صبر)، ئەگەر بەزۆر جڵەوی دەروونی خۆی کردو خۆی رادەهێناو تاڵیی چەشت پێیدەوترێت(تصبر – بەزۆر ئارامگرتن)، وەك ئەوەی مرۆڤ بەزۆر نەرموونیان بێ، بەزۆر ئازایەتیی بنوێنێ و زۆر لەخۆی بکات رێز بنوێنێ و خۆڕاگربێ و هاوشێوەکانی تریش.

ئەگەر بەندەکە زۆر لەخۆی بکات و خۆی لەسەر رابهێنێ،ئەوە بۆی دەبێتە سرووشت، هەروەك لەفەرموودەدا هاتووە کە پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم) فەرموویەتی:« وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللَّهُ »[1] ،واتا: هەرکەسێ بەزۆر لەخۆکردن ئارام بگرێ، ئەوە خوای گەورەش ئارامگری دەکات.

هەروەها بەندە زۆر لەخۆی دەکات و خۆڕادەگرێ لەسەر داوێنپاکی، تائەوەی داوێنپاکیی بۆی دەبێتە سرووشت، تەواوی رەوشتەکانی دیکەش هەر بەوشێوەیەن.

بابەتێکەو خەڵکیی لەبارەیەوە جیاوازن: ئاخۆ دەکرێ یەکێك لەوانە دەستبخرێ، یان زۆر لەخۆکردن بۆ ئەو رەوشتە دەبێتە سرووشت و خوورەوشت؟ هەروەك شاعیر ئەڵێ:

يُرادُ من القلب نسيانكم وتأبى الطِّباعُ على النَّاقل

---

[1] - فەرموودەیەکی صەحیحەو پێشتر تەخریج کرا.

واتــا: لــەدڵ داوا دەکرێــت ئێــوە لــەبیر بکــات، بــەڵام دڵ ڕەتیدەکاتــەوە دەستبەرداریی خۆشویستنی شتێك بێ پێیەوە سرووشتی وەرگرتبێ.

یەکێکی تر ئەڵێ:

يا أيها المتحلّي غيرَ شِيْمَتِه　　　　إن التخلق يأتي دونه الخلق[1]

واتا: ئەی ئەو کەسەی بەڕەوشتێك خۆتت نواندووە کە هــی خــۆت نییــە، ئــەو ڕەوشتە دەڕوات و ئەوەی خۆت دێت و دەردەکەوێت.

یــەکێکی تــر ئــەڵێ: خۆنوانــدن، جــوامێریی کەســەکە دەشــێوێنێ و ناشــیرینی دەکات.

وتوویانــە: خــوای گــەورە ڕەوشــت و دروســتبوون و ڕزق و ڕۆژی و مردنـــی بڕیووەتەوە.

کۆمەڵێکی تر وتوویانە: چۆن عەقڵ و نەرموونیانی و ســەخاوەتی و ئازایــەتیی دەســـتدەخرێ و مـــرۆڤ وەریـــاندەگرێ، خووڕەوشـــتیش بـــەدەستدەخرێت، بــوون( وجود ) بۆ ئەوە شایەتە.

وتوویانــە: بــەردەوامبوون و هەوڵدانــە بــەهرەکان دەدات، واتــا گــەر کەســێك لەکارێکـدا بــەردەوام بــوو کردیــە نــەریت و لەســەری ڕاهێنــانی کــرد، ئــەوە بــۆی دەبێتــە سرووشــت و بــەهرە، وتوویانــە: نەریتــەکان سرووشــتەکان دەگــۆڕن و دەگوازنەوە، بۆیە بەنــدە بــۆ ئــارامگریی زۆر لــەخۆی دەکــات و خــۆی رادەهێنــیَ تاوەکو ئارامگریی بۆی دەبێتە سرووشت، هەروەك بــۆ نــەرمونیان بــوون و ڕێــزو ئارامی و دامەزراوبوونیش هەوڵدەدات تاوەکو بۆی دەبێتە سرووشت.

---

[1] - بڕوانرێتە :المستطرف(١/ ١٣٣).

وتوویانــە: خــوای گــەورە لەمرۆڤــدا هێــزی قبــوڵکردن و فێربــوونی دانــاوە، گواستنەوەی سرووشت ئەستەم نییە، بەلاَم ئەوە هەیـە گواسـتنەوەیەکی لاوازەو بەکەمترین پاڵنەرێك بەندە دەگەڕێتـەوە سرووشـتی خـۆی، رەنگـە هەنـدێجاریش بەهێزبێ و سرووشتی نەگواستبێتەوە، ئەگەر پاڵنەرەکەی بەهێزبوو دەگەڕێتەوە بۆ سرووشتی جارانی خۆی.

هەرچی(الاصطبار)ە، ئەوە بـەپێزترو گـرنگترە لە(التصـبر)، (التصـبر)بنەمای (الاصطبار)ە، زۆر ئارامگرییەکە دووبارە دەبێتەوە تاوەکو دەبێتە(الاصطبار).

هەرچی(المصابرة)یە: بەرەنگاریکردنی رکەبـەرو کەسـی ناکۆکـە لـەگۆڕەپانی ئارامگرییدا، (مفاعلة)یە، دەبێ لەنێوان دوو کەسدا رووبـدات وەك شـەڕە جنێـو و قسە بــەیــەکتر وتن، لێدانـکردنـی یــەکتر، پــەروەردگـار دەفەرمــوێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾ ﴾ آل عمران: ٢٠٠، واتــا: ئــەی ئــەوانەی کــە بــڕواتان هێناوە خـۆ گـربن و ( لەخۆگری دوژمن )خۆگرتر بن و لەسەنگەردا ئێشك بگـرن و لـە خـوا بترسـن بـۆ ئەوەی رزگار بن.

فەرمانی پێداون بەخۆڕاگری و ئارامگرتن، کەسەکە لەگەڵ خۆیدا ئارام بگـرێ، (المصــابرة) حاڵــەتی ئارامگرتنــە لەگــەڵ کەســی ناکۆکــدا، ســەنگەرگرتن و دامەزرابوون و مانەوەیە لەسەر ئارامگرتن، هەندێجار بەندە ئارامگر دەبێ لەگـەڵ خۆیـدا، بـەلاَم لەگـەڵ ناکۆکـدا ئـارامگر نـابێ، ئـەکرێ لەگـەڵ خـودی خـۆی و ناکۆکیشدا ئارامگربێ، بەلاَم توانای ئارامیی سەنگەرگرتنی نییـە، ئـەکرێ لەگـەڵ خودی خۆی و ناکۆك و لەسەنگەریشدا ئارامگربێ و بۆ خواپەرستیی نەبێ، بـەلاَم خواپەرســتیی گرنگــەو رزگــاربوون لەســەر تــەقواو خواپەرســتیی راوەســتاوە،

پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾ ﴾ آل عمران: ٢٠٠، واتا:لەخوا بترسن بۆ ئەوەی ڕزگار بن.

سەنگەرگرتن کە مانەوەی سەر سنوورەو ترسی پەلاماری دوژمنی لێ هەیە، یەکێکە لەپێویستییەکانی سنووری دڵیش تاوەکو هەواو ئارەزوو شەیتانی لێیەوە نەیەتە دڵەوەو بەم سەنگەرگرتن و ئارامگرتنە، بەندە شەیتان و هەواو ئارەزووی لەشانشینی دڵی خۆی دووردەخاتەوە.

***

## تەوەری پێنجەم

## لەبارەی بەشەکانی ئارامگرییەوە بە پێی شوێنەکانی

ئارامگرتن دوو جۆرە: جۆرێکی جەستەیی و جۆرێکی دەروونی، هەریەک لەم جۆرە دەبێتە دوو جۆری ترەوە: سەرپشکی و ناچارانە، بەوەش دەکاتە چوار جۆر:

**یەکەم:** جەستەیی سەرپشکدارانە، وەك راهاتن لەسەر کارە قورسەکانی سەر جەستە بەویستی ئازادو سەرپشکانە.

**دووەم:** جەستەیی ناچارانە، وەك ئارامگرتن لەسەر ئازاری لێدان و نەخۆشی و برین و سەرماو گەرماو ئەو شتانەی تر.

**سێیەم:** دەروونیانەی سەرپشکدارانە، وەك ئارامگرتن و دوورگرتنی دەروون لەبەردەم کارێکدا کە لەڕووی شەرع و عەقڵەوە ئەنجامدانی جوان نییە.

**چوارەم:** دەروونیانەی ناچارانە، وەك ئارامگرتنی دەروون لەسەر خۆشەویستەکەی کە ناچارانە لەیەك دادەبڕێن.

کە ئەو جۆر گەلەت ناسی، ئەوە بزانە تایبەتن بەمرۆڤەوە نەوەك ئاژەڵان، ئاژەڵ لەدوو جۆریدا لەگەڵ مرۆڤدا هاوبەشە: ئارامگرتنی دەروون و جەستەی ناچارانە، لەوەدا هەندێك ئاژەڵ لەمرۆڤ بەئارامترە، مرۆڤ بەدوو جۆرە سەرپشکدارییەکە لەئاژەڵ جیادەکرێتەوەو تایبەتمەند دەبێ، زۆربەی خەڵك هێزی ئارامگرییەکەیان لەو جۆرەدایە کە لەگەڵ ئاژەڵدا هاوبەشن نەك لەو جۆرەی تایبەت بەمرۆڤە، لەجۆری سەرپشکییدا لەڕیزی ئارامگران دانانرێت.

ئەگەر وترا: ئایە لەئارامگرتندا جنۆکەش هاوبەشی مرۆڤ دەبێ؟

ئەوە وتراوە: بەڵێ، ئەوە لەپێویستییەکانی ئەرکەداربوونن، لەجێبەجێکردنی فەرمان و نەهییەکاندا شوێنیان هەیەو جنۆکەش وەك مرۆڤ ئەرکیان بەسەردا دراوە تاوەکو لەسەر فەرمانەکان و دوورگرتن لەنەهییەکان بەئارام بن، وەك ئێمە چۆن لەڕووی شەرعەوە ئەرکدارکراوین، ئەوانیش هەر بەو شێوەیە ئەرکدار کراون.

ئەگەر وترا: هەر بەو جۆرەی ئێمە ئەرکدار کراون یان بەجۆرێکی تر؟

ئەوە وتراوە: لەنمونەی پێویستییەکانی دەروون، وەك خۆشەویستی و رق و کینەو باوەڕو راستخستنەوەو دۆستایەتی کردن و دوژمنایەتی کردن، ئا لەوانەدا ئێمەو ئەوان وەك یەکین، لە نمونەی پێویستییەکانی جێبەجێکردنی لایەنی جەستەیی وەك خۆشۆردنی دوای لەشگرانی و شۆردنی ئەندامانی جەستە بۆ دەستنوێژ شۆردن و سەرئاوکردنەوەو خەتەنەکردن و خۆشۆردنی دوای سووڕی مانگانەو جۆرەکانی تر، ئا لەو ئەرکانەدا وەکو ئێمە نین،بەڵکو پەیوەستە بەجۆری دروستبوون و ژیانیانەوە.

ئەگەر وترا: لەهیچ بەشێکی ئارامگرییدا فریشتەش هاوبەشی ئێمەی مرۆڤ ئەبن و وەك ئێمەن؟

وتراوە: فریشتەکان بەهەواو ئارەزوویەك تاقی نەکراونەتەوە دژ بێ بەعەقڵ و مەعریفەیان بێ، بەڵکو خواپەرستی و گوێڕایەڵیان وەك هەناسەی ئێمەیە، بۆیە تێڕوانینی ئەوە ناکرێ پێویستییان بەئارامگریی هەبێ تاوەکو هاندەری ئایین و عەقڵ بێ و سەریبخات بەسەر هاندەری شەهوەت و ئارەزوودا.

ئەگـەر ئارامگرییـەکیان هـەبێ، ئـەوە شـیاو بەخۆیانـە، وەك دامـەزرابوونیان لەسەر ئەو شێوەیەی لەسەری دروستکراون بێ پێویستبوون بەشەڕکردنی هـەواو ئارەزوو سرووشتێك.

هــەر مرۆڤێـك لەئێمــە گــەر ئارامگرییەکـەی بەســەر هانــدانی شــەهوەت و ئارەزوویـدا زاڵبوو،ئـەوە بەفریشـتەکان دەگـات، ئەگـەر هانـدەری شـەهوەت و ئارەزووی زاڵبوو، ئەوە بەشـەیتانەکان دەگاتـەوە، ئەگـەر سرووشـتی خـواردن و خواردنـەوەو جووتبـوونی بەسـەر ئارامگرییـدا زاڵبـوو، ئـەوە دەگاتـەوە ریـزی ئاژەڵان.

قـەتادە[1] ئـەڵێ: خـوای گـەورە فریشـتەکانی دروسـتکرد، عـەقڵی پێیـان داو شـەهوەتی پـێ نـەدان، شـەهوەتی بـەئاژەڵان داو عـەقڵی پـێ نـەدان، مرۆڤـی دروستکردو عەقڵ و شەهوەتی پـێ دا، هـەر مرۆڤـێ عـەقڵی بەسـەر شـەهوەتیدا زاڵبوو، ئەوە لەگەڵ ریزی فریشتەدایە، هەرکەسێکیش شەهوەتی بەسەر عەقڵیـدا زاڵبوو، ئەوە لەریزی ئاژەڵان دایە.

لەبەرئـەوەی مـرۆڤ لەسـەرەتادا بەناتـەواویی دروسـتکرا، ئـەوە تـەنیا حـەزو ئارەزووی خواردنی تیادا دروستکراوە کە پێویستی پێ هەیە، بۆیـە ئـارامگرتنی لەم حاڵەتـەدا وەك ئـارامگرتنی ئاژەڵانـە،پێش فامیـدە بـوون هێـزی ئـارامگرتنی سەرپشکانەو خۆویستانەی نییە.

کـە حـەزی یـاریکردنی تێـدا دەرکـەوت، ئامـادە دەبـێ بـۆ هێـزی ئـارامگریی سەرپشـکانە چـونکە تیایـدا لاوازە، کـە حـەزی هاوسـەرگیریی دەرکـەوت هێـزی

---

[1] - قــەتادەی کــوڕی دیعامــە، ئــەبو ئەلخــەتاب ئەلسەدوســی ئەلبەســری، زانــا بــووە لــەزمانی عەرەبییدا(ساڵی٦٠ك لەدایکبووەو ١١٨ك مردووە).

ئارامگرییشی تێدا دەردەکەوێت، کە دەسەلاتی عەقلّ جولایەوەو بەهێز بوو، ئەوکات پشت بەسوپای ئارامگریی دەبەستێ، بەلام ئەو دەسەلات و سوپایە بەتەنیا ناتوانن روبەرووی دەسەلات و سەربازانی حەزو ئارەزوو بووەستنەوە، ئەوە هەڵهاتنی رووناکیی باوەڕە لەیەکەمین ساتی فامیدە بووندا بەڕوویدا هەڵدێت و بەلەسەرخۆیی تاوەکو تەمەنی پێگەیشتن ( باڵغبوون ) گەشە دەکات، وەك دەرکەوتنی نیشانەی بەیانیبوونەوەیە کە دواتر دەرکەوتنی زیاتر ئەبێت، هەموو ئەوانە رێنیشاندەرییەکە تەنیا لەبارەی بەرژەوەندی و زیانەکانی ئاخیرەتەوە نییە، بەڵکو ئامانجی وابەستبوون و پەیوەستبوونێت بەهەندێ بەرژەوەندیی دونیاو خراپییەکانیشییەوە.

بەلام ئەگەر خۆری پەیامبەرایەتیی بەسەر ئەو دەروونەدا هەڵهات، ئەوکات لەژێر ئەو رووناکییەدا وردو درشتی سوودو زیانەکانی دونیاو ئاخیرەت دەبینێ و ئەنجامەکانی لەپێش چاو ئەبێ، کەرەستەو ئامرازی جەنگ لەبەر دەکات و جۆر گەلێکی چەك هەڵدەگرێ و ئەکەوێتە نێوان شەڕکردنی پاڵنەرەکانی شەهوەت و ئارەزوو، هەروەها پاڵنەرەکانی عەقلّ و هیدایەتەوە، سەرکەوتوو ئەو کەسەیە خوای گەورە سەریبخات، دۆڕاویش ئەو کەسەیە خوای گەورە شەرمەزاری بکات، ئەم جەنگە کۆتایی ناکات تاوکو مرۆڤەکە دەگاتە بەهەشت یان دۆزەخ و بەیەکێك لەو دوو شوێنە دەگات کە بۆی دروستکراوە.

***

## تەوەری شەشەم

## لەبارەی بەشەكانییەوە بە پێی جیاوازیی هێزو لاوازییەكەی و بەرەنگاریكردنی سوپای هەواو ئارەزوو، بێ توانایيشی بەرانبەری

پاڵنەری ئایینداری و هەروەها هەواو ئارەزوو سێ حاڵوباری هەیە:

یەكەم:ئەوەیە زاڵبوون بۆ پاڵنەری ئایین بێ و سوپای هەواو ئارەزوو بەتێكشكانەوە وەلأم بداتەوە، جا مرۆڤ بەبەردەوامبوونی لەسەر ئارامگریی بەم حاڵەتە دەگات، ئەوانەی بەم پلەو مەقامە گەیشتوون ئەوانەن كە لەدونیاو ئاخیرەتدا سەركەوتوون، ئەوانەن كە وتیان:﴿ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ ﴾ فصلت: ٣٠، واتا:وتیان خوا پەروەردگارمانە و لەپاشان ڕاست(لەسەر ئایین)بەردەوام بوون.

ئەوانەن كە لەسەرەمەرگدا فریشتە پێیان ئەڵێ:﴿ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ فصلت: ٣٠ – ٣١، واتا:مەترسن و خەفەت مەخۆن وە مژدەبێ لێتان ئەو بەهەشتەی كە بەڵێنتان پێ درابوو. ئێمە لەژیانی دنیاو لە ڕۆژی دواییدا دۆستی ئێوەین وە لەو( بەهەشتەدا ) هەرچی حەزی لێ بكەی بۆتان ئامادەیە وە هەرچی داوا بكەن لەوێدا لە خزمەتتاندایە.

ئەوانەن کە لەگەڵ ئارامگراندا بەمەقامی ئەوە گەیشتوون خوای گەورەیان لەگەڵ بێ، ئەوانەن کە راستگۆیانە لەپێناو خوای گەورەدا تێکۆشاون و خوای گەورەش بەهیدایەت و رێنیشاندەریی ئەوانی تایبەت کردووەو دوژمنانی لەو تایبەتمەندییە بەدوورگرتووە.

حاڵەتی دووەم: ئەوەیە کە هێزو زاڵبوون بۆ پاڵنەری هەواو ئارەزوو بێ، تەواوی پاڵنەرەکانی ئاین تێکبشکێنێ و کەسی بەدبەخت و تێکشکاو ملکەچی شەیتان و سەربازەکانی بێ و چۆنیان بووێ بەڕێیبخەن، جا ئەو مرۆڤە لەگەڵ شەیتان و سەربازەکانیدا دوو حاڵەتی هەیە: یەکەم: یان لەخودی سەربازو شوێنکەوتەکانیانەو حاڵەتی بێ دەسەڵاتێکی لاوازی هەیە، دووەم: یان شەیتان بووەتە سەربازی ئەم، ئەمەش حاڵی خراپەکارێکی بەهێزی زۆردارو بیدعەکارێکە بانگەواز دەکات خەڵکیی شوێنی بکەون، وەك شاعیر ئەڵێ:

وكنتُ امرأً من جندِ إبليس فارتقى بي الحالُ حتى صار إبليسُ من جُندي

واتا: من پێشتر یەکێك بووم لەسەربازەکانی شەیتان، ئەوەندە پێشکەوتم شەیتان بووە یەکێك لەسەربازەکانی من.

شەیتان و سەربازەکانی ئەبنە هاوکارو پشتیوانی، ئەوانەن کە بەدبەختییان بەسەردا زاڵبووەو ئاخیرەتیان بەدونیایان فرۆشتووە، کاتێك بەو حاڵە گەیشتن کە لەئارامگریی مایەپووچ بوون.

ئەمە حاڵەتی نەهامەتی و بەدبەختی و قەدەری ناخۆش و ئەو کاتەیە کە دوژمن بەو حاڵەت دڵخۆشەو پێت پێدەکەنێ. سەربازگەلێکن هاوڕێ و هاوەڵەکانی ئەمانەن: فرتوفێڵ و تەڵەکەو خۆزگەی پووچ و لەخۆبایی بوون و کار

دواخستن و ئومێد درێژی و پێشخستنی دونیا بەسەر قیامەتدا، ئەوەیە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)لەبارەیەوە فەرموویەتی: "العاجز من أتبع نفسه هواها، وتمنى على الله الأماني"، واتا: بێ دەسەلاَت کەسێکە دەرووني شوێن هەواو ئارەزوو دەخات و ئومێد درێژیی هەیە.

ئەوانەی ئەم حاڵەتەیان هەیە جۆر گەلێك مرۆڤن، هەیانە شەڕی خواو پەیامبەرەکەی دەکات و تێدەکۆشێ بۆ پووچەڵ دەرخستنی ئەوەی پەیامبەر هێناویێتی و بەر بەپەیامی خوا دەگرێ و بە بەلارێدابردن و شێواندن هەوڵی بۆ دەدات، ئەمە بۆ ئەوەی خەڵکی لێ دووربخاتەوە، مرۆڤی وەهاش هەیە پشتی لەوە کردووە کە پەیامبەر هێناویێتی و تەنیا سەرقاڵی دونیاو شەهوەتی خۆیەتی، هەیە دوورپووەو لەبێباوەڕیی و ئیسلام دەخوات، هەیە خراپەکاری ئارەزووبازی گاڵتەجاڕەو بەبەرەلاَیی و شەهوەت و یاریکردنەوە هەناسەی لەخۆی بڕیووە، لەوانە مرۆڤی وا هەیە کاتێك ئامۆژگاریی دەکرێت ئەڵێ: ئای چەندە تامەزرۆی تەوبەکردنم، بەلاَم تەوبە بۆ من سەختەو تاقەت و ئارەزووی تەوبەم نییە، مرۆڤی تر هەیە ئەڵێ: خوا پێویستی بەنوێژو ڕۆژووی من نییە، من بەکاروکردەوەی خۆم ڕزگارم نابێ، خوا بەبەزەیی و لێخۆشبووە. مرۆڤی وا هەیە ئەڵێ: وازهێنان لەتاوان بەسووك تەماشاکردنی لێبووردن و لێخۆشبوونی خوایە:

فكثر ما استطعت من الخطايا      إذا كان القدوم على كريم

واتا: مادام گەڕانەوە بۆلای خوایەکی بەخشندەو بەڕێزە، ئەوە چیت لەدەست دێ لەتاوان ئەنجامی بدە.

لەوانە مرۆڤی وا هەیە ئەڵێ: لەپاڵ ئەوەی کردوومە، ئاییندارییکردن چی سوودێکم پێ دەگەیەنێ، بۆ کەسێکی خنکاو رزگاربوونی پەنجەکانی چی سوودێکی هەیە لەکاتێکی ئەندامەکانی تری لاشەی نقووم بوونە؟! هەیانە ئەڵێ: لەداهاتوودا تەوبە دەکەم، کە گەیشتمە سەرەمەرگ تەوبە دەکەم و تەوبەکەم قبوڵکراو دەبێ....تا ئەو جۆرە لەخۆبایی و لەخشتەبراوانەی تر کە عەقڵیان کەوتووەتە دەست شەهوەت و ئارەزووەکانیان، عەقڵیان بەکارناهێنن، تەنیا لەو چەند ساتەدا نەبێ کە فێڵ بەکاردەهێنن بۆ ئەنجامدانی ئارەزووەکانیان، بۆیە عەقڵیان لەگەڵ شەیتاندا، نمونەی دیلێکە لەدەست بێباوەڕداو لەشوانێتیکردن و چاودێریکردنی بەرازو عەرەق دروستکردن و خاچ هەڵگرتندا بەکاریدەهێنێ، جا ئەو مرۆڤە بەوەی عەقڵی خۆی سەرکزپێکردووەو رادەستی دوژمنەکانی کردووە، لای خوای گەورە وەك کەسێکە موسڵمانێکی سەرکزپێکردبێ و بەبێباوەڕانی فرۆشتبێ و کردبێتییە دیلی دەستیان.

## بەش

لێرەدا قسەیەکی خۆش و جوان هەیە دەبێ تێیبگەین و دڵی بۆ بکەینەوە لێی تێبگات و رابمێنێ، ئەویش ئەوەیە، ئەو کەسە لەخۆباییەی کە دیاری و دەسەڵاتی خوا کە عەقڵێتی و پێیەوە ئەوی رێزدارو پایەدار کردووەو خستوویەتییە دەست دوژمنانی خواوەو چۆنیان بووێ ئاوەهای بەرێدەخەن، لەکاتێکدا دەبوو ئارەزووەکان لەژێر دەسەڵاتی عەقڵدابن، بەنمونەی کەسێکە خۆی رادەستی دوژمنی خۆی بکات و دوژمنیش خراپترین ئازارو ئەشکەنجەی

بدات، دەکرا ئەم مرۆڤە دوژمنی دیل بکردبایە و تۆڵەی خۆی لێ بکردبایەتەوە، بەڵام کاتێك دەستبەرداری بەرگریکردن و شەڕکردنی بوو خۆی رادەستی کرد، وەك سزایەك دوژمنی بەسەردا زاڵبوو، پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ ( النحل: ٩٨ – ١٠٠ )

واتا: ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)کاتێ ویستت قورئان بخوێنی پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی دەرکراو لەبەزەیی خوا. بە ڕاستی ئەو(شەیتان) دەسەڵاتی نی یە بەسەر ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و تەنها پشتیان بە پەروەردگاریان دەبەستن. تەنها دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە کە ئەو(شەیتان)دەکەنە دۆست و پشتیوانی خۆیان و ئەوانەی بە هۆیەوە بوونەتە هاوەڵ دانەر.

ئەگەر وترا: لێرەدا سەلمێندرا کە شەیتان دەسەڵاتی بەسەر دۆست و شوێنکەوتەکانی خۆیدا هەیە، ئەی بۆچی خوای گەورە ئەو قسەیەی شەیتان دەسەلمێنێ:

﴿ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ ﴾ ( إبراهيم: ٢٢ )

واتا: جا شەیتان دەڵێ کاتێ کە کار تەواو دەبێ بێگومان خـوا بـەڵێنی پێـدان بە بەڵێنێکی هەق و ڕاست و منیش بەڵێنم پێدان بەڵام درۆم کرد لەگەڵتان وە من ئەم بوو بەسەرتاندا هیچ زۆرو دەسەلآتێك تەنها ئـەوە نـەبێ کـە بـانگم کردن(بـۆ گومڕایی)ئیتر ئێوەش بە دەنگمەوە هاتن(و بەگوێتان کردم).

هەروەها فەرمایشتی:﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۝٢٠ وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِٱلْأَخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِى شَكٍّ ﴾ ( سبأ: ٢٠ – ٢١ )

واتا:سوێند بەخوا بەڕاستی شەیتان گومـانی خـۆی لەوانـدا بـەدی هێنـا بۆیـە ئیمانداران نەبێت هەموویان شوێنی شەیتان کەوتن. وە شەیتان هـیچ دەسـەلآتی بەسەر ئیمانداران دا نەبوو تەنها بۆ ئەوەی بزانرێـت کـێ بـاوەڕی بـەڕۆژی دوایـی هەیـەو کـێ لـەوان دەربـارەی ( دواڕۆژ ) لـە گوماندایـە وە پەروەردگارت(ئـەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) بەسەر هەموو شتێکدا چاودێرە.

لەوەلآمـدا ئـەوترێ: ئـەو دەسـەلآتەی کـە بـۆی سـەلمێندراوە بەسـەر شـوێنکەوتەکانیدا هەیـەتی، هـەمان ئـەو دەسـەلآتە نییـە کـە لـەدوو رووەوە رەتیکردووەتەوە:

یەکەم: دەسەلآتی جێگیری، دەسەلآتی تواناداربوونێتی لەنێو ئەو مرۆڤانـەداو یـاریی پـێ کـردوون، کـە گوێڕایـەڵیی بوونـەو بـۆی دڵسـۆزبوونە چـۆنی ویسـتبێ بەوجۆرە بەڕێیکردوون، بەلآم ئەو دەسەلآتەی کـە رەتیکردووەتـەوە بەسـەریاندا هەیبووبێ، دەسەلآتی بەڵگەیە، ئیبلـیس بەڵگـەو بیانوویـەکی نـەبووە بەهۆیـەوە ئـەوانی ملکـەچ کردبێ، هـەر ئەوەنـدە بـووە داوای لێکـردوون شـوێنی بکـەون و ئەوانیش بێ بەڵگەو بیانوویەك بەدەم داواکەیەوە رۆیشتوون.

**دووەم:** لەسەرەتادا خوای گەورە شەیتانی بەسەر ئەواندا زاڵ نەکرد، ئەوە خودی ئەو مرۆڤانەن بەگوێڕایەڵیکردنیان شەیتانیان بەسەر خۆیاندا زاڵکرد و چوونە ریزی سەربازو پێڕەکەیەوە، شەیتان بەهێزی خۆی بەسەریاندا زاڵ نەبووە، چونکە فێڵی شەیتان لاوازە، بەڵکو ئەوە خۆیانن بەویست و سەرپشکیی خۆیان شەیتانیان بەسەر خۆیاندا زاڵکردووە.

## بەش

## شەڕ گەرم و بەردەوامە

**حاڵەتی سێیەم:** ئەوەیە لەنێوان هەردوو سەربازگەدا شەڕ بەردەوامە، جارێك سەردەکەوێ و جارێکی تر دەدۆڕێ، جارەکانی سەرکەوتن کەم و زۆر دەبن، ئەمە حاڵی زۆربەی ئەو باوەڕدارانەیە کە کاری چاکەو خراپە تێکەڵ دەکەن.

دۆخ و حاڵی قیامەت بەپێی ئەو سێ حاڵەتە تەرازوو کێشانە دەکرێت، هەندێ خەڵك دەچنە بەهەشت و ناخرێنە دۆزەخەوە، هەندێکی تر دەخرێنە دۆزەخەوەو ناچنە بەهەشت، هەندێکیان دەچنە دۆزەخەوە دواتر دەخرێنە بەهەشتەوە.

هەر ئەم سێ حاڵەتە، حاڵەتی خەڵکین لەلەشساغی و نەخۆشییدا، هەندێ خەڵك هەن شەڕی هێزی نەخۆشیی خۆیان دەکەن و بەسەریدا زاڵ دەبن، هەندێ خەڵکیی تر هەن نەخۆشییەکە هێزی ئەو دەدۆڕێنێ و بەسەریدا زاڵ دەبێ، هەندێ خەڵکیی تریش هەن شەڕی نۆرە لەنێوان نەخۆشی و هێزیدا هەیە، جارێك هێزی بەرەنگاریکردنی سەردەکەوێ و جارێکی تر نەخۆشییەکەی، لەنێوان لەشساغی و نەخۆشییدایە.

# بەش

## نمونە گەلێکی ئارامگری

هەنـدێ کـەس هـەن بەتێکۆشـان و ناڕەحەتییـەوە ئـارام و خـۆڕاگر دەبـن، هەنـدێکی تـریش بەکـەمترین مانـدووکردنێکی دەروون، نمونـەی یەکـەم: وەك پیاوێکـە لەتـەك پیـاوێکی جەربـەزەدا زۆرانبگـرێ و بەمانـدووبوونێکی سـەخت بەسەریدا سەرکەوێ، نمونەی دووەمیش: وەك نمونەی کەسێکە لەتـەك پیـاوێکی لاوازدا زۆرانبگرێ و بێ ماندووبوون بیکوتێ بەزەوییدا، جا ململانـێ و زۆرانبـازیی نێوان سەربازانی خواو سەربازانی شەیتانیش هەر بەوجۆرەیە، هەرکەسێ بەسـەر سەربازانی شەیتاندا سەرکەوێ بەسەر شەیتانیشدا سەردەکەوێ.

عبداللەی کوڕی مەسعود(خوای لێ رازیـی بێ)ئـەڵێ: پیـاوێکی نێـو مرۆڤـەکان بەپیاوێکی نێو جنۆکـەکان گەیشـت و زۆرانیـان گـرت و مرۆڤەکـە جنۆکەکـەی دا بەزەوییـدا، وتـی: چـییەوە دەبیـنم لاوازی؟ وتـی: مـن لەنێویانـدا چـوار شـانەم، وتیان: ئایە ئەو پیاوە عومـەری خـەتاب بـوو؟ ئـەویش وتـی: ئـەی عومـەر نـەبێ دەبێ کێ بێ؟![1].

هەندێ لەهاوەڵان وتوویانە:((باوەڕدار شەیتانی خۆی ماندوو دەکات، هەروەك چۆن لەئێوە لەکاتی گەشتدا وشترەکەی ماندوو دەکات))[2].

ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا[1] لەهەنـدێ پێشـینەوە گێڕاویەتییـەوە: شـەیتانێك بەشەیتانێکی تر گەیشتووە وتوویەتی: چییەوە دەبینم هەر ئێسکت پێوە ماوە؟

---

[1] - صەحیحە، بەیهەقیی لە(دلائل النبوة(٧/ ١٢٣) ئیخراجی کردووە، لای تەبەرانییش شێوە گەلێکی تـری گێڕانەوە هەیە لە المعجم الكبير(٨٨٢٤، و ٨٨٢٦)

[2] – حسن، ئەحمەد ئیخراجی کردووە(٢٠/ ٣٨٠)ئەلهەیسەمییش باسیکردووە لەمجمع الزوائد(١/ ١١٦).

شەیتانەکەی تر ئەڵێ: من لەگەڵ پیاوێکدام کە نان دەخوات بسم الله ئەکات بۆیە منیش ناتوانم نان بخۆم، کە ئاو دەخواتەوە بسم الله دەکات منیش ناتوانم لەئاوەکە بخۆمەوە، کە دێتەوە ماڵ بسم الله ئەکات، بۆیە منیش لەدەرەوەی ماڵەکە شەو دەکەمەوە. شەیتانەکەی تر ئەڵێ: من لەگەڵ پیاوێکدام کە خواردن دەخوات بسم الله ناکات، بۆیە پێکەوە هەمووی دەخۆین، کە ئاو دەخواتەوە بسم الله ناکات، بۆیە منیش لەگەڵیدا دەخۆمەوە، کە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا جووت دەبێ بسم الله ناکات، بۆیە منیش لەگەڵ هاوسەرەکەیدا جووت دەبم[2].

هەرکەسێ لەسەر ئارامگریی نەریت بگرێ، دوژمنەکەشی بەگەورە دەبینێ، هەرکەسێکیش ئارامگریی لەسەر سەخت و دژوار بێ،ئەوە دوژمنەکەی تەماحی تێ دەکات و ئەگەرە نیازی خۆی لێ وەدیبهێنێ.

***

---

[1] - عبداللەی کوڕی موحەممەدی کوڕی عوبەیدی کوڕی سوفیان کوڕی ئەبی ئەلدونیای ئەلقورەیشیی ئەلئەمەوی، ئەلبەغدادی لەڕووی مەوالیبوونەوە، ئەبو بەکر(ساڵی٢٠٨ك لەدایکبووەو ساڵی٢٨١ك مردووە حافیظی فەرموودە بووە، دانراوی زۆری هەبووەو ذەهەبیش بیست کتێبی لەدانراوەکانی بینیووە.

[2] - لاوازە، عبدالرزاق لە(مصنف)ەکەیدا باسیکردووە(١٩٥٦٠) و بەیهەقییش لەشعب الإيمان(٥٨٣٣) لەفەرموودەی عبداللەی کوڕی مەسعود(خوای لێ ڕازیی بێ).

## تەوەری حەوتەم

## لەباسکردنی جۆرەکانی ئارامگریی بە پێی ئەوانەی پێوەی پەیوەستن

ئارامگرتن بەپێی ئەوانەی پێوەی پەیوەستن سێ جۆرە: ئارامگرتن لەسەر فەرمان و فەرزەکان تاوەکو ئەنجامی دەدات، ئارامگرتن لەسەر دوورگرتن لە نەهی و تاوانەکان تاوەکو بەو تاوانانەی تووش نەبێ، ئارامگرتن لەسەر قەزاو قەدەرو ناڕەزایی دەرنەبڕین.

ئەو سێ جۆرەیە کە شێخ عەبدولقادر[1] لە(فتوح الغيب)دا باسیکردووەو ئەڵێ: دەبێ بۆ بەندە فەرمان گەلێك هەبێ ئەنجامی بدات و ڕێگریی گەلێك هەبێ دووریان لێ بگرێ و قەدەرێکیش هەبێ ئارامیی لەسەر بگرێ.

ئەم قسەیە پەیوەندیی بەدوو لایەنەوە هەیە: لایەنێکی خوای گەورەیە و لایەنەکەی تریشی لەڕووی بەندەکەوەیە:

هەرچی ئەوەی پەیوەندیی بەخوای گەورەوە هەیە: ئەوەیە کە خوای گەورە دوو بڕیاری بەسەر بەندەکەوە هەیە: بڕیارێکی شەرعیی ئایینی، بڕیارێکی گەردوونیی قەدەری، بڕیارە شەرعییەکە پەیوەستە بەفەرمانەکانییەوە، گەردوونییەکەش پەیوەستە بەدروستکردنەکانییەوە، خوای گەورەیە فەرمانی دروستکردنی گەردوون و یاسادانانی هەیە.

حوکم و بڕیارە ئایینییەکەی بەپێی کاری ویستراو و داواکراو دوو جۆرە، ئەگەر ئەو حوکمەی داواکراوە فەرمانەکان بێ، ئەوە یان واجیبە ئەنجام بدرێ یان موستەحەبە(سوونەت)، ئەوەش تەنیا بەبوونی ئارامگرییەوە ئەنجام

---

[1] - عەبدولقادری کوڕی عبداللەی ئەلجیلی: تەریقەتی قادریی دەدرێتەوە پاڵ، ساڵی٥٦١ك مردووە.

دەدرێت، ئەگەر شتەکە قێزەون بێ و داواکرابوو وازی لێبهێنرێت و کاری لەو جۆرە ئەنجام نەدرێ، ئەوە یان حەرامە یان مەکروهە، ئەمەش هەر لەسەر ئارامگریی راوەستاوەو ئەوە بڕیارە ئایینییە شەرعییەکەیەتی.

بڕیارە گەردوونییەکەشی، ئەو قەدەرەیە کە لەکۆست و ناخۆشیی دەخاتەسەر بەندەکەی و بەندەکە لەوەدا دەسەلاتی نییەو لەبەرانبەر ئەو نەهامەتییەدا فەرزی کردووە ئارامی لەسەر بگرێ، زانایان لەبارەی واجیبێتیی رازیبوون بەو قەدەرە دوو بۆچوونیان هەیە، لەمەزهەبی ئەحمەدیشدا دوو راو بۆچوون هەیە، دروستترین بۆچوون ئەوەیە کە موستەحەبە.

بۆیە هەموو سەرچاوەکانی ئایین بۆ سێ رێسا دەگەڕێتەوە: کارێك فەرمان کراوە ئەنجام بدرێ، کارێکی قەدەغەکراو دەبێ دووری لێ بگیردرێ، ئارامگرتن لەسەر قەدەرێکی ناخۆش.

هەرچی ئەوەی تایبەت بەبەندە بێ: تائەوەی ئەرکی کەوتووەتە سەر شان لەو سێ بوارە نابێتەوە، کەی ئەرکی لەسەر نەما ئەوکات ئەو سێ رێسایەی لەسەر نامێنێ.

بەندایەتییکردن بەئەنجامدانی فەرمانەکان و دوورگرتن لەنەهییەکان و ئارامگرتن لەسەر قەدەر، هەر بەخودی ئارامگرتن رادەوەستێ، هەروەك چۆن گوڵە گەنم بەهۆی ساقی گەنمەکەوە رادەوەستێ، بۆیە ئارامگرتن پەیوەستە بەفەرمان و نەهییەکان و قەدەرکراویش بەدروستبوون و فەرمانەوە، ئەو زانایەش کە هەمیشە لەبارەی ئەو سێ بنەمایەوە دوواوەو ئاماژەی داوە، ئەڵێ: کوڕی شیرینم کاری فەرمان پێدراو ئەنجام بدەو لەقەدەغەکراو دووربگرەو لەسەر قەدەریش ئارامبگرە.

ئـــەمە ئەو سێ شتەیە کە لوقمان ئامۆژگاریی کوڕەکەی پـێ دەکـات و ئـەڵێ:
﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ ﴾
لقمان: ١٧، واتا: ئەی کوڕە شیرینەکەم نوێژ بەجێ بێنەو فـەرمان بکـە بەچاکەو بەرگری بکە لەخراپە هۆگرو بە ئارام بە لەسەر هەر بەلاو ناخۆشـی یـەك تووشـت دێ بێگومان ئەوە لەو کارە گەورانەیە کە خوا پێویستی کردووە.

فەرمانکردنی بەئەنجامدانی کاری چاك، لەسەر خودی خۆی و کەسـی تریشـە، ڕێگریکردنی لەکاری قێزەونیش هەر بەوجۆرەیە، لەڕووی بێژەوە خـۆی و کەسـی تریش دەگرێتەوە، بەڵام لەڕووی پابەندیی شـەرعییەوە، دەبـێ سـەرەتا بـەخۆی فەرمانەکان جێبەجێ بکات و لەنەهییەکان دووربگرێ.

خـــوای گەورە ئەم سێ بنەمایەی باسکردووە: ﴿ ۞ أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ
مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا
يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ٢٠ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ
وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ٢١ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ
مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ٢٢ ﴾
( الرعد: ١٩ – ٢٢ )

لەو وەسفانەدا مەقام و پایەی ئیسلام و ئیمـانی بـۆ کۆکردوونەتـەوە، پاشـان بەئەمەکداریی وەسفی کردوون کە بەو پەیمانەی خـوا بەسـەریدا داوون ئەمەکـدار بوونە، کە فەرمان و نەهییەکانی لەخۆدەگرێ و پەیمانی نێوان خواو ئەوان بووە، پاشـان خـوای گـەورە هـەواڵی داوە، کـە ئـەو باوەڕدارانـە بەبـەڵێن و ئەمـەکی خۆیانەوە پابەندو بەردەوام بوونە.

پاشـــان وەســـفی کـــردوون بـــەوەی بـــەردەوام مـــافی خـــواو خـــەڵکییان بەجێگەیانـدووە، بـێ هـیچ هاوبەشـییەك بـەردەوامییان بەپەرسـتنی خـوا داوەو گوێڕایەڵییان کردووەو پشتیان پێ بەستووەو خۆشیانویستووەو لێـی ترساون و تەوبەیان کردووەو ملکەچی بوونە، دانیان بەنیعمەت و فەزڵی خوادا ناوەو هەڵـەو تاوانی خۆیانیان لای خـوای گـەورە دانپێـداناوەو داوای لێخۆشـبوونیان کـردووە، ئەوە پەیوەندی و گەیاندنی نێـوان خـواو بەندەیـە، خـوای گـەورە فـەرمانی داوە بـەو هۆکـارەی لـەنێوان خـۆی و بەندەکـەی دایـە پەیوەندییەکـە بـەردەوام بـێ، فەرمانیشی داوە پەیوەندیی نێوان ئێمـەو پەیامبەرەکەشـی بـەردەوامیی هـەبێ، بەباوەڕبوون بەپەیانبەرو بەڕاستخستنەوەی و بڕیار دانە دەستی لەهەموو شـتێك و ڕازیبوون بەبڕیارەکەی و ملکەچبوون بـۆی، خۆشویسـتنی ئـەو بخەینـە پـێش خۆشویستنمان بۆ خودی خۆمان و منداڵ و دایك و باوك و تەواوی خەڵك، سەڵات و سەلام لەسەر پەیامبەری خوا بێ.

دەبـــێ مـــافی خـــواو پەیامبەرەکەشـــی بـــدەین، هـــەروەها فـــەرمانی داوە بەبەرەوامیدان بەپەیوەندیی نێوان خۆمان و دایك و باوك و خزمان، بەپەیوەندیی چـاك و ســەردانیکردن، فــەرمانی داوە بەچــاکەکردن لەگــەڵ دایــك و بــاوك و بەجێگەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتی، فـەرمانی داوە هاوسـەرانی خۆمـان بەسـەر بکەینەوە و چاك بین لەگەڵیانداو مافیان بدەین، مافی کۆیلەکانمان بدەین بەوەی لەخواردنی خۆمانیان پێ بدەین و لەبەرگی خۆشمانیان لەبەر بکەن و لەسەرووی توانـای خۆیانـەوە ئـەرکیان نەخەینەسـەر، ئـەرکی نێـوان هاوسـێی دوورو نزیـك بەجێبگەیەنین، بەوەی ڕەچاوی مافیان بکەین، چۆن ژیانی خۆمـان و کەسـوکارو

سەروەتمان دەپارێزین دەبێ ژیان و ماڵ و منداڵی ئەوانیش بپارێزین، لەگەشت و شوێنی خۆماندا مافی هاوڕێ و دۆستان بپارێزین، لەگەڵ تەواوی خەڵکیشدا بەهەمان شێوە، بەو جۆرەی حەزدەکەین ئەوان مامەڵەی ئێمە بکەن ئێمەش بەو جۆرە مامەڵەیان بکەین، ڕێزو شەرممان بۆ ئەو فریشتانە هەبێ کە کردەوەکانمان دەنووسنەوە، خوای گەورە فەرمانی بەهەموو ئەو شتانە کردووەو دەبێ بەجێیبگەیەنین.

پاشان وەسفیکردوون بەوەی ترسی ڕۆژی قیامەتیان هەیە، بۆیە ناکرێ بەبێ ترسی خواو ڕۆژی قیامەت ئەو فەرمانانە جێبەجێبکرێ، هەرکات ترس لەدڵدا نەما ئەو پەیوەندییانەش نامێنن.

پاشان هەموو ئەو شتانەی لەیەك بنەمادا کۆکردووەتەوە کە کۆڵەکەو خولگەی هەموویەتی، ئەویش ئارامگرییەو ئەفەرمووێ:﴿ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ﴾، هەر بەئارامگریی ڕازیی نەبووە، بەڵکو دەبێ ئەو ئارامگرییە تەنیا لەبەر ڕەزامەندیی خوای گەورە بێ.

پاشان ئەوەی بۆ خستوونەتە پێش چاو کە نوێژکردن لەسەر ئارامگریی هاوکاری و دامەزراویان دەکات و ئەفەرمووێ: ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، بۆیە ئارامگریی‌و نوێژ هاوکاری بەرژەوەندییەکانی دونیاو ئاخیرەتن، خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿ وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾ البقرة: ٤٥، واتا: پەنا ببەنە بەر ئارام گرتن و نوێژ(بۆ گەیشتن بە مەبەست) وە بێگومان نوێژ(ئەرکێکی)گەورەو گرانە مەگەر لای ئەوانە نەبێ کە لەخوا ئەترسن واتە خۆیان بەزل نازانن.

هـەروەها فەرموویـەتی:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ۝١٥٣ ﴾ البقرة: ١٥٣، واتا: ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتـان هێنـاوە پشـت ببەسـتن بـەخۆڕاگرتن و نوێـژ(کردن) بەڕاسـتی خـوا لەگـەڵ خۆڕاگراندایە.

پاشان خوای گەورە باس لەچاکەو بەخشینی نهێنی و ئاشکرای ئەوان دەکات کە بەرانبەر کەسانی تر ئەنجامی دەدەن، بەئارامگرتن و نوێژ چاکە بەرانبەر خۆیان دەکەن و بەبەخشینیش چاکە بەرانبەر کەسانی تر دەکەن.

پاشان باسیان دەکات گەر نەفامییان بەرانبەر کراو ئازار دران، بەنەفامی و ئازار دانەوە وەڵام نادەنەوە، بەڵکو بەچاکەکردن وەڵامی خراپە دەدەنەوە، کێ خراپەیـان بـەرانبەر بکـات ئـەوان چاکـەی بـەرانبەر دەکـەن و ئـەفـەرمووێ:﴿ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ ﴾، الرعـد:٢٢، واتـا: بەچـاکە بـەرگری لەخراپە دەکەن(بەچاکە خراپەکانیان دەسڕنەوە و لادەبەن).

راڤەی ئەوە کراوە کە دوای هەڵەو تاوان چاکە دەکەن، هەروەك خوای گەورە دەفـەرمووێت:﴿ إِنَّ ٱلْحَسَنَـٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ﴾ هـود: ١١٤، واتـا: بەڕاستی(کردەوە)چاکەکان(کردەوە)خراپەکان لادەبەن.

پەیامبەریش( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی:« أَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا »[1]،واتـا: دوای هەڵـەو تـاوان چـاکەی بـەدوادا بهێنـە بـا ئـەو تاوانـەت بـۆ بسڕێتەوە.

[1] - صەحیحە، ترمیزی(١٩٨٧) و ئەحمەد(٥/ ٢٢٨و ٢٣٦)ئیخراجیان کردووە لەموعازەوە(خوای لێ رازیی بێ).

ئەوەی سەلماوە ئەوەیە، ئایەتەکە هەردوو جۆرەکە دەگرێتەوە.

مەبەست ئەوەیە، ئەو ئایەتانە تەواوی مەقامەکانی ئیسلام و ئیمانیان باسکردووە، کارە فەرمان پێکراو و دوورگرتن لەقەدەغەکراوەکان و ئارامگرتن لەسەر قەزاو قەدەریان لەخۆگرتووە.

پەروەردگار لەم ئایەتانەدا ئەو بنەمایانەی باسکردووە: ﴿بَلَىٰٓ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ﴾ آل عمران: ١٢٥، واتا: بەڵێ ئەگەر ئارام بگرن وە لە خوا بترسن. هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ﴾ یوسف: ٩٠، واتا: هەرکەس خۆی بپارێزێ و دان بەخۆیدا بگرێ.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٢٠٠﴾ آل عمران: ٢٠٠، واتا: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە خۆ گربن و لەخۆگری دوژمن خۆگرتربن و لەسەنگەردا ئێشك بگرن و لەخوا بترسن بۆ ئەوەی رزگاربن.

لەهەر شوێنێکدا باسی تەقوا هاتبێ و ئارامگرییشی لەگەڵدا بێ، ئەوە ئەو سێ کاروبارەی لەخۆگرتووە، حەقیقەتی تەقوا( لەخواترسان ) ئەمانەیە: ئەنجامدانی فەرزو واجیبەکان و دوورگرتن لەقەدەغەکراوەکان[1].

***

[1] - بڕوانە: مدارج السالكين(٢/ ١٦٦).

## تەوەری هەشتەم

## لەبارەی بەشەکانی ئارمگرییەوە بە پێی پەیوەستەیی پێنج ئەحکامەکە پێیەوەی

بەم پێیە دابەش دەبێت بۆ: واجیب، مەندوب، قەدەغە(حەرام)، مەکروە، موباح.

ئارامگرتنی واجیب سێ جۆرە: یەکەم: ئارامگرتن لەدوورگرتن لەحەرامەکان. دووەم: ئارامگرتن لەسەر ئەنجامدانی واجیبەکان. سێیەم: ئارامگرتن لەسەر ئەو ناخۆشی و نەهامەتییانەی مرۆڤ توانای بەسەریاندا نییە، نمونەی نەخۆشی و هەژاری و ئەوانی تر.

ئارامگرتنی مەندوب: ئارامگرتن لەسەر ئەنجام نەدانی حەرامەکان. ئارامگرتنە لەسەر شتە موستەحەبەکان. ئارامگرتن لەسەر هاوشێوە وەڵام نەدانەوەی هەڵەکار.

ئارامگرتنی حەرام و قەدەغەکراو، ئەمیش چەند جۆرێکە: ئارمگرتنە لەنەخواردن و نەخواردنەوە تاوەکو مردن، هەروەها نەخواردنی مردارەوە بوو هەروەها خوێن و گۆشتی بەراز کاتێك هیچی تر نییە بخورێت و بێ ئەوانە دەمری.

طاوس و دوای ئەویش ئیمام ئەحمەد وتوویانە:(( هەرکەسێ ناچار بێ بەخواردنی مردارەوە بوو هەروەها خوێن و نەیخوات و بمرێ، دەچێتە دۆزەخەوە)).

ئەگەر وترا: ئەی لەم حاڵەتەدا لەبارەی سواڵکردنەوە چی ئەڵێن؟

ئەوتریٚ: حوکمی ئەمە جیاوازیی لەسەر هەیە ئایە حەرامە یان ریٚگە دراوە، دوو بۆچوون هەیە کە بۆچوونی هاوەلاٌنی ئەحمەدن، بەڕواڵەتی دەقەکەیان لەم حاڵەتەدا سواڵکردن جائیزە، پرسیاری لیٚکراوە: گەر سواڵی نەکردو مرد بەوهۆیەوە؟ ئەڵیٚ: نامریٚ، بەڵکو خوای گەورە رزق و رۆزیی خۆی بۆ دەنیٚریٚ، بۆیە ئەحمەد سواڵکردنی حەرام داناوە، گەر خوای گەورە پیٚویستیی بەندەکە بزانیٚ و دەرکەویٚ راستگۆیەو سواڵکردنی ناوی، خۆی رزق و رۆزیی بۆ دەنیٚریٚ.

زۆریٚك لەزانایانی شویٚنکەوتەی ئەحمەدو شافیعیی ئەڵیٚن: پیٚویستە سواڵ بکات، ئەگەر سواڵ نەکات سەرپیٚچیکارە، چونکە سواڵکردن لەم کاتەدا لەمردن رزگاری دەکات.

# بەش

## ئارامگرتنی قەدەغەکراو

لەنمونەی ئارامگرتنی قەدەغەکراو: مرۆڤ ئارام بگرێ لەنەکوشتنی شتێك کە دەبێتە هۆی لەنێوچوونی خۆی، نمونەی نەکوشتنی دڕندەو مارو دوو پشك، یان ئارامگرتن و نەکوژاندنەوەی ئاگرو هەڵنەهاتن لەبەردەم لافاو و نەکوشتنی بێباوەڕێك کە دەیەوێ بیکوژێ و راوەستێ و ئارامبگرێ، ئەمە پێچەوانەیە بەخۆڕادەستکردن و ئارامگرتنی لەفیتنەو نەکوشتنی موسڵمانان، چونکە دەستپێشخەریی نەکردن لەشەڕکردنی موسڵمانان کە دەیانەوێ ئەم بکوژن ئارامگرتنی موباح و موستەحەبە، هەروەك بەڵگەی زۆری لەسەر هاتووە، لەم بارەیەوە پرسیار لەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)کراوە فەرموویەتی: ،واتا: " كُنْ خَيْرَ ابْنَيْ آدَمَ "[1]،واتا: تۆ باشترینی دوو کوڕەکەی ئادەم بە، لەفەرموودەیەکی تردا: " فَكُنْ عَبْدَ اللهِ الْمَقْتُولَ، وَلَا تَكُنْ عَبْدَ اللهِ الْقَاتِلَ"[2]،واتا: تۆ بەندەی کوژراو بەو بەندەی بکوژ مەبە. لەفەرموودەی تردا: "واتا بهێڵە تاوانی خۆی و خۆتی بکەوێتەسەر"[3].

---

[1] - صەحیحە، ئەبو داوود(٤٢٥٧) و ئەحمەد(١/ ١٨٥)ئیخراجیان کردووە لەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە(خوای لێ رازیی بێ).

[2] - حسن لغیره، ئەحمەد(٢٩٥)ئیخراجی کردووە لەخالیدی کوڕی عرفطەوە(خوای لێ رازیی بێ).

[3] - صەحیحە، بەشێکە لەفەرموودەیەکی ئەبی بەکرەیە(خوای لێ رازیی بێ)، موسلیم(٢٨٨٧)ئیخراجی کردووە.

لەفەرموودەیەکی تردا:" فإن بهرك شعاع السيف فضع يدك على وجهك"[1] ، واتا: ئەگەر تیشکی شمشێرەکەی بۆت دەرخست و شمشێری لێت کێشا، تۆ دەستبخەرە سەر روومەتت.

خوای گەورە خۆڕادەستکردنی باشترینی دوو کوڕەکەی ئادەمی گێڕاوەتەوەو لەوەدا ستایش و پیاهەڵدانی کردووە، ئەمە پێچەوانەی کوشتنی بێباوەڕە، ئەگەر بێباوەڕێك ویستی بتکوژێ دەبێ بەرگریی لەخۆت بکەی، چونکە مەبەست و ئامانج لەجیهادکردن بەرگریکردنە لەخۆت و موسڵمانان.

بەڵام ئایە دز دەکوژرێت یان هیچی بەرانبەر ناکەی؟ ئەگەر بۆ پاراستنی کەسی تر بوو واجیبە شەڕی دز بکرێ، ئەگەر بۆ سەر گیانی خودی کەسەکە بوو،ئەوە رواڵەتی دەقەکە ئەوەیە کە واجیب نییەو هەندێ زاناش واجیبیان داناوە، ئەگەر ئامانجی کەسەکە دەستدرێژیکردنەسەر ناموس بێ،ئەوە نابێ ئارامی لێ بگری و بەرگریی نەکەی.

---

[1] - صەحیحە، ئەبو داود(٤٢٦١) و ئیبن ماجە(٣٩٥٨) و ئەحمەد(٥/ ١٦٣) ئیخراجیان کردووە لەفەرموودەیەکی ئەبی زەڕەوە(خوای لێ رازیی بێ).

## بەش

## ئارامگرتنی مەکروە

هەرچی ئارامگریی مەکروهە، ئەوە چەند نمونەیەکی هەیە: یەکەم: ئارامگرتنە لەبەردەم نان و ئاو نەخواردن و جووت بوون لەگەڵ هاوسەردا تاوەکو زیان بەجەستەی خۆی بگەیەنێ. دووەم: ئارامگرتن و دوورگرتنێتی لەجووت بوون لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کە هاوسەرەکەی پێویستی پێیەتی و بەکردنی خودی خۆی زیان ناکات. سێیەم: ئارامگرتنێتی لەسەر مەکروە. چوارەم: ئارامگرتنی لەبەردەم کاری موستەحەب(ئاسایی).

## بەش

## ئارامگرتنی موباح

هەرچی ئارامگرتنی موباحە، واتا ئارامگرتن لەسەر کارێك کردن و نەکردنی وەك یەك بێ، کەسەکە سەرپشکە ئەنجامی بدات یان ئەنجامی نەدات.

**بەتێکڕا:** ئارامگرتن لەسەر شتە واجیبەکان واجیبە، ئارام نەگرتن لەو لایەنەوە حەرامە، ئارامگرتن لەدوورگرتن لەحەرام واجیبە، ئارام نەگرتنی حەرامە، ئارامگرتن لەسەر موستەحەب موستەحەبە، ئارام نەگرتن لەو رووەوە مەکروهە، ئارامگرتن لەسەر شتە مەکروهەکان موستەحەبە، ئارام نەگرتن لێی مەکروهە، ئارامگرتن لەسەر موباح موباحەو خوای گەورەش زاناترە.

***

## تەوەری نۆیەم

## لەڕوونکردنەوەی جیاوازییەکانی پلەکانی ئارامگری

وەك رایبوورد، ئارامگریی دوو جۆری هەیە: سەرپشکداری و ناچاری، سەرپشکداری لەناچاریی کاملترو تەواوترە، لەئارامگریی ناچارییدا هەموو خەڵکیی هاوبەشن و ئەوانەش تیایدا بەشدارن کە ئارامگریی سەرپشکدارانەیان نییە.

بۆیە ئارامگریی یوسفی راستگۆ(سەلامی خوای لەسەربێ)لەوەی گوێڕایەڵیی ژنەکەی عەزیزی میسر نەبوو، ئارامی گرت لەو بەندکردن و ناخۆشییانەی بەسەریدا هات، گەورەتر بوو لەو ئارامگرتنەی لەسەر ئەو ناڕەحەتییەی براکانی بۆیان رێکخست و خستیانە نێو بیرەکەوەو لەباوکی جیایان کردەوەو وەك بەندەیەك فرۆشتیان، لەئارامگرتنی دووەمیدا خوای گەورە پلەداری و دەسەڵات و تواناداریی پێ بەخشیی لەزەوییدا.

هەروەها ئارامگرتنی ئیبراهیمی خۆشەویست، ئارامگرتنی موسا و نوح و ئارامگرتنی مەسیح و کۆتا پەیامبەرو گەورەی کوڕانی ئادەم(سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ)، ئارامگرتن بوو لەسەر بانگەوازکردن بۆلای خوای گەورەو شەڕکردنی دوژمنانی خوا، بۆیە خوای گەورە ناوی لێنان(أولي العزم)، فەرمانی بەپەیامبەریش دا ئارامگریی ئەوانی هەبێ و فەرموویەتی:﴿ فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ﴾ الأحقاف: ٣٥، واتا:کەواتە خۆگر بە(ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) هەروەکو پێغەمبەرانی خۆڕاگری بەهێز دانیان بەخۆدا گرت.

ئولولعەزمیش ناویان لەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا هاتووە:﴿ ۞ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ ﴾ ( الشورى: ١٣ )

واتا: ئەو ئاینەی بۆ داناوون کە فەرمانی داوە بە نووح و ئەوەش نیگامان کردووە بۆ تۆو ئەوەش کە فەرمانمان داوە بەئیبراهیم و مووسا و عیسا.

هەروەها لەم فەرمایشتەشدا:﴿ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمۡ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٖ وَإِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۖ﴾ الأحزاب: ٧، واتا:ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بیریان بخەرەوە کاتێ کە پەیمانمان وەرگرت لە پێغەمبەران هەروەها لە تۆو نووح و ئیبراهیم و مووساو عیسای کوڕی مەریەم.

هەروەك ئیبن عەباس و کەسانی تری پێشینیش وتوویانە.

خوای گەورە رێگریی لێکردووە هاوشێوەی هاوەڵی نەهەنگەکە(صاحب الحوت)بکات و ئەگەر بێتو ئارامگریی ئولولعەزمی نەبێ، بۆیە دەفەرمووێت: ﴿ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ ﴿٤٨﴾ ﴾ القلم: ٤٨، واتا:ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)دان بەخۆتا بگرە و چاوەڕوانیی فەرمانی خوات بکە وەك هاوڕێی نەهەنگەکە مەبە(کە یونس پێغەمبەرە(عليه السلام)کاتێك کە بانگی(خوای)کرد وە ئەو پیشی خواردبۆوە لە بێ بڕوایی گەلەکەی.

لێرەدا پرسیارێکی بەسوود هەیە، ئەوەیە دەوترێ:ئەوەی لەناوەڵفرمانەکە کاریکردووە، ئەم فەرمایشتەیە:﴿إِذۡ نَادَىٰ﴾ و رێگریی لەکارەکە نەکراوە کە

دوعاکردنه، بەڵکو خوای گەورە لەو هاوارو دوعایەدا ستایشی کردووەو هەواڵی داوە کە بەهۆی ئەو هاوارو بانگکردنەوە رزگاری کردووەو ئەفەرمووێ: ﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٧ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٨٨﴾ الأنبياء: ٨٧ – ٨٨، واتا: باسی زەننون (یونس بکە کە پێغەمبەری خەڵکی نەینەوا بوو)کاتێ ڕۆیشت بە توورەیی(گەلەکەی بەجێ هێشت)وای دەزانی ئێمە تەنگانەی بەسەردا ناهێنین جا لەتاریکیەکاندا(تاریکی شەو و دەریاو ناوسکی نەهەنگ)هاواری کرد(ئەی خوا)بەڕاستی هیچ پەرستراوێك نی یە جگە لە تۆ پاکی و بێگەردی بۆ تۆیە بێگومان من لەستەمکاران بووم. ئێمەش نزاو هاواری ئەومان گیراکردو لەو غەم و خەفەتە ڕزگارمان کرد هەرواش ئیمانداران ڕزگار دەکەین.

لەترمیزی و کەسانی تریشدا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیە وسلم) کە فەرموویەتی:"دَعْوَةُ أَخِي ذِي النُّونِ مَا دَعَا بِهَا مَكْرُوبٌ إِلَّا فَرَّجَ اللَّهُ كُرْبَتَهُ: لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ"،واتا:بانگ و پاڕانەوەکەی یونسی برام، هەرکەسێ ئەوەی ئەو بڵێت و ناخۆشییەکەی هەرچییەك بێ، ئەوە خوای گەورە دەرووی لێ دەکاتەوە کە ئەمەیە:"لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ"[1].

---

[1] - صەحیحە، ترمیزی(٣٥٠٥) و حاکم(١/ ٥٠٥) ئیخراجی کردووە.

نەهیکردنی خوای گەورە کە هاوشێوەی یونس نەکات، نەهیکردن نەبووە لەم بانگ و تکابردنەی بۆلای خوای گەورە، ئەو تکاو هاواری بردە لای خوای گەورە، بەڵکو رێگریی لێکردووە هەمان کار نەکات کە یونسی پەیامبەری بەوە گەیاند ئەو هاوارە بکات، کە تووڕەبوونی بوو وەهای لێکرد بکەوێتە سکی نەهەنگەکەوەو ئەوەندە سەخت بوو بۆی بەخەم و خەفەتەوە تکاو هاواری رزگاربوون لەخوای گەورە بکات و جگە خوا هیچ شتێکی تر ئەوی دەرنەهێنا.

ئەگەر وترا: بکەرو کارەکتەری ئاوەڵفرمانەکە کامەیە(العامل في الظرف)؟.

لەوەڵامدا ئەوترێ: هاوەڵی نەهەنگەکە واتای کردارەکەی نییە، رێگریی کراوە هاوشێوەی ئەو کارە نەکرێ نەوەك یونس.

ئەگەر بووترێ: جارێك پرسیار هەر ماوە: ئەگەر نەهیکراو بەکۆت و زەمەنێکەوە پەیوەست بێ، ئەوە لەنێو بازنەی نەهیدایە، ئەگەر واتاکەش ئەمەبێ: لەم حاڵ و کاتەدا وەك هاوەڵی نەهەنگەکە مەبە، ئەوە نەهیکردنەکە لەبارەی حاڵەتەکەوەیە.

ئەوترێ: لەبەرئەوەی بانگ و هاوارەکەی هۆکاری ئەوە بوو، ئەوە نەهی کراوە هاوشێوەی ئەو حاڵەتەی ئەوی هەبێ کە بووە هۆکاری ئەوەی بکەوێتە سکی نەهەنگەوەو هاوار بباتەوە لای خوای گەورە، ئەویش حاڵەتی لاوازیی عەزیمەت و ئارامگریی بوو لەبەرانبەر بڕیاری خوای گەورە، بۆیە خوای گەورە نەیفەرمووە: وەك هاوەڵی نەهەنگەکە مەبە کە بەتووڕەییەوە رۆیشت و کەوتە سکی نەهەنگەکەوەو ئینجا هاواری بردە بەر خوای گەورە، بەڵکو چیرۆکەکەی بەکورتییەوە باسکردووەو لەشوێنی تردا باسیکردووەتەوە، تەنیا مەبەستی گێڕاوەتەوە.

ئەگەر بووترێ: چی شتێك بووە هۆكاری ئەوەی هەمان كاری نەهی لێكراو ئەنجام نەدەیتەوە؟ واتا: بانگ و هاوارت نمونەی هاواری ئەوە نەبێ كە پڕبوو بەتووڕەیی و پەژارە و خەفەت، بەڵكو هاوارو داوای تۆ هاوارو داوای ڕازیبووانە بێ بەو قەدەرەی هاتووەتەپێش و بەسنگفراوانی و ڕازیبوونەوە داوا بكە نەك بەتووڕەیی و خەفەتەوە.

ئەوترێ:ئەگەر ئەو واتایەش ڕاستبێ، ئەوە نەهیكردنەكە لەوەدا نییە خۆی بەیونس نەشوبهێنێ، بەڵكو نەهی كراوە هەمان ئەو حاڵەتەی ئەوی هەبێ كە بەتووڕەییەوە نەتەوەكەی خۆی بەجێهێشت و لەسكی نەهەنگەكەدا گیریخوارد، ئەمەش بەبەڵگەی: ﴿ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ ﴿٤٨﴾ ﴾ القلم: ٤٨، واتا: ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)دان بەخۆتا بگرەو چاوەڕوانی فەرمانی خوات بكە وەك هاوڕێی نەهەنگەكە مەبە(كە یونس پێغەمبەرە(علیه السلام))كاتێك كە بانگی(خوای)كرد وە ئەو پیشی خواردبۆوە لە بێ بڕوایی گەلەكەی.

ئەگەر وترا: چی بووە ڕێگر لەوەی ئارام بگرێ، كە بەهۆی حیكمەتێكی كەونیی قەدەرییەوە قەدەرێكی بەسەردا دراوە و دەبێ ئارامبگرێ و وەك هاوەڵی نەهەنگ نەكات كە ئارامی نەگرت، كاتێك بانگ و هاواری بردەلای خوا كە خەمباربوو بینی چی ڕوویداوەو پێشتر ئارامی نەگرت؟!

ئەوترێ: لەوەدا ڕێگریی كراوە، خوای گەورەش ستایش و پیاهەڵدانی یونس و پەیامبەرانی تریشی كردووە كە خەم و ناخۆشیی لەسەریان هەڵگرتووەو ئەفەرمووێ: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ

ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ ﴾ الأنبياء: ٨٧ – ٨٨،

ئاخۆ چۆن ڕێگریی دەکرێ خۆی بەیونس بشوبهێنێ لەکاتێکدا خوای گەورە ستایشی یونسی کردووە، پیاهەڵدانی ئەیووبیشی کردووەو ئەفەرمووێ: ﴿ مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ الأنبياء: ٨٣، واتا: بەڕاستی من زیان و ئازارو نەخۆشی دووچارم بووە وە تۆش میهرەبانترینی میهرەبانانی.

هەروەها ستایشی یەعقوبیشی کردووەو ئەفەرمووێ:﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ یوسف: ٨٦، واتا: ووتی من باسی خەفەت و پەژارەم هەر لای خوا دەکەم.

ستایشی موساشی کردووەو فەرموویەتی:﴿ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ ﴿٢٤﴾ ﴾ القصص: ٢٤، واتا: ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من هەژارم(پێویستم هەیە)بەهەر خێرو ڕۆزییەك بۆم بنێری.

کۆتا پەیامبەری خۆیشی گازندە دەباتەوە لای خوای گەورەو دەفەرمووێت: :"اللَّهُمَّ أشْكُو إلَيْكَ ضَعْفَ قُوَّتِي، وَقِلَّةَ حِيلَتِي.."[1].

گازندەو شکات بردنەوە لای خوای گەورە دژ نییە بەئارامگرتنی جوان و شیرین، بەڵکو ئارامگرتن ئەوەیە گازندەی ناخۆشییەکان بۆلای غەیری خوای گەورە نەبەیتەوەو تەنیا لای خوای گەورە شەکوای حاڵی خۆت بکەی.

خوای گەورە بەندەی خۆی تاقیدەکاتەوە تاوەکو گوێبیستی شەکواو پاڕانەوەی بێ، سەرزەنشتی ئەو کەسانە دەکات کە تکای لا ناکەن و لەکاتی

[1] - لاوازە، پێشتر تەخریج کراوە.

ناخۆشییدا بەدوعاکردن خۆیان دڵئارام ناکەن، هەروەك دەفەرموویێت: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾ المؤمنون: ٧٦، واتا: سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ئەوانمان تووشی سزاو ئازار کرد(تاهۆش بکەنەوە)بەڵام ئەوان(لەبەرانبەر)پەروەردگاریان دا نەخۆیان بەکەم زانی(ملکەچ بوون بۆی) وە نە هاناو نزایان(بۆ خوا)دەبەن لەکاتی ناڕەحەتی دا.

بەندە لەوە لاوازترە رق لەخوا هەڵبگرێ و تکای لێ نەکات، خوای گەورەش نایەوێ بەندەکەی پشتی لێ بکات و رقی لێ هەبێ، بەڵکو دەیەوێ بەندەکەی بە ئەوەوە دڵئارام بێ و تکاو پاڕانەوەی بۆ هەبێ، خوای گەورە رقی دەبێتەوە شەکوای حاڵی خۆت لای بەندەکانی بکەی، دەبێ هەموو گازندەو گلەییەکانی حاڵی ناخۆشی بۆلای خوای گەورە بێ، بەهەندێکیان وتراوە: چۆن گازندەی حاڵی خۆتی دەبەیتەوە لای لەکاتێکدا حاڵی تۆی بەلاوە شاراوە نییە؟ ئەوانیش وتوویانە: خوای گەورە بەکزۆڵی و گەڕانەوەی بەندەی رازییەو جێی رەزامەندیی ئەبێ.

مەبەست ئەوەیە، خوای گەورە فەرمانی بەپەیامبەرەکەی داوە ئارامگرتنی ئولولعەزمی هەبێ، ئەوانەی کە سەرپشکانە بەحوکم و بڕیاری خوای گەورە رازیی بوون، ئەوەش کامڵترین ئارامگرتنە، هەر لەبەر ئەوەیە تکای رۆژی قیامەت دەخرێتە بەردەم ئەو پەیامبەرانەو ئەوانیش دەیگێڕنەوە بۆ باشترین و بەئارامترینی نێو پەیامبەران(سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ).

ئەگەر وترا: کام لەسێ جۆرە ئارامگرتنەکە کامڵترین و تەواوترینە: ئارامگرتن لەسەر ئەنجامدانی فەرزو واجیبەکان،یان ئارامگرتن لەسەر دوورگرتن لەشتە حەرامکراوەکان، یان ئارامگرتن لەسەر قەدەرو ناخۆشییەکان؟

لەوەڵامدا ئەوترێ: ئارامگرتن لەسەر ئەنجامدانی ئەوانەی ئەرکن، کە فەرزو واجیبەکان و دوورگرتنە لەحەرامەکان، ئەوە باشترە لەئارامگرتن لەسەر قەدەر، چونکە قەدەر تووشی چاکەکارو خراپەکار و باوەڕدارو بێباوەڕ ئەبێ، بەسەرپشکی بێ یان ناچاریی ئارامی لەسەر دەگرن، بەڵام ئارامگرتن لەسەر فەرزو حەرامەکان، ئارامگرتنی شوێنکەوتەی پەیامبەرانە، کامەیان شوێنکەوتەبوونی زیاتر و زۆرتر بێ ئارامگرتنیان زۆرتر بووە، هەموو ئارامگرتنێك لەشوێنی خۆیدا باشترینە: ئارامگرتن لەسەر دوورگرتن لەحەرام لەکات و شوێنی خۆیدا باشترینە، هەروەها ئارامگرتن لەسەر جێبەجێکردنی فەرزو واجیبەکان لەشوێنی خۆیدا باشترینە.

ئەگەر وترا: کام لەم دوو جۆرە ئارامگرتنە لای خوای گەورە شیرینترە: ئارامگرتن لەسەر جێبەجێکردنی فەرزو فەرمانەکانی، یان ئارامگرتن لەسەر دوورگرتن لەحەرامەکان؟

ئەوترێ: ئەمە بابەتێکە جیاوازیی لەسەر هەیە، هەندێك وتوویانە: ئارامگرتن لەسەر شتە حەرامەکان باشترینە، چونکە سەخت و ناڕەحەتترە، کاری باش مرۆڤی باش و خراپ ئەنجامی دەدات، بەڵام ئەوە تەنیا راستگۆیانن لەحەرام و کارە خراپەکان خۆیان بەدوور گرن، ئارامگرتن لەسەر حەرامکراوەکان ئارامگرتنە لەسەر هەواو ئارەزووی دەروون، ئەوەش سەخترین و باشترین شتێکە.

وتوویانە: وازهێنان لەشتێك کە دەروونەکان حەزی پێ دەکەن، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، ئەو کەسەی کە لەبەر ئەو واز لەو شتە هێنراوە، لەدەروون و ئارەزووەکانی دەروون خۆشەویستترە.

هەروەها وتوویانە: جوامێری و لاوخاسییش ئارامگرییە، پێشەوا ئەحمەد وتوویەتی: جوامێری و بەخشندەیی، وازهێنانە لەهەواو ئارەزوویەك كە مایەی ترسە[1]، بۆیە جوامێری و لاوخاسیی بەندە بەپێی ئارامگرییەكەیەتی.

وتوویانە: سەیر نییە كەسێك لەسەر فەرز واجیبەكان ئارامبگرێ، چونكە زۆربەی ئەو فەرمانانە بەلای دەروونە ساغەكانەوە خۆشەویستن، دادگەری و چاكەكاری و دڵسۆزییان تێدایە، دەروونە پاكەكانیش حەزیان بەو سیفەتانەیە، سەیر ئەوەیە كەسێك خۆی لەحەرامەكان بەدووربگرێ كە زۆربەی دەروونەكان حەزیان پێ هەیە، خۆشویستراوێكی دونیا وازلێدەهێنێ بۆ خۆشویستراوێكی قیامەت، دەروونیش حەزی بەشتی بەپەلەو حازرییە، بۆیە ئەو ئارامگرتنەی پێچەوانەی سرووشتی دەروونێتی.

وتوویانە: لەبەر ئەوەی نەهێڵێكراوەكان چوار پاڵنەریان هەیە: دەروونی مرۆڤ و شەیتان و هەواو ئارەزووی و دونیاكەشی، بەندە شەڕی ئەو چوار شتە دەكات، ئەوەش سەخترین و تاڵترین شتێكە بەسەر دەروونەوە.

وتوویانە: نەهیلێكراوەكان لەبابەت شەڕی دەروونە بەرانبەر حەزو ئارەزووەكانی، جا كە پاڵنەری ئارەزوو هەبێ و خۆت لەو حەرامانە بەدووربگری،ئەوە سەخترین و ناڕەحەتترین كارێكە ئەنجامی دەدەی.

وتوویانە: بۆیە تەواوی دەرگاكانی حەرامكراوەكان داخراوەو بەشی فەرزو واجیبەكانیش بەپێی توانا ئەنجام دەدرێ، هەروەك پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: :«إِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَائْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَمَا نَهَيْتُكُمْ

---

[1] - الرسالة القشيرية(ص٢٢٧).

عَنْهُ فَاجْتَنِبُوهُ»[1] ،واتا: کە فەرمانێکم بەسەرتاندا دا بەپێی تواناتان ئەنجامی بدەن، ڕێگریی چی شتێکیشم لێتان کرد بەتەواویی دووری لێبگرن.

دەروازەو بواری نەهێلێکراوەکان بەرتەسکترە لەوەی فەرزو واجیبەکان، بەهۆی نەتوانین و عوزرێکەوە ڕێگە دراوە هەندێ فەرز ئەنجام نەدرێ، بەڵام بەئەنجامدانی تاوان ڕێگە نەدراوە.

وتوویانە: بۆیە هەموو تاوانەکان سزایان بۆ دانراوە، پێچەوانەی فەرزەکان، بۆ فەرزەکان خوای گەورە سزایەکی دیاری کراوی دیاریی نەکردووە، گەورەترین فەرزێك نوێژ کردنە، زانایانیش لەبارەیەوە جیاوازن: ئاخۆ کەسێك نوێژ نەکات سزا دەدرێت یان نە؟ ئەمە بەڵگەی ئەو کۆمەڵەیە بوو.

کۆمەڵێکی تر وتوویانە: ئارامگرتن لەسەر جێبەجێکردنی فەرزەکان باشترو گرنگترە لەئارامگرتن لەسەر حەرامکراوەکان، چونکە ئەنجامدانی فەرز خۆشەویسترە بەلای خوای گەورەوە لەوازهێنان لەحەرامکراوەکان، بۆیە ئارامگرتن لەسەر باشترینی ئەو دوو کارە باشترین و گرنگترینە، ئەوەش لەچەند ڕوویەکەوە:

**یەکەم:** کردنی کاری فەرمانپێکراو تەنیا بۆ خوای گەورەیە، ناسینی خوای گەورەو یەکتاناسینی و تەنیا پەرستنی و گەڕانەوە بۆلای خوای گەورەو پشت پێ بەستن و دڵسۆزانە کار کردن بۆ خوای گەورەو خۆشویستن و خزمەتکردنی، ئەو ئامانجەیە کە مرۆڤی بۆ دروستکراوەو بەفەرمانی خوای گەورە ئەوە جێگیر کراوەو کارێکە تەنیا خوای گەورەی تیادا مەبەستە، بەڵام شتە نەهێلێکراوەکان بۆیە حەرامکراون، چونکە ڕێگریی خواپەرستیی دەکەن و مرۆڤ بەجگە خواناسییەوە سەرقاڵ دەکەن و تەواوێتیی ناهێڵن، بۆیە پلەکانی نەهیکردنیش

---

[1] - بوخاری(٧٢٨٨) و موسلیم(١٣٣٧)ئیخراجیان کردووە لەئەبی هورەیرەوە(خوای لێ ڕازیی بێ).

بەپێی بەربەست دروستکردنی تاوانەکەیە بەرانبەر فەرزەکان و نەهێشتنی کەمالییەت و ئەنجامدانێتیی بۆ شتانی تر، بەجێهێنانی فەرزەکان بۆ خوای گەورەیە.

عەرەق و قومار گەر بەربەستی بەردەم یادی خواو نوێژکردن و رێزو خۆشەویستیی نەبوایە کە خوای گەورە رێزو خۆشەویستیی خستووتە نێوان بەندەکانییەوە، ئەوە عەرەق و قوماری حەرام نەدەکرد، هەروەها گەر نەبوایەتە مایەی لەکارخستنی عەقڵی بەندە کە خوای گەورە ئەو عەقڵەی پێ داوە تاوەکو پێیەوە خوا بناسێ و بیپەرستێ و سوپاسی بکات و شکۆداری رابگرێ و نوێژی بۆ بکات، گەر عەرەق و قومار ئەو کاریگەرییە خراپەی نەبووایە،ئەوە خوای گەورە حەرامی نەدەکرد، بۆ تەواوی حەرامکراوەکانی تریش هەر بەو جۆرەیە. حەرامکراوەکان بەربەستی بەردەم ئەو شتانەن کە خوای گەورە خۆشیانی دەوێ و پێی رازییە، هەروەها بەربەستی نێوان بەندەو کەماڵی خۆیەتی.

**دووەم:** فەرزو واجیبەکان پەیوەستن بەناسینی خوای گەورەو یەکتادانان و پەرستن و یاد و سوپاس و خۆشویستنی خوای گەورە و پشت پێ بەستن و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە، پەیوەستن بەزات و ناو و سیفەتەکانی خوای گەورەوە، بەڵام نەهی لێکراوەکان شت گەلێکن پەیوەستن بەو شتانەی نەهیان لێکراوە، جیاوازییەکەش گەورەیە.

**سێیەم:** پێویستیی مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی کارە فەرمانپێکراوەکان(فەرزو واجیبەکان) زۆر گەورەترە لەپێویستیی وازهێنان و دوورگرتن لەحەرامکراوەکان، هیچ شتێك پێویستتر نییە بەئەندازەی پێویستیی ناسینی خوای گەورەو یەکتادانان و دڵسۆزبوون لەکارو کردەوەو بەتەنیا پەرستن و خۆشویستن و

گوێڕایەڵیکردنی، بۆیە پێویستیی ئەم لایەنە زیاترە لەپێویستیی بەندە بۆ ناسینی خودی خۆی، ناسینی خۆی و ژیانیشی پێویستترە لەناسینی ئەو خۆراکەی جەستەی پێوەی زیندوو دەمێنێتەوە، ئەمە دڵ و ژیانێتی کە گەورەترو گرنگترە لەخۆراك و جەستەی، مرۆڤ بەڕوح و دڵی مرۆڤە نەوەك جەستەو هەیکەلی، هەروەکو شاعیر ئەڵێ:

یا خادمَ الجسم کم تشقی بخدمته فأنتَ بالقلبِ لا بالجسم إنسانُ

واتا: ئەی ئەو کەسەی خزمەتی جەستەی خۆت دەکەی، بەخزمەتکردنی جەستەت چەندە ماندوو بووی، بزانە تۆ بەدڵ مرۆڤی نەوەك بەجەستەت.

فەرمانی دوورگرتن لەتاوان و حەرامەکان تەنیا بۆ ئەوەیە خواپەرستیی بێتەدی کە پێویستە بۆ بەندە، ئای مرۆڤ چەندە پێویستی بەخواناسی و پەرستنی خوای گەورەیە بەیەکتادانان و دڵسۆزییەوە.

**چوارەم:** وازهێنان لەحەرامکراوەکان لەڕووی پارێزکردنەوەیە، ئەنجامدانی فەرزو واجیبەکانیش لەڕووی پارێزگاریکردنی ئەو هێزو خۆراکەوەیە کە جەستە بێ ئەوە راناوەستێ و بێ ئەوە ژیان بوونی نابێ، مرۆڤ ئەگەر سەختترین نەخۆشییشی هەبێ و خۆپارێزیی نەکات دەژێ، بەلام بەبێ ئەو هێزو خۆراکە ناژێ کە ژیانی ئەو دەپارێزن، ئا ئەمە نمونەی فەرمانپێکراو و نەهیکراوەکانە.

**پێنجەم:** هەموو تاوانەکان بۆ ئەو دوو بنەمایە دەگەڕێنەوە: وازهێنان لەفەرزو واجیبەکان و ئەنجامدانی کارە حەرامکراوەکان، ئەگەر بەندە هەموو تاوان و حەرامکراوەکان ئەنجام بدات و شتێکی کەمی فەرزەکانی ئەنجام دابێ گەر نمونەی گەردیلەیەکیش بێ، ئەوە لەدۆزەخدا بەهەمیشەیی نامێنێتەوە، بەلام

گەر هیچ حەرامێکی ئەنجام نەدابێ و هیچ فەرزو کارێکی ئیمانی ئەنجام نەدابێ، ئەوە بەهەمیشەیی لەدۆزەخدا دەمێنێتەوە، ئاخۆ ئەمەو ئەوە لەکوێی یەکتردان، بەگەردیلەیەك چاکەوە لەدۆزەخدا نەمر نابێ لەکاتێکدا بەقەد چیاکان تاوان و خراپەی هەیە؟

**شەشەم:** تەواوی حەرام و تاوانەکان بەتەوبەکردن لەسەر بەندە نامێنن و دەسڕدرێنەوە، بەڵام تەواوی کارە چاك و فەرمانپێکراوەکان تەنیا بەهاوبەش بڕیاردان و مردن لەسەر هاوبەش بڕیاردان پووچەڵ دەبنەوە، لەنێو ئوممەتیشدا هیچ جیاوازییەك نییە لەوەی هەموو تاوانێك بەتەوبە نامێنێ، بەڵام جیاوازن، ئایە کارە چاکەکان بەتاوان هەڵدەوەشێنەوە؟ لەم بابەتەدا ناکۆکیی هەیەو ئێرە جێی باسی دووروودرێژ نییە[1].

**حەوتەم:** تاوانی باوکە ئادەم بەئەنجامدانی نزیکبوونەوە بوو لەحەرامکراو، ئەنجامەکەی ئەوە بوو: خوای گەورە هەڵیبژاردەوەو خوای گەورە لێیخۆش بوو هیدایەتیشی دا، ئەی تاوانی ئیبلیس، ئەوە بوو فەرمانی بەجێنەگەیاند، سەرەنجامیشی ئەوە بوو کە خوای گەورە باسیکردووەو تاوەکو ڕۆژی قیامەت بۆ نەوەی ئادەم کردیە پەند.

**هەشتەم:** خوای گەورە حەزی بەفەرمانپێکراوەکان و ڕقی لەحەرام و نەهی لێکراوەکانە، ئەوە خوای گەورەیە بڕیاری ئەوەی داوە، بەوە خوای گەورە خۆشەویستیی نێوان خۆی و بەندەکەی دەهێنێتەدی، سەبارەت بەبەندەکەشی، تەوبەو داوای لێخۆشبوون و ملکەچی و شتانی تر.

---

[1] - بڕوانە: کتێبی مدارج السالکین(١/ ٢٧٧- ٢٨٢)بابەتی تێروتەسەل لەو بارەیەوە هەیە.

خـوای گـەورە لێخۆشـبوون و وەرگرتنـی تەوبـەی بەنـدەو لێبـووردن و نەرمونیانی و دەستبەرداریکردنی مـافی خۆی، بەلایـەوە خۆشەویسـترە لـەوەی بەندەکە شت گەلێکی کردووە جێی رق و تووڕەییەتی. قـەدەری ئـەو شـتانەی کردووە کە جێی تووڕەیی و حەزی ئەو نـین، ئـەوەش تـەنیا ئامرازێکـە تـاوەکو بەنـدە لەململانێـدا بـەو کـارو کردەوەیـە بگـات کـە خـوای گـەورە پێـی رازییـەو بەلایـەوە کـردەوە گـەلێکی جـوان و خۆشویسـتراون، بۆیـە لەدەستچـوونی شـتە خۆشویستراوەکان زیاتر خوای گـەورە تـووڕە دەکـات تـاوەکو ئەنجامـدانی شـتە بێزراو رق لێبووەکان. ئەگەر شتە خراپـەکان تـووڕەی بکـات، ئـەوە ئەنجامـدانی شتە جوان و خۆشویسـتراوەکان بەلایـەوە خۆشەویسـترن، شـتە رق لێبووەکـان ئیرادەی ئامرازەکانە هەروەك نەهی لێکردوون و حەزی بەو کارانە نییە.

ئەوەی بەلایەوە خۆشەویستە، وەك باسمـان کـرد ئـیرادەی مەبەسـتە، خـوای گەورە لەپێناو تەنیا پەرستنی خۆیدایە، مرۆڤ و جنۆکەی دروست کـرد، هـەروەك دەفەرموویێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾ الذاريات: ٥٦، واتـا: من جنۆکەو ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بەندایەتی من بکەن.

خوای گەورە قەدەری ئـەو شـتانەی کـردووە کـە حـەزیان پـێ ناکـات و رقـی لێیان دەبێتەوە، تـەنیا وەك تەواوکـەرێك بـۆ ئـەو ئامانجـەی کـە مـەخلوقاتی بـۆ دروسـتکردووە، بـەبێ ئـەو شـتە رقلێبووانـە فـەرمان پێکراوەکان(فـەرزو واجیبەکان)نەدەهاتنـەدی، وەك جیهـادکردن کـە شـیرینترین کـارە بـەلای خـوای گەورەوە، دۆستایەتیکردن لەپێناو خواو دوژمنایەتیکردن لەپێناو خوا، گـەر ئـەو شتە شیرینانە نەبووایـە ئـەوە شـتانێکیش بوونیـان نـەدەبوو کـە خـوای گـەورە

حەزی پێیان نییە، بەبوونی ئەو شتە بوغزێنراوانە ئەو شتە شیرینانەش بوونیـان هەیە.

**نۆیــەم:** وازهێنـــان لەقەدەغــەکراوەکان بـــەبێ ئەنجامــدانی واجیبـــەکان، بەخواپەرستی و نزیکبوونەوە لەخوای گەورە دانانرێـت، خـوای گـەورە ستایشـی ئـەو بەندەیــە ناکـات کـە تــەنیا لەحــەرامکراوەکان دووردەگـرێ تـاوەکو ئــەو واجیباتانەش بەدینەهێنێ کە لەکاروبارەکانی ئیمانن، هەروەها دوورگرتنی تاوان و شــتە قەدەغــەکراوەکان بـۆ بـاوەڕدار بەپەرســتش دانانرێــت تــاوەکو نیــازو مەبەستی بۆ خوا ساغ نەکردبێتــەوە، وازهێنــان لـەکاری قەدەغـەکراو پێویسـتی بەئەنجامدانی فەرزەکانە، بەڵام ئەنجامدانی فـەرزەکان وەك ئـەوەی پەرسـتش و نزیکبوونەوەیە لـەخوای گـەورە بـەبێ دوورگـرتن لـەتاوان هــەر قبـوڵکراو دەبـێ، ئەگەر بەبێ دوورگرتن لەتاوان قبـوڵ کـراو نەبووایـە، ئـەوە خـوای گـەورە کـاری بەندەی سەرپێچیکاری قبوڵ نەدەکرد.

**دەیەم:** قەدەغەکراوەکان دەبێ ئەنجام نەدرێن و بوونیان نەبێ،واجیبەکانیش دەبێ بوونیان هەبێ و ئەنجام بدرێن، مەبەسـت بـەبوون و نـەبوون ئەوەیـە، گـەر ئەندازە کرا هەردوو شتەکە بوونیان نەبێ یان هەردووکیان بوونیان هـەبێ، ئـەوە بوونی هەردووکیان لەنەبوونیان باشترە، ئەگـەر واجیبـات بـوونی نـەبێ نـەبوونی قەدەغـەکراوەکانیش بــێ ســوود ئــەبوو، کــە واجیــب هــەبوو ئــەوە بــۆ لادانــی قەدەغەکراو و نەهێشـتنی شـوێنەوارو کاریگەرییەکـەی پشـتی پـێ دەبەسـترێت، بۆیە بوونی هێزو نەخۆشی باشترە لەنەبوونی ژیان و نەخۆشی.

**یانزەیەم:** کاروبارە چاکەکان دە ئەوەندە چاکەی هەیەو دەگاتەوە حەوسەدو زیاتر پاداشتی خۆی، بەڵام تاوان و قەدەغەکراو وەك خۆیەتی، بەتەوبەو داوای لێخۆشبوون و چاکەو کۆست و بەڵاو داوای لێخۆشبوونی فریشتە بۆ باوەڕداران و پاڕانەوەی باوەڕداران بۆ یەکتر و بەشتانی تر دەسڕێتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو کارە لەنەبوونی نەهی لێکراو بەلای خوای گەورەوە خۆشەویسترە.

**دوانزەیەم:** بەزۆر شت کە بەندە ئەنجامی دەدات، خوای گەورە تاوانەکانی بۆ دەسڕێتەوە، بەتەوبەی راستگۆیانەو داوای لێخۆشبوون و چاکەو کۆست و بەڵاو لێخۆشبوونی فریشتان و پاڕانەوەی باوەڕداران تاوانەکانی بۆ دەسڕێتەوە، ئەوە شەش شتە لەژیانی باوەڕداردا، بەسەختیی سەرەمەرگی و بەجێهێشتنی دونیاو سەختیی و نارەحەتیی بینینی گۆڕو ترسان لەدوو فریشتەکەی نێو گۆڕ و گوشین و سەختیی دۆخ و هەڵوێست و تکای تکاکاران بۆی و بەبوونی بەبەزەییترین بەزەییان بۆی.

ئەگەر ئەمانە سوودیان پێ نەگەیاند، ئەوە دەبێ بچێتە دۆزەخەوە، مانەوەشی لەدۆزەخدا بەئەندازەی مانەوەی پیسی و چەپەڵیی تاوانەکانێتی، چونکە خوای گەورە بەهەشتی تەنیا بۆ مرۆڤە پاکەکان داناوەو لەسەر ئەوانی تر حەرامی کردووە، مرۆڤ لەکوورەی پاککردنەوەدایە تاوەکو لەو پیسی و چەپەڵییە پاك دەبێتەوە، بەڵام کارە واجیب و رێدراوەکان تەنیا بەهاوبەش بڕیاردان پووچەڵ دەبنەوە.

**سیانزەیەم:** پاداشتی ئەنجامدانی کارە واجیبەکان، پاداشتدانەوەیە بەچاکەو بواری چاکەکاری و رێزو بەزەییە، پاداشتی ئەنجامدانی قەدەغەکراوەکانیش

سزایە، کە تووڕەیی و دادپەروەرییە، بەزەیی خوای گەورەش بەسەر تووڕەییەکەیدا زاڵبووە، ئەوەی پەیوەست بێ بەبەزەیی و فەزڵەوە بەلایەوە خۆشەویستترە لەوەی پەیوەست بەتووڕەیی و دادپەروەرییەوەی بێ، لەکارخستنی ئەوەی پەیوەست بەبەزەیی بێ تووڕەتری دەکات زیاتر لەوەی پەیوەست بەو کارانە بێ کە تووڕەی دەکەن.

**چواردەیەم:** بەئەنجامدانی واجیبێك هەزاران تاوان دەسڕدرێتەوە، بەلاّم بەیەك تاوان هەزاران چاکە ناسڕدرێتەوە.

**پانزەیەم:** ئەوەی پەیوەست بەکارە واجیبەکان بێ، سیفەتی کەمالەو بەکردەوەی بەندەکان تەواوێتی و کەماڵ دێتەدی، ئەوەشی پەیوەست بەقەدەغەکراو بێ واتا وازلێهێنان، دەبێ ئەو شتەی قەدەغەکراوە نەبوو دابنرێ و ئەنجامدانی بەکەماڵ دانانرێت، هەر نەبوونیشی لەواقیعدا بەکەماڵ دانانرێت، بەوە بەکەماڵ دادەنرێت کە کرداری بوون پێویستی دەکەن و هۆکارێکە بۆ کەماڵبوون، دەنا هەر لەبنەڕەتەوە قەدەغەکراوان بوونیان نەبێ ئەوە کەماڵ نییە، بۆ نمونە: کڕنۆش نەبردن بۆ بتێك کەماڵ نییە تاوەکو کڕنۆش بردن بۆ خوای گەورە بوونی نەبێ، ئەگەرنا کڕنۆش نەبردن بۆ خوای گەورەو بۆ بت کەماڵ نییە.

بەدرۆنەزانینی پەیامبەر و دوژمنایەتی نەکردنی، مرۆڤ باوەڕدار ناکات، تاوەکو پەیامبەر بەڕاست نەزانێ و خۆشی نەوێ و گوێڕایەڵی نەبێ، بۆیە دەزانرێ کە کەماڵ و تەواوێتیی هەموو لەئەنجامدانی واجیبەکاندایە، قەدەغەکراوەکانیش گەر ئەنجامدانی واجیبەکانی لەگەڵدا نەبێ دوورگرتن لەوانە بێ سوودەو بەتەواوێتیی دانانرێت.

ئەگەر کەسێك بەپەیامبەری خوای وتبایە: نە بەدرۆت دەخەمەوەو نەبەڕاستت دەخەمەوە، نە دۆستایەتییت دەکەم و نەدوژمنایەتیش، ئەوە هەر مرۆڤێکی بێ باوەڕ دەبوو، بەوازهێنان لەدوژمنایەتیکردن و بەدرۆخستنەوەو شەڕکردنی نەدەبووە باوەڕدار، تاوەکو ئەو کارانەی نەکردبایە کە فەرمان دراوە ئەنجامیان بدات.

**شانزەیەم:** ئەگەر بەندە کارە واجیبەکان ئەنجام بدات، ئەوە لەقەدەغەکراوەکانیش واز دەهێنێ و دەبێ وازبهێنێ، مەبەست ئەنجامدانی واجیبەکانە.

لەحەقیقەتدا قەدەغەکراوەکان بەربەستی بەردەم واجیبەکانن، بۆیە گەر بەندە کاری دادپەروەری و داوێنپاکیی ئەنجامداو لەستەم و کاری قێزەون و بەدڕەوشتیی دووری گرت، ئەوە هەر دادپەروەرییە لەستەم کردن بەدووری گرتووەو داوێنپاکییە ئەوی لەبەدڕەوشتیی پاراستووە، بەئەنجامدانی واجیبەکانە نەکردنی قەدەغەکراوانی بەدواداهاتووە، واجیبەکان دوای قەدەغەکراوەکان ناکەون، وازهێنان لەتاوان ئەوە لەخۆناگرێ واجیبەکان ئەنجام بدرێ، هەیە پێکەوە واز لەقەدەغەکراو و واجیبیش دەهێنێ،بۆیە مەرجە بەوازهێنان لەکارە قەدەغەکراوەکان فەرزو واجیبەکان ئەنجام بدرێن.

**حەڤدەیەم:** خوای گەورە کە فەرمانی بەبەندە داوە کارێك ئەنجام بدات و لەکارێك دووربگرێ، بەندەکەش فەرمانەکانی بەجێگەیاندو تاوانیشی کرد، ئەوە خۆشویستن و تووڕەبوونی خوای دەستخستووە، بەو کارانەی کە حەزیان پێ دەکات تووڕەیی و حەزپێ نەبوونەکانی لادەدات، بەتایبەت گەر ئەو کارەی باشە بەلایەوە خۆشەویستتربێ لەو کارەی تووڕەی دەکات و بەهۆی ئەو کارە شیرینەیەوە لەتاوانەکەی خۆشدەبێ.

نمونە بۆ ئەوە: پیاوێك دوژمنێکی پادشا بکوژێ کە پادشا حەزو پێداگریی هەیە بۆ کوشتنی، عەرقێك بخواتەوە کە پادشا رێگریی خواردنەوەی لێکردووە، ئەوە لەبەر کوشتنی دوژمنەکەی لەو هەڵەیەی دەبووریێ، بەلاٌم گەر فەرمانەکەشی بەجێ نەگەیاند، ئەوە کارێکی نەکردووە لێبووردنی بۆ هەبێ، وەك ئەوەی پادشا فەرمان بەبەندەکەی بدات دوژمنەکەی بکوژێ و عەرەقیش نەخواتەوە، بەلاٌم بەندەکە سەرباری ئەوەی توانای کوشتنی کەسەکەشی هەیە کوشتنەکە ئەنجام نەدات و عەرەقەکەش بخواتەوە، ئەوە بەهۆی ئەوەی فەرمانەکەی ئەنجام نەداوە پادشا لەعەرەقخواردنەوەی بەندەکە نابووریێ کە رێگریی خواردنەوەی لێکردووە.

خوای گەورە بەندەکانی لەسەر ئەو سرووشتە راهێناوە، گەورەکان لەگەڵ کۆیلەکانیان و باوکانیش لەگەڵ منداڵەکانیان و پادشایان لەگەڵ سەربازەکانیان و هاوسەران لەگەڵ مێردەکانیان، ئەوەی لەخراپەو هەڵە خۆی بەدوورنەگرێ وەك ئەنجامدەری فەرمانپێکراوان نییە،مرۆڤەکان بەهۆی ئەنجامدانی واجیبەکانەوە لەهەڵەکانیان دەبووردرێن.

**هەژدەیەم ئەمە روون دەکاتەوە:** ئەنجامدەری چاکەو واجیبەکان کە خۆشەویستی پەروەردگارە، ئەستەمە هەموو قەدەغەکراوەکان ئەنجام بدات، بەڵکو بەئەندازەی ئەنجامدانی واجیبەکان لەقەدەغەکراوەکانیش دووردەگرێ، شتانێك دەکات جێی رازیبوونی خوای گەورەو توورەبوونی بێ، ئەگەر هەردوو کاری پێکەوە کۆکردەوە، ئەوە لەڕوویەکەوە خوای گەورە خۆشیدەوێ و لەڕوویەکی ترەوە جێی توورەییەتی، بەلاٌم گەر تەواوی واجیبەکانی نەکرد، ئەوە

شتێکی نەکردووە خوای گەورە خۆشیبووێ، تەنیا بەنەکردنی کاری قەدەغەکراو کەسەکە خۆشەویستیی خوای گەورە دەستناخات تاوەکو فەرمانیش بەجێ نەگەیەنێ، تەنیا بەنەکردنی واجیبەکان دەبێتە جێی تووڕەیی خوای گەورە، تۆش رابمێنە.

**نۆزدەیەم روونی دەکاتەوە:** خوای گەورە، خۆشویستنی خۆی پەیوەست کردووە بەئەنجامدانی کارێکەوە کە حوکمی واجیب بوون یان موستەحەبی هەیە، خۆشویستنی خۆی پەیوەست نەکردووە بەنەکردنی کاری قەدەغەکراوەوە، تەوبەکاران و چاکەکاران و سوپاسگوزاران و ئارامگران و پاکڕاگران و ئەوانەی خۆشدەوێ کە لەپێناو ئەودا پۆل پۆل دەجەنگن و وەك دیوارێکی قایمن، لەخواترساوان و یادکاران و راستگۆو خێرومەندانی خۆشدەوێ، بۆیە دەبینی خۆشویستنی خۆی بەئەنجامدانی فەرمانەکانییەوە پەیوەست کردووە، لەدروستبوونی مرۆڤ و فەرمانەکانیشدا هەر ئەوە مەبەستە: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦ ﴾ الذاريات: ٥٦، واتا: من جنۆکەو ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بەندایەتی من بکەن.

مرۆڤ و جنۆکەی تەنیا بۆ راپەڕاندنی فەرمانەکانی دروستکردووە، نەهییەکانیشی بۆ ئەوەیە، قەدەغەکراوان شت گەلێکن بوونەتە بەربەستی فەرمانەکانی.

**بیستەم روونی دەکاتەوە:** گەر قەدەغەکراوەکان بەربەستی فەرمانەکان نەبووایە، ئەوە هیچ واتایەکیان نەدەبوو، بەڵکو بۆیە ئەوانەی قەدەغەکردووە، چونکە دژ بەفەرمانەکانی ئەون و تەنگەژەیان دەخەنەبەردەم، بۆیە

قەدەغـەکردنیان لـەبواری تـەواوکردنی فەرمانەکانـە، نمونـەی پاککردنـەوەی جۆگـەی ئـاوە تـاوەکو بـێ هـیچ کێشـەیەك ئاوەکـە لەڕۆیشـتن بـەردەوام بـێ، فەرمانەکان بەجێگەی ئەو ئاوەن کە لەڕووبارێکدا دەنێردرێت بۆ ژیانی مرۆڤەکان و وڵات، قەدەغـەکراوەکانیش نمونـەی پاککردنـەوەی ڕێـڕەوی ئاوەکـەن و ئـەوە لادەدرێـت کـە بەربەسـت لەبـەردەم ئاوەکـەدا دروسـت دەکـات، فەرمانـەکان بەنمونەی هێـزو ژیـانن، قەدەغـەکراوەکانیش بەنمونـەی پارێزکـاری هێـزو دەردو پەتان و خزمەتی دەکات.

وتوویانە: ئەگـەر ڕوونبوویـەوە فـەرزو واجیبـەکان باشـترن، ئـەوە ئـارامگرتن لەسـەر ئـەو فـەرزو واجیبانـە باشـترین جـۆری ئارامگرتنـە و بـەوەوە ئـارامگرتن لەسـەر قەدەغـەکراوەکان و قـەدەر ئاسـان ئـەبێ، بێگومـان ئـارامگرتنی گـەورە ئارامگرتنی بچووکیش لەخۆدەگرێ، ئەوە ئارامگرتنی بچووکە ئارامگرتنی گـەورە لەخۆناگرێ.

بۆ تۆ ڕوونبوویەوە کە ئـەو سـێ جـۆرە ئارامگرتنـە پەیوەست بەیـەکن، هـەر جۆرێك هاوکاری دوو جۆرەکەی تر ئەکات.

خـەڵکانێك هــەن هێــزی ئارامگرییەکــەیان لەســەر قــەدەرە، لــەواجیب و قەدەغەکراوەکاندا ئارامگرتنیان لاوازە، هەشە بەپێچەوانەوەیە، مرۆڤـی وا هەیـە لەفەرمانەکانـدا ئـارامگرتنی بـەهێزەو لەقەدەغەکراوەکانـدا وەهـا نییـە، خـواش زاناترە.

***

## تەوەری دەیەم

## دابەشکردنی ئارامگرتن بۆ باش( ستایشکراو ) و بوغزێنراو

ئارامگرتن دەبێتە دوو بەشەوە: بەشێکی بوغزێنراو و بەشێکی ستایشکراو.

**بوغزێنراو و سەرزەنشتکراو:** ئارامگرتنە لەسەر دوورگرتن لەخوای گەورەو ویست و خۆشویستنی و دڵ خستنەلای، ئەم ئارامگرتن و دوورگرتنە بەتەواوەتیی کەماڵی بەندە لەکاردەخات، ناشیرینترین جۆری ئارامگرتنە، هیچ شتێك لەوە سەختتر نییە بەندە خۆی لەو خوا خۆشەویستەی بەدووربگرێ کە بێ ئەو ژیانی بۆ نابێ، هەروەك هیچ مرۆڤێك لەوە بێ دەربەستترو نەویستکارتر نییە لەوەی خوای گەورە لەبەخشندەیی و رێزی خۆی بۆ دۆستانی خۆی داناوە لەبەهەشتدا بەجۆرێك هیچ چاوێك ئەوانەی نەبینیووەو هیچ گوێیەك لەبارەیانەوە نەیبیستووەو بەختورەی دڵی هیچ بەندەیەکیشدا وەسفی ئەو نازونیعمەتانە نەهاتووە، ئەوە ئەوپەڕی نەویستییە، هەروەك پیاوێك بەسەرسامبوون بەدونیانەویستیی کەسێك ئەڵێ: لەتۆ دونیا نەویستراوترم نەبینیووە ! زاهیدەکە(دونیا نەویستەکە)ئەڵێ: بەڵکو تۆ لەمن زاهیدتری، من دونیام نەویستووە کە مانەوەو وەفای نییە، بەلأم تۆ ئاخیرەتت نەویستووە، ئاخۆ کام لەئێمە زاهیدترە؟

یەحیای کوڕی مەعازی رازیی[1] ئەڵێ:((ئارامگرتنی خۆشەویستان سەیرترە لەئارامگرتنی دونیانەویستان، سەیرە چۆن ئارام دەگرن))؟!...لەم بارەیەوە وتراوە:

الصبرُ يُحمَدُ في المواطن كلها　　　إلاّ عليك فإنه لا يُحمَدُ

واتا: ئارامگرتن لەسەر هەموو شتێك جوان و ستایشکراوە، تەنیا ئارامگرتن لەدوورگرتن لەتۆ نەبێ کە کارێکە پیاهەڵدان ناکرێ.

پیاوێك لەسەر شیبلی[2] راوەستاو وتی: چی ئارامگرییەك بەسەر ئارامگرانەوە سەختترینە؟ وتی: ئارامگرتن بۆ خوا[3]، وتی: نە. وتی: ئارامگرتن لەبەر خوا؟ وتی: نە. وتی: ئارامگرتن لەگەڵ خوا؟ وتی: نە. وتی: ئەی چییە؟ وتی: ئارامگرتن لەمانەوە لەتاوانکردن بەرانبەر بەخوای گەورە. شیبلیی هاوارێکی کرد وەختە روحی دەربچێ[4].

وتراوە: ئارامگرتن بەمانەوە لەگەڵ خوای گەورەدا ئەمەکدارییە، ئارامگرتن لە سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خوا بێ ئەمەکییە. خەڵکیی یەکدەنگن لەسەر ئەوەی، ئارامگرتن لەدوورگرتن لەخوای گەورە کارێکی ستایش نەکراوە، ئەی

---

[1] – یەحیای کوڕی مەعازی کوڕی جەعفەری رازی، ئەبو زەکەریا، واعیز و زاهید، لەسەردەمی خۆیدا هاوشێوەی نەبووە، خەڵکی رەی بووەو لەبەلخ نیشتەجێ بووە، لەنیسابور مردووە ساڵی٢٥٨ك.

[2] – دلفی کوڕی جەحدەری ئەلشیبلی: ئەبو بەکر، هاوڵێتیی جونەیدی کردو لەسەر مالیکیی فیقهی وەرگرت و لەبارەی تەصەوفەوە باس و خواسی هەیە. (ساڵی٢٤٧ك لەدایکبووە– ساڵی٣٣٤ك مردووە).

[3] - لەکوردییدا ئارامگرتن لەبەر خواو ئارامگرتن بۆ خوا یەك شتە، بەلاّم نووسەر لێرەدا مەبەستی ئارامگرتنێکە زۆر جارو بەردەوامەو ئارامگرتنێکیش کاتییە(بۆ حاڵەتێکە)–وەرگێڕ.

[4] – الرسالة القشيرية(ص١٨٥).

چۆن وەها نابێ لەکاتێکدا کەماڵ و رزگاربوونی بەندە لەخۆشوویستنی خوای گەورەدایە؟! خۆشویستان بەدوورگرتنی خۆشەویستانیان، خۆشەویستانی خۆیان عەیبدار دەکەن و گلەییان لێ دەکەن، هەروەك وتراوە:

والصبر عنك فمذموم عواقبه والصبر في سائر الأشياء محمود[1]

واتا: ئارامگرتن لەسەر دوورگرتن لەتۆ سەرەنجانێکی خراپ و سەرزەنشتکراوی هەیە، بەڵام ئارامگرتن لەسەر شتانی تر باش و ستایشکراوە.

یەکێکی تر لەبارەی ئارامگرتن لەدوورگرتن لەخۆشەویستەکەیەوە ئەڵێ:

إذا لعب الرجال بكل شيء رأيت الحب يلعب بالرجال
وكيف الصبر عمن حل مني بمنزلة اليمين مع الشمال[2]

واتا: گەر پیاوان یاریی بەهەموو شتێك بکەن، ئەوە من بینیوومە خۆشەویستیی یاریی بەپیاوان دەکات، چۆن دەتوانم لەدوورگرتن لەکەسێك ئارام بگرم کە لەمندا وەك لای راست و چەپی لێهاتووە.

کەسێکی تر لای خۆشەویستەکەی گازندە ئەکات و ئەڵێ:((گەر تۆ لەوەی ئەیڵێی لەخۆشەویستییدا راستگۆ بوایەی، ئەوە لەدوورگرتن لەمن ئارامت نەدەگرت)).

ولما شكوتُ الحب قالت: كذبتني ترى الصب عن محبوبه كيف يصبر

واتا: کە گازندەی خۆشەویستییم کرد وتی: درۆت لەگەڵمدا کرد، مرۆڤی عاشق چۆن لەدووریی خۆشەویستەکەی ئارام دەگرێ.

---

[1] – الرسالة القشيرية(ص١٨٦).

[2] – هەمان سەرچاوە(ل١٨٦).

## بەش

## ئارامگرتنی ستایشکراو

ئارامگرتنی ستایشکراو دوو جۆرە: ئارامگرتن لەبەر خوا، ئارامگرتن بەهێز و پشتیوانیی خوای گەورە، پەروەردگار ئەفەرموویت: ﴿ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾ النحل: ١٢٧، واتا: ئەی موحەممەد(صلی اللە علیە وسلم)دان بەخۆتدا بگرە ئارام گرتنەکەشت هەر بە(یارمەتی)خوایە.

هەروەها دەفەرموویت: ﴿ وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ﴾ الطور: ٤٨، واتا: ئارام بگرە بۆ بڕیاری پەروەردگارت ئەوسا بێگومان تۆ لە ژێر چاودێری ئێمەدایت.

خەڵکیی ناکۆکییان هەبووە کە کام لەو دوو جۆرە تەواوترینە، کۆمەڵێك وتوویانە: ئارامگرتن لەبەر خوا تەواوترینە، ئارامگرتن لەبەر خوا تەواوترە لەئارامگرتن بەپشت بەستن بەهێزو پشتیوانی خوای گەورە، ئەوەی بۆ خوایە ئامانجە، ئارامگرتن بەپشت بەستن بەخوای گەورە ئامرازە(وەسیلەیە)، ئامانجەکان لەئامرازەکان پیرۆزترن، بۆیە گەر نەزرێك کرا و نزیکبوونەوە بوو لەخوای گەورە دەبێ ئەنجام بدرێ، گەر لەسوێندیش دەرچوو ئەنجامدانی واجیب نییە.

ئەوەی بۆ خوای گەورەبێ پەیوەستە بەخواییەتی خواوە، بەڵام پشت پێ بەستنی پەیوەستە بەرپەروەردگارێتییەوەی، ئەوەی پەیوەستە بەخواییەتییەوە گرنگترە لەوەی پەیوەست بەپەروەردگارێتیی بێ، تەوحیدی پەروەردگارێتی(ربوبییەت)بەتەنیا مرۆڤ لەدۆزەخ رزگار ناکات، ئەوە تەوحیدی

خوایەتییە(ألوهیة) مرۆڤ لەدۆزەخ رزگار دەكات، بتپەرستان دانیان بەوەدا دەنا كە تەنیا (الله) هەموو شتێكی دروستكردووەو پەروەردگاری هەموو شتێكە، بەلاَم یەكتاپەرستیی خوایەتییان ئەنجام نەدەدا،واتا تەنیا پەرستنی خوا بەبێ هاوبەشێك، تەوحیدی پەروەردگارێتییش بەتەنیا سوودی پێیان نەگەیاند.

كۆمەڵێكی تر وتوویانە: ئارامگرتن بەهێزو پشتیوانیی خوای گەورە تەواوترە، هەر ئارامگرتن لەبەر خوا بەئارامگرتن بەهێزو پشتیوانیی خوای گەورە دێتەدی، هەروەك پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿ وَٱصۡبِرۡ﴾، ئارامبگرە، فەرمانی پێ داوە بەئارامگرتن، ئەوەی بڕیاری ئارامگرتنی لەسەر دراوە هەر لەبەر خوا ئەنجام دەدرێ، پاشان دەفەرمووێت:﴿ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾ النحل: ١٢٧، ئەمە رستەیەكی خەبەرییە نەك رستەی داواكاری(طلبي)، خوای گەورە لەم ئایەتەدا هەواڵی داوە كە ئارامگرتن تەنیا بەهۆی هێزو پشتیوانیی خوای گەورەوە دێتەدی، ئەوەش دوو شت لەخۆدەگرێ: پشت بەستن بەخوای گەورە(الإستعانة) و ئەو لەتەكدا بوونەی كە پیتی(باء) مصاحبة(لەتەكدا بوون)بەڵگەی لەسەر داوە وەك فەرمایشتی:((فَبِي يَسْمَعُ، وَبِي يُبْصِرُ، وَبِي يَبْطِشُ، وَبِي يَمْشِي...))[١].

مەبەست بەپیتی(باء) إستعانة (پشت پێ بەستن) نییە، چونكە كارو شتێكی هاوبەشی نێوان كەسی گوێڕایەڵ و سەرپێچیكارە، هەرشتێك بەبێ بوون و هێزی خوا بوونی نەبێ بەهیچ شتێكی تر بوونی نابێ، بەڵكو (باء) مصاحبة(لەتەكدا بوون)ە وەك لەم فەرمایشتەدا رایگەیاندووەو ئەفەرمووێت:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٥٣ ﴾ البقرة: ١٥٣، واتا: بەڕاستی خوا لەگەڵ خۆڕاگرانە.

---

١ - بەشێك لەفەرموودەیەكی بوخاری(٦٥٠٢) لەفەرموودەكانی لای ئەبو هورەیرە(خوای لێ رازیی بێ).

ئـەم لەتەكـدا بوونـەی كـە بـۆ بەنـدە هاتووەتـەدی، بـەهۆی ئەنجامـدانی سوونەتەكانەوەیە تاوەكو بووەتە خۆشەویستی خواو بینین و بیستنی بەهێزی خواوەیەو لەهەموو جوڵەو وەستانێكدا خوای گەورەی لەگەڵدایە.

هەركەسێ بەوجۆرەبێ، ئەوە ئارامگریی بـەهێزی دەكـات و مرۆڤەكـە لـەپێناو خـوای گـەورە بـاری ناڕەحەتییـەكان هەڵـدەگرێ، بەبەڵگـەی: ﴿وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ﴾ النحل: ١٢٧. هەركەسـێ خـوای لەگەڵـدا نـەبێ توانـای ئـارامگریی نییـە، كەسێك كە خوای گەورەی لەگەڵدا نەبێ چۆن لەبەردەم ئەنجامدانی فـەرزەكان و دوورگـرتن لەتاوانـەكان و ناڕەحەتییـەكانی قـەدەر ئـارامگر دەبـێ و بـەهێزو پشـتیوانیی خـواوە خـۆی هەڵدەواسـێ؟ هەركەسـێ ئـارامگریی بـەهێزی خـواوە نـەبێ، تـەماحی ئـەوەی نـابێ پاداشـتی ئـارامگرتنی ستایشـكراوی بـۆ هـەبێ، هەروەك تەماحی پلەی نزیكبوونەوەی خۆشەویستی نییە گـەر بیسـتن و بیـنین و هێزو بازوو ڕۆیشتنی بەبوونی خواوە نەبێ.

ئەمە ئەو مەبەستەیە لەو فەرمایشتەی كە هاتووە: "كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتي يَمْشي بِهَا" [١]، مەبەست هەمان ئـەو ئەندامانـەو هێـز نییـە وەك ئـەوەی دوژمنـانی خـوا گومـانی دەكـەن و وەهـای دادەنـێن بەنـدە دەبێتـە زاتـی خـوای گـەورە وەك ئـەوەی گاورەكان ئەیڵێن بەرزو پیرۆزیی بۆ خوای گەورە، ئەگـەر ئـەوە بوایـە كـە ئـەوان گومانی دەكەن، ئەوە جیاوازیی لەنێوان بەندەو كەسانی تردا نەدەبوو، هـەروەها جیاوازییەك لەنێوان حاڵەتی نزیكبوونەوە لـەخوای گـەورە بەچـاكەو سـوونەت و بوونە جێی ڕقی نەدەبوو بەهۆی تاوان و سەرپێچییەوە، جیاوازیی لەنێوان خـواو

[١] - هەمان سەرچاوە.

بەندەدا نەدەبوو، جا بەتێڕامانێکی دیار لەسی رووەوە فەرموودەکە بانگەشەی پووچ و بێ مانایان بەدرۆ دەخاتەوە.

جا ئەو فەرموودەیە شیکراوەتەوە بەوەی بەندە، بەنزکبوونەوە لەخوای گەورەو لەتەکدا بوونی خوای گەورە، بەندە وەهای لێ دێ هەموو بیستن و بینین و دەست و رۆیشتنی بەخوای گەورەبێ.

هاوشێوەی ئەمە ئەم فەرمایشتەیە:(الحجر الأسود يمين الله في الأرض فمن صافحه وقبله فكأنما صافح الله تعالى وقبل يمينه)[1]،واتا: بەردە رەشەکە دەستی راستی خوایە زەوییدا، هەرکەسێ دەستی لێ بدات و سڵاوی لێ بکات و ماچی بکات، وەك ئەوەیە سڵاو و تەوقەی لەگەڵ خوای گەورە کردبێ و ماچی کردبێ.

لەوتنی ئەمەدا بەناوبانگە، بەندە بەپێگەو پلەیەك دەگات لەگەڵیدابێ، تا ئەوەی بەخۆشەویست دەوترێ: تۆ روح و بیستن و بینینی منی، ئەمەش دوو واتای هەیە:

یەکەم: لای ئەو وەك روح و دڵ و بیستن و بینینی لێهاتووە...دووەم: خۆشویستن و باسی ئەوی بەسەر دڵ و روحیدا زاڵ بووە وەك ئەوەی لەگەڵیدا بێ، هەروەك لەفەرموودەدا هاتووە:«أَنَا جَلِيسُ مَنْ ذَكَرَنِي»[2]،واتا: من ئەبمە هاومەجلیسی ئەو کەسەی یادم بکات. لەفەرموودەیەکی تریشدا:« أَنَا مَعَ عَبْدِي مَا ذَكَرَنِي وَتَحَرَّكَتْ بِي شَفَتَاهُ»[3]،واتا: خوای گەورە دەفەرمووێ من لەگەڵ بەندەکەمدام کاتێك یادم دەکات و لێوی لەسەر یادی من دەجوڵێنێ.

---

[1] - (باطل)ە وەك ئەوەی ئیبن ئەلجەوزی باسیکردووە لە(العلل المتناهية٢/ ٥٧٥) ، هەروەها بروانرێتە: فيض القدير(٣/ ٤٠٩).

[2] - غەزالیی باسیکردووە لە(بداية الهداية، ص١١٥)، سەنەدی نییەو بناغەیەکی مەرفوعیشی نییە.

[3] - صەحیحە بوخاری ئیخراجی کرووە لە:خلق أفعال العباد(٤٣٦) و ئیبن ماجە(٣٧٩٢) و ئەحمەد((٢/ ٥٤٠) لەفەرموودەیەکی ئەبی هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ).

لەفەرموودەیەکی تریشدا:(إذا أحببتُ عبدا كنت له سمعاً، وبصراً ، ويداً، ومؤيداً)،واتا: ئەگەر بەندەیەکم خۆشبووێ، بۆی دەبمە بیستن و بینین و دەست و پشتیوان. بۆیە لەم واتایانە جوانتر و ناسکتر نابینینەوە روونکەرەوەو راماڵەری قسەی کەسانی تر بێ.

**مەبەست:** بەندە بەئەندازەی ئەوەی خوای لەگەڵ بێ، ئارامگرتنی هەیە، ئەبو عەلیی وتوویەتی: ئارامگران شکۆداریی هەردوو دونیان، چونکە لەتەکا بوونی خوایان دەستخستووە، پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ۝١٥٣ ﴾[1] البقرة: ١٥٣، واتا: بەڕاستی خوا لەگەڵ خۆڕاگرانە.

نهێنییەکی جوان لێرەدا هەیە، ئەویش ئەوەیە، هەرکەسێ پەیوەست بەسیفەتێکی خوای گەورە ببێ، خوای گەورە ئەو سیفەتەی بەسەردا دەدات و بەخۆی دەگەیەنێ، خوای گەورە(الصبور)ە، بەڵکو هیچ شتێك نییە بەئەندازەی خوای گەورە ئارامگر بێ کە هەڵەو خراپەی بەندەکانی گوێ لێ دەبێت، وتراوە: خوای گەورە نیگای بۆ داوود کردووەو فەرموویەتی:(رەوشتی من وەربگرە، یەکێك لەڕەوشتەکانی من ئارامگرتنە)[2].

خوای گەورە ناو و سیفەتەکانی خۆی خۆشدەوێ، حەز دەکات ناوەڕۆك و شوێنەواری سیفەتەکانیشی لەبەندەدا دەرکەوێ، خوای گەورە جوانەو جوانی خۆشدەوێ، لێبووردەیەو لێبووردەکارانی خۆشدەوێ، بەخشندەیە(کریم)ە و بەخشندەکارانی خۆشدەوێ، زانایە(علیم) و زانایانی خۆشدەوی، تاکە و تاکەکانی خۆشدەوێ، بەهێزەو باوەڕداری بەهێز لای خۆشەویستترە

[1] – الرسالة القشيرية (ص١٨٦).

[2] – الرسالة القشيرية (ص١٨٥).

لــەباوەڕداری لاواز، ئــارامگرەو ئــارامگرانی خۆشــدەوێ، سوپاســگوزارو سوپاسگوزارانی خۆشدەوێ، جا کە خوای گەورە ئەوانەی خۆشدەوێ کە خۆیـان بەسیفەتەکانی ئـەو دەڕازێننـەوە، بەئەنـدازەی پشـکی هـەڵگری ئـەو سـیفەتانە لەگەڵیاندا ئەبێ، لەتەکدا بوونێکی تایبەتەو بەم فەرمایشتەی دەربڕیـووە:(کنـت له سمعاً، وبصراً ، ويداً، ومؤيداً).

## بەش

## ئارامگرتن لەگەڵ خوای گەورە

هەندێکیان بەشی سێیەمی ئارامگرتنیـان زیـاتر کـردووە، ئـەویش ئارامگرتنـە لەگەڵ خوای گەورەو کردوویانەتە بەرزترین پلەکانی ئارامگری، وتوویانە: ئەویش ئەمەکدارییە، ئەگەر لەبارەی حەقیقەتی ئەم ئارامگرتنەوە پرسـیار بکـرێ، ئـەوە بەبێ جۆرەکانی پێشووتری ئـارامگریی نـاتوانرێ ئـەم ئارامگرتنـە شـیبکرێتەوە، ئـەویش بەشـیکردنەوەی ئـارامگرتن لەسـەر قـەزاو قـەدەری خـوای گـەورە، ئـارامگرتن لەسـەر فـەرمان و واجیباتـەکانی، ئـارامگرتن لەسـەر دوورگـرتن لەنەهییەکانی.

ئەگەر وەها دانرا، کە ئارامگرتن لەگەڵ خوا واتا دامەزران لەگـەڵ خـوا لەسـەر حوکم و بڕیارەکـانی و لـێ لانـەدان و هەمیشـە بەندەکـە لەگـەڵ خـوادابێ، ئـەوە بەخۆشەویستی و رازیبوونەوە لەگەڵ خوای گەورەدایە، ئەم واتایە راستە، بـەڵام دەبێ لەجۆرەکانی تری ئارامگریشدا بەو جۆرە بێ.

ئەگەر وەها دانرا کە ئارامگرتن لەگەڵ خـوای گـەورەدا، کۆکـەرەوەی تـەواوی جۆرەکـانی تـری ئارامگرییـە، ئـەوەش راسـتە، بـەڵام رێـك نییـە بکرێتـە جـۆری چوارەمی ئارامگرتن.

بزانـه ئـارامگرتن لەگـەڵ خـوای گـەورە، دامـەزرابوونی دڵـە لەگـەڵ خـوای گـەورەدا، لەمـەدا مـرۆڤ وەك رێـویی نییـە لێـرەو لـەوێ خـۆی بدزێتـەوە، بۆیـە حەقیقەتی ئەم ئارامگرتنـە، واتـا دامـەزرابوون لای خـوای گـەورەو دڵ مانەوەیـە لەسەری.

## بەش

## ئارامگرتن بۆ خوا

هەنـدێکیان بەشـێکی تریـان زیـاتر کـردووەو ناویـان لێنـاوە: ئـارامگرتن بـۆ خوا(الصبر في الله)، ئەمەش جیا لەوانـەی پێشـووتر نییـەو جیـاوازە لـەئارامگرتن لەبەر خوا، لەمەدا وتراوە: فعلت هذا في الله وله، واتا: ئەمەم لەبەر خـواو بـۆ خـوا کرد، خوبەیبیش[1] ئەڵێ:

وذلك في ذات الإله وإن يشأ      يُبارك على أوصال شلو ممزع

واتا:ئەمەی بەسەر مندا دێت بۆ زاتی خـوای گەورەیـە، ئەگـەر بیـەوێ پارچـە لێکراوەکانی لاشەی من پیرۆز دەکات.

پـــەروەردگاریش دەفـــەرمووێت:﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ العنكبوت: ٦٩، واتـا: کەسـانێ کـە لـەپێناو ڕەزامەنـدی ئێمـەدا تێکۆشـانیان کـردووە بەڕاسـتی ڕێنموونیـان دەکـەین بـۆ ڕێبازەکانی خۆمان وە بێگومان خوا لەگەڵ چاکان دایە.

---

[1] - خوبەیبی کوڕی عەدی کوڕی مالیکی ئەوسیی ئەنصاریی شەهید، چیرۆکەکەی بەناوبانگەو لەصـەحیحی بوخارییدا باسی هاتووە(٣٠٤٥ و ٤٠٨٦ و ٧٤٠٢).

هەروەها دەفەرمووێت:﴿ وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ ﴾ الحج: ٧٨، واتـا: جیهادو تێکۆشان بکەن لە پێناوی خوادا بەو شێوەی شیاوێتی ئەو(خوا).

لەفەرموودەکـەی جابریشـدا هـاتووە: خـوای گـەورە کاتێـك بـاوکی زینـدوو دەکاتەوە پێی دەفەرمووێت: خۆزگە بخوازە، ئەڵێ: پەروەردگارم بمگێڕەوە بۆ دونیا تاوەکو جارێکی تر بۆ تۆ بکوژرێمەوە[1]، پەیامبـەری خواش(صـلی الله علیـه وسلم) فەرمووی:(ولقد أُوذيتُ في الله وما يؤذى أحد)[2]،واتا: بۆ خوای گەورە ئازارو ئەشکەنجەیەك درام، هیچ کەسێ ئازارو ئەشکەنجەی وەها نەدراوە.

**ئەمە دوو واتای لێ دەگەینرێ:**

**یەکـەم:** لەبـەر رەزامەنـدی و گوێڕایـەڵی و رێگـەی خـوای گـەورە، مـرۆڤ سەرپشـکانە ئـەوە دەکـات، هـەروەك لەفـەرموودەدا هاتووە:لـەتۆدا زانسـت فێربووم.

دووەم: بەهۆی خوای گەورەوە ئەوە روودەدات، بـەبێ سەرپشـکی، بـەزۆریی ئەڵێن بۆ خوا، وەك ئەوەی پەیامبەر(صـلی الله علیـه وسـلم)فەرموویەتی: :(ولقـد أُوذيـتُ في الله)، لەبـەر خـوا ئـازارو ئەشـکەنجە درام، هـەروەها وتەکـەی خوبەیب(ئەمە بۆ زاتی خوایە بەسـەرمدا هـاتووە)، یـان قسـەی عبداللـەی کـوڕی خزام: (تاوەکو بۆ تۆ بکوژرێم)، هەروەها خـوای گـەورە دەفـەرمووێت:﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا﴾ العنکبوت: ٦٩، بۆیە ئازارو ناڕەحەتییـەکان بـۆ خـوای گەورەیـە بەسەر بەندەدا دێت. (في)لێرەدا(ظرفية) نییە و تەنیا هۆ نییە.

---

[1] - حسن صحيح، ترمیزی(٣٠١٠) و ئیبن ماجە(٢٨٠٠) و ئەحمەد(٣/ ٣٦١).

[2] - صەحیحە،ترمیزی(٢٤٧٢) و ئیبن ماجە(١٥١) و ئەحمەد(٣/ ١٢٠) ئیخراجیان کردووە لەفەرموودەیـەکی ئەنەسەوە(خوای لێ رازیی بێ).

هەندێکیان وتوویانە: (ئارامگرتن لەبەر خوا دەوڵەمەندییە، ئارامگرتن بەهێزی خوا مانەوەیە، ئارامگرتن بۆ خوا ناخۆشی و بەڵایە، ئارامگرتن لەگەڵ خوا ئەمەکدارییە، ئارامگرتن لەدوورگرتن لەخوا نەهامەتییە)[1]، قسەیەکە نابێ ملکەچی بین، چونکە تێڕوانین و تێگەیشتنی ئەو کەسەیە بەم واتایانە گەیشتووە، بەڵکو دەبێ ملکەچی قسەی ئەو کەسە بین کە خوای گەورە لەهەڵە بەدووری گرتووەو پاراستوویەتی، ئێمەش ئەم وتانە شیدەکەینەوە:

ئارامگرتن لەبەر خوا دەوڵەمەندییە: ئارامگرتن لەبەر خوا بەدەستهەڵگرتن لەحەزەکانی دەروون تەنیا لەبەر خوای گەورە، ئەمە سەختترین ئارامگرتنە بەسەر دەروونەوە، رێگە بڕین و خێراکردن بەرەو لای خوای گەورە بەپێ خستنەسەر دەروون، سەختترین کارێکە بەسەر دەروونەوە، پێچەوانەی رۆیشتن رووەو ئاخیرەت، ئەمە ئاسانترە، هەروەك جونەید ئەڵێ: رێگە گرتنەبەر لەدونیاوە بۆ ئاخیرەت ئاسانە بەسەر باوەڕدارەوە... دوورگرتن لەدروستکراوان و رۆیشتنە پاڵ خوای گەورە سەختە، دەرچوون لەدەروون و رێگەگرتنەبەر بەرەو لای خوای گەورە زۆر سەختە،ئارامگرتن لەگەڵ خوای گەورە سەختترە[2].

وتەی: ئارامگرتن بەهێزی خوا مانەوەیە: ئەگەر بەندە پشت بەخوای گەورە ببەستێ، ئەوە هەموو شتێکی لا سووك و ئاسان ئەبێ، هەموو بارو نارەحەتییەکی قورس هەڵدەگرێ و بەقورسی نازانێ، چونکە ئەو پشتی بەخوا بەستووە نەوەك هێزی مەخلوقات و خۆی، ئەو بوونێکی تری هەیە بەهۆی دڵ و روحیەوە. لەم حاڵەتەدا تاڵی و نارەحەتیی ئارامگرتنی نییە، سەختییەکانی بۆ

[1] – الرسالة القشيرية(ص١٨٦).

[2] – هەمان سەرچاوە(لا١٨٣).

دەبێتە نازونیعمەت و جێی ئارامی، زاهیدێ وتوویەتی: یەك ساڵ شەونوێژم کرد و بیست ساڵ خۆشییم لێ بینی، هەرکەسێ نوێژ بۆی ببێتە ئارامی، ئەوە سەختی و نارەحەتیی لەنوێژکردندا نابینێ.

وتەی: ئارامگرتن بۆ خوا ناخۆشی و بەلایە: بەلا لەسەرووی کولەمەرگییەوەیە، ئارامگرتن لێرەدا لەسەرووی پلەی ئارامگرتن لەبەر خوایە، لەم جۆرەدا بەپلەی جیهادکردنە بۆ خوای گەورە کە سەختترە لەجیهادکردن لەبەر خوای گەورە، هەموو ئەوانەی جیهاد دەکەن بۆ خواو ئارام دەگرن بۆ خوا، جیهاد و ئارامگرتنەکەیان لەبەر خوای گەورەیە، بەڵام جیهادکردن لەبەر خوای گەورەو ئارام گرتن لەبەر خوای گەورە وەك ئەوە نابێ، مرۆڤ جارێك جیهاد و ئارام دەگرێ لەبەر خوای گەورە تاببێتە هەڵگری ناوی جیهادکارو ئارامگر لەبەر خوای گەورە، بەڵام نابێتە هەڵگری جیهادکارو ئارامگر بۆ خوای گەورە، بەڵکو ئەو ناوە بەکەسێك دەوترێ رۆچووبێ لەجیهادکردن و ئارامگرتن لەبەر خوای گەورەو پێیەوە بچێتە بەهەشتەوە.

وتەی: ئارامگرتن لەگەڵ خوای گەورە ئەمەکداریە(وفاء)، ئارامگرتن لەگەڵ خوای گەورە، واتا دامەزراوبوون لەسەر حوکم و بڕیارەکانی و لانەدانی دڵە لەتەوبەو هەموو ئەندامەکانی جەستە لەگوێڕایەڵییدان، ئەو لەتەکدا بوونە مافی ئەمەکداریی خۆی دەدات، هەروەك پەروەرگار دەفەرموێت: ﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ٣٧ ﴾ النجم: ٣٧، واتا: بەئارامگرتنی لەگەڵ خوای گەورە لەسەر فەرمانەکانی خوا ئەمەکدار بوو.

هەروەها وتەی: ئارامگرتن لەدوورگرتن لەخوا پشت تێکردنە: هیچ شتێك سەخت و گرانتر نییە لەو کەسەی ئارامبگریّ لەدوورگرتن لەو خوایەی ئەوی دروست کردووە کە جگە ئەو هیچ خوایەکی تری نییەو بێ بوونی خوای گەورە ژیان و چاکی و نازونیعمەتێکی نییە. بەخۆشویستنی خوای گەورەو نزیکبوونەوە لێی و پێشخستنی رازیی بوونی بەسەر هەموو شتێکدا،ئەوجار ژیان بۆ بەندە دێتەدی، ئاخۆ چی شتێك سەختترە لەوەی لەدوورگرتن لەو خوایە بەئارام بی؟!

ئەمە واتای قسەی ئەو کەسەیە کە توویەتی: ئارامگرتن دوو جۆرە: ئارامگرتنی پەرستشکاران و ئارامگرتنی خۆشەویستان، باشترین ئارامگریی پەرستشکاران ئەوەیە پارێزراویی بێ، باشترین ئارامگرتنی خۆشەویستانیش ئەوەیە کە رەتکردنەوە بێ، وەك وتراوە:

يبين يوم البين أن اعتزامه على الصبر من إحدى الظنون الكواذب[1]

واتا: لەو رۆژەی کە ڕووندەبێتەوە دەردەکەوێت، پێداگربوونی لەسەر ئارامگرتن یەکێك بووە لەگومانە درۆینەکان.

یەکێکی تر ئەڵێ:

ولما دعوت الصبر بعدك والبكا أجاب البكا طوعا ولم يجب الصبر

واتا: کاتێك لەدوای تۆ بانگی گریان و ئارامگرتنم کرد، گریان بەویستی خۆی وەڵامی دامەوەو ئارامگرتن وەڵامی نەدامەوە.

[1] - الرسالة القشيرية(ص١٨٨).

وتوویانه: بەڵگە بۆ ئەوە، قسەی یەعقوبە(سەلامی خوای لەسەربێ) کە وتی: ﴿ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ ﴾ یوسف: ١٨، واتا: ووتی جا ئارام دەگرم بەئارام گرتنێکی جوان و پەسەند.

پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) کە بەڵێنی دا، پێوەی ئەمەکدار بوو، پاشان خەفەتباربوونی بۆ یوسف و تامەزرۆبوونی هەڵیپێچاو وتی: ﴿يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ ﴾ یوسف: ٨٤، واتا: ئاخ و داخ بۆ یوسف. ئەم ئارام نەگرتنەی بۆ دووربوونی لەیوسف، دژ نییە بەوەی وتی: ﴿ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ ﴾، ئارامگرتنی جوان ئەوەیە کە گازندەی لەگەڵدا نەبێ، بەڵام گازندە بردنەوەلای خوای گەورە بەوە دژ نییە، فەرمووی: ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٨٦ ﴾ یوسف: ٨٦، واتا: ووتی من باسی خەفەت و پەژارەم هەر لای خوا دەکەم وە من لە لایەن خواوە شتانێك دەزانم کە ئێوە نایزانن.

خوای گەورەش فەرمانی بەپەیامبەری خۆی دا ئارامگرتنی جوانی هەبێ، پەیامبەریش ئەو فەرمانەی بەجێهێنا و فەرمووی: "اللَّهُمَّ أشْكُو إلَيْكَ ضَعْفَ قُوَّتِي، وَقِلَّةَ حِيلَتِي........"[1].

هەندێکیان وتوویانە: ئارامگرتنی جوان ئەوەیە، خاوەن کۆست و مەینەتارییەکە لەنێو قەوم و کۆمەڵێکدا بێ نەناسرێتەوە کە ئەو کۆستبارە[1]، ئا

[1] - لاوازە، کەمێك پێش ئێستا تەخریج کرا.

ئەوەیە ئـارامگرتنی جـوان و شـیرین، هەرکەسـێ ئـەوەی لەدەسـت دا، ئـەوە ئـارامگرتنی جوانیشـی لەدەسـت داوە، سـەرکەوتن و سـەرفرازییش بـەخوای گەورەیە.

هەنـدێکی تـر بەشـێکی تـری ئارامگرییـان زیـاتر کـردووەو ناویـان لێنـاوە: ئـارامگریی لەسـەر ئـارامگری، ئـەڵێ: لەئارامگرییـدا بـەجۆرێك رۆبچـێ ئـارامگرتن لەسەر ئارامگرییەکە بێ توانابێ، وەك وتراوە:

صابر الصبر فاستغاث به الصبر　　　　فصاح المحب بالصبر صبرا

واتا: ئارامگرتن ئارامی گرت تاوەکو ئارامگریی هـاواری بـۆ بـرد، خۆشەویسـت هاواری لەئارامگریی کرد با ئارام بی.

ئەمە لەبەشەکانی دیکـەی ئـارامگریی بـەدەر نییـە، بـەڵکو مانـەوەو سـەنگەر گرتنە لەسەر ئارامگری و دامەزرابوونە لەسەری، خواش زاناترە.

***

[1] – الرسالة القشيرية(ص١٨٧).

# تەوەری یانزەیەم

## لەجیاوازیی نێوان ئارامگریی مرۆڤی بەڕێزو ئارامگریی مرۆڤی بێ ڕێز

دەبێ هەموو کەسێك بەخۆشیی بێ یان ناچاریی لەسەر هەندێ شتی ناخۆش ئارامبگرێ،کەسی بەڕێز لەبەر ئەوەی سەرەنجامی ئارامگرتن دەزانێ، ئەوە بەسەرپشکیی خۆی ئارام دەگرێ و دەزانێ لەسەری سوپاس دەکرێ و لەکڕوزانەوەو نارەزایی دەربڕین سزا دەدرێ، ئەگەر ئارامیش نەگرێ کڕوزانەوەو ناخۆشییشی لەسەر لاناچێ و توانای لابردنی قەدەریشی نییە، بۆیە لەم کاتەدا کڕوزانەو نارەزایی دەربڕین زیانی لەسوودی زیاترە. هەندێ ژیر وتوویانە: مرۆڤی ژیر لەکاتی کۆست و بەلادا، ئەوە دەکات کە مرۆڤی گەمژە دوای مانگێك لەکۆست و بەلایەکە دەیکات، هەروەك وتراوە:

وأن الأمر يُفضي إلى آخر        فيصير أخره أولا

واتا: کۆتایی کارەکە دوا دەخات و کۆتاییەکەی ئەخاتە سەرەتاوە.

کە کۆتایی ناخۆشییەکە ئارامگرتنە و بەندە بەهۆی نارەزاییبوونیەوە ستایشکراو نەبوو، چەندە جوان دەبێ هەر لەسەرەتاوە پێچ بکاتەوەو کاری کۆتایی گەمژەکە وەربگرێ و ڕێگە لەخۆی نزیکبخاتەوە. هەندێ ژیر وتوویانە: هەرکەسێ هەندێ ئارامگریی بەڕێزانی نەبێ، سەرەنجام وەك ئاژەڵان لەبیری دەچێتەوە. مرۆڤی بەڕێز دەڕوانێتە کۆست و بەلایەکە، گەر هەستی بەکڕوزانەوەو نارەزایی کرد بەربەرەکانێی دەروون خۆی دەکات و ئەوکات بۆی بەسوود دەبێ، گەر ئارامی نەگرت کۆست و ناخۆشییەکە دەبێتە دوو کۆست و ناخۆشی.

## بەش

## ئارامگرتنی مرۆڤی سووك و بێ ڕێز

هەرچی مرۆڤی سووکە،ئەوە ناچارانە ئارام دەگرێت، بەدەور گۆڕەپانی ترس و ناخۆشییدا دەسووڕێتەوەو هیچ چارەسەرێك نادۆزێتەوە، ئەوجار ناچار ئەبێ وەك کەسێك چۆن بەسترابێتەوەو لێدان بکرێ، ئاوەها ئارام دەگرێت، هەرچی مرۆڤی بەڕێزیشە، ئەوە لەگوێڕایەڵیی خوای گەورەدا ئارام دەگرێ و سووك و بێ ڕێزەکانیش لەگوێڕایەڵیی شەیتاندا، کەسانی سووك و بێ ڕێز لەگوێڕایەڵیکردنی هەواو ئارەزوویاندا زۆر ئارامگرن و لەگوێڕایەڵیی پەروەردگاردا کەمترین ئارامگرتنیان هەیە.

مرۆڤی سووك ئەوپەڕی ئارامگریی هەیە لەگوێڕایەڵیکردنی شەیتاندا، کەمترین ناڕەحەتییەك هەڵناگرێ لەگوێڕایەڵیکردنی خوای گەورەدا، بۆ شەهوەتی خۆی و گوێڕایەڵیکردنی دوژمنی خوا ئەوپەڕی ناخۆشیی قبوڵدەکات، بەڵام کەمترین ناخۆشیی قبوڵ ناکات کە لەپێناو پەروەردگاریشیدابێ، ئارام دەگرێ گەر لەبارەی تاوانەوە قسە بەناموسی بکرێ، بەڵام قبوڵی نییە لەبەر خوا قسە بەناموس و ناوبانگیی بکرێت، بەڵکو هەڵدێ لەفەرمان بەچاکە کردن و ڕێگریکردن لەخراپە نەوەك لەبەر خوا قسە بەناموس و ناوبانگییەکەی بکرێ.

ناموس و ناوبانگیی خۆی دەخاتە خزمەت هەوای دەروونییەوەو بەئارامە چی شتێکی لەبارەوە بووترێ، بەڵام ئامادە نییەو ئارامگریی نییە لەبەر خوا خۆی ماندوو بکات، کەچی ئەوپەڕی ئارامگریی و توانای هەیە لەگوێڕایەڵیکردنی

شەیتان و شەهوەتی دەروونی خۆیدا، بێ تواناترین کەسێکیشە لەئارامگرتن لەسەر فەرمانەکانی خوای گەورە، ئەمە گەورەترین سەرزەنشتییە، کەسێك بەو جۆرە بێ،ئەوە لای خوای گەورە بەڕێز نییە، لەڕۆژی قیامەتدا کە جاڕدەدرێ، لەگەڵ بەڕێزەکاندا زیندوو نابێتەوەو راناگیردرێ کاتێ جاڕ دەدرێ لەنێو هەموو مەخلوقاتدا ئەمڕۆ بەڕێزەکان با کۆببنەوەو لەخواترساوان لەکوێن؟ لەو رۆژە ئەو مرۆڤە لەڕیزی ئەوانەدا نییە.

***

# تەوەری دوانزەیەم

## ئەو هۆکارانەی ئارامگریی بەهێز و دروست دەکەن

لەبەرئەوەی فەرمانکراوە بەئارامگرتن، ئەوە خوای گەورە هەندێ هۆکاری پشتگیری و بەهێزی بۆ دروستکردووەو مرۆڤ بەئارامگریی دەگەیەنێ، هەرشتێ خوای گەورە فەرزو پێویستی کردبێ هۆکاری یارمەتیدەریشی بۆ رەخساندووە، هەروەك چۆن نەخۆشیی دروستکردووە، ئاوەهاش دەرمان و چارەسەریشی بۆ رەخساندووە،یان بەبەکارهێنانی دەرمان گرنتیی شیفای کردووە[١].

ئەگەرچی ئارامگرتن سەخت و تاڵە بەسەر دەروونەکانەوە، بەلاّم بەدەستدێت، لەدوو وشە پێکهاتووە: زانست و کار، لەو دوو شتەوە تەواوی ئەو دەرمانانە پێکدێت کە دڵ و جەستەکانی پێ دەرمان و تیمار دەکرێن، دەبێ بەشێکی زانستی(زانین) و بەشێکی کردارییش بوونی هەبێ، لەو دوو بەشەوە ئەو دەرمانە پێکدەهێنرێت کە بەسوودترینی دەرمانەکانە.

بەشی زانستی(زانین): پەیبردنە بەچاکەو سوودو چێژو کەماڵی نێو فەرمانپێکراوەکان(فەرزو واجیبەکان) و پەیبردنە بەو خراپەو زیان و ناتەواوییەی لەقەدەغەکراوەکاندا بوونی هەیە، هەروەها پەیبردن بەو دوو زانستە، وەك ئەوەی پێویستە عەزیمەتی راستگۆیانەو دەبێ هیممەت بەرزی و بژاردەیی و جوامێرییان بۆ زیاتر بکرێ و هەردوو بەش بدرێنەوە پاڵ یەك، هەرکاتێ ئەوە

---

[١] - پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: «مَا أَنْزَلَ اللَّهُ دَاءً إِلَّا أَنْزَلَ لَهُ شِفَاء»،واتا: خوای گەورە هەر دەردو نەخۆشییەکی دابەزاندبێ شیفاشی بۆ دابەزاندووە...بوخاریی ئیخراجی کردووە(٥٦٧٨)لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ).

کرا، ئەوە ئارامگریی دێتەدی و ناڕەحەتییەکانی سەر شانی مرۆڤ سووك دەبن و تاڵییەکەی نامێنێ و ئازارەکەی دەگۆڕێ بۆ چێژو خۆشی.

پێشتر باسمان کرد، کە ئارامگرتن ململانێ و زۆرانی نێوان پاڵنەرەکانی عەقڵ و ئایینە لەگەڵ پاڵنەرەکانی هەواو ئارەزوو دەروون، هەردوو زۆرانباز دەیانەوێ یەکتر بەزەوییدا بدەن، رێگەی ئەوەش هەوڵدانی هەریەکێك لەو دووانەیە تاوەکو خۆی بەهێز بکات و ئەوی تریش لاواز، حاڵی تەك هێزو نەخۆشییش هەر بەوشێوەیەیە.

گەر پاڵنەری شەهوەتی حەرام بەهێز بوو، تاوەکو هیچ دەروازەو چارەسەرێکی لەدەست نەهێڵێ، ئەوە بیرو دڵی داگیر دەکات و مرۆڤەکە دووردەخاتەوە لەحەقیقەت و سوودی دونیاو دواڕۆژی خۆی، جا ئەگەر بیەوێ و پێداگربێ چارەسەری ئەو دەردەی خۆی بکات و بەرەنگاریی ئەو دەردە بکات، دەبێ بەم چەند شتەی خوارەوە پاڵنەرەکانی ئارەزووی حەرام لاواز بکات:

**یەکەم:** بڕوانێتە ماددەی هێزی شەهوەتی، بۆی دەردەکەوێ بزوێنەری لەجۆرو بڕو زۆریی خواردنێکدایە، گەر ئەوەی دەستنیشان کرد، با لەو خواردنە کەمبکاتەوە، گەر ئەوەی بۆ نەکرا با بەڕۆژووبێ، بەوە رێڕەوی شەهوەت لاواز ئەبێ و توونددبوونەکەی نامێنێ[1]، بەتایبەت گەر خواردنی کاتی رۆژوو شکاندنی مامناوەند بێ.

**دووەم:** لەبزوێنەری داواو ویستراو دوربکەوێتەوە، کە روانین و تەماشاکردنی حەرامە، تاوەکو دەتوانێ جڵەوی روانین و لاکردنەوەی بکات. بێگومان داواو

[1] - بڕوانە ئەو فەرموودەیەی کە بوخاری گێڕاویەتییەوە(١٩٠٥) و موسلیم(١٤٠٠) لەڕێگەی عبداللەی کوڕی مەسعودەوە(خوای لێ رازیی بێ).

پاڵنەری ویست و شەهوەت بەتەماشاکردن گڕ دەگرێ، تەماشاکردنیش بەشەهوەتەوە دڵ دەبزوێنێ، لەموسنەددا لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)ەوە هاتووە فەرموویەتی:«النظرة سَهْم مسموم من سهام إبليس»[1]،واتا: تەماشاکردنی حەرام، تیرێکی ژەهراویە لەتیرەکانی شەیتان.

شەیتان ئەم تیرە دەگرێتە دڵ و تەنیا چاوداخستن و نەڕوانین ڕێگر دەبێ لەوەی ئەو تیرە بەر دڵ نەکەوێ، ئەو تیرە لەکەوانەی وێنەدا دەهاوێژێ، ئەگەر تۆ خۆت نەخەیتەبەردەم تیرەکە ئەوە لێت نادات، بەلاّم گەر دڵی خۆتت خستەبەردەمی، ئەوە ڕەنگە بەیەك تیر لەو تیرە ژەهراویانە دڵت بمرێ.

سێیەم: دەروونت بەشتە حەلاّڵەکانەوە خۆش بکە و لەحەرام بەدووری بگرە، بەحەلاّڵ قەرەبووی بکەرەوە، هەرشتێ سرووشتی مرۆڤ حەزی پێ بکات، ئەوە خوای گەورە حەلاّڵی کردووەو پێویست بەحەرام ناکات، ئەمەش دەرمانێکی بەسوودە بۆ زۆربەی خەڵك، هەروەك پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)ڕێنمایی و ڕێنیشاندەریی بۆ کردووە.

دەرمانی یەکەم: لێکچووی لابردنی ئالیکە لەبەردەم وڵاخی برسی، لەسەگی هار، ئەوەش بۆ ئەوەی وڵاخە برسی و سەگە هارەکە لاواز بێ.

دەرمانی دووەم: لێکچووی لابردن و دوورخستنەوەی گۆشتە لەبەردەم سەگ و کاو جۆ لەبەردەم مەڕو ماڵات تاوەکو لەکاتی بینیندا هێزیان نەجوڵێ.

[1] - زۆر لاوازە، حاکم(٤/ ٣١٤)ئیخراجی کردووە لەحوزەیفەوە(خوای لێ رازیی بێ)، ئیسحاقی کوڕی عبداللەی ئەلقورەیشی و عەبدولڕەحامن ئەلواسطي تێدایە، یەکەم تێکەڵو پێکەڵی کردووەو دووەمیش لاوازە، لەموسنەدی پێشەوا ئەحمەد بەم جۆرە نەمبینیووە.

دەرمانی سێیەم: لێکچووی پێدانی خۆراکە لەکاتی پێویستدا گەر بەپێی سرووشتیان بێ، تاوەکو ئەوەندە هێزیان بمێنێ ملکەچی خاوەنەکەیان بن، زیاتر لەوەی پێ نەدرێت و هار بکرێ.

چوارەم:بیرکردنەوە لەخراپیە ئەگەرکراوەکانی دونیا کە ئەم ناخۆشی و گێچەڵەی هێناوە، گەر بەهەشت و دۆزەخێك بوونی نەبووایە، ئەوە ئەو خراپە دونیاییانە لەداواکردن دەستیان هەڵنەدەگرت و کۆتاییان نەدەهات، گەر بەسەرماندا پێویست بکرابایە ژمارەیان بکەین ئەوە نەماندەتوانی، بەڵام چاوی هەواو ئارەزوو کوێرە[1].

پێنجەم: بیرکردنەوە لەناشیرینیی ئەو وێنە گەلەی دەروونی بانگەوازی بۆ دەکات، ئەوکات مرۆڤەکە خۆی بەدووردەگرێ، دەروون بەرزیی بۆ دروست دەبێ لەوەی لەحەوزە ئاوێك بخواتەوە کە سەگ و گورگ لێیدەخۆنەوە، هەروەك وتراوە:

| | |
|---|---|
| سأترك وصلكم شرفا وعزا | لخسة سائر الشركاء فيه |

واتا:لەبەر رێزو شکۆدارییم دستبەرداری بینین و کاروانی ئێوە دەبم، بەهۆی ئەو مرۆڤە سووکانەی لەنێویدان.

یەکێکی تر ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| إذا كثر الذباب على طعام | رفعت يدي ونفسي تشتهيه |
| وتجتنب الأسود ورود ماء | إذا كـان الكـلاب يـلغن فيه |

[1] - بڕوانە کتێبی روضة المحبين ص(٣٥٢– ٣٧٦)، والداء والدواء ص(٢٣٠).

واتـا: ئەگـەر مـێش بەسـەر خواردنێکـەوە زۆر بوویـەوە دەسـتم لـەخواردن هەڵدەگرم با دەروونیشم حەزی خواردنەکـەی هـەبێ، شـێر لەسەرچـاوەی ئاوێـك خۆی بەدووردەگرێ گەر ببینێ سەگ دەمی تێخستووە.

با مرۆڤ ئەوەی بیر بێتـەوە، تێکـەڵبوونی تـف و لیکـی خـۆی بـەلیکی هـەموو سووك و چەپەڵێك، بەتێکـەڵبوونی لیکـی خـۆی بـەلیکی نـەخۆش و دەردەدارێـك بشوویهێنێ، بێگومان لیك و تفی خراپەکار دەردو نەخۆشییە، هەروەك وتراوە:

تسل يا قلب عن سمح بمهجته | مبـذل كل مـا يلقـاه يقرفـه
كــالماء أي صيد يأتيه ينهلـه | والغصن أي نسيم من يعطفه
وإن حلا ريق فــاذكــر مرارتـه | في فم أبخر يحفيه ويـرشفـه

هەرکەسـێ کـەمترین پیـاوەتی و جـوامێری و خرۆشـی هەبێ،ئـەوە خـۆی بەدووردەگرێ لەگەڵ کەسێکدا هاورێ و دۆست بـێ کـە ئـەوە حـاڵی بـێ، ئینجا ئەگەر دەروونی بـەدەم داوای دوورگرتنـەوە نەڕۆیشـت و بەهاوبەشـیکردن رازیـی بوو، با بڕوانێتە ناشیرینی و چەپەڵیی ناخەوەی، بێگومان گەر هەرکەسێك نـاخ و دەروونـی بـەکرداری ناشـیرین بـەهێزو توانـادارکرد، ئـەوە دەروونـی لـەدەرووونی ئاژەڵان ناشیرینترە، تەنیا بەراز بەسووك و ریسواو چەپەڵ دادەنرێـت، بۆیـە ئـەو کەسەی بۆ خۆی بەسووك و ریسوایی رازیی بوو، هەروەك بەرازە.

ئەو ناشیرینییە، جوانی و شیرینیی رووم‌ەت و جەسـتەش دادەگرێ، چـونکە خۆشویستنی شتێك مرۆڤ کوێرو لاڵ ئەکات، ئەگـەر وێنەکـە مێینـەش بـێ، ئـەوە ناپاکیی کردووە لـەخواو پەیامبەرەکـەی و کەسـوکاری خـۆی و پیـاو و منـداڵ و خودی خۆیشی، نەوەکانیشی لەو تاوانە میراتبەر ئـەکات و تـاوان و شـەرمەزاریی ئەوانیش هەڵدەگرێ، جا لەو تاوانە قێزەونەدا جوانیی خـۆی هـیچ قوورسـاییەکی

نییە، گەر دەتەوێ ئەوەش بزانی، ئەوە بڕوانە ئەو ناشیرینییەی لەکاتی پیرییدا لەسەر رووومەتیان دەردەکەوێ، دەبینی چۆن خوای گەورە ئەو جوانییەی بەناشیرینیی گۆڕیووە، وەك لەو بارەیەوە شیعرێك وتراوە:

لو فكر العاشق في منتهى        حسن الذي يسبيه لم يسبه

واتا: گەر مرۆڤی عاشق بیری لەکۆتایی بکردبایەتەوە کە ئاوابوون بەسەر مەعشوقدا دێت، ئەوە عاشق نەدەبوو.

ئەمە باسێکی دووروودرێژە، لێرەدا ئەوەندە بەسە تەنیا بنەماکەی باس بکرێ[1].

## بەش

## بەهێزکردنی پاڵنەری ئایین

بەچەند شتێك پاڵنەری ئایین بەهێز دەکرێ:

**یەکەم:** شکۆدارکردن و بەرزڕاگرتنی خوای گەورە بەجۆرێ لەبەر چاو و بیستنی خوای گەورە تاوان نەکات، بۆیە هەرکەسێك بەدڵ بینینی، خوای گەورە ببینێ هەرگیز بۆ دڵی ملکەچ ناکات.

**دووەم:** بینینی خۆشویستنی خوای گەورە، ئەوکات لەبەر خۆشەویستیی خوای گەورە لەسەرپێچیکردنی دوور دەکەوێتەوە، هەرکەسێ یەکێکی خۆشبووێ ئەوە گوێڕایەڵی ئەبێ، باشترین وازهێنانێك لەتاوان وازهێنانی خۆشەویستانە، باشترین پەرستشێك پەرستشی خۆشەویستانە، بۆیە بۆشایی و

---

[1] - بڕوانە کتێبی الداء والدواء(ص٣١٩)، دانەر بەڕەحمەت بێ هەمووی باسکردووە.

دوورابییەکی زۆر هەیە لەنێوان وازهێنان و پەرستشی خۆشەویستان و ئەوانەی لەخوا دەترسن و پەرستشی دەکەن.

**سێیەم:** دیمەنی نیعمەت و چاکەی خوای گەورە، کەسی بەڕێز بەخراپە وەڵامی چاکەی کەس ناداتەوە، کەسێك بەخراپە وەڵامی چاکە دەداتەوە کە خۆی سووك و ریسوا بێ، بۆیە کەسی بەڕێز با دیمەنی چاکەو نیعمەتی خوا لەتاوان بەدووری بگرێ و شەرم بکات لەوەی خێرو خۆشیی خوای گەورە بۆ دادەبەزێ و ئەمیش تاوان و کرداری ناشیرینی لێ بەرزبێتەوە بۆ لای پەروەردگاری، فریشتەیەك نازونیعمەتی بۆ دابەزێنێ و فریشتەیەکی تر خراپەی ئەم بۆ ئاسمان بەرزبکاتەوە، بەڕاستی پاداشتدانەوەیەکی زۆر ناشیرینە گەر مرۆڤ کاری لەو جۆرە بکات.

**چوارەم:** دیمەنی تووڕەیی و تۆڵەکردنەوە، گەر بەندە لەتاواندا بەردەوام بێ،ئەوە دەبێتە مایەی تووڕەبوونی خوای گەورە، کە تووڕەش بوو هیچ شتێك بەر بەتووڕەییەکەی ناگرێ، چ جای ئەو بەندە لاوازە.

**پێنجەم:** دیمەنی لەدەستچوون، مرۆڤ بەخراپە و تاوان خێری دونیاو دوارۆژی لەدەست دەردەچێ، تووشی ناو و ناتۆرەو کرداری قێزەون دەبێ لەڕووی عەقڵ و شەرع و نەریتەوە، لەڕووی شەرع و عەقڵ و عورفیشەوە ناو و سیفەتی جوانی بۆ نامێنێ، ئەوەی بەسە دیمەنی ئیمانی لەدەست دەچێ، ئەو ئیمانەی کە تۆزقاڵێکی چەندان ئەوەندەی دونیاو ئەوەی تیایدایە بەسوودترو خێرترە، چۆن دەکرێ و ئەتوانێ بەشەهوەتێك بیفرۆشێتەوە کە چێژ و خۆشییەکانی نامێنێ و سزاو ناخۆشییەکانی لەدوا بەجێدەمێنێ، شەهوەت دەچێ و بەدبەختییەکانی دەمێنێتەوە، بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)ەوە هاتووە

فەرموویەتی: "لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ"[1]،واتا: کاتێك مرۆڤێك کاری داوێنپیسیی دەکات باوەڕدار نییە. هەندێ لەهاوەڵانیش وتوویانە: ئیمانی لەسەر هەڵدەگیردرێ و لەسەر سەری وەك سێبەرێك دەمێنێتەوە، کە تەوبەی کرد ئیمانی بۆ دەگەڕێتەوە[2]. هەندێ لەتابیعیین وتوویانە:وەك چۆن کراسی لەبەر دادەماڵدرێت، ئاوەها ئیمانی لێ دەکرێتەوە، کە تەوبەی کرد لەبەری دەکاتەوە، لەمەدا لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)گێڕدراوەتەوە لەو فەرموودەیەی کە بوخاری گێڕاویەتییەوە[3]:"الزناة في التنور عراة"، واتا: داوێنپیسەکان لەتەندووری ئاگریندان و رووتن. رووتن لەبەرئەوەی بەرگی ئیمانیان لەبەر داکەندبوو، ئەو تەندوورەی شەهوەت کە لەدڵیاندا بووە لەدۆزەخدا دەبێتە تەندوورێکی دیارو دەیانسووتێنێ.

شەشەم: دیمەنی سەرکووتکردن و بردنەوە، بەدڵنیاییەوە سەرکوتکردنی شەهوەت و بردنەوە لەشەیتان، چێژو خۆشیی خۆی هەیە، ئەو کەسەی بەو چێژو خۆشییە گەیشتبێ دەزانێ کە چێژو خۆشیی زیاترە لەبردنەوە لەدوژمنە ئادەمییەکان، بردنەوە لەشەیتان خۆشترو مەزنترە لەبردنەوە لەو مرۆڤانەی دوژمنتن. خۆشترین و باشترین سەرەنجامێکیشی هەیە، وەك سەرەنجامی ئەو دەرمانە بەسوودەیە کە دەردی جەستە ناهێڵێ و لەشساغیی بۆ مرۆڤەکە دەگەڕێنێتەوە.

---

[1] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٢٤٧٥) و موسلیمیش(٥٧) لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ).

[2] - صەحیحە، ئەبو داوود(٤٦٩٠) و حاکم(١/ ٢٢) و بەیهەقیی لە الشُعَب(٤/ ٣٥٢)ئیخراجیان کردووە.

[3] - بڕوانە واتای ئەم فەرموودەیەی لای بوخاری(٣٨٦) لەفەرموودەکەی سمرەی کوڕی جوندوب(خوای لێ رازیی بێ).

**حەوتەم:** دیمەنی قەرەبووکردنەوە، ئەو قەرەبووکردنەوەیەی خوای گەورە بۆ ئەو بەندەیەی لەبەر خوای گەورە لەحەرام خۆی بەدوورگرتووەو رێگریی دەروونی خۆی کردووە لەهەواو ئارەزوو، بەراورد ئەکات لەنێوان ئەوەی وازی لێدەهێنێ و ئەوەی خوا بۆی دەکاتە قەرەبوو، کە کامیان شیاوە دەستبەرداریی بکرێت،بۆیە ئەوە هەڵدەبژێرێ و بۆ دەروونی خۆی پێی رازییە.

**هەشتەم:** دیمەنی ئاگاداربوون و لەتەکدا بوون، ئەمە دوو جۆرە: لەتەکدابوونێکی گشتی، لەتەکدابوونێکی تایبەتی، گشتییەکە خوای گەورە ئاگای بەهەموویەتی، هیچ شتێکی لێ شاراوە نییە، پێشتر ئەمەمان باسکرد، مەبەست بەلەتەکدابوونی تایبەت، ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت:﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٥٣﴾ البقرة: ١٥٣، واتا: بەڕاستی خوا لەگەڵ خۆڕاگرانە.

هەروەها دەفەرموێت:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ١٢٨﴾ النحل: ١٢٨، واتا: بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەوانەیە کە خۆیان پاراستووە(لەتاوان)هەروەها ئەوانەش کە چاکەکارن.

هەروەها دەفەرموێت:﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩﴾ العنكبوت: ٦٩، واتا: بێگومان خوا لەگەڵ چاکان دایە.

ئەم لەتەکدابوونە تایبەتییە، بەسوودترو چاکترە بۆ کەسێك دەروونی خۆی جڵەوکردبێ،چۆن ئەهێڵێ ئەم شەهوەتە لەخشتەبەرە زوو لەنێوچووە لەماوەیەکی کەمی تەمەندا کاریگەریی بکاتەسەر دەروونی؟ بەڕاستی دونیاو ئارەزووەکان وەك خەونی مرۆڤێکی خەوتوو یان سێبەرێکی کاتییە.

نۆیەم: دیمەنی لەناکاو مردن و یەکلاکردنەوە، ئەترسێ لەناکاوێکدا مردنی بێت و خوای گەورە بێ بواردان بیگێڕێتەوە قیامەت و چێژو خۆشیی ئاخیرەتی لەدەستبچێ، ئای ئەوە چی حەسرەت و پەشیمانییەکە! چەند تاڵ و سەختە مردنی لەو جۆرە! تەنیا کەسێك ئەو حاڵەتە دەزانێ کە ئەزموونی کردبێ و بەو حاڵەدا چووبێ.

لەهەندێ کتێبی کۆندا هاتووە: ئەی ئەو کەسەی بۆ چاوتروکانێك لەخۆت دڵنیانیت و خۆشیی رۆژێکت بۆ تەواو نەبووە، وریابە وریا!

دەیەم: دیمەنی نەهامەتی و خۆشی، بێگومان تاوان و سەرەنجامەکەی تەنیا هۆکاری بەلاّو نەهامەتیین، خۆشی و سەرفرازیی رەهاش لەگوێڕایەڵیکردنی خوای گەورەو سەرەنجامی خواپەرستییدایە، خەڵکانی بەلاّو مەینەتبار تاوانکارەکانن گەرچی جەستەشیان ساغ و سەلامەت بێ، سەرفرازانیش خەڵکانی گوێڕایەڵی خوای گەورەن با جەستەشیان نەخۆش و دەردەداربێ.

هەندێ ئەهلی زانست وتوویانە لەئەسەردا هاتووە: ئەگەر خەڵکانی بەلاّو ناخۆشییتان بینی، لەخوای گەورە داوای سەرفرازیی(عافیەت)بکەن[1].

خەڵکانی خاوەن بەلاّ، تاقیکراونەتەوە بەو کارانەی سەرپێچیی فەرمانی خوایان تیادایە و لەفەرمان و نەهییەکانی پێچەوانەیان کردووەو لێی بێ ئاگابوونە، ئەمەو ئەگەرچی گەورەترین بەلاّیە، بەلاّم بێژەکە هەموو ئەوانە

[1] - لەسەرچاوەکاندا ئەمەم نەبینیووە، ئەوە بەسە کە ترمیزی(٣٤٢٩)گێڕاویەتییەوە: "الحمد لله الذي عافاني مما ابتلى كثيراً من خلقه، وفضلني على كثير ممن خلق من عباده تفضيلاً"،واتا: هەرکەسێ کەسێکی خاوەن بەلاّو نەهامەتیی بینی و وتی: سوپاس بۆ خوای گەورە کە منی لەو تاقیکردنەوەیە پاراست و فەزڵی دا بەسەر زۆرێك لەمەخلوقاتی خۆیدا، ئەوە تووشی ئەو بەلاّیە نایەت. لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ).

دەگرێتەوە کە لەجەستەو ئایینیاندا کەوتوونەتە بەر تاقیکردنەوەو بەلاوە، خواش زاناترە.

**یانزەیەم:** دەبێ پاڵنەرو هاندەرییەکانی ئایین کەم کەم و بەلەسەرخۆیی ململانێ و بەرەنگاریی هەواو ئارەزوو بکەن و ببێتە نەریت تاوەکو پەی بەچێژی سەرکەوتن ببردرێ، هەرکەسێ چێژو تامی شتێکی کردبێ ئەوە هیممەتی دەستخستنی زۆرتر ئەبێتەوە، نەریتگرتنیش بەکارە سەختەکان، ئەو هێزە زۆرتر ئەکاتەوە کە لەو کارانەوە سەرچاوە دەگرێ، بۆیە دەبینین هێزی کۆڵبەرو خاوەن پیشە سەختەکان زۆرترە لەهێزی قوماشفرۆش و بەرگدوورو ئەوانەی تر.

هەرکەسێ تەواوی بەرەنگاریکردنی دەروون وازلێبهێنێ،ئەوکات پاڵنەرەکانی ئایینی لاواز و پاڵنەرەکانی شەهوەتی بەهێز ئەبن، بەلام هەرکات دەروونی رابهێنێ لەسەر پێچەوانەکردنی هەواو ئارەزووی، ئەوە هەرکات بیەوێ بەسەریدا زاڵ دەبێ.

**دوانزەیەم:** دوورخستنەوەی شتی پووچ و ناڕەوا لەدەروون، هەرکاتێ ختورەی خراپی بەسەر دەرووندا بێ، ناهێڵێ لەدەروونیدا جێ بگرێ، چونکە گەر شتی خراپ لەدەرووندا جێی گرتەوە دەبێتە خۆزگە، خۆزگەی خراپیش سەرمایەی مایەپووچانە.

هەرکاتێ رازو نیاز لەدەرووندا جێگەی گرتەوە دەبێتە خۆزگە، ئینجا دەبێتە خەم و پەژارە، بەهێز دەبێتەوە دەبێتە ویست(ئیرادە)، پاشان بەهێز دەبێت و دەبێتە عەزیمەت و ئینجا دەبێتە مەبەست، بۆیە رەتکردنەوەی رازی یەکەم و سەرەتا ئاسانترە لەنەهێشتنی شوێنەواری روودانێك و هەوڵدان بۆ وازلێهێنانی.

**سیانزەیەم:** نەهێشتنی ئەو پەیوەندی و هۆکارانەی گونجاون بەهەواو ئارەزوو، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ ئارەزووی نەبێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە مرۆڤ ئارەزووەکانی بەوە بگەیەنێ کە سوودی پێ دەگەیەنن و لەجێبەجێکردنی مەبەستەکانی خوای گەورەدا بەکاریبهێنێ، ئەمە وەهای لێدەکات لەسەرپێچیی خوای گەورەدا بەکاری نەهێنێ. هەر شتێ مرۆڤ لەبەر خوا ئەنجامی بدات، ئەوە خوای گەورە دەیپارێزێ لەوەی بەخراپ بۆ خۆی و شەیتان بەکاریبهێنێ، هەرشتێ بۆ خوای بەکارنەهێنێ، بێگومان بۆ خۆی و هەواو ئارەزووی خۆی بەکاریدەهێنێ.

زانستێك گەر بۆ خوا نەبێ، ئەوە بۆ دەروون و هەواو ئارەزووە. کارێك بۆ خوا ئەنجام نەدرێ، ئەوە بۆ ریاو دووڕوویيە. سەروەتێك بۆ خوا خەرج نەکرێ، ئەوە بۆ شەیتان و هەواو ئارەزوو خەرج دەکرێت. ناوبانگییەك گەر مرۆڤ نەیخاتە خزمەت فەرمانەکانی خوای گەورەوە، ئەوە بۆ دەروون و هەوای خۆی بەکاریدەهێنێ. هێزێك گەر لەخزمەت گوێڕایەڵیی خوای گەورەدا بەکارنەهێنرا، ئەوە لەسەرپێچیی خوای گەورەدا بەکاردەهێندرێت.

هەرکەسێ دەروونی رابهێنێ لەسەر کارکردن بۆ خوای گەورە، ئەوکات سەختترین شتێك بەسەرییەوە ئەوەیە بۆ غەیری خوای گەورە کارێك بکات، هەرکەسێکیش خۆی راهێنابێ بۆ هەواو ئارەزووی خۆی کاربکات، لەدڵسۆزی و کارکردن بۆ خوای گەورە هیچ شتێکی تری بەلاوە سەختتر نییە. ئەمەو تەواوی کارەکانی تریش هەر بەو جۆرەیە، ئەوەی پارەو کاتی بۆ خوای گەورە خەرج دەکات، لەوە سەختتر نییە بەسەرییەوە کات و سەرمایەی بۆ غەیری خوا خەرج بکات و بەپێچەوانەشەوە.

**چواردەیەم:** روانینە نیشانە سەیرەکانی خوای گەورە، داوای لەبەندەکانی کردووە لەو نیشانانە تێفکرن، نیشانە گەلێکی روون و ئاشکران، گەر بەسەر دڵی بەندەدا زاڵبن، چپەو رازو گومانی شەیتانی لەسەر رادەماڵن.

چەندە دۆڕاو و خەسارومەندە ئەو کەسەی ئەتوانێ ئاشنای خواو قورئان و پەیامبەرو هاوەڵان بێ، کەچی ئەوەی ناوێ و دەبێتە هاوەڵی شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە، لەوە دۆڕاوترو ماڵ کاولتر نییە، خوایە بە تۆ پەنادەگرین.

**پانزەیەم:** بیرکردنەوە لەدونیاو خێرا پووکانەوەو نەمانی، کەسێك لەم دونیایە تووێشوو هەڵناگرێ بۆ ژیانی هەتاهەتایی کە بێ هیممەت و ناجوامێرو دڵ مردوو بێ. حەسرەتی تووندو سەخت دەبێ کە دەبینێ شتێکی لەدونیا هەڵنەگرتووە سوودی بۆ هەبێ، کە دەبینێ شتی بەسوودتری لەدەست خۆی داوە،ئەوکات حەسرەت و نەهامەتیی زۆرتر ئەبێ.

**شانزەیەم:** هەمیشە پاڕانەوە کردن بۆلای خوای گەورە،ئەو خوایەی کە دڵەکانی لەنێو پەنجەدایەو کاروبارەکان رادەپەڕێنێ و هەموو شتێك بۆلای ئەو دەگەڕێتەوە، بپاڕێرەوە رەنگە پاڕانەوەکەت بکەوێتە کاتەکانی بەخشینەوە، هەروەك لەئەسەری بەناوبانگدا هاتووە:"إن لله في أيام دهره نفحات فتعرضوا لنفحاته واسألوا الله أن يستر عوراتكم ويؤمن روعاتكم"،واتا: خوای گەورە لەڕۆژگارەکانیدا کات گەلێکی هەیە بۆ بەخشین، ئێوەش هەوڵبدەن ئەو بەخشین و لێخۆشبوونانە دەستبخەن، داوا لەخوای گەورە بکەن عەیبەکانتان داپۆشێ و دڵئارامتان بکات.

رەنگە بەهۆی زۆر پاڕانەوەوە،پاڕانەوەیەکت بکەوێتە کاتی بەخشینەکانەوە کە داوای هەرچییەك بکەی خوای گەورە پێتی دەدات، هەرکەسێ پاڕانەوەی

قبـولٚ بکـریٚ داواکارییەکـەی بەجێدەگـەینرێت، بزانـە گـەر وەلاٚمـی پاڕانـەوەت نەدرابایە،ئەوە داوای پاڕانەوەت لیٚ نەدەکرا، هەروەك وتراوە:

لو لم تُرِدْ نيل ما أرجو وأطلبه          من جود كفك ما عودتني الطلبا

واتا: ئەگەر بتویستبایە داواو تکای بەخشندەیی خۆتم لیٚ رەتبکەیتەوە، ئەوە منت رانەدەهێنا داواو تکات لیٚ بکەم.

لەڕواڵەتدا شتێکی نامۆ نابینین، خوای گەورە بـەجۆرێك مامەڵـەی بەندەکـەی دەکات هاوشـێوەی کـاری خـۆی نـەبیٚ، هـەروەك لەسیفەتەکانیشـدا هاوشـێوەی نییـە، بەندەکـەی لەشـتێك بـیٚ بەشـکردووە تـاوەکو داوای لـیٚ بکـات، نەخۆشـی دەخات تاوەکو بەپاڕانـەوەی شـیفای بـدات، هـەژاری خسـتووە تـاوەکو بـەداواو تکای دەوڵەمەندی بکـات، ئـەیمرێنیٚ تـاوەکو زینـدووی بکاتـەوە، دایـك و بـاوکی لەبەهەشـت دەرکـرد تـاوەکو بەتـەواوترین حـالٚ بـۆ بەهەشـتیان بگەڕێنێتـەوە، هەروەك وتراوە: ئەی ئادەم بێتاقەت مەبە لەوەی وتم: لەبەهەشـت دەربچۆ، مـن بۆ تۆم دروست کردو بۆ ئەو شوێنەت دەگەڕێنمەوە.

خوای گەورە بەتاقیکردنەوەو ناخۆشیی سەر بەندەی، نیعمەتی خۆی بەسـەر بەندەکەیدا دەدات، بەبێبەشکردنی پێی دەبەخشـیٚ، بەنەخۆشخسـتنی لەگەڵیـدا دەبیٚ، بەهیچ حاڵێك خوای گەورە بەندەی خۆی دڵتەنگ و خەفتبار ناکات، تەنیا ئـەو بەندەیـە نـەبیٚ کـە لـەدونیادا لیٚـی تـووڕە بـووەو خـوای لـەخۆی دوورخستووەتەوە.

**حەقدەیـەم:** دەبـیٚ بەنـدە بزانـیٚ دوو راکێشـەری دژی تێدایـە، کۆسـت و ناخۆشـییەکەی لـەنێوان دوو راکێشـەردایە: راکێشـەرێك رایدەکێشـیٚ بـەرەو لای خوای گەورە کە لەبڵندترین شوێنە، راکێشەرێك رایدەکێشیٚ بـۆ نـزمترین شـوێن،

هەرکاتێ ملکەچ و گوێڕایەڵی خوای گەورە ببێ پلەیەك بەرزدەبێتەوە تائەگاتە ئەو پلەبەرزییەی کە شیاوێتی، هەرچکاتێکیش بەرەو لایەنی نزم بڕوات، ئەوە پلەیەك دادەبەزێ تا دەگاتە شوێنی خۆی لەسجیندا.

هەرچکاتێ بیەوێ بزانێ ئایە لەگەڵ خوای گەورەدایەو لەشوێنی بەرزە یان لەنزمترینە، با بڕوانێتە روحی ئاخۆ لەچی شوێنێکی ئەو جیهانەدایە، روح کە جەستەی بەجێهێشت دەگەڕێتەوە لای خوای گەورە کە لەدونیادا بۆلای خۆی رایدەکێشاو لەپێشترە بەو روحە.

لەڕووی سرووشت و عەقڵ و پاداشتەوە، مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشیدەوێ، هەر کەسێ گرنگیی بەشتێك بدات بۆلای ئەو شتەو خەڵکانی گرنگیدەر بەو شتە دەچێ، هەموو مرۆڤێك بۆ لای ئەو شتە خوار دەبێتەوە کە شیاوێتی، پەروەردگاریش فەرموویەتی: ﴿قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ﴾ الإسراء: ٨٤، واتا: ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)بڵێ هەموو کەس کار دەکات لەسەر سرووشت(و ڕێباز)ی خۆی.

بۆیە دەروونە بەرزو باڵاکان بەزات و ورەو کاری خۆیان بەرەو باڵاتر کێش دەبن، دەروونە نزمەکانیش بەرەو نزمتر.

**هەژدەیەم:**بەندە دەبێ بزانێ، بەتاڵکردنەوەو پاککردنەوەی شوێن(دڵ) مەرجی دابەزاندنی بارانی رەحمەتە، پاککردنەوەی زەوی کشتوکاڵیی لەگژو گیای زیانبەخش مەرجی کشتوکاڵییەکەی تەواوە، کە شوێنەکە پاك و بەتاڵ نەکرایەوە رووناداب بارانی رەحمەتی بەسەردا داباریێ، ئەگەر شوێنەکەی رێکخستبوو گەنمەکەشی چاندبوو بارانیشی بەرکەوت، بەڵام گژوگیای

زیانبەخشی هەڵنەکێشابوو، ئەوە کشتوکاڵییەکەی هەر تەواو دانانرێت، رەنگە گژوگیا زیانبەخشەکە بەسەر تۆوە چێندراوەکەدا زاڵبێ و کشتوکاڵییەکەی لەنێو ببات، ئەو بەندەیە وەك کەسەیە کە زەوییە کشتوکاڵییەکەی چاك دەکات بۆ چاندن و تۆوی تێدا دەچێنێ و چاوەڕوانی باران دەکات.

ئەگەر بەندە دڵی خۆی پاککردەوەو لەویست و رازی خراپ بەتاڵیکردەوەو تۆوی یادکردنەوەو بیرو خۆشەویستیی خواو دڵسۆزیی تێدا چاندو خستیە بەردەم بای رەحمەتەوەو لەکاتی خۆیدا چاوەڕوانیی بارانی رەحمەتی کرد، ئەوە شیاوی خۆیەتی بەرهەمی چاك بچنێتەوە، هەروەکو چۆن تکاکردنی داباریني باران لەکاتی خۆیدا چاوەڕوانییەکی بەهێزە، ئەوە ئەگەری بەهێزیشی هەیە هەمان ئەو بەخشینە خواییە دەستبخات کە خوای گەورە لەهەندێ کاتی جوان و پیرۆزدا دەیبەخشێتە بەندەکانی، بەتایبەت گەر هیممەتەکان کۆهاتبنەوەو دڵەکانیش یارمەتیدەربن، گەورەترین گردبوونەوەکانیش: وەکو گردبوونەوەی عەرەفەو گردبوونەوەی نوێژە بارانە و گردبوونەوەی ئەهلی جومعە، بێگومان کۆبوونەوەی ورەو تین و هەناسەکان هۆکار گەلێکن خوای گەورە دایناوە تاوەکو ببێتە مایەی قبوڵکردن و هێنانەدیی خۆشی و داباریني رەحمەت. ئەو هۆکارانەی دەستخستنی رەحمەتن بەهێزترن لەهۆکارە هەستییەکان لەدەستخستن و بەدیهاتنی هۆکارکراوەکانیاندا.

بەڵام بەندە بەهۆی نەزانی و نەفامیی خۆیەوە، شتی بینراوی بەسەردا زاڵ دەبێ و نادیار باش نابینێ، جا گەر بەندە شوێنەکە بەتاڵبکاتەوە لەتاوان و ئامادەسازی بکات، ئەوجار شت گەلێکی سەیر دەبینێ. ئەو تاوانەی کە لەبەندەدا هەیە لەبەردەم فەزڵی خوای گەورە دەبێتە رێگرو بەربەست، گەر ئەو

بەربەستە نەما، ئەوە لەهەموو لایەکەوە فەزڵ و بەخشندەیی خوای گەورە بەخێرایی دەگاتە بەندەکە، تۆش بڕوانە دۆخی رووبارێکی گەورە کە هەموو زەوییەکانی دەورووبەری خۆی ئاودێریی ئەکات، بەڵام کە لەنزیك زەوییەکی نزیکیدا بەربەستێك هەیە دەبینی خاوەن زەوییەکە شەکوای حاڵی زەوییەکەی خۆی دەکات کە وشك و بێ ئاوەو تینووە، بەربەستەکە ئەو خاکەی لەو رووبارە گەورەیە بێ بەش کردووە،تاوانیش بەو جۆرەیە.

**نۆزدەیەم:** دەبێ بەندە ئەوە بزانێ، کە خوای گەورە ئەوی دروستکردووە بۆ مانەوە نەك لەنێوچوون، بۆ سەربەرزییەك کە سەرشۆڕیی لەگەڵدا نییە، بۆ ئارامییەکی بێ ترس، بۆ دەوڵەمەندییەك کە هەژاریی لەگەڵدا نەبێ، بۆ چێژو خۆشییەك ئازاری لەگەڵدا نەبێ، بۆ تەواوییەك ناتەواویی لەگەڵدا نەبێ، لەم دونیایەدا بەو مانەوەیە تاقیدەکاتەوە کە نەمان خێرای بۆ دەکات، بەو سەربەرزییەی کە سەرشۆڕیی لەگەڵدایەو سەرشۆڕییشی بەدوادا دێت، بەو ئارامییەی کە ترسی لەگەڵدایە و دواتریشی هەر ترسە، هەروەها دەوڵەمەندی و چێژو خۆشی و ئەو نازونیعمەتانەی تر کە دژەکانیان هەیە، دژەکان دوایان دەکەون کە زوو ئەوانە دەپووکێنەوە، بۆیە هەڵەی زۆربەی خەڵك لەم بوارەدا لەوەدایە، لەشوێن و جێگەی خۆیدا بەدوای مانەوەو شکۆمەندی و دەسەڵات و ناوبانگییەوە نین، لەشوێنی خۆیدا بۆ ئەوانە ناگەڕێن بۆیە لەدەستیان دەچن، زۆربەیان بەو شتانە نەگەیشتوون کە ویستوویانە، ئەوەشی دەستیانخستبێ چێژو خۆشییەکی کەم و هەڵوەریوێکی نزیکە، خێرا لەدەستیان دەچێ.

پەیامبەران(سەلامی خوایان لەسەربێ)هاتوون بەبانگەوازکردن بۆ نازونیعمەتێکی هەمیشەیی و دەسەڵات و پادشایەتی و خاوەندارێتییەکی گەورە،

هەرکەسێ بەدەم بانگەوازەکەیانەوە رۆیشتبێ، خۆشترین و پاکترین چێژی لەدونیادا دەستخستووە، ژیانی لەژیانی پادشایان خۆشتربووە.

بێگومان بێ دەربەستوون و نەویستنی دونیا سەروەتێکی گەورەو دەسەڵاتێکی ئاوەدانە، شەیتان لەوەدا زۆر حەسوودیی بەبەندەی باوەڕدار ئەبات و تەواوی هەوڵ دەدات و پێداگریی ئەکات بەندەی باوەڕدار بەو ئاستە نەگات. بێگومان بەندە گەر بووە خاوەنی شەهوت و تووڕەیی خۆی و ئەو دووانەی ملکەچی پاڵنەرەکانی ئایین کرد، ئەوە بەڕاستیی پادشاو خاوەن سەرمایەیە،چونکە کەسێکی ئازاد و سەربەستە.

ئەو پادشایەی کە ملەچی شەهوەت و تووڕەیی خۆیەتی، ئەوە بەندەی شەهوەت و تووڕەییەکەیەتی، بەندەیە لەبەرگی پادشادا، وەك چۆن وشتر بەڕێدەخرێ ئاوەهاش شەهوەت و تووڕەیی جڵەویان لەملی ئەو کردووەو بەڕێیدەخەن.

کەسی لەخشتەبراو و فێڵ لێکراو ناڕوانێتە پادشای دیار، کە راستە لەڕواڵەتە پادشایە و لەناخەوە کۆیلەیە، ناڕوانێتە شەهوەت کە سەرەتای چێژو خۆشییەو کۆتاییەکەشی حەسرەت و پەشیمانییە، بەڵام مرۆڤی بەرچاوروونی سەرکەوتوو، کەسێکە دەڕوانێتە کۆتایی شتەکان، لەبنەماکانەوە دەچێتەسەر سەرەنجامەکان، ئەوەش فەزڵ و گەورەیی خوایە بەهەرکەسێکی بووێ دەیبەخشێ و خوی گەورە خاوەن فەزڵ و منەتی گەورەو مەزنە.

**بیست:** دەبێ بەندە ئەوە بزانێ و لەخۆی بایی نەبێ، وەها بزانێ تەنیا بەزانینی ئەوەی کە باسمان کرد مەبەست بەدەستدەهێنێ، بەڵکو دەبێ هەوڵ و کاریش بەگەڕبخات و بواری زیاتر و وزەی زیاتری تێدا بەکاربهێنێ، ئەوەش بەدەرچوونە لەنەریت و خووەکان، نەریت و خووەکان دوژمنی تەواویی(کامڵی) و

سەرفرازیین، هەرگیز ئەو کەسە سەرفراز نابێ کە لەنەریت و خووەکاندا بەردەوامە. هەڵهاتن لەشوێنی فیتنە و تائەوپەڕی توانا لەدوورگرتن لەو شوێنانە، یارمەتیدەری دەرچوون ئەبن لەنەریت و خووەکان، پەیامبەری خواش(صلی الله علیە وسلم)فەرموویەتی:« من سمع بالدجال فلینأ عنە»[1]، واتا: هەرکەسێ بیستی دەجال دەرچووە با لێی هەڵبێ و خۆی لێ بەدووربگرێ.

هیچ شتێك یارمەتیدەری رزگاربوون نییە لەخراپە بەئەندازەی دوورگرتن لەهۆکارو شوێنەکانی خراپەکاری.

شتێکی خۆش بۆ شەیتان هەیە کە تەنیا مرۆڤی ژیر دەرکی دەکات، ئەوەیە لەشوێن و کاری خراپەدا هەندێ شتی خێر و چاکە هەیە داوا لەبەندە دەکات ئەو چاکەیە ئەنجام بدات، هەرکات بەندە بۆ کارە چاکەکە نزیکدەبێتەوە، شەیتان ئەیخاتە تۆڕو داواکەوەو تووشی خراپەکەی دەکات، خواش زاناترە[2].

***

[1] - صەحیح، ئەبو داوود(٤٣١٩) و ئەحمەد(٤/ ٤٣١)ئیخراجیان کردووە لەعیمرانی کوڕی حصینەوە(خوای لێ رازیی بێ).

[2] - بڕوانە: إغاثة اللهفان من مصائد الشيطان(١/ ١٠٢- ١٢٠).

## تەوەری سیانزەیەم

## مرۆڤ بەهیچ حاڵێك لەحاڵەكان بێ ئارامگرتن نایكرێ

مرۆڤ لەنێوان فەرمانێكدایە كە دەبێ ئەنجامی بدات و نەهی گەلێك دەبێ دووریان لێ بگرێ و قەزاو قەدەرێك بەسەریدا دێت و نازونیعمەتێك دەبێ لەسەری سوپاسگوزاربێ، جا كە لەم حاڵ و بارانە نابێتەوە،ئەوە ئارامگرییەكیشی پێویستە كە تاوەكو مردن لێی نابێتەوە.

هەموو ئەوەی لەم دونیایەدا دەخرێتە بەردەم مرۆڤ، دەبێ یەكێك بێ لەم دوو جۆرە: جۆرێك گونجاو بەهەواو ئارەزوو مەبەستی خۆی، جۆرەكەی تر پێچەوانەی هەواو ئارەزوو مەبەستی خۆی، لەهەردوو جۆرەكەدا پێویستی بەئارامگرتنە.

**ئەو جۆرەی گونجاو بەمەبەستی خۆیەتی:** وەكو لەشساغی، سەلامەتی، ناوبانگی، سەروەت و سامان، تەواوی خۆشییە حەلاڵەكان، بێگومان لەچەند روویەكەوە زۆر پێویستیی بەئارامگرتنە:

**یەكەم:** نابێ دڵ بەوانە بدات و پێیانەوە لەخۆبایی بێ و بیگەیەنن بەخراپەو ناسوپاسگوزاری و لووتبەرزی و خۆشییەكی ناشیرین، كە خوای گەورە خەڵكانی لەو جۆرەی خۆشناوێ.

**دووەم:** لەبەدەستهێنانی ئەوانەدا خۆی ماندوو نەكات و زیادەڕۆیی بكات بۆ دەستخستنیان، دەنا بۆ دژەكان دەگۆڕێن، هەركەسێ لەخواردن و خواردنەوەو جووتبووندا زیادەڕۆیی بكات بۆ دژەكەی دەگۆڕێ و لەخواردن و خواردنەوەو جووتبوون بێ بەش دەكرێ.

سێیەم: لەبەجێهێنانی مافی خوا لەو نیعمەتانەدا ئارامگربێ، بەفیڕۆی نەدات، دەنا لێی وەردەگیردرێتەوە.

چوارەم: دەبێ ئارامبگرێ لەدوورگرتنی لەحەرام، دەروونی هەرچی ویست بەگوێی نەکات، دەنا دەروونی ئەیخاتە حەرام و تاوانەوە، ئەگەر هەموو خۆپارێزییەکیش بکات هەر دەکەوێتە مەکروهەوە، لەخۆشی و خۆشگوزەرانییدا تەنیا راستگۆیانن ئارام دەگرن و لەخۆبایی نابن.

هەندێ پێشین وتوویانە: بەڵاو نەهامەتی، باوەڕدارو بێباوەڕ ئارامی لەسەر دەگرن، بەڵام لەخۆشی و خۆشگوزەرانییدا تەنیا راستگۆیان ئارام دەگرن.

عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف(خوای لێ رازیی بێ)وتوویەتی: بەناخۆشیی تاقیکراینەوە ئاراممان گرت، بەڵام بەخۆشگوزەرانیی تاقیکراینەوە ئاراممان نەگرت[1].

بۆیە خوای گەورە بەندەکانی خۆی وریاکرووەتەوە لەفیتنەی سەروەت و ژن و منداڵەکانی و ئەفەرمووێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ﴾ المنافقون: ٩، واتا: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ماڵ و منداڵەکانتان بێ ئاگاتان نەکەن لە یادی خوا.

هەروەها دەفەرمووێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٤ ﴾ التغابن: ١٤، واتا: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بەڕاستی هەندێ لەژنان و منداڵەکانتان دوژمنی ئێوەن جا خۆتانیان لێ بپارێزن وە

[1] – حسن، ترمیزیی ئیخراجی کردووە(٢٤٦٤).

ئەگەر(لێیان)ببورن وە وازبێنن(لێیان) وە(لێیان)خۆش بن ئەوە بێگومان خواش لێخۆش بووی میهرەبانە.

ئەو دوژمنایەتییەی لەم ئایەتانەدا هاتووە، هەمان ئەو دوژمنایەتییە نییە کە خەڵکی بەدوژمنایەتی و رق و کینە بەرانبەر بەیەکتر تێگەیشتوون، بەڵکو دوژمنایەتیی خۆشەویستانە کە دەبێتە رێگر لەبەردەم هیجرەت و جیهاد و فێربوونی زانست و راستگۆیی و تاوەکو شتەکانی دیکەی کاروباری ئاین و کارە چاکەکان، هەروەك لەجامیعی ترمیزییدا هاتووە لەفەرموودەو باسێکی ئیسرائیلییدا: سەمماك بۆی باسکردین، ئەویش لەعیکرەمەوە، ئەویش لەئیبن عەباسەوە کە پیاوێك لەبارەی ئەم ئایەتەوە لێیپرسیووە:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٤ ﴾ التغابن: ١٤، وتوویەتی: ئەوە لەبارەی پیاو گەلێکی خەڵکی مەککەوەیە موسڵمان بوون و ویستیان بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)کۆچبکەن، ژن و منداڵەکانیان رێگربوون بۆلای پەیامبەر برۆن، بەڵام کاتێ رۆیشتن بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)بینیان خەڵك لەکاروباری ئیسلام تێگەیشتوون، بۆیە داوایان کرد سزا بدرێن، خوای گەورەش ئەو ئایەتەی دابەزاند، ترمیزیی ئەڵێ فەرموودەیەکی(حسن صحیح)ە[1].

[1] - حسن، ترمیزیی ئیخراجی کردووە(٣٣١٧).

ئـای چـەندە کـەماڵ و سـەرفرازیی هەیـە بەنـدە بـەهۆی ژن و منداڵییـەوە لەدەستی چووە، لەفەرموودەشدا هاتووە:«الْوَلَدُ مَبْخَلَةٌ مَجْبَنَةٌ»[1]،واتـا: کـوڕ بـۆ مرۆڤ مایەی چرووککردن و ترسنۆکییە.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: یەزیدی کوڕی ئەلحیباب بۆی باسکردین،وتی:حەسەنی کوڕی واقیدیی بۆی باسـکردین،وتی: عبداللـەی کـوڕی بورەیـدە بـۆی باسـکردین وتی: لەباوکمم گوێ لێبوو ئەیووت: پەیامبەری خوا(صـلى الله عليـه وسـلم)وتاری بـۆ دەدایـن، حەسـەن و حوسـێن هـاتن و دوو قەمیسـی سـووریان لەبـەردابوو دەرۆیشتن و دەکەوتن، پەیامبەری خـوا لەسـەر مینبـەر دابـەزی و هـەردووکیانی هەڵگرت و لەبەردەستی خۆیدا دانیان و پاشان فەرمووی: راسـتی فـەرموو خـوای گـەورە:﴿ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ﴾ التغـابن: ١٥، واتـا: بێگومـان دارایی و منداڵتان هەر هۆی تاقی کردنەوەتانن.

ئینجا فەرمووی: روانیمە ئەم دوو منداڵە دەرۆیشتن و دەکەوتن ئارامم نـەگرت تاوەکو وتارەکەم بچڕاندو هێنایانمە لای خۆم))[2].

ئـەوەی پەیامبـەری ئـازیز کـردی، تـەواوی سـۆزو بـەزەیی بـوو بەرانبـەر بچـووکەکان، ئوممەتەکـەی فێـری بـەزەیی و نـەرموونیانی و سـۆز کـرد بەرانبـەر منداڵان.

---

[1] - صـەحیحە، ئـیبن ماجـە(٣٦٦٦)و ئەحمـەد(٤/ ١٧٢) ئیخراجیـان کـردووە لەفـەرموودەی یـەعلا ئەلعامری(خوای لێ رازیی بێ).

[2] - صەحیحە، ئـەبو داوود(١١٠٩) و ترمیـزی(٣٧٧٢) و نەسـائی(٣/ ١٠٨) و ئـیبن ماجـە(٣٦٠٠)ئیخراجیـان کردووە.

ئارامگرتن لەکاتی ناخۆشی و سەختییەکاندا توندو بەهێزە، چونکە ئەوکات توانای ئارامگرتن هەیە، مرۆڤی برسی کە خواردن نەبێ ناچارە ئارامبگرێ و ئارامگرتنەکەی زۆرترە لەو کاتەی خواردن ئامادەیە، هەروەها کە ئافرەت بوونی نەبێ و لەبەرچاوی پیاو نەبێ، پیاو زیاتر ئارامترەو بەسەر هەوەسی خۆیدا زاڵ دەبێ.

هەرچی جۆری دووەمی دژ بەهەواو ئارەزووە، ئەوە یان بەندە بەسەربەستیی خۆی ئارامگریی هەیە وەك گوێڕایەڵی کردن و تاوانەکان، یان هیچ سەربەستییەکی خۆی تیادا نییە، نمونەی کۆست و بەلاَو نەهامەتییەکان، یان سەرەتا بەئازادییەوە دەچێتە نێو کارەکەوەو دواتر ناتوانێ لێی دەربچێ، ئەم بابەتە لێرەدا دەبێتە سێ بەشەوە:

**یەکەم: ئەوەی بەسەربەستیی بەندەوە پەیوەستە:** تەواوی کارەکانێتی کە بەگوێڕایەڵیی خوای گەورە یان بەتاوان دادەنرێت، هەرچی خواپەرستییە، ئەوە بەندە پێویستی بەوەیە ئارامی لەسەر بگرێ، چونکە دەروون بەسرووشتی خۆی تاقەت و حەزی بەخواپەرستیکردنی زۆر نییە. بۆ نمونە نوێژکردن، سرووشتی دەروون حەزی بەتەمبەڵی و پشوودانە، بەتایبەت ئەگەر دڵڕەقییشی لەگەڵدابێ و خراپە دڵی داگرتبێ و حەزی بەئارەزووەکان و تێکەڵی بێ ئاگایان بێ.

بەبوونی ئەو هۆکارانەش، دەبێ بەندە ئەو کارانە ئەنجام بدات، ئەگەر ئەنجامیشی بدات ئەوە ئەرکدارەو دڵی لای نییەو حەزو ویستی بەجێهێشتنی هەیە، وەك چۆن کەسێك لای لاکێك دانیشتبێ و بیەوێ لاکە تۆپیوەکە بەجێبهێڵێ.

لەبابەت زەکاتیشدا لەبەرئەوەی دەروون چرووکیی تێدایە، هەروەها حەج و جیهادیش وەك ئەو کارانەی دیکەیە کە ئەنجامدانیان لەسەر دەروون گرانە.

ئا لێرەداو لەسێ حاڵەتەدا بەندە پێویستی بەئارامگرتنە:

**یەکەم:** پێش ئەوەی بچیتە کارەکەوە نییەت و دڵسۆزیی خۆت بۆ خوای گەورە ساغ بکەرەوەو لەپاڵنەرەکانی ریاو ناوبانگیی دووربکەوەرەوە، پێداگربە لەسەر ئەوەی مافی فەرزو کارەکان بدەی.

**حاڵەتی دووەم:** لەکاتی کارەکەدا ئارامبگرە، لەبوونی پاڵنەرەکانی کەمتەرخەمی و سستی نواندن بەندە پێویستیی بەئارامگرتنە، لەکاتی بوونی نییەتدا ئارامگریی پێویستە، پێویستە لەوەستان لەبەردەم خوای گەورەدا دڵت ئامادەیی هەبێ و بێ ئاگا نەبێ، دڵت خوا لەبیر نەکات، ئەمەو لەتەواوی کاروبارەکانتدا بەو جۆرەبێ، ئەوە شێوەی پەرستشی بەندە دڵسۆزەکانە بۆ خوای گەورە. بەندە پێویستی بەئارامگرتنە تاوەکو مافی پەرستشی خوای گەورە بدات و سووننەت و واجیب و پایەکانی وەك خۆی بەجێبگەیەنێ، دەبێ ئارامبگرێ تاوەکو یادی خوای گەورەی تیادا هەبێ و شتی تر سەرقاڵی نەکات بەرانبەر بەپەرستشکردنی بۆ خوای گەورە، دەبێ بەئەندامەکانی جەستەی و ئامادەیی دڵییەوە خوای گەورە بپەرستێ.

**حاڵەتی سێیەم:** ئارامگرتن لەدوای لێبوونەوە لەکارەکە، ئەوەش لەچەند روویەکەوە:

**یەکەم:** دەروونی خۆی جڵەوگیر بکات تاوەکو کارێك نەکات چاکەکانی هەڵبوەشێنێتەوە، پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ لَا تُبۡطِلُوٓاْ

صَدَقَـٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ﴾ البقـرة: ٢٦٤، واتا: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە پوچەڵی مەکەنەوە خێرو بەخشینەکانتان بە منەت نان و ئازاردان و دڵ ئێشان.

تەنیا خواپەرستیکردن گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە ئەو خواپەرستییە بـەجۆرێك بپارێزی هیچ شتێك ئەنجام نەدەی مایە پووچی بکات.

**دووەم:** دەبـێ ئـارامبگریێ لـەخۆ بـەدوورگرتن لـەڕیاو بـەخۆ سەرسـامبوون و خۆبەزلزانی و گەورەیی نواندن بەخواپەرستییەکەی، چونکە ریابازی و خۆنواندن بەکاری چاکەوە لەتاوانە ئاشکراکان زیانی سەختترە بۆ سەر بەندە.

**سێیەم:** دەبێ ئارامبگریێ و لـەنهێنیی بوونـەوە نەیگوازێتـەوە بـۆ ئاشـکرایی، چونکە گـەر بەنـدە بـەنهێنیی لـەنێوان خـۆی و خـوای گـەورەدا کـارێکی ئـەنجام دا،ئەوە لـەدیوانی نهێنییەکانـدا تۆمـار دەکریێ، گـەر باسـی کـرد دەگوازرێتـەوە دیوانی ئاشکراکان، ئینجا با وەها گومان نەبات بەلێبوونەوە لەکارەکە ئارامگریی پێچرابێتەوە.

ئارامگرتن لەسەر تاوان و سەرپێچییەکان شتێکی دیارە، باشـترین شـتێك کـە هاوکاربیێ بۆ دوورکەوتنەوە لەو تاوانانە، دابڕین و دوورکەوتنەوەیـە لـەوەی بـۆی بووەتـە نـەریت و دووربگـریێ لەوانـەی لەدانیشـتن و گفتوگۆکانـدا هۆکـارن بـۆ خراپـەکاری، لەنـەریت و خووەکـانی خراپـەکاریی دابـڕیێ. نـەریت سرووشـتێکی تایبەتە، گەر شەهوەتیشی بێتەپاڵ، ئەوە دوو سەربازی شـەیتان دەردەکـەون و پاڵنەرەکانی ئایینیان بەسەردا زاڵ نابیێ.

**بەشی دووەم ئەوەی ناچێتە خانەی سەرپشکی و سەرپەستبوونەوە،** بەنـدە هیچ چارەیەکی نییە لەسەر خۆی لایبدات، وەك ئەو کۆست و بەلآیانـەی دەسـتی

خـۆی تیـادا نییـە، وەك مردنـی کەسـێکی خۆشەویسـتی، دزینـی سـەروەت و سامانەکەی، نەخۆشکەوتنی و هاوشێوەکانی تر، ئەمەش دوو جۆرە: جۆرێکیان: دەسەڵاتی مرۆڤی تیادا نییە، جۆرێکی تریان لەلایەن مرۆڤـەکانی هاوشـێوەیەوە بەرانبەری دەکرێت، وەك جنێوپێدان و لێدان و هاوشێوەکانی تری ئەم کارانە.

**لـەجۆری یەکەمـدا بەنـدە چـوار حاڵـەت و مـەقامی هەیـە:** کـات و شـوێنی کڕوزانـەوەو شـکایەتکردن و تـووڕە بـوون، ئەمـە کەسـانێك ئـەنجامی دەدات کـەمترین عـەقڵ و ئـاین و جوامێرییـان هـەبێ، کـە گـەورەترین دوو کۆسـت و بەلایەکەیە.

**حاڵەت و مەقامی دووەم:** یان بۆ خوایە یان لەبەر جوامێریی مرۆڤایەتی.

**حاڵەت و مەقامی سێیەم: مەقامی رازیبوونە:** بەرزترە لەمـەقامی ئـارامگرتن، لەبارەی واجیبوونی ئـەم حاڵەتـەوە راجیـاوازیی هەیـە، بـەڵام یەکـدەنگیی هەیـە لەسەر واجیبوونی ئارامگرتن.

**حاڵـەت و مـەقامی چـوارەم: مـەقامی سوپاسـگوزارییە**، بـەرزترە لەمـەقامی رازیبوون، بەڵاو کۆستەکە بەنیعمەت دەبینێ و سوپاسی خوای لەسەر دەکات.

**هەرچـی جـۆری دووەمـە:** ئەوەیـە کـە لەلایـەن خـەڵکییـەوە تووشـی دەبـێ، سەرباری ئەو چوار حاڵەتەی پێشوو، ئەوە چوار حاڵەت و مەقامی تریشی هەیە:

**یەکەم:** شوێن و مەقامی لێبووردن و لێخۆشبوون.

**دووەم:** شـوێنی پـارێزراوێتیی دڵ لەویسـتی تۆڵەکردنـەوەو دڵئـارامبوون بەتۆڵەکردنەوەو بیرکەوتنەوەی تاوانەکە لەهەموو کاتێك و پـێ سـەغڵەت بـوونی، دڵ لەوانە پارێزراو دەمێنێتەوە.

**سێیەم:** شوێنی بینەرو شایەتی قەدەرەکە، ئەگەرچی ستەمکارێك ئەو زیانەی پێـت گەیانـدبێ، بـەڵام ئـەوەی ئـەو رووداوەی بـۆ تـۆ کردبێتـە قـەدەرو لەسـەر دەستی ستەمکارێك ئـەوەی بەسـەرت هێنـابێ سـتەمکار نییـە، ئـازاری خـەڵکیی وەك سەرماو گەرما وەهایە کە مرۆڤ چارەیەکی بەرانبـەر نییـە، کەسـێکیش گـەر لـەئازاری گـەرماو سـەرما تـووڕەبێ هیچـی پـێ نـاکرێ، بـەڵام خـراپ مامەڵـەی قەدەری کردووە ئەگەرچی شێواز و هۆکارەکانیشی جیاوازبێ.

**شوێن و مەقامی چوارەم:** مەقامی چـاکەکردن لەگـەڵ ئـەو کەسـەی خراپـەی بەرانبەرت کردووە، جا ئەم کـارە سـوودو بەرژەوەندییـەکی تێدایـە تـەنیا خـوای گەورە دەیزانێ، جا ئەگەر بەندە ئەم مەقامە بەرزەی لەدەستچوو، بـا بەمەقامـە نزمەکان بۆ خۆی رازیی نەبێ.

## بەش

## دەرمانی دەرد

**بەشـی سـێیەم:** لـەوەی مرۆڤەکـە سەرپشـکانە ئـەنجامی دەدات، بـەڵام گـەر کارەکـە شـوێنی خـۆی گـرت ئـەوکات توانـای چارەسـەرو لادانـی نییـە، نمونـەی عاشـقبوونە، مرۆڤەکـە سـەرەتا ئازادانـە ئـەنجامی دەدات و دواتـر توانـای چارەسەری نییە، وەك خۆنەخۆشخستنە کە هۆکاری نەخۆشیی فەراهەم دەکات،

تووشــــی نەخۆشــیی بـــوو نـــاتوانێ لێـــی رزگـــاری بـــێ، وەك ئـــەوەی کـــە عــەرەقتخواردەوە نــاتوانی رێگریــی بکــەی لەسەرخۆشــبوونت، بۆیــە دەبــێ لەســـەرەتادا خــۆت لەبەردەمیــدا رابگــری، کــە لەسەرەتاشــدا خۆتــت پــێ رانەگیردرا،ئـەوە لەکۆتاییەکەیـدا خـۆت رابگـرەو ملکەچـی پاڵنـەرەکانی هـەواو ئارەزووت مەبە.

شەیتان لێرەدا فێڵێکی سەیری هەیە، ئەو خەیاڵە بـۆ بەنـدە دروسـت دەکـات کە بۆ چارەسەرکردن(دەواو دەرمان) ئاساییە و رێگە دراوە هەنـدێ لـەو حەرامـە بەکاربهێنێ لەنمونەی عەرەق و پیسـی و وەهـای بـۆ دەڕازێنێتـەوە، کـە هەنـدێ لەشەرعناسـان رێگـەی ئـەو کارەیـان داوە، بێگومـان ئـەوە ئەوپـەڕی نەزانییـە، عـەرەق و شـتە پیسـەکان نـەك برینەکـە چارەسـەر ناکـەن بـەڵکو نەخۆشـیی و برینەکە زیاتر دەکەن، چەندە خەڵکانێك هـەبوون بـەوە تیمـاری خۆیانیـان کـرد، کەچـی ئـایین و دونیایـان بەهیلاکـدا چـوو، بـەڵکو دەرمـانی سوودبەخشـی ئـەو نەخۆشییە ئارامگرتن و لەخواترسانە، هەروەك پـەروەردگار دەفـەرموێت:﴿وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ١٨٦﴾ آل عمـران: ١٨٦، واتـا: ئەگەر ئێوە ئـارام بگـرن و پارێزگـار بـن ئـەوە بێگومـان ئـەوە لـە کـارە بـەهێزو گەورەکانە لەو کارانەیە لێبڕانی دەوێ.

هــــەروەها دەفــــەرموێت:﴿ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٩٠﴾ یوسف: ٩٠، واتا: بەڕاستی هەرکـەس خـۆی بپـارێزێ و دان بەخۆیدا بگرێ ئەوسا بەڕاستی خوا پاداشتی چاکەکاران ون ناکات.

بەڕاستی ئارامگرتن و لەخواترسان دەرمانی هەموو نەخۆشییەکن، مرۆڤ بێ ئەو دووانە نایکرێ و لەچارەسەرییەکانی ئایینن.

ئەگەر وترا: ئەگەر کەسێك سەرپێچیکاربێ بەزیادەڕۆیی کردنی لەهۆکار وەرگرتندا،ئایا پاداشتی ئەو ئارامگرتنەی بۆ دەبێ، ئەگەر سەرپشك و ئازادانە نەبوو کارێکی کرد سزا دەدرێت؟

ئەوترێ: بەڵێ گەر بۆ خوای گەورە ئارامی گرت و تەوبەی کرد لەسەر ئەوەی هۆکارێکی حەرامی گرتووەتەبەر، ئەوە لەسەر ئارامگرتنەکەی پاداشت دەدرێت، چونکە بەربەرەکانێی دەروونی خۆی کردووە کە کارێکی چاکە، خوای گەورەش پاداشتی کاری چاك بەفیڕۆ نادات، لەسەر هەر کارێکی خراپیش لێیەوەی سەرچاوە گرتبێ بەڵێ سزا دەدرێ، هەروەك مرۆڤی سەرخۆش گەر لەکاتی سەرخۆشبوونییدا هەر کارێکی خراپ بکات لەسەری سزا دەدرێت، ئەگەر هۆکارەکە حەرام بێ ئەوە سەرخۆشەکە بێ تاوان نییە، بۆیە خوای گەورە سزای مرۆڤ دەدات لەسەر ئەو هۆکارانەی حەرامن و ئەنجامیان دەدات و ئەو ڕووداوانەش کە لەو کارە خراپانەوە سەرچاوە دەگرن، لەوەدایە گەر هەرکەسێك بانگەواز بۆ بیدعەو گومڕاییەك بکات،ئەوە لەخراپەی ئەو کەسانەش بەشدارە کە بەگوێی ئەویان کردووەو شوێنی کەوتوون[1]، چونکە بەهۆی کاری ئەوەوە خەڵکیی شوێنی کەوتوون، بۆیە کوڕە بکوژەکەی ئادەم تاوەکو ڕۆژی قیامەت

---

[1] - بڕوانە ئەو فەرموودەیەی موسلیم(٢٦٧٤)ئیخراجی کردووە لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی: هەرکەسێ بۆ ئیسلام و کاری چاکە بانگەواز بکات، نمونەی پاداشتی ئەوانەی هەیە کە شوێنی دەکەون بێ ئەوەی لەپاداشتی ئەوان کەم بکاتەوە، هەرکەسێکیش بانگەواز بکات بۆ گومڕایی، ئەوە نمونەی سزاو تاوانی ئەوانەی هەیە کە شوێنی دەکەون بێ ئەوەی لەتاوانی ئەوان کەمبکرێتەوە.

لـەتاوانی کوشـتندا بەشـداره[1]، پـەروەردگار دەفـەرموویٚت: ﴿لِيَحۡمِلُوٓاْ أَوۡزَارَهُمۡ كَامِلَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَمِنۡ أَوۡزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيۡرِ عِلۡمٍۗ﴾ النحل: ٢٥، واتا: بـۆ ئەوانەی بـاری گونـاهی خۆیـان بەتـەواوی هـەڵ بگـرن لـە ڕۆژی دوایـی دا لەگـەڵ هەندیٚ لەباری گوناهی ئەوانەی کە ئەمان گومڕایان دەکردن بە بیٚ زانیاری بیٚدار بن زۆر بەدە ئەوەی کە هەڵی دەگرن و دەیگرنە ئەستۆ.

هـــــەروەها دەفـــــەرموویٚت: ﴿وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ﴾ العنکبوت: ١٣، واتا: سویٚند بەخوا(بیٚ باوەڕان)باری گرانی(کوفرو تاوانی)خۆیـان هەڵـدەگرن وە بـاری گرانی(خـەڵکانی)تریش لەگـەڵ بـاری گرانـی خۆیـان دا(هەڵدەگرن).

ئەگەر وترا: بۆ لەکاریٚك تەوبە بکات کە ئـەو نـەیکردووە، مـرۆڤ لەسـەر کاریٚك تەوبـە دەکـات سەرپشـکانە ئـەنجامی دابـیٚ؟ لەوڵامـدا ئـەوتریٚ: تەوبـەکردن بەپەشـیمانیی دەرخسـتن لەسـەر ئـەو کـارەو وەڵام نەدانـەوەی ویسـت و پاڵنەرەکانی تاوانەکەیە، دەروونی لەبـەردەم جڵـەو بکریٚ، گـەر ئـەوەی لیٚیـەوە دروسـتبووە پەیوەنـدیی بەکەسـی تـرەوە هـەبیٚ، ئـەوە تەوبـەکردنی لەوەدایـە بەپیٚی توانا لەسـەر کەسـەکەی تـر لایبـدات و بـۆی راسـتبکاتەوەو ئـەوە لەسـەر خۆی نەهیٚڵیٚ کە خۆی هۆکاری بووە.

تەوبەی کەسیٚك کەهۆکاری بیدعە دروستبوونیٚك بووە، ئەوەیە بانگەواز بکـات کە ئەوەی وتوویەتی و بانگەوازی بۆ کـردووە بیدعـەو گـومڕایی بـووە، راسـتی و

---

[1] – بڕوانە بوخاری(٣٣٣٥) و موسلیم(١٦٧٧) لەئیبن مەسعودەوە(خوای لیٚ رازیی بیٚ).

هیدایەت پێچەوانەی ئەوەیە کە وتوویەتی، بۆیە خوای گەورە مەرجی کردووە لەسەر قبوڵکردنی تەوبەی ئەهلی کیتاب ئەوانەی بەڵگەو نیشانەکانی خوای گەورەیان شاردووەتەوە تاوەکو خەڵکیی پێ لەخشتەببەن، دەبێ خۆیان چاکبکەن و ئەوانەش بۆ خەڵکیی ئاشکرا بکەن کە شاردبوویانەوەو ئەفەرمووێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ١٥٩ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ١٦٠ ﴾ البقـــــرة: ١٥٩ – ١٦٠، واتا: بێ گومان ئەوانەی دەیشارنەوە ئەوەی کە ناردوومانەتە خوارەوە لەئایەتی ڕۆشن و ڕێنمایی دوای ئەوەی کە ڕوونمان کردۆتەوە بۆ خەڵکی لە نامە(ی تەورات و ئینجیل)دا ئەوانە خودا نەفرەتیان لێ دەکات وە نەفرەتکەرانیش نەفرەتیان لێ دەکەن. مەگەر ئەوانەی کە پەشیمان بوونەوە وە کردەوەی باشیان کردبێ و (ئەوەی شاردبویانەوە)ئاشکرایان کردبێ ئا ئەوانە پەشیمانیان لێ گیرادەکەم وە هەر منم گیراکەری میهربان.

هەر ئەمەش مەرج بووە بۆ تەوبەکردنی دووڕووان، ئەوانەی کە کاریان خراپکردنی دەروونی باوەڕدارە لاوازەکان و کەنارگرتن و پەنادانی جولەکەو هاوبەش پەیداکەرانی دوژمنانی پەیامبەری خوا بوو، بۆ ریاو ناوبانگیی وەك موسڵمان خۆیان دەرخستبوو، مەرجی قبوڵکردنی تەوبەیان ئەوەبوو لەجیاتی خراپەکارییەکانیان چاکەکاریی بکەن و لەجیاتی پەناگرتن بەبێباوەڕانی ئەهلی کیتاب و هاوبەش پەیداکەران بەخوا پەنابگرن و لەجیاتی ریاو ناوبانگیی بۆ خوا دڵسۆز بن، مەرج و حەقیقەتی تەوبە ئاوەهایە، تەنیا پشت بەخوای گەورە دەبەستێن.

## تەوەری چواردەیەم

## ناڕەحەتترین ئارامگرتن لەسەر دەروونەکان

سەختی و گرانیی ئارامگرتن، بەپێی هێزی پاڵدەری کردار و ئاسانبوونێتی بەسەر بەندەوە، ئەگەر هێزی پاڵنەرو ئاسانبوونی کار لەکاردا کۆبوونەوە، ئەوکات ئارامگرتن لەسەر کەسی ئارامگر سەختترین شتێك ئەبێ، ئەگەر ئەو دووانە پێکەوە بوونیان نەبێ ئارامگرتنیش ئاسان ئەبێ، ئەگەر یەکێك لەو دوو شتە بوونیان هەبوو، هێزی پاڵنەر یان ئاسانبوونی کارەکە، ئەوە لەڕوویەکەوە ئارامگرتن سووك و لەڕوویەکی ترەوە سەختە.

هەرکەسێ حەزو پاڵنەری کوشتن و دزیکردن و عەرەقخواردنەوەو خراپەو داوێنپیسیی نەبێ و ئەو کارانەی بۆ ئاسان نەبێ، ئەوە ئارامگرتنیشی بەرانبەر ئەو کارانە ئاسانترین شتێکە، هەرکەسێکیش پاڵنەرەکانی بۆ ئەو کارانە توندو بەهێزبن و ئەنجامدانیشی بۆی ئاسان بێ، ئەوە ئارامگرتنی سەختترین شتێکە، بۆیە ئارامگرتنی سوڵتان و دەسەلات لەخۆ بەدوورگرتن لەستەم و گەنج لەداوێنپیسی و دەوڵەمەند لەخۆشی و ئارەزووەکان ،لای خوای گەورە کارێکی گەورەیە.

لەموسنەدو ئەوانی تردا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی:«عَجِبَ رَبُّكَ مِنْ شَابٍّ لَيْسَتْ لَهُ صَبْوَةٌ»[1] ،واتا: خوای گەورە

---

[1] - صەحیحە، ئەحمەد(٤/ ١٥١، و تەبەرانی لە المعجم الكبير(١٧/ ٢٦٦/ ٨٥٣) ئیخراجیان کردووە لەفەرموودەی عوقبەی کوڕی عامرەوە(خوای لێ رازیی بێ).

سەیری بەگەنجێك دێت حەزو ئارەزوو شەهوەتی نەبێ، بۆیە ئەو گەنجە شیاوی ئەو پلەیەیە کە خوای گەورە لەڕیزی ئەو حەوت کۆمەڵەدا دایناون کە ئەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە[1]، چونکە ئارامگرییەکی تەواوی هەبووە، ئارامگرییەکی زۆر سەخت، چونکە ئارامگرتنی پێشەواو دەسەلآتدار بەدادپەروەرییکردن و ئارامگرتنی گەنج لەبەردەم خواپەرستی و دژایەتیکردنی هەواو ئارەزوو، ئارامگرتنی پیاو بەپەیوەستبوون بەمزگەوت و ئارامگرتنی خێرومەند بەشاردنەوەی خێرەکانی و ئارامگرتنی مرۆڤ لەبەردەم کاری خراپ و داوێنپیسی کە داواکەر جوان و خاوەن پۆست و ناوبانگیی بێ و ئارامگرتنی ئەوانەی لەبەر خوا یەکتریان خۆشدەوێ لەکاتی کۆبوونەوەو لەیەك دابڕان و ئارامگرتنی کەسێك لەترسی خوا گریانەکەی دەشارێتەوەو ناهێڵێ خەڵکیی پێی بزانن، ئەوە لەسەختترین جۆرەکانی ئارامگرتنن.

لەبەرئەوەیە مرۆڤی بەتەمەنی داوێنپیس و پادشای درۆزن و هەژاری لووتبەر سەختترین سزایان هەیە[2] چونکە بەئاسان دەتوانن لەبەردەم شتە حەرامکراوەکاندا خۆڕاگرین و لێی دوورکەونەوەو پاڵنەریان بۆ ئەو کارانە کەمە، دەستبەرداربوونیان بۆ ئەو ئارامگرتنە کەمە، بەڵگەی یاخیبوونیانە لەخوای گەورە.

---

[1] - بڕوانە ئەوەی بۆخاری(٦٦٠) و موسلیم(١٣٠١) گێڕاویانەتەوە لەئەبی هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ).

[2] - بڕوانە ئەو فەرموودەیەی موسلیم(١٠٧)ئیخراجی کردووە لەفەرموودەکانی ئەبو هورەیرەیە(خوای لێ رازیی بێ).

لەمەدایە ئارامگرتن لەبەردەم تاوانەکانی زمان و داوێن سەختترین جۆرەکانی ئارامگرتنە، چونکە پاڵنەریان زۆرەوەو ئاسان ئەنجام دەدرێن، تاوانەکانی زمان میوەی مرۆڤە: وەك دوو زمانی و غەیبەتکردن و درۆکردن و رووپامایی و خۆهەڵنان و گێڕانەوەی قسەی خەڵکی و تانەدان لەو کەسەی رقت لێیەتی و پیاهەڵدانی ئەو کەسەی خۆشتدەوێ و هاوشێوەکانی تر، هێزی پاڵدان بۆ ئەو شتانە هەڵدەقوڵێ و جووڵەی زمانیش بۆیان ئاسانە، بەوە ئارامگرتن لاواز ئەبێ، لەمەدایە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەموعاز ئەفەرمووێ: "أَمْسِكْ عَلَيْكَ لِسَانَكَ"،واتا: زمانت جڵەوگیر بکە. موعاز وتی: ئێمە لێپرسینەوە دەکرێین لەسەر ئەو شتانەی کە ئەیڵێین؟ پەیامبەریش فەرمووی: "وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ إِلَّا حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ"[1]،واتا: ئایە خەڵکیی لەبەر کونی لووتیان دەخرێنە دۆزەخەوە، تەنیا دەسهاتی زمانیانە ئەیانخاتە دۆزەخەوە.

بەتایبەت گەر تاوانەکانی زمان بۆ بەندە بووبێتە نەریت و خوو، ئەوکات سەختە بتوانێ ئارامبگرێ و خۆی لەتاوانەکانی زمان بەدووربگرێ، بۆیە کەسی وەها دەبینی شەونوێژ دەکات و بەڕۆژ بەڕۆژووەو خۆی بەدوور دەگرێ بۆ ساتێکیش بێ لەسەر سەرینی ئاورێشم پاڵکەوێ، بەلاّم زمانی بەڕەلاّ دەکات لەغەیبەت و دووزوومانی و قسە کردن لەسەر ناموسی خەڵك، رەنگە لەسەر خەڵکانی چاك و زانا بەخواو ئایین قسە بکات و بێ زانست و زانیاریی قسە لەسەر خوا دەکات.

---

[1] - صەحیحە، ترمیزی(٢٦١٦) و ئیبن ماجە(٣٩٧٣) و ئەحمەد(٥/ ٢٣١)ئیخراجیان کردووە.

زۆر کەس دەبینی خۆی بەووردەگریێ لەوردە حەرام و دڵۆپێك عەرەق و لەنمونەی سەرە دەرزیەك لەپیسیی نزیك نابێتەوە، بەلاَم بیێ خەمە لەوەی داوێنی لەحەرام بەکاربهێنیێ، هەروەك دەگێڕدرێتەوە پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانەدا(نامەحرەم) بەتەنیا دەبیێ، کاتێك لەگەڵ ئافرەتەکەدا داوێنپیسیی دەکات ئەڵیێ: تۆ چیت روومەتت داپۆشە، نازانی تەماشاکردنی روومەتی نامەحرەم تاوانە ! !

پیاوێك لەبارەی خوێنی مێش لەعبداللەی کوڕی عومەر دەپرسیێ، ئەویش ئەڵیێ: بڕواننە ئەمانە، لەبارەی خوێنی مێشەوە لێم دەپرسن، لەکاتێکدا ئەوان بوون کچەزاکەی پەیامبەری خوایان کوشت[1] ! !

نزیك بەم گێڕانەوەیە بۆم روویداوە: لەکاتی ئیحرام کردندابووم کۆمەڵێك ئەعراب هاتنەلام، ناسراوبوون بەخەڵك کوشتن و هەڵکوتانەسەر ماڵی خەڵکی، پرسیان ئایە حەلاَڵە کەسێك لەئیحرامدابیێ ئەسپیێ بکوژیێ؟ منیش وتم: ئەمە چی قەومێکی سەیرن، خۆیان بەدوورناگرن لەکوشتنی ئەو مرۆڤانەی خوای گەورە کوشتنیانی حەرام کردووە کەچی پرسیار لەبارەی کوشتنی ئەسپیێ دەکەن لەکاتی ئیحرامدا ! !

مەبەست ئەوەیە جیاوازیی توونـدی و سەختیی ئارامگرتن لەجۆرەکانی ئارامگرتندا بەپێی جیاوازیی پاڵنەرەکانە، بەپێی بەهێزی و لاوازیی پاڵنەرەکانەوە ئارامگرتنەکان جیاوازن.

---

[1] - بڕوانە ئەوەی بوخاریی ئیخراجی کردووە(٥٩٩٤).

لەعەلییەوە(خوای لێ رازیی بێ) دەگێڕدرێتەوە کە فەرموویەتی: ئارامگرتن سێ جۆرە: ئارامگرتن لەسەر کۆست و بەلاّ، ئارامگرتن لەسەر فەرمانەکان، ئارامگرتن لەدوورگرتن لەتاوان، هەرکەسێ لەسەر کۆست و بەلاّ جوان ئارامبگرێ،ئەوە خوای گەورە سێسەد نمرەی بۆ دەنووسێ، هەرکەسێ لەسەر گوێڕایەڵیی خوای گەورە ئارامبگرێ و وەك ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێکردووە بەجێیبگەیەنێ شەسەد نمرەی بۆ دەنووسێ، هەرکەسێکیش لەبەرانبەر تاوان بەدووربێ لەترسی خواو بەئومێدی پاداشتی خوایی، ئەوە خوای گەورە نۆسەد نمرەی بۆ دەنووسێ[1].

مەیمونی کوڕی میهران[2] ئەڵێ: ئارامگرتن دوو جۆرە، ئارامگرتن لەسەر کۆست و بەلاّ جوانە، باشتر لەوە ئارامگرتنە لەدووربوون لەتاوان[3].

فوزەیل لەبارەی ئەم ئایەتەوە:﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡ ﴾ الرعد: ٢٤ ئەڵێ، ئەو باوەڕدارانە ئارامگربوون لەسەر ئەو شتانەی فەرمانکرابوو ئەنجامی بدەن و ئارامگربوون لەدوورگرتن لەو شتانەی لێیان حەرامکرابوو[4]، وەك ئەوەی ئارامگرتن لەسەر کۆست و بەلاّی کردبێتە بەشێکی فەرمانپێکراوەکان، خوای گەورەش زاناترە.

***

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئیخراجی کردووە لە(الصبر٢٤)، بڕوانە: الموضوعات ی ئیبن ئەلجەوزی(٣/ ١٨٤).

[2] - مەیمونی کوڕی میهران ئەلڕەقی، ئەبو ئەیووب، شەرعناس و یەکێك بووە لەدادوەران(ساڵی٤٠ك لەدایکبووەو ساڵی١١٨ك مردووە).

[3] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئیخراجی کردووە لە(الصبر١٨).

[4] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئیخراجی کردووە لە(الصبر٢٩)،بەیهەقیش لە(الشُّعَب).

# تەوەری پانزەیەم

## ئەوەی لەبارەی ئارامگرتنەوە لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە

پێشەوا ئەحمەد(بەڕەحمەت بێ)ئەڵێ: خوای گەورەی لەنەوەد شوێنی قورئاندا باسی ئارامگریی کردووە[1]. ئێمەش لێرەدا چەند جۆرێکی ئەو ئارامگرییە باسدەکەین کە لەقورئاندا هاتووە:

**یەکەم: ئەوەی فەرمانی پێکراوە:** وەك دەفەرمووێ: ﴿ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ ﴾ النحل: ١٢٧، واتا: (ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)دان بەخۆتدا بگرە ئارام گرتنەکەشت هەر بە(یارمەتی)خوایە.

**دووەم: نەهی و ڕێگریکردن لەوەی دژە بەوە:** وەك دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا تَسۡتَعۡجِل لَّهُمۡۚ ﴾ الأحقاف: ٣٥، واتا: پەلە مەکە بۆ(سزادان)،هەروەها دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ ﴾ آل عمران: ١٣٩، واتا: سست و دڵ لاواز مەبن وە غەمبار مەبن.

هەموو ئەوەی نەهی لێکراوە، دژە بەئارامگرتنی فەرمانکراو.

**سێیەم: رزگاری و سەرفرازیی پێوەی پەیوەستکراوە:** وەك دەفەرمووێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۝٢٠٠ ﴾ آل عمران: ٢٠٠، واتا: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە خۆ گربن و لەخۆگری دوژمن خۆگرتربن و لەسەنگەردا ئێشك بگرن و لەخوا بترسن بۆ ئەوەی رزگاربن.

---

[1] - بڕوانە: مدارج السالكين(٢/ ١٥٢).

بۆیە دەبینین سەرفرازیی پەیوەست کردووە بەکۆی ئەوانەی فەرمانی داوە ئەنجام بدرێن.

**چوارەم:باسکردن لەوەی پاداشتی ئارامگران چەندان ئەوەندەی کەسانی ترە:** وەك دەفەرموویت:﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُواْ ﴾ القصص: ٥٤، واتا: ئەوانە دووجار پاداشتیان پێ دەدرێ لەبەر ئەوەی خۆیان گرت و بەئارام بوون. هەروەها دەفەرموویت:﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾ ﴾ الزمر: ١٠، واتا: بەڕاستی تەنها دان بەخۆدا گران بێ ژمارە پاداشتیان دەدرێتەوە.

سولەیمانی کوڕی ئەلقاسم ئەڵێ: دەزانرێ پاداشتی هەموو کارێك چەندە تەنیا ئارامگرتن نەبێ. پەروەردگار دەفەرموویت:﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾ ﴾ الزمر: ١٠، ئەڵێ: وەك ئاوی لەبەر ڕۆیشتووی بەردەوامە[1].

**پێنجەم:** پەیوەستکردنی پێشەوایەتییکردنی ئایین و دڵنیایی بەئارامگرییەوە، خوای گەورە دەفەرموویت:﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُواْ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ السجدة: ٢٤، واتا: لەنێو ئەواندا پێشەوایانێکمان دانا ڕێنمونی خەڵکیان دەکرد بەفرمانی ئێمە کاتێ خۆیان گرت و لەئایەتەکانی ئێمە دڵنیابوون(باوەڕی پتەویان هێنا).

کەوابوو بەئارامگرتن و دڵنیاییەوە پێشەوایەتیکردن لەئایین دێتەدی.

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئیخراجی کردووە لە الصبر٢٠.

شەشەم: بە لەتەکدابوونی خوایی قازانج دەکەن، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ۝١٥٣ ﴾ البقرة: ١٥٣، واتا: بەڕاستی خوا لەگەڵ خۆڕاگرانە.

ئەبو عەلیی ئەلدەقاق ئەڵێ: ئارامگران شکۆی هەردوو دونیایان بردووەتەوە، چونکە بەهاوەڵێتیکردنی خوای گەورە گەیشتوون[1].

حەوتەم: سێ شتی بۆ ئارامگران کۆکردووەتەوە کە بۆ هیچ کەسێکی تری کۆنەکردووەتەوە: سەلاتی خوا بۆیان، بەزەیی بەرانبەریان، ڕێنیشاندەرییکردنیان، پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ۝١٥٥ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ۝١٥٦ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ۝١٥٧﴾ البقرة: ١٥٥ – ١٥٧، واتا: جا مژدە بدە بەخۆڕاگران. ئەوانەی کە لەکەڵ دووچاری سەختی یەك بوون دەڵێن ئێمە هەر هی خواین و هەر بۆلای ئەو دەگەڕێینەوە. ئا ئەوانە درودوو بەزەیی بەسەر ئەواندا دەبارێ لە لایەن پەروەردگاریانەوە و ئەوانە ئەو کەسانەن هیدایەتیان وەرگرتووە.

هەندێ پێشین لەکاتی کۆست و بەلاو مەینەتییدا کە دڵدانەوە کراون وتوویانە: گەر ئارام نەگرین چی بکەین، خوای گەورە لەسەر ئارامگرتن بەڵێنی سێ شتی پێ داوین، هەریەك لەو سێ شتە لەدونیاو ئەوەی تیایدایە خێرو سوودی زیاترە.

[1] – الرسالة القشيرية(ص١٨٥).

**هەشتەم:** خوای گەورە ئارامگرتنی کردووەتە پشتیوانی و ئامادەسازی، فەرمانی داوە پشت بەئارامگریی ببەستریّ و ئەفەرمووێ: ﴿ وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ ﴾ البقرة: ٤٥، واتا: پەنا ببەنە بەر ئارام گرتن و نوێژ.

بۆیە هەرکەسێ ئارامگریی نەبێ پشتیوانێکیشی نییە.

**نۆیەم:** خوای گەورە سەرکەوتنی بەئارامگری و لەخواترسانەوە پەیوەست کردووەو ئەفەرمووێ: ﴿بَلَىٰٓ ۚ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَـٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَـٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾ ﴾ آل عمران: ١٢٥، واتا: بەلێ گەر ئارام بگرن وە لە خوا بترسن پەلامارتان بدەن لەم کاتەدا پەروەردگارتان کۆمەکتان بکات بە پێنج هەزار لە فریشتە نیشانەدارەکان.

پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: "وَاعْلَمْ أنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ"[1]،واتا: بزانە کە سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتندایە.

**دەیەم:** خوای گەورە ئارامگری و لەخواترسانی کردووەتە قەڵغانێکی گەورە لەبەرانبەر فێڵ و تەڵەکەی دوژمندا: چی شتێك لەو دووانە باشترین قەڵغان و پارێزیی ئەبێ بۆ بەندە، پەروەردگار ئەفەرمووێت: ﴿ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا ۗ ﴾ آل عمران: ١٢٠، واتا: ئەگەر ئێوە بەئارام بن(لەسەر گوێڕایەڵی خوا)و لەخوا بترسن ئەوان هیچ زیانێکتان پێ ناگەیەنێت.

---

[1] - صەحیحە، ئەحمەد(١/ ٢٩٣) و تەبەرانی لە: الدعاء(٤٢)ئیخراجی کردووەو حافیظ ئیبن حەجەریش لە:موافقة الخبر الخبر(١/ ٣٢٧)حوکمی (حسن)ی پێ داوە.

**یانزەیەم:** خوای گەورە هەواڵیداوە کە فریشتەکان بەهۆی ئارامگرتنی بەندەکانەوە لەبەهەشتدا سەلام لەبەندەکان دەکەن، هەروەك فەرموویەتی: ﴿وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَـٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ۚ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾﴾ الرعد: ٢٣ – ٢٤، واتا: فریشتەکانیش دەچنە ژوورەوە بۆ لایان لە هەموو دەرگایەکەوە. پێیان دەڵێن: سەلامتان لێ بێ چونکە ئارامتان گرت(لە دنیادا) جا چەند سەرئەنجامێکی چاکتان بوو.

**دوانزەیەم:** خوای گەورە ڕێگەی پێداون بەئەندازەی ئەوەی سزا دراون تۆڵە بکەنەوە، پاشان بەوپەڕی دووپاتکردنەوە سوێند دەخوات کە ئارامگرتن بۆیان باشترە و ئەفەرموێت: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾﴾ النحل: ١٢٦، واتا: ئەگەر تۆڵەتان سەندەوە ئەوە بە ئەندازەی ئەو ستەمەی دژتان کراوە تۆڵە بکەنەوە وە ئەگەر ئارام بگرن ئەوە باشترە بۆ ئارام گران.

بڕوانە ئەو سوێندەی خوای گەورە بەپیتی(واو)پاشان پیتی(لام) کە لەوەڵامی سوێندەکەدا هاتووە.

**سیانزەیەم:** خوای گەورە، لێخۆشبوون و پاداشتی گەورەی لەسەر ئارامگرتن و کاری چاك ڕیزبەند کردووەو ئەفەرمووێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١١﴾﴾ هود: ١١، واتا: جگە لەوانەی کە بەئارام و خۆگر بوون و کردەوە چاکەکانیان بەجێ هێنا ئەوانە بۆیان هەیە لێبوردن و پاداشتی گەورە.

ئەوانە بەشی جیاکراوەی خوای گەورەن لەجۆری مرۆڤی سەرزەنشتکراو کە بەبێ ئومێدو بێباوەڕیی لەکاتی کۆست و ناخۆشی و خۆهەڵکێشان و

شانازییکردن لەکاتی نازونیعمەتدا وەسفکراون، بێگومان تەنیا بەئارامگرتن و کاری چاکە مرۆڤ لەو وەسفە خراپانە رزگاری دەبێ، هەر بەو دووانەش لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە وەدەستدەخرێت.

**چواردەیەم:** خوای گەورە ئارامگرتنی کاتی کۆست و ناخۆشییەکانی بەکارە سەخت و گرانەکان داناوەو ئەفەرمووێ: ﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿٤٣﴾ ﴾ الشوری: ٤٣، واتا: هەر کەس خۆگرو لێبوردە بێ بەڕاستی ئەمە لە کارە پڕ بایەخ و پەسەندەکانە.

هەروەها لوقمان بەکوڕەکەی خۆی ئەڵێ: ﴿ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ ﴾ لقمان: ١٧، واتا: ئەی کوڕە شیرینەکەم نوێژ بەجێ بێنە و فەرمان بکە بەچاکە و بەرگری بکە لەخراپە هۆگرو بە ئارام بە لەسەر هەر بەڵاو ناخۆشی یەك تووشت دێ بێگومان ئەوە لەو کارە گەورانەیە کە خوا پێویستی کردووە.

**پانزەیەم:** خوای گەورە بەڵێنی سەرکەوتنی بەباوەڕداران داوە، وتەو فەرمایشتی پێشترە بۆیان، وتەی جوانە، هەواڵی داوە بەوەی بەئارامگرتن دەستیدەخەن و فەرموویەتی: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُوا۟ ۖ ﴾ الأعراف: ١٣٧، واتا: بەڵێنی هەرەجوانی پەروەردگارت بە تەواو هاتەدی بۆ نەوەی ئیسرائیل بەهۆی ئارامگری یانەوە(لەسەر ناڕەحەتی یەکان).

**شانزەیەم:** خوای گەورە خۆشەویستیی خۆی بەئارامگرتنەوە پەیوەستکردووەو تایبەتی کردووە بۆ ئارامگران و ئەفەرمووێ: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا۟ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا۟ وَمَا

ٱسۡتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ ﴾ آل عمــران: ١٤٦، واتــا: زۆر لەپێغەمبــەران جەنگ و كوشتاریان كردووە لەگەڵیانـدا زۆر لـەزانایان و خواناسـان جـا سسـت و دەستە پاچە نەبوون بەهۆی ئەوەی كە دووچاریان بـووە لـەڕێ ی خـوادا وە بـێ هێزو لاواز نەبوون وە سەریان شۆڕ نەكرد بـۆ دوژمـن وە خـوا خـۆڕاگرانی خـۆش دەوێت.

**حەڤدەیەم:** خوای گەورە لەبارەی تایبەتمەندییە چاكەكانەوە هەواڵی داوە كە تەنیا ئـارامگران پێـی دەگـەن:﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗاۚ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾ القصــص: ٨٠، واتا: ئەو كەسانەی كە زانستیان پێ درابوو وتیان هاوار بۆ ئێوە پاداشتی خوا(لە ڕۆژی دواییدا) لەوە چاكترە بۆ ئەو كەسانەی بڕوایان هێناوەو كردەوەی چاكیان كردووە وە كەس ئەو(ووتەی زانایانە)وەرناگرێ جگە لە خۆڕاگران.

لەسورەتی سەجدەشدا فەرمانی داوە بەچاكە وەڵام بدەنەوە، بەوە چی ڕق و دوژمنایەتییــەك لــەنێوان مرۆڤەكــەو كەســێكی تــردا هــەبێ دەگــۆڕێ بــۆ خۆشەویستی، پاشان دەفـەرمووێت:﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ﴿٣٥﴾ ﴾ فصلت: ٣٥، واتا: بەم ئاستـە ناگـات كەسـانێ نـەبێ كە خۆ ڕادەگرن و بە ئارامن وە پێ ی ناگات مەگەر كەسێ خاوەنی بەشی هـەرە گەورە بێت لە پاداشت.

**هەژدەیەم:** خوای گەورە هەواڵی داوە كە بەئایەت و نیشانەكانی خۆی سوودو پەند دەداتە زۆر ئارامگرە سوپاسگوزارەكان و ئەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا

مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَآ أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَـٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٥﴾ ﴾ إبراهيم: ٥،

واتا: سوێند بەخوا بەڕاستی مووسامان نارد بە موعجیزەکانمانەوە(فەرمانمان پێ دا) کە گەلەکەت ڕزگار بکە لە تاریکیەکانەوە بۆ ڕووناکی و ئامۆژگاریان بکە بە(ڕووداوەکان لە)ڕۆژەکانی خوادا(یا بەهرەکانی خوایان بیر بخەرەوە)بەڕاستی لەو(بیر خستنەوە)دا پەندو بەڵگەی زۆر هەیە بۆ هەموو خۆڕاگرێکی سوپاس گوزار.

لەبارەی لوقمانیشەوە دەفەرمووێت:﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَـٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾ ﴾ لقمان: ٣١، واتا: ئایا نەتزانیوە(نەت دیوە) کە کەشتیەکان بە چاکەو فەزڵی خوا دەڕۆن لە دەریادا بۆ ئەوەی هەندێ لە نیشانەکانی خۆیتان نیشان بدات چونکە بەڕاستی لەمەدا(کەباسکرا)چەند بەڵگەیەك هەیە بۆ هەموو ئارامگرێکی شوکرانە بژێر.

لەچیرۆکی سەبەئیشدا ئەفەرمووێت:﴿ فَجَعَلْنَـٰهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَـٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَـٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾ ﴾ سبأ: ١٩، واتا: ئێمەش کردمانن بە داستانێ لەناو خەڵکدا بیگێڕنەوە پرژو بڵاومان کردن(بە وڵاتاندا)بەوپەڕی پرژو بڵاوکردن بەڕاستی لەو بەسەرهاتەدا چەند نیشانە هەیە بۆ هەموو زۆر خۆگری شوکرانە بژێر.

هـــەروەها دەفـــەرمووێت:﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ ﴿٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣٣﴾ ﴾ الشـــوری: ٣٢ – ٣٣، واتـــا: لەبەڵگەکانی(دەســـەڵاتی)خوایە کەشـــتیانی وەك شاخەکان لەدەریادا دەڕۆن. ئەگـەر خـوا بیـەوێ بـا ڕادەگـرێ ئـیتر کەشـتیەکان بەســەر پشـتی دەریاکـەوە دەوەسـتن بەڕاسـتی ئەوەی(کـە بـاس کرا)چـەندین بەڵگەو نیشانە هەیە بۆ ئارام گرێکی سوپاس گوزار.

ئەمە چوار شوێنی قورئانە، بەڵگە دەدەن لەسەر ئەوەی بەڵگـەو نیشـانەکانی خوای گەورە تەنیا ئارامگرو سوپاسگوزاران سوودو پەندی لێ وەردەگرن.

**نۆزدەیەم:** خوای گـەورە ستایشـی ئـەیووبی بەنـدەی خـۆی کـردووە بـەوەی لەسەر ئارامگرتنەکەی باشترین پاداشتی دەداتەوە، لەو بارەیـەوە فەرموویـەتی: ﴿ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا ۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٤٤﴾ ﴾ ص: ٤٤، واتا:بەڕاســـتی ئێمـــە ئەو(ئـەیوب)مان بـە خـۆگر بینـی چ بەندەیـەکی چـاك بـوو بەڕاسـتی ئـەو زۆر گوێڕایەڵ و ڕوو لەخوا بوو.

کە خوای گەورە ئەیووبی بینی ئـارامگرە، وەسـفی باشـترین بەنـدەی پـێ دا، ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێ گـەر هەرکەسـێ لەتاقیکردنـەوەدا ئـارام نەگرێ،ئـەوە خراپترین بەندەیە.

**بیستەم:** خـوای گـەورە بڕیـارێکی گشـتیی داوە بـەبڕیاری دۆڕان و زیـانکردن بەسـەر هەرکەسێکدا بـاوەڕ نـەهێنێ و حـەقناس و ئـارامگر نـەبێ، ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێ تەنیـا حەقناسان و ئارامگران براوەن، پـەروەردگار دەفـەرمووێت:

﴿ وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ٣ ﴾ العصر: ١ – ٣، واتا: سوێند بەکات. بێگومان هەموو خەڵکی لە زیاندایە. مەگەر ئەوانەی کە بڕوایان هێنابێ و کردەوە چاکەکانیان کردبێ وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئایینی ڕاست وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئارام گرتن.

لەمەدا شافیعیی وتوویەتی:گەر تەواوی مرۆڤ بیڕوانیبایەتە ئەم ئایەتەو بیریان لێ بکردبایەتەوە ئەوە بەسیان بوو، کەمالی بەندە لەتەواو ڕێککردنی دوو هێزیدایە: هێزی زانست و هێزی کار، ئەوانیش ئیمان و کاری چاکەن، ئینجا پێویستی بەوەیە دەروونی خۆی ڕێك و کامڵ بکات و کەسانی تریش کامڵ بکات، ئەویش پەیوەستبوونە بەحەق و ئارامگرتنەوە، ئەو کۆڵەکەو پێگەیەی ئەوەی لەسەر رادەوەستێ ئارامگرتنە.

**بیست و یەکەم:** خوای گەورە خەڵکانی دەستە راستی تایبەت کردووە بەوەی خەڵکانی ئارامگرو بەبەزەیین، ئەو دوو تایبەتمەندییەیان تێدایەو کەسانی تریشیان بەو دوو تایبەتمەندییە ئامۆژگاری و وەسێت کردووە:﴿ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ ١٧ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ١٨ ﴾ البلد: ١٧ – ١٨، واتا: سەرەڕای ئەمانەش لەو کەسانە بێ کە بڕوایان هێنابێ و ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بەئارامگرتن و ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە بەزەیی و میهرەبانی. ئەوانە هاوەڵانی دەستی ڕاستن.

ئەمە تایبەت کراوە بەخەڵکانی دەستە راست،ئەوانەی ئەو دوو وەسفەیان راپەڕاندووە. خەڵکیی بەنیسبەت ئەو دوو وەسفەوە چوار بەشن،ئەوانەی ئەو دوو وەسفەیان هەیە باشترینی بەشەکانن، خراپترینیان ئەوانەیانن کە ئارامگرییان نییەو سۆزو بەزەییان لەدڵدا نییە، لەوە خوارتر ئەوانەی ئارامگرییان هەیە بەڵام سۆزیان لا پەیدا نابیّ، بەشی چوارەم ئەوانەن کە سۆزو دڵنەرمییان هەیە بەس ئارامگرییان نییە.

**بیست و دووەم:** خوای گەورە ئارامگریی پەیوەست کردووە بەپایەکانی ئیسلام و تەواوی مەقامەکانی ئیمانەوە: بەنوێژەوە پەیوەستی کردووەو ئەفەرمووێ:﴿ وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ ﴾ البقرة: ٤٥، واتا: پەنا ببەنە بەر ئارام گرتن و نوێژ.

بەتەواوی کارە چاکەکانەوە پەیوەستی کردووە:﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ هود: ١١، واتا: جگە لەوانەی کە بەئارام و خۆگر بوون و کردەوە چاکەکانیان بەجیّ هێنا.

کردوویەتییە هاوەڵی لەخواترسان وەك دەفەرمووێت:﴿ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ ﴾ یوسف: ٩٠، واتا: بەڕاستی هەرکەس خۆی بپارێزێ و دان بەخۆیدا بگرێ.

کردوویەتییە هاوەڵی سوپاسگوزاری:﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ۝٥ ﴾ إبراهيم: ٥، واتا: بەڕاستی لەو(بیر خستنەوە)دا پەندو بەڵگەی زۆر هەیە بۆ هەموو خۆڕاگرێکی سوپاس گوزار.

کردوویەتییە هاوەڵی سۆزو بەزەیی:﴿ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ ﴾، کردوویەتییە هاوەڵی دڵنیایی، وەك دەفەرمووێت:﴿ لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ۝٢٤ ﴾ السجدة: ٢٤، واتا: کاتێ خۆیان گرت و لەئایەتەکانی ئێمە دڵنیابوون(باوەڕی پتەویان هێنا).

هەروەها کردوویەتییە هاوەڵی ڕاستگۆیی و ئەفەرمووێ:﴿ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ ﴾ الأحزاب: ٣٥، واتا: پیاوە ڕاست گۆکان و ئافرەتە ڕاست گۆکان و پیاوان و ئافرەتانی بەئارام.

خوای گەورە ئارامگریی کردووەتە هۆی خۆشویستنی خۆی و لەتەکابوون و سەرخستن و پشتیوانیکردن و باشترین پاداشت، دەستخستنی هەندێ لەوانەش بەسە بۆ شەرەف و ڕێزداربوون، خوای گەورەش زاناترە.

***

## تەوەری شانزەیەم

## ئەوەی لەدەقەکانی سووننەتەوە لەبارەی ئارامگرییەوە هاتووە

لەصەحیحەیندا فەرموودەیەك هاتووە ئەنەسی کوڕی مالیك(خوای لێ رازیی بێ)دەیگێڕێتەوە، کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)هاتەلای ئافرەتێك کە لەسەر منداڵەکەی دەگریا، پێی فەرموو:"اتقي الله واصْبِري"،واتا: لەخوا بترسێ و ئارامبگرە. ئافرەتەکە وتی: تۆ چی شتێك لەبارەی کۆست و نەهامەتیی منەوە دەزانی و ئازاری منت هەیە؟ کە پەیامبەر رۆیشت بەئافرەتەکەیان وت: ئەوە پەیامبەری خوا بوو کە تۆ بەو جۆرە وەڵامت دایەوە، ئەویش وەك ئەوەی مەرگی بەسەردا هاتبێ هاتەبەردەمماڵی پەیامبەرو هیچ دەرگاوانێکی نەبینی و وتی:ئەی پەیامبەری خوا، من تۆم نەناسییەوە، پەیامبەریش فەرمووی:«إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُوْلَى»[1]، واتا: ئارامگرتن لەساتی یەکەمی کۆست و بەڵاکەدایە.

ئەو فەرمایشتەی پەیامبەر، نمونەی فەرمایشتێکی دیکەیەتی کە فەرموویەتی:«لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ ، وَلَكِنَّ الشَّدِيدَ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ»[2]،واتا: کەسی بەهێز ئەوە نییە کە پلە دەکات و لەزەوی نادرێ،بەڵکو بەهێز ئەو کەسەیە لەکاتی توورەییدا جڵەوی دەروونی خۆی دەکات.

بێگومان کۆستی کتوپڕ ترس و راچەنینی لەگەڵدایە، حاڵەتێکی سەخت و جەرگبڕە، بۆیە ئارامگرتن لەو کاتەدا ناڕەحەتییەکانی کۆست و مەینەتییەکە

---

[1] – بوخاری(١٢٥٢) و موسلیم(٩٢٦)ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٦١١٤) و موسلیم(٢٦٠٩)ئیخراجیان کردووە لەفەرموودەی ئەبی هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ).

کەم دەکاتەوە، بەردەوامبوونی ئارامگریی ئەوەی لەسەر سووك دەکاتەوە. لەبەر ئەوەی دڵ جێگەی کۆست و نەهامەتیی نییە، ئەوە کاتێك کۆستێکی بەسەردا دێت نارەحەت دەبێ، ئا ئەوەیە شۆك و نارەحەتیی یەکەم.

بەڵام کە نارەحەتییەکانی دوای کۆستی یەکەم بارگرانیی کەمترو حاڵەتەکە لەدڵدا جێگەی گرتووە، ئەزانێ چارە نییەو ئارامگرتنەکەی شێوە ناچارانە ئەبێت، ئەو ئافرەتەش کە زانی کرۆزانەوەو گریانەکەی هیچ سوودێك ناگەیەنن هاتەلای پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)و داوای لێبووردنی کرد، وەك ئەوەی بەپەیامبەری وتبێ: وا ئارام دەگرم، پەیامبەریش هەواڵی پێدا کە ئارامگرتن لەسەرەتای ناخۆشییەکەدایە.

هەمان ئەم واتایە دەدات ئەوەی سەعیدی کوڕی زەربیی گێراویەتییەوە لەموحەممەدی کوڕی سیرینەوە، ئەویش لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕبوو خۆی دابوو بەسەر گۆڕێکدا و دەگریا، پێی فەرموو:((ئەی بەندەی خوا لەخوا بترسێ و ئارامبگرە))، ژنەکە وتی: ئەی بەندەی خوا من کۆست کەوتووم، پەیامبەر فەرمووی: ئەی بەندەی خوا لەخوابترسێ و ئارامبگرە))، ژنەکە وتی: ئەی بەندەی خوا گەر تۆش کۆست کەوتوو بووتایە عوزرت بەمن دەدا، پەیامبەر فەرمووی:((ئەی بەندەی خوا لەخوابترسێ و ئارامبگرە))، ژنەکە وتی: ئەی بەندەی خوا گوێم لێتگرت لەمن دووربکەوەرەوە، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) رۆیشت و هاوەڵێکی پەیامبەر دوایکەوت و لەسەر سەری ئافرەتەکە وەستاو وتی:ئەو پیاوەی رۆیشت چی پێت وت؟ وتی: ئەوەو ئەوەی وت و منیش ئەوەو ئەوەم پێ وت. هاوەڵەکە وتی: تۆ ئەو دەناسی؟ وتی: نایناسم. وتی:

ئەوە پەیامبەری خوا بوو(صلی الله علیه وسلم)، ئافرەتەکەش کتوپڕ راپەڕی و دوایکەوت تاوەکو گەیشتە پەیامبەری خواو وتی: من ئارام دەگرم، من ئارام دەگرم ئەی پەیامبەری خوا، پەیامبەریش فەرمووی:"الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُوْلَى، الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُوْلَى"، واتا: ئارامگرتن لەساتی یەکەمی کۆست و بەڵاکەدایە، ئارامگرتن لەساتی یەکەمی کۆست و بەڵاکەدایە.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: بیشری کوڕی وەلیدی ئەلیکیندی و سالحی کوڕی مالیك بۆی باسکردین وتیان:سەعیدی کوڕی زەربیی بۆی باسکردین[1]. ئەوەش واتای ئەو فەرموودەیە روون دەکاتەوە.

ئەبو عوبەیدە ئەڵێ: واتای فەرموودەکە ئەوەیە: ئەوپەڕی توانای هەموو کۆستبارێك ئارامگرییە، لەسەختی و گڕی کۆستەکەدا لەسەر ئارامگرییەکەی ستایش دەکرێت.

منیش ئەڵێم: لەم فەرموودەیەدا چەند جۆرێك زانست هەیە:

یەکەم: پێویستە لەسەر کۆست و ناخۆشییەکان ئارامگریی هەبێ، ئەوەش بەشێکە لەخواپەرستیی کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە.

دووەم: فەرمانکردن بەکاری چاکەو رێگرییکردن لەخراپە، ئێش و ئازاری کۆست و بەلا رێگە نادات نەهییەکان حەڵاڵ بکرێت.

سێیەم: دووبارەکردنەوەی فەرمان و نەهییەکە یەك بەدوای یەك تاوەکو کارەکە بۆلای پەروەردگار دەگێڕدرێتەوە.

چوارەم:بەڵگە بۆ ئەوە، رێگە دانە بەژنان سەردانی گۆڕستان بکەن، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) رێگریی لێ نەکردن سەردانی گۆڕستان

---

[1] - لاوازە، ئەبو یەعلا(٦٠٦٧)ئیخراجی کردووە، ئەبو عوبەید ئەلناجیی تێدایە کەسێکی لاوازە.

بکەن، بەڵکو فەرمانی پێیان کرد ئارامبگرن، ئەگەر سەردانیکردنی گۆڕستان بۆ ئافرەتان حەرام بووایە ئەوە حوکمەکەی روونده‌کرده‌وه.

ئەمەو لەکۆتایی فەرمانەکەدا، ئەبو هورەیرە لەدوای ساڵی نۆی کۆچی موسڵمان بوو، وەلأم بۆ ئەمە دەوترێت پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمانی بەئافرەتەکە کرد لەخوابترسێ و ئارامبگرێ، ئەمە رەتکردنەوەی پەیامبەر بوو بەهۆی حاڵی ئەو ئافرەتەوە کە لەسەردانیکردنی گۆڕستان و گریانەوە بەسەریدا هاتووە، بەڵگە بۆ ئەمە، ئافرەتەکە کاتێك زانیی ئەو کەسەی فەرمانی لەخواترسان و ئارامگریی پێ داوە بەگوێکردنی واجیبە، خێرا رۆیشت بۆلای پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەبو هورەیرەش نەیووتووە کە خودی خۆی ئەو چیرۆکەی بینیووە، بۆیە فەرموودەکە بەڵگە نادات لەسەر ئەوەی دوای موسڵمانبوونی ئەبو هورەیرە روویدابێ، ئەگەر ئەوەی ببینایە.

لەوکاتەی ئەو ئافرەتە لەحاڵەتێکی سەخت و جڵەونەکردنی خۆیدا بووە، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)لەبەر سۆزو بەزەیی خۆی پێ نەناساندووە، ئەگەر خۆی پێ بناسیبایەو گوێبیستی پەیامبەر نەبووایە لەنێودەچوو، یاخیبوونی لەفەرمانی پەیامبەر کە نەیناسی ئاسانترە لەوەی گەر بیزانیبایە ئەوە پەیامبەری خوایە، ئەوەش کەماڵی بەزەیی و سۆزی ئەو پەیامبەرەیە(سەلامی خوای لەسەربێ).

لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە[1] لەئوم سەلەمەوە ئەڵێ: گوێم لەپەیامبەری خوا بوو(صلى الله عليه وسلم)ئەیفەرموو:"مَا مِنْ مُسْلِمٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ فَيَقُولُ مَا أَمَرَهُ اللَّهُ: {إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ} ، اللَّهُمَّ أْجِرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلُفْ لِي خَيْرًا

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٩١٨).

مِنْهَا، إِلَّا أَخْلَفَ اللَّهُ لَهُ خَيْرًا مِنْهَا "،واتا: هەر موسڵمانێك تووشی بەلاو كۆستێك بێت و ئەوە بڵێ كە خوای گەورە فەرمانی وتنی پێ داوەو بڵێ إنا لله وإنا إليه راجعون، خوایە گیان لەم كۆست و ناخۆشییەم پاداشتم بدەی و باشترم لەدوا بۆ بەجێبهێڵی، ئەوە خوای گەورە باشتری بۆ بەجێدەهێڵێ و بەباشتر بۆی پڕ دەكاتەوە.

ئەڵێ: كە ئەبو سەلەمە مرد وتم: لەنێو موسڵماناندا چی كەسێكی تر هەیە لەئەبو سەلەمە باشتربێ كە یەكەمینماڵێك بوو بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)كۆچی كرد، پاشان ئەوەم وت، بۆیە خوای گەورە بەپەیامبەری خوا ئەو بۆشاییەی بۆ پڕكردمەوە، پەیامبەری خوا حاتەبی كوڕی ئەبی بەلتەعەی ناردە خوازبێنیم و وتم: من كچێكم هەیەو ئافرەتێكم غیرەم هەیە، فەرمووی: هەرچی كچەكەیەتی ئەوە داوا لەخوای گەورە دەكەم وەهای لێ بكات پێویستی پێ نەبێ و كاری بۆ ئاسان بێ، خۆیشی غیرەكردنی نەمێنێ))، بۆیە مێردم بەپەیامبەری خوا كرد(صلی الله علیه وسلم).

لای ئەبو داوودیش لەبارەی ئوم سەلەمەوە هاتووە، ئوم سەلەمە وتی: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:"إِذَا أَصَابَتْ أَحَدَكُمْ مُصِيبَةٌ فَلْيَقُلْ: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، اللهُمَّ عِنْدَكَ أَحْتَسِبُ مُصِيبَتِي، فَأْجُرْنِي فِيهَا، وَأَبْدِلْنِي بِهَا خَيْرًا مِنْهَا"، ،واتا:گەر هەریەك لەئێوە تووشی كۆستێك هات با بڵێ:إنا لله وإنا إليه راجعون، خوایە گیان لای خۆت چاوەڕێی پاداشتی ئەم كۆست كەوتنەم و پاداشتم بدەو بەباشتر جێگەی پڕ بكەرەوە. كە ئەبو سەلەمە گەیشتە سەرەمەرگ وتی: خوایە گیان بەباشتر لەمن جێگەی من لەنێو خێزانەكەمدا پڕ بكەرەوە، كە مرد ئوم سەلەمە وتی: إنا لله وإنا إليه راجعون،

خوایە گیان خۆت پاداشتی ئەم كۆستكەوتنەم بدە[1]. بڕوانە سەرەنجامی ئارامگری و گەڕاندنەوەو شوێنگرتنەوەی بەپەیامبەری خوا، رازیبوون لەبەرانبەر خوای گەورە ئەوەی لێ هاتەدی، ئوم سەلەمە بە بەڕێزترین بەندەی خوا مێردی كرد.

لەجامیعی ترمیزی و موسنەدی ئیمام ئەحمەدو صەحیحی ئیبن حیباندا هاتووە لەئەبو موسای ئەشعەرییەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:«إذا مـاتَ ولَـدُ العبـد قـال اللهَ للملائكة:أقَبَضْتُمْ ولَـدَ عَبـدي؟ فيقولون: نَعَم. فيقولُ اللهُ تعالى: أقبضتم ثمرة قلبه؟ فيقولـون: نعـم. فيقـول اللهُ تعالى: ماذا قال؟ فيقولون: حَمِدَك واستَرْجَع، فيقول الله تعالى: ابْنُوا لعَبْدِي بَيْتاً في الجَنَّةِ وسَمُّوه بَيْتَ الحمدِ»[2]،واتا: گەر منداڵی بەندەیەك بمرێ، خوای گەورە بەفریشتەكانی ئەفەرمووێ: گیانی منداڵی بەندەكەمتان كێشاو مراندتان؟ ئەڵێن: بەڵێ، خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەی بەندەكەم چیی وت؟ ئەڵێن: سوپاسی تۆی كردو پەنای بۆلای تۆ گەڕاندەوە، پەروەردگاریش دەفەرمووێت: بۆ ئەو بەندەیەم لەبەهەشتدا خانوویەك دروست بكەن و ناوی لێبنێن ماڵی سوپاسگوزاری.

لەصەحیحی بوخارییدا لەفەرموودەیەكی ئەنەسدا هاتووە، كە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:((إذا ابتليتُ عبدي بحبيبتيه – أي عينيه

[1] - صەحیحە، ئەبو داوود(٣١١٦) و ترمیزی(٣٥١١) و ئیبن ماجە(١٥٩٨) و ئەحمەد(٦/ ٣١٧) ئیخراجیان كردووە.

[2] - حسن لغيره، ترمیزیی ئیخراجی كردووە(١٠١٢)و ئیبن حیبان(٢٩٤٨) و ئەحمەد(٤/ ٤١٥).

– فصبر، عوضته منهما الجنة))[1]،واتا: ئەگەر بەندەکەم بەلێسەندنەوەی هەردوو چاوی خۆشەویستی تاقیمکردەوەو ئارامی گرت، ئەوە بەبەهەشت قەرەبووی هەردوو چاوی دەکەمەوە.

لەترمیزییدا لەفەرموودەیەکدا هاتووە:" إِذَا أَخَذْتُ كَرِيمَتَيْ عَبْدٍ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَكُنْ لَهُ جَزَاءٌ عِنْدِي إِلَّا الْجَنَّةُ"[2] ، واتا: ئەگەر دوو چاوی نرخداری بەندەیەکم لەدونیادا وەرگرتەوە، پاداشتی من بۆ ئەو تەنیا بەهەشتە.

هەر لەترمیزییدا هاتووە لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:" يَقُولُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِذَا أَخَذْتُ كَرِيمَتَيْ عَبْدِي فَصَبَرَ، وَاحْتَسَبَ لَمْ أَرْضَ لَهُ ثَوَابًا دُونَ الْجَنَّةِ "[3]،واتا:گەر هەردوو چاوی شیرین و نرخداری هەر بەندەیەکی خۆمم وەرگرتەوەو ئارامی گرت و چاوەڕێی پاداشتی کرد، ئەوە تەنیا بەپاداشتی بەهەشت بۆی رازییم.

لەسووننەنی ئەبو داوودیشدا هاتووە لەفەرموودەکەی عبداللەی کوڕی عەمر ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:" لا يرضى الله لعبده المؤمن إذا ذهب بصفيه من أهل الارض واحتسبه بثواب دون الجنة "[4]،واتا: خوای گەورە تەنیا رازییە بەبەهەشت پاداشتی ئەو بەندەیەی بداتەوە، کە هەردوو چاوی لەدەست دەدات و ئارام دەگرێ و چاوەڕێی پاداشتی خوا ئەبێ.

لەصەحیحی بوخارییشدا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:" يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى مَا لِعَبْدِي

[1] – بوخاریی ئیخراجی کردووە(٥٦٥٣).

[2] – صەحیحە، ترمیزیی ئیخراجی کردووە(٢٤٠٠).

[3] – صەحیحە، ترمیزیی ئیخراجی کردووە(٢٤٠١).

[4] – حسن، نەسائیی ئیخراجی کردووە(٤/ ٢٣).

الْمُؤْمِنِ جَزَاءٌ إِذَا قَبَضْتُ صَفِيَّهُ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا ثـم احتسبه إِلى الْجَنَّـةُ "[1]، واتـا: خوای گەورە ئەفەرمووێ: هەر بەندەیەکی باوەڕدارم کە لەدونیادا هەردوو چاوی لەدەست دەدات و ئارام دەگرێ و چاوەڕێی پاداشتی ئێمە دەبێ، بەهەشت دەکەینە پاداشتی.

هەر لەصەحیحی بوخارییدا لەعەتائی کوڕی رەباحەوە ئەڵێ: ئیبن عەباس پێیوتم: ئایە ئافرەتێکت پیشان بدەم خەڵکی بەهەشت بێ؟ وتم: بەڵێ پیشانمی بدە، وتی: ئەم ئافرەتە رەشە هاتەلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و وتی: ئەی پەیامبەری خوا من پەرکەمم هەیەو کاتێ دەمگرێ داوێنم بەدەردەکەوێ، لای خوا بۆم بپاڕێرەوە، پەیامبەریش فەرمووی:(إِن شِئتِ صَبرتِ ولَكِ الجَنـةُ، وإِن شِـئتِ دَعـوتُ اللّـهَ أن يُعَافِيَـكِ)،واتا:ئەگەر ئارامبگری ئەوە بەهەشتت بۆ دەبێ لەبری ئەو نەخۆشییەو ئەگەر بتەوێ داوا لەخوای گەورە دەکەم شیفات بدات. وتی: ئارام دەگرم، بەڵام لەوکاتەدا گیانم بدەردەکەوێ لەخوا بپاڕێرەوە گیانم بەدەرنەکەوێ، پەیامبەریش بۆی پاڕایەوە[2].

لەمەوطیئدا هاتووە لەفەرموودەیەکی عەتائی کوڕی یەساردا کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی:"اذا مرض العبد بعث اليه ملكين فقال انظرا ماذا يقول لعواده فإن هو اذ جاؤوه حمد الله وأثنى عليه رفعا ذلك إلى الله وهو أعلم فيقول ان لعبدي علي ان توفيته ان أدخله الجنة وان أنا شفيته أن أبدله لحما خيرا من لحمه ودما خيرا من دمه وأن أكفر عنه سيئاته"[3]،واتا: گەر بەندە

---

[1] - بوخاری(٦٢٢٤) و موسلیم(٢٥٧٣)ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٥٦٥٢) و موسلیم(٢٥٧٦)ئیخراجیان کردووە.

[3] - صحیح لغیره، مالیك ئیخراگی کردووە لەموطأدا(٢٥٧٦).

نەخۆشـبکەوێ خـوای گـەورە دوو فریشـتەی دەنێرێتـەلای و ئەفـەرمووێ بـزانن لـەبارەی نەخۆشییەکەیەوە چـی ئـەڵێ، کـە دێـن بـۆلای و دەبیـنن سـوپاس و ستایشـی خـوا دەکـات لەسـەر ئـەو نەخۆشـییەی، هەواڵەکـە بـۆ خـوای گـەورە بەرزدەکەنەوە، خواش زاناترەو ئاگای لەبەندەکەیەتی و ئەفـەرمووێ: مـافی ئـەو بەندەیەم بەسەر منـەوە ئەوەیـە کـە مـرد بیخەمـە بەهەشـتەوە، کـە شیفاشـم دا گۆشت و خـوێنی باشـتر لەگۆشـت و خـوێنی ئێسـتای پـێ بـدەم و لەتاوانـەکانی دەسڕمەوە.

لەصـــەحیفەی عـــەمری کـــوڕی شـــوعەیبەوە ئـــەویش لەباوکییـــەوە ئـــەویش لەباپیرییەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسـلم)فەرمووی:"اذا جمـع الله الخلائق نادى منـاد أين أهل الصبر فيقوم ناس وهـم قليلـون فينطلقـون سـراعا إلى الجنة فتلقاهم الملائكة فيقولون انا نراكم سراعا إلى الجنة فمن أنـتم فيقولـون نحـن أهل الفضل فيقولون ما كان فضـلكم فيقولـون كنـا اذا ظلمنـا صـبرنا واذا أسـيء الينـا غفرنـا واذا جهـل علينـا حلمنـا فيقـال لهـم ادخلـوا الجنـة فـنعم أجـر العاملين"[1]،واتا: کاتێ خوای گەورە مەخلوقـەکان کۆدەکاتـەوە، جاڕدەرێـك جـاڕ دەدات: ئارامگران لەکوێن؟ خەڵکانێك هەڵدەستنەوە کـە ژمارەیـان کەمـە، خێـرا دەردەچـن بـۆ ڕۆیشـتنە بەهەشـت، فریشـتەکان پێیـان دەڵـێن و ئـەڵێن: چـییە دەبینین زۆر خێـران بـۆ بەهەشـت، ئێـوە کـێن؟ ئـەڵێن: ئێمـە خـەڵکانی خـاوەن

---

[1] - زۆر لاوازە ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە:الحلم(٥٦) ئیخراجـی کـردووە، عبداللـەی کـوڕی عوبەیدواللـەی کـوڕی مەیسەرەی تێدایە کەسێکی لاوازە، مەتروکە.

فەزڵێن، فریشتەکان ئەڵێن: فەزڵەکەتان چییە؟ ئەڵێن: کە ستەممان لێ دەکرا ئارامەمان گرت، کە خراپەمان بەرانبەر دەکرا لەو کەسانە خۆشدەبووین خراپەیان بەرانبەرمان دەکرد، کە نەفامییمان بەرانبەر دەکرا چاوپۆشییمان دەکرد، بۆیە پێیان دەوترێ: برۆنە بەهەشتەوە کە باشترین پاداشتێکی ئەوانەیە کاروکردەوەیان کردووە.

لەصەحیحەیندا هاتووە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)ماڵ و سەروەتێکی دابەشکرد، هەندێ خەڵك وتیان:ئەمە دابەشکردنێکە خوای گەورە پێی رازیی نییە، ئەم هەواڵە بەپەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)گەیشت و فەرمووی:" رَحِمَ اللهُ مُوسَى قَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا فَصَبَرَ "[1] ،واتا: خوای گەورە بەزەیی بەموسادا بێتەوە، زیاتر لەمە ئازار دراو ئارامی گرت.

لەصەحیحەیندا هاتووە: لەفەرموودەیەکی زوهەری لەعورووەوە ئەویش لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)فەرمووی:"مَا من مُصِيبَة تصيب الْمُسلم إِلَّا كفر الله بهَا عَنهُ حَتَّى الشَّوْكَة يشاكها"[2] ،واتا: هەر موسڵمانێك تووشی کۆست و ناخۆشییەك هات، خوای گەورە لەتاوانەکانی دەسڕێتەوە گەر درکێکیش بێ و بچێ بەپێیدا.

هەر لەصەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەبی سەعیدو ئەبو هورەیرەوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیە وسلم)فەرموویەتی:،واتا:"ما يصيب المسلم من نصب ولا وصب ولا هم ولا حزن ولا أذى ولا غم حتى الشوكة يشاكها الا كفر

---

[1] – بوخاری(٣٤٠٥) و موسلیم(١٦٠٢)ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری(٥٦٤٠) و موسلیم(٢٥٧٢/ ٤٩)ئیخراجیان کردووە.

الله بها من خطاياه"[1]،واتا: هەر موسڵمانێك تووشی كۆست و ناخۆشی و پەژارەو خەفەت و ئازارو نەهامەتییەك هات تەنانەت گەر دڕكێكیش ببێتە مایەی ئازاردانی، ئەوە خوای گەورە لەتاوانەكانی دەبوورێت.

لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە لەفەرموودەی عائیشەدا ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی:"لا يصيب المؤمن من شوكة فما فوقها الا رفعه الله بها درجة وحط عنه بها خطيئة "[2]،واتا: هەر موسڵمانێك بەدڕكێك و شتانی لەوە گەورەتر ئازارێك ببینێ، ئەوە خوای گەورە پلەیەك بەرزی دەكاتەوەو تاوانێكیشی لەسەر دەسڕێتەوە.

لەموسنەددا فەرموودەیەكی ئەبو هورەیرە هاتووە ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی:"لَا يـزَال الْبلَـاء بِالْمُؤْمنِ والمؤمنة فِي نَفسه وَفِي وَلَده وَمَاله حَتَّى يلقى الله وَمَا عَلَيْهِ من خَطِيئَة"[3]،واتا: پیاو و ئافرەتی باوەڕدار هەیە لەدەروونی خۆیان و ماڵ و منداڵیدا لەتاقیكردنەوەدا دەبێ تائەو كاتەی بەخوای گەورە دەگاتەوەو تاوانی لەسەر نییە.

لەصەحیحدا هاتووە لەفەرموودەی سەعیدی كوڕی ئەبی وەقاصەوە(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: وتم: ئەی پەیامبەری خوا، چی جۆرە خەڵكێك كۆست و نەهامەتیی سەختتری هەیە؟ فەرمووی:«أَشَدُّ النَّاسِ بَلَاءً الْأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الصَّالِحُونَ، ثُمَّ الْأَمْثَلُ فَالْأَمْثَلُ ، يُبْتَلَى الرَّجُلُ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ صَلَابَةٌ زِيدَ

---

[1] - بوخاری(٥٦٤١) و موسلیم(٢٥٧٣)ئیخراجیان كردووە.

[2] - موسلیم(٢٥٧٢/ ٤٧)ئیخراجی كردووە.

[3] – حسن، ئەحمەد(٢/ ٢٨٧)، ترمیزی(٢٣٩٩)ئیخراجیان كردووە.

له فِي الْبَلَاءِ»[1]،واتا: خەڵكانێك كۆست و مەینەتییان هەبێ پەیامبەرانن پاشان چاكەكاران پاشان باشترین و پاشان باشترین،مرۆڤ بەئەندازەی ئایینداریيەكەی تاقیدەكرێتەوە، ئەگەر ئایینی بەهێز بوو نەهامەتییەكەشی زیاتر دەكرێ، گەر ئایینی نەرم و لاواز بوو نەهامەتییەكەشی لەسەر سووك دەكرێ، بەندەی باوەڕدار لەتاقیكردنەوەی ناخۆشدا دەبێ تائەوەی بەسەر زەوییدا دەڕوات و تاوانی پێوە نییە.

لەصەحیحەیندا هاتووە لەعبداللەی كوڕی مەسعودەوە(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: رۆیشتمە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)تایەكی سەختی هەبوو، ئەڵێ: وتم ئەی پەیامبەری خوا جەستەت تایەكی سەختی هەیە، ئەویش فەرمووی:«أَجَلْ، إِنِّي لَأُوعَكُ كَمَا يُوعَكُ الرَّجُلَانِ مِنْكُمْ»،واتا: بەڵێ من تاو ئازاری دوو كەس لەئێوەم هەیە، وتم: پاداشتی دوو كەسیشت هەیە؟ فەرمووی:" نَعَمْ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا عَلَى الْأَرْضِ مُسْلِمٌ يُصِيبُهُ أَذًى: مَرَضٌ فَمَا سِوَاهُ إِلَّا حَطَّ اللَّهُ بِهِ عَنْهُ مِنْ خَطَايَاهُ كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا "[2]،واتا: بەڵێ، سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە، هەر موسڵمانێك لەم سەر زەوییدا تووشی نەخۆشییەك ببێ، تاوانی لێ هەڵدەوەرێ هەروەك چۆن دارو درەخت گەڵایان لێ هەڵدەوەرێ.

---

[1] - صەحیحە، ترمیزی(٢٣٩٨) و ئیبن ماجە(٤٠٢٣) و ئەحمەد(١/ ١٧٢)ئیخراجیان كردووە.

[2] - بوخاری(٥٦٤٨) و موسلیم(٢٥٧١)ئیخراجیان كردووە.

لەصەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی دایکە عائیشەدا(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: هیچ ئازارو تایەکم نەبینیووە لەتاو ئازاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)سەختتربێ[1].

لەهەندێ موسنەدیشدا بەمەرفوعیی هاتووە:«إِنَّ الرَّجُلَ لَتَكُونُ لَهُ الدَّرَجَةُ عِنْدَ اللَّهِ لَا يَبْلُغُهَا بِعَمَلِهِ حَتَّى يُبْتَلَى بِبَلَاءٍ فِي جِسْمِهِ فَيَبْلُغَهَا بِذَلِكَ»[2]،واتا:هەندێ جار پیاوی وا هەیە بەپلەیەك دەگات بەکردەوە پێی ناگات، بەتاقیکردنەوەی کۆست و نەخۆشیی جەستەی بەو پلەو مەقامە دەگات.

لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ)دەگێڕدرێتەوە ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی:«إِذَا اشْتَكَى الْمُؤْمِنُ أَخْلَصَهُ ذَلِكَ مِنَ الذُّنُوبِ كَمَا يُخْلِصُ الْكِيرُ الْخَبَثَ مِنَ الْحَدِيدِ»[3]،واتا: ئەگەر باوەڕدار تووشی نەخۆشیی بێ، نەخۆشییەکەی لەتاوان پاکی دەکاتەوە هەروەك چۆن کوورەی ئاگر ژەنگ و ژار لەئاسن پاکدەکاتەوە.

لەصەحیحی بوخارییدا لەفەرموودەیەکی خەبابی کوڕی ئەرەت ئەڵێ: شەکوای حاڵی خۆمانمان بردە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە بوردەیەکی(عەبایەکەی)لەژێر سەری دانابوو لەسێبەری کەعبەدا،وتمان: ئایە داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەی؟ لەخوای گەورە بۆمان ناپاڕێیتەوە لەم نەهامەتییە رزگارمان بێ؟! ئەویش فەرمووی:«قد كان من قبلكم يؤخَذُ الرجل

---

[1] - بوخاری(٥٦٤٦) و موسلیم(٢٥٧٠)ئیخراجیان کردووە.

[2] – حسن، ئەبو یەعلا ئیخراجی کردووە لەموسنەدەکەیدا(٦٠٩٥) و ئیبن حیبان(٢٩٠٨) و حاکم(١/ ٣٤٤)، ئەلحافیظ ئەڵێ: لا بأس بە(کێشەی لەسەر نییە).

[3] - صەحیحە، بوخاریی ئیخراجی کردووە لە(الأدب المفرد٤٩٧)، ئیبن حیبان(٢٩٣٦)، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە: المرض والكفارات(٩٠).

فيُحفَرُ له في الأرض فيُجعل فيها، ثم يؤتى بالمنشار فيوضعُ على رأسه فيُجعل نصفَين، ويمشَط بأمشاط الحديد لحمه وعظمه، فما يصدُّه ذلك عن دينه. والله ليتمَّنَّ هذا الأمر حتى يسير الراكبُ من صنعاء الى حضرموتَ لا يخاف الا الله، والذئبَ على غنمه، ولكنكم تستعجلون»[1]،واتا:لەپێش ئێوەدا باوەڕدار دەگیردراو چاڵیان بۆ هەڵدەکەندو ئەیانخستە نێو چاڵەکەوەو هەڕە دەخرایە سەر سەری و دەکرا بە دوو لەتەوەو ئێسك و گۆشتی لەیەکجیادەکرایەوە، لەئایینی خۆی پەشیمان نەدەبوویەوە، سوێند بەخوا خوای گەورە ئەم ئایینە گەورە رادەگرێ و دەگەنە دەسەڵات و توانـاداری، تـا ئـەوەی سـوار لەسەنعاوە دەچێ بۆ حەزرەمەوت جگە لەخواو زیانی گورگ بۆ سەر مەڕەکانی ترسی هیچ شتێکی تری نابێ، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن.

لەبوخارییدا هاتووە: هاتمە لای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)و عەباکەی خستبووە ژێر سەری لەسێبەری کەعبەدا، لەهاوبەش پەیداکەران ئازارێکی زۆرمان تووشهات و ئێمەش وتمان: ئەی پەیامبەری خوا: لەخوای گەورە بۆمان ناپاڕێیتەوە؟ ئەویش هەڵسایەوەو دانیشت و روومەتی سوور هەڵگەڕاو فەرمووی:"لقد كان الرجل ليمشط بأمشاط الحديد لحمه وعظمه، فما يصدُّه ذلك عن دينه "[2]،واتا: پیاوی باوەڕداری وا هەبووە مەقاشی ئاسنی خراوەتە سەر و گۆشت و ئێسکی لێکجیاکراوەتەوە، لەئایینی خۆی هەڵنەگەڕاوەتەوە.

---

[1] – بوخاریی ئیخراجی کردووە(٣٦١٢).

[2] – بوخاریی ئیخراجی کردووە(٣٨٥٢).

ئەهلی زانست ئەم قسەیەی خەبابیان بەمجۆرە گێڕاوەتەوە:((شەکوای گەرمای زەوی و سەختیی ئەشکەنجەمان بردەلای پەیامبەری خواو شەکواکەمانی وەرنەگرت))[1]، شەکواکەیانی قبولْ نەکرد، ڕێنمایی و ئامۆژگاریی پێدان بەئارامگرتن. ئەمە گونجاوترین شیکردنەوەیەکی ئەو کەسانەیە کە بەکڕنۆشبردن لەسەر زەویی گەرم لێکیان داوەتەوەو بەڵگەی ئەوانەیە کە ڕەخنە دەگرن لەوانەی بەواجیبی دەزانن کەسی نوێژخوێن ڕاستەوخۆ کڕنۆش ببات و لووتی لەزەویی بدات، ئەویش بەسێ بەڵگە:

یەکەم: لەم فەرموودەیەدا باس لەوە نەکراوە هیچ شتێك ڕانەخەی و دەموچاوتی بخەیتەسەر.

دووەم: ئەوان باسیان کردووە کە لەگەڵ پەیامبەری خوادا بوونە، گەر یەکێکیان نەیتوانیبایە لەسەر زەوییەکە کڕنۆش ببات، بەرگی خۆی ڕاخستووە، دیارە پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم)ئەمەی بینیووەو ناڕەزایی دەرنەخستووە.

سێیەم: گەرمای سەختی حیجاز ناهێڵێ ڕاستەوخۆ و بێ ڕاخەرو شتێك روومەت و دەست بخەیتەسەر زەوی، ڕەنگە بەهۆی گەرماوە دەمووچاوت بسووتێ، ناتوانی دڵئارامانە کڕنۆش ببەی، خشوع و بیرت لەنوێژدا نامێنێ و جەستە ئازار دەبینێ و تووشی نەخۆشیی دەبی، شەریعەتیش ئەم حاڵەتەی ناوێ، تۆش لەقسەکانی خەباب بڕوانەو بیربکەرەوە، کە دەڵێ شکایەتیی ئێمەی

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٦٩٠/ ١٩٠).

قبـولّ نـەکرد، مەبەسـت ئەوەیـە ئامۆژگـارییکردن ئـارامگرتنی خـەڵکانی پـێش خۆیانیان هەبێ، خواش زاناترە[1].

لەصـــەحیحدا هـــاتووە لەفەرموودەیـــەکی ئوســـامەی کـــوڕی زەیـــدەوە ئەڵێ:کچەکەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)هەواڵی نـارد بـۆ پەیامبـەری خوا کـە: منداڵەکـەم لەسـەرەمەرگە وەرە بـۆ لامـان، ئـەویش سـەلامی بـۆ نـاردو فەرمووی:" إِنَّ لِلَّهِ مَا أَخَذَ وَلَهُ مَا أَعْطَى وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ" ، واتا: خـوای گـەورە هـەموو ئـەوەی وەریـدەگرێ و دەیباتـەوە هـی خۆیـەتی و ئەوەشـی دەیبەخشـێ هـەر هـی خۆیـەتی، هـەموو شـتێك تەمـەن و کاتێکی دیاریکراوی هەیە، با ئارامبگرێ و چاوەڕێی پاداشتی خـوای گـەورە بـێ. جارێکی تر هەواڵی بۆ ناردەوەو سـوێندی لەسـەر پەیامبـەری خـوا خـوارد دەبـێ سەردانی بکات، بۆیە هەستایە سەرپێ و سەعدی کوڕی عوبادەو موعـازی کـوڕی جەبەل و ئوبەیی کوڕی کەعب و زەیـدی کـوڕی ثابـت و پیـاوانێکی تـری لەگەڵـدا ڕۆیشـتن، منداڵەکـە بـۆ پەیامبـەری خوا(صـلى الله عليـه وسـلم)بەرزکرایەوەو لەباوەشی خۆی دایناو هەناسەی سوار بـوو دەنگـی هەناسـەی دەهـات، هـەردوو چاوی پەیامبەری خوا پڕ فرمێسك بوون و فرمێسـکیان لـێ دەتکـا، سـەعد وتـی: ئەی پەیامبەری خوا ئەم فرمێسکانە چیین؟ پەیامبەریش فەرمووی:" قَالَ رَحْمَةٌ جَعَلَهَا اللَّهُ فِي قُلُوبِ عِبَادِهِ وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللَّهُ مِنْ عِبَادِهِ الرحماء"[2]،واتـا: ئەمـە

[1] - بروانە ئەو بێژەیەی کە موسلیم ئیخراجی کردووە(٦١٩).

[2] - بوخاری(٣٠١) و موسلیم(٢١٤٤)ئیخراجیان کردووە.

بەزەییەکە خوای گەورە دەیخاتە دڵی بەندکانی خۆیەوە، خوای گەورە بەزەیی بەرانبەر بەندە بەبەزەییەکانی هەیە.

لەسوننەنی نەسائییدا هاتووە لەئیبن عەباسەوە ئەڵێ: کچە بچووکەکەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)لەسەرەمەرگدا بوو، پەیامبەری خوا هەڵیگرت و بەسنگی خۆیەوە نووساندی و پاشان دەستی بەسەریدا هێنا، ئوم ئەیمەن گریا، منیش پێموت: دەگریی لەکاتێکدا پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)لێرەیە لای تۆ؟ وتی: بۆ نەگریم لەکاتێکدا پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)دەگری، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:((من ناگریم، بەڵکو ئەمە سۆزو بەزەییە))، پاشان فەرمووی:"الْحَمْدُ لِلَّهِ، الْمُؤْمِنُ بِخَيْرٍ، تُنْزَعُ نَفْسُهُ مِنْ بَيْنِ جَنْبَيْهِ وَهُوَ يَحْمَدُ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ "[1]، واتا: مرۆڤی باوەڕدار لەهەموو حاڵێکدا لەسەر خێرو چاکەیە، دەروونی لێ وەردەگیردرێتەوەو سوپاسی خوای گەورە دەکات.

لەصەحیحی بوخارییدا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەنەسدا(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: کوڕەکەی ئەبو تەلحە نەخۆش بوو مرد، ئەبو تەڵحە لەماڵ نەبوو، کە ژنەکەی بینی منداڵەکەی مردووە، شتێکی راخست و لەپاڵێکی ماڵەکەدا داینا، ئەبو تەڵحە گەڕایەوە ماڵ و وتی: کوانێ کوڕەکەمان؟ ژنەکەی وتی: خەوتووە بەڵکو پشوویەك بکات، ئەبو تەڵحە وایزانی ژنەکەی بەڕاستێتی، ئەڵێ: ئەبو تەڵحە لەگەڵ ژنەکەیدا جووت بوو، لەبەیانییدا خۆی شۆردو ویستی لەماڵ دەربچێ، ژنەکەی تێیگەیاند کە کوڕەکەیان مردووە، ئەبو تەڵحە لەگەڵ

---

[1] - صەحیحە، ئەحمەد(١/ ٢٧٣– ٢٧٤) و نەسائی(٤/ ١٢) و بەزاز(٨٠٨/ کشف الأستار)تەخریجیان کردووە.

پەیامبەری خوادا نوێژی کردو هەواڵی پێدا کەچی لەنێوان خۆی و ژنەکەیدا روویداوە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:"لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُبَارِكَ لَكُمَا فِي لَيْلَتِكُمَا"[1]، واتا: بەڵکو خوای گەورە بەرەکەت بخاتە کاری ئەم شەوەتانەوە. ئیبن عویەینە ئەڵێ: پیاوێکی ئەنصاریی وتی: بینیم نۆ کوڕی هەیەو هەموویان قورئانخوێن بوون.

لەمەوطیئی مالیکدا هاتووە: لەئەلقاسمی کوڕی موحەممەدەوە[2] ئەڵێ: خێزانێکم مرد، موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەیزیی[3] هاتەلام و سەرەخۆشیی لێکردم و وتی: لەنێو بەنی ئیسرائیلدا پیاوێکی شەرعناسی خواناس،زاناو موجتەهید هەبووە، ژنێکی هەبووە زۆر خۆشویستووەو پێی سەرسام بووە، ژنەکەی مردووە، ئەم زانایە بۆ مردنی خێزانەکەی زۆر خەم و خەفەتی خواردووەو دەرگای لەسەر خۆی داخستووەو لەخەڵکیی دووریگرتووە، کەس نەیتوانیووە بچێتەلای، پاشان ئافرەتێکی بەنی ئیسرائیل ئەم هەواڵەی بیستووە هاتووەتەلای و وتوویەتی: پرسیارێکم هەیەو بۆچوونی ئەوم دەوێ، تا بۆچوونی نەزانم دڵئارام نابم، خەڵکەکە رۆیشتوون و ئەمیش لای دەرگاکە ماوەتەوەو هەواڵ بەزاناکە دراوە ئافرەتێك پرسیاری هەیە، مۆڵەتی داوە، ئافرەتەکە ئەڵێ:

---

[1] - بوخاری(٥٦٥٥) و موسلیم(٩٢٣)ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئەلقاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکر، ئەبو موحەممەد(ساڵی٣٧کۆچیی لەدایکبووەو ١٠٧ی کۆچیی مردووە): یەکێك بوو لەحەوت شەرعناسەکەی مەدینە، لەمەدینە لەدایك بوو لەقەدید مرد(لەنێوان مەککەو مەدینەیە)بەنیازی حەج یان عومرە رۆیشت، پیاوێکی چاك و متمانەدارو یەکێك بووە لەگەورەکانی تابیعین، لەکۆتاییەکانی تەمەنیدا نابینابوو.

[3] - موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەیزی، ئەلمەدەنی، متمانەدارو زانا بووە، بەدروست ساڵی چل لەدایکبووەو لەسەدو بیستدا مردووە.

لەشتێکدا فەتوای تۆ وەردەگرم، ئەڵێ: ئەو شتە چییە؟ ئافرەتەکە ئەڵێ: لەهاوسێیەکم زێڕو زیووم بەئەمانەت بردووەو سەردەمانێکە لەبەریان دەکەم، ئێستا کەسی ناردووە بەشوێندا بۆی بگەڕێنمەوە، ئایە بۆی بگەڕێنمەوە؟ ئەڵێ: بەڵێ بۆی بگەڕێنەوە. ژنەکە ئەڵێ: ئاخر زەمانێکە لای منە، زاناکە ئەڵێ: ئەو لەپێشترو شیاوترە بەوەی بۆی بگەڕێنیتەوە. ژنەکە ئەڵێ: بەر رەحمەتی خوای بکەوی، ئایە تۆ خەفەتباری بۆ شتێ کە خوا بەئەمانەت بەتۆی دابوو دواتر لێتی وەرگرتەوە، ئاخۆ لەتۆ لەپێشتر نییە بەو ئەمانەتە؟! کابرای زانا بەرچاو روونبوویەوەو خوای گەورە بەقسەی ئەو ئافرەتە سوودی پێگەیاند[1].

لەجامیعی ترمزییدا لەپیاوێکی بەتەمەنی نەوەی مورەوە ئەڵێ: هاتمە کوفەو هەواڵی بیلالی کوڕی ئەبی بوردەم پرسی وتم پەندو وانەی لێ وەردەگرم، هاتمەلای و بینیم لەماڵەکەیدا بەندکراوە،هەموو شتێك گۆڕابوو بەئەشکەنجەو لێدان،وەك گژوگیای وشکەوەبووی لێهاتبوو، وتم: سوپاس بۆ خوا ئەی بیلال، تۆم بینی بەنێوماندا تێپەڕیت و لووت گرتبوو بێ ئەوەی تۆزی لێوە دەربچێ و ئەم حاڵەشت هەیە، ئاخۆ ئارامگرتنی ئەمڕۆت چۆنە؟ وتی: تۆ کێی؟ وتم: لەنەوەی مورەی کوڕی عابدم، وتی: ئایە فەرموودەیەکت بۆ باس بکەم بەڵکو خوای گەورە بۆ تۆی بەسوود بکات و سوودی لێ ببینی؟ وتم: بەڵێ ئەمەوێ. وتی: ئەبو بوردە بۆی باسکردم لەئەبو موساوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:«لَا يُصِيبُ عَبْدًا نَكْبَةٌ فَمَا فَوْقَهَا أَوْ دُونَهَا إِلَّا بِذَنْبٍ، وَمَا يَعْفُو اللَّهُ عَنْهُ أَكْثَرُ»،واتا: هەر بەندەیەك زۆر یان کەم تووشی بەڵاو ناخۆشیی بێ بەهۆی تاوانەوەیە و خوای گەورەش بەهۆی ئەو ناخۆشییەوە لێی دەبووری

---

[1] - مالیك ئیخراجی کردووە لە(الموطأ ١/ ٢٣٧).

و ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە:﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ۝٣٠ ﴾[1]الشورى: ٣٠، واتا: هەر ناخۆشی یەكتان تووش بـووبێ ئـەوە بەهۆی كردەوەی (خراپی)خۆتانەوەیە وە لە زۆرێكیش چاوپۆشی كردووە.

لەصەحیحەیندا[2] هاتووە لەفەرموودەكەی عبداللەی كوڕی مەسعودەوە(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: وەك ئـەوەی ئێستا بڕوانمـە پەیامبـەری خوا(صـلى الله علیـە وسـلم) باسـی پـەیامبـەرێكی لەپەیامبـەران دەكـرد كـە قەومەكـەی لێیـان داوەو سەریان شكاندووە، خـوێنی بەدەمووچاویدا دەسـڕی و دەیفـەرموو:"اللَّهُـمَّ اغفـر لِقَوْمِي فإِنَّهُم لا يَعْلَمُونَ"،واتا: خوایە گیـان لەقەومەكـەم خۆشـبە، ئـەوان نـازانن. ئەم دوعایەی ئەو پەیامبەرە، لێخۆشبوونی دەگەیەنێ بـۆ قەومەكـەی و عوزریـان بۆ دەهێنێتەوەو بەسۆز بووە بۆیان.

لەمەوطیئدا هاتووە لەفەرموودەی عەبدولڕەحمانی كوڕی ئەلقاسمـەوە ئـەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله علیە وسلم) فەرمووی:" لِيُعَزِّ الْمُسْـلِمِينَ فِـي مَصَـائِبِهِمُ، الْمُصِـيبَةُ بِـي"[3] ،واتـا: موسـڵمانان لەكۆسـت و ناخۆشـییەكانیاندا بەكۆسـت و ناخۆشییەكانی من دڵدانەوەی خۆیان بكەن.

لەترمیزییـدا لەفەرموودەكـەی یـەحیای كـوڕی وثـابـدا هـاتووە لەزانایـەكی هـاوەڵانی پەیامبـەری خواوە(صـلى الله علیـە وسـلم)وتوویەتی: پەیامبـەری

---

[1] – لاوازە، ترمیزیی ئیخراجی كردووە(٣٢٢٥).

[2] – بوخاری(٣٤٧٧)ئیخراجی كردووەو لای موسلیم نەمبینیووە.

[3] - حسن، مالیك ئیخراجی كردووە(١/ ٢٣٦)، ئیبن سەعدیش لە الطبقات(٢/ ٢٧٥) و ئیبن ئـەلموبارەكیش لە الزهد(٤٦٧).

خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: «الْمُؤْمِنُ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ خَيْرٌ مِنَ الَّذِي لَا يُخَالِطُهُمْ وَلَا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ»[1]،واتا: ئەو باوەڕدارەی کە تێکەڵیی خەڵك دەکات و لەسەر ئازارو ناخۆشییان ئارام دەگرێ، پاداشتی زۆرترە لەو باوەڕدارەی کە تێکەڵیی خەڵك ناکات و لەسەر ئازارو ناخۆشییەکانیشیان ئارام ناگرێ.

ترمیزیی ئەڵێ: شوعبە وەهای دەبینێ ئەو زانایە ئیبن عومەر بووە.

لەصەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەبو سەعیدی خودرییەوە(خوای لێ رازیی بێ)ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:" مَا أعْطِي أحد عَطاء خير وأوسع من الصَّبْر"[2]،واتا: خوای گەورە خێرو چاکەیەکی فراوانی بەکەس نەداوە نمونەی ئارامگریی چاك و فراوان بێ.

لەهەندێ مەسانییدا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: «إِذَا وَجَّهْتُ إِلَى عَبْدٍ مِنْ عَبِيدِي مُصِيبَةً فِي بَدَنِهِ أَوْ مَالِهِ أَوْ وَلَدِهِ، ثُمَّ اسْتَقْبَلَ ذَلِكَ بِصَبْرٍ جَمِيلٍ" اسْتَحْيَيْتُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنْ أَنْصِبَ لَهُ مِيزَانًا أو أن أَنْشُرَ لَهُ دِيوَانًا»[3]،واتا: پەروەردگار فەرموویەتی: گەر کۆست و بەلاّم خستەسەر بەندەیەکم کە تووشی جەستەی یان سەروەتی یان منداڵی هات و،

---

[1] - صەحیحە، ترمیزی(٢٥٠٧) و ئیبن ماجە(٤٠٣٢) و بوخاریی لە الادب المفرد(٣٨٨) و ئەحمەد(٥/ ٣٦٥)ئیخراجیان کردووە.

[2] - پێشتر ئیخراج کرا.

[3] - لاوازە، ئەلحەکیم ئەلترمیزی لەنوادر الاصول(٢٢٢)ئیخراجی کردووەو ئەلعیراقی لە المغني عن حمل الأسفار(٤/ ٧٢)لاوازی کردووە.

پاشان جوان ئارامی گرت، ئەوە شەرم دەکەم لەڕۆژی قیامەتدا تەرازووی بۆ دابنێم و کردەوەکانی بلاّوبکەمەوە.

لەجامیعی ترمیزییدا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی: (إذا أحب الله قوماً ابتلاهم، فمن رضي فله الرضا، ومن سخط فله السخط)[1]،واتا: ئەگەر خوای گەورە قەومێکی خۆشبووێ تاقییان دەکاتەوە، هەرکەسێ بەو تاقیکردنەوەیە رازیی بێ رازیی بوونی بۆ هەیەو هەرکەسێ تووڕەبێ تووڕەبێ بۆ دەبێ.

لەهەندێ مەسانیددا لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)هاتووە بەمەرفوعی:"إذا أراد الله بعبد خيراً صَبَّ عليه البلاء صباً"[2]،واتا: ئەگەر خوای گەورە خێری بەندەی بووێ، بەلاّو ناخۆشیی بەسەردا دەڕژێنێ.

لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە لەفەرموودەی جابری کوڕی عبداللە(خوای لێ رازیی بێ): کە پەیامبەری خوا چووە سەردانی ئافرەتێك و فەرمووی: چییە لەرز گرتووتی؟ وتی: گرانەتامە خوا بەرەکەتی تێ نەکات، پەیامبەر فەرمووی:"جنێو بەگرانەتا مەدە، گرانەتا تاوانی مرۆڤ دەسڕێتەوە هەروەك چۆن کوورەی ئاگر پیسیی ئاسن دەتووێنێتەوەو نایهێڵێ".

لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ)باسدەکرێ ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)کە فەرموویەتی:"مَنْ وَعَكَ لَيْلَةً فَصَبَرَ ، وَرَضِيَ بِهَا

---

[1] - حسن، ترمیزیی ئیخراجی کردووە(٢٣٩٦) و ئیبن ماجە(٤٠٣١).

[2] - لاوازە،ئەلدەیلەمی لەمسند الفردوس(١/ ٢٥١) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٢٢٠) ئیخراجیان کردووە،ئەلعێراقیی لە(المغني)دا ئەڵێ:بەکری کوڕی خونەیس و ئەلرقاشی تێدایە هەردووکیان لاوازن.

عَنِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ خَرَجَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ "[1]،واتا: هەرکەسێ بۆ یەك شەو تابیگرێ و ئارامبگرێ و لەخوای گەورە رازیی بێ، ئەوە تاوانی پێوەی نامێنێ و وەك رۆژی یەکەمی لەدایکبوونی لەتاوان پاکدەبێتەوە.

ئەلحەسەن وتوویەتی: بەتای یەك شەو، هەموو تاوانەکانی بەندە دەسڕدرێتەوە[2].

لەموسنەدو ئەوانی تردا هاتووە لەئەبو سەعیدی خودرییەوە(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: چوومە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)تا گرتبووی، دەستم خستەسەر عەباکەی بینیم گەرمە، وتم: تایەکەت چەندە گەرمە ئەی پەیامبەری خوا! فەرمووی:"ئێمەی کۆمەڵی پەیامبەران تامان لەسەر سەخت و دوو ئەوەندەیە، تاوەکو پاداشتیشمان دوو ئەوەندە بێ، وتم: ئەی پەیامبەری خوا چی خەڵکانێك کۆست و ناخۆشییان سەختە؟ فەرمووی: پەیامبەران، وتم: پاشان کێی تر؟ فەرمووی: چاکەکاران، بەندە بەهەژاریی تاقیدەکرێتەوەو تەنیا عەبایەکی بۆ دەمێنێتەوە لەبەری دەکات، بەندەی وا هەیە بەئەسپێ تاقیدەکرێتەوە تائەو رادەیەی ئەسپێ دەیکوژێ، ئێوە چەندە حەزتان بەخۆشییە ئەوان ئەوەندە حەزیان بەناخۆشییە بۆ پاداشتەکەی[3].

عوقبەی کوڕی عامری ئەلجوهەنیی ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:،واتا:هەموو کارێك بەمۆڵەت و بڕیاری خوای گەورە روودەدات،

---

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئیخراجی کردووە لە(المرض والكفارات ٣٨)، ئەبو سوفیانی تێدایە، قسە رەتکراو و نەناسراوە، مامۆستاکەشی سالم ئەلخەیاطە: ئەزبەردەکردنی خراپ بووە.

[2] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئیخراجی کردووە لە(المرض والكفارات ٢٨)، عومەری کوڕی موغیرەی تێدایە، قسە رەتکراو و نەناسراوە.

[3] - صەحیحە، ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(٤٠٢٤) هەروەها ئەحمەد(٣/ ٩٤) و حاکم(٤/ ٣٠٧).

که باوەڕدار نەخۆش دەکەوێ فریشتەکان ئەڵێن: ئەی پەروەردگارا، فلأنەکەسی بەندەت لەکار دوورتخستووەتەوە، پەروەردگاریش دەفەرموێت: لەسەر نمونەی ئەو کارەی لە لەشساغییەکەی ئەنجامی دەدا بۆی رابگرن تاوەکو چاکدەبێتەوە یان دەمرێ.

ئەبو هورەیرە ئەڵێ: کە بەندەی موسڵمان نەخۆش دەکەوێت، بەسەر فریشتەکانی سەر شانی راست جاڕ دەدرێت:پاداشت بۆ بەندەکەم بنووسە مادام تاوەکو ساغ بوو کاری چاکەی دەکرد، بەفریشتەی سەر شانی چەپیش دەوترێ: تاوان لەسەر بەندەکەم کەم بکەرەوە مادام بەنەخۆشیی گیرم داوە، پیاوێك لای ئەبو هورەیرە وتی: خۆزگە نەخۆش دەکەوتم، ئەبو هورەیرەش وتی: ئەوە بۆ بەندەیەکە حەزی بەتاوان نەکردووە[1]، ئیبن ئەبی ئەلدونیا باسی کردووە.

هەروەها باسکراوە لەهیلالی کوڕی یەسافەوە وتوویەتی: لای عەماری کوڕی یاسر دانیشتبووین، باسی تاو نەخۆشیی کرا، کابرایەکی ئەعرابیی وتی: قەت نەخۆش نەکەوتووم، عەمار وتی: تۆ لەئێمە نییت، مرۆڤی موسڵمان تووشی نەخۆشی و ناخۆشیی دێت و لەگوناهەکانی هەڵدەوەرێ هەروەك گەڵای دار لەدارەکەی هەڵدەوەرێت، کەسی بێباوەڕیش یان وتی: خراپەکار بەناخۆشی و نەخۆشییەك تاقیدەکرێتەوە وەك وشتر وایە، بەرەڵای دەکەی ناڕوات و دەیبەستیشەوە خۆی راناگرێ[2].

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئیخراجی کردووە لە(المرض والكفارات١٤)،بەیهەقییش لە الشُعب(٩٩٤٨).

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئیخراجی کردووە لە(المرض والكفارات ١٥)، بەیهەقییش لە الشُعب الإيمان(٩٩١٣).

لەئــەبی موعەممــەری ئەزدییــەوە باســدەکریٚ ئــەڵیٚ: کــە شــتێکمان لــەئیبن مەسعود گویٚ لێبووایە حەزمان پیٚ نەکردبایە بیٚ دەنگ دەبووین تــاوەکو روونــی دەکـردەوە، ڕۆژێکیــان پێیــوتین: نەخۆشــیی هــیچ پاداشــتێکی بــۆ نییــە، ئــەم قسەیەمان بەلاوە ناخۆش و گران بوو، وتی: بەڵام تاوانی لەســەر دەسڕدرێتەوە، خۆشحاڵی کردین بەو روونکردنەوەیەو سەرسامی کردین[1].

لەکەماڵی زانست و فیقهی ئیبن مەسعود(خوای لــیٚ رازیــی بــیٚ)، ئەوەیــە کــە پاداشت لەسەر کارێکی سەرپشکانەیە، بەڵام پاداشتی نەخۆشیی و کۆست و بەڵا سڕینەوەی تاوانەکانــە، لەمەدایــە خــوای گــەورە دەفــەرمووێت: ﴿ وَمَآ أَصَـٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ ۝٣٠ ﴾ الشــوری: ٣٠، واتــا: هــەر ناخۆشی یەکتان تووش بووبیٚ ئــەوە بــەهۆی کـردەوەی (خراپی)خۆتانەوەیــە وە لە زۆرێکیش چاوپۆشی کردووە.

پەیامبــــەری خواش(صــــلی الله علیــــه وســــلم)لەبارەی کۆســــت و مەینەتییەوە(موسیبەتەوە)فەرموویەتی:«کفر الله بها من خطایاه »[2]،واتــا:خوای گــەورە بەهۆیــەوە لەتاوانــەکانی دەسڕێتەوە...هەروەها فەرموویــەتی:" المـرض حطة"[3]،واتا: نەخۆشیی مایەی سڕینەوەی تاوانەکانە.

---

[1] - ئــیبن ئــەبی ئەلــدونیا ئیخراجــی کــردووە لــە(المــرض والکفــارات١٦)،تەبــەرانییش لــە المعجــم الکبیر(٨٥٠٦)ئیسنادەکەی حەسەنە.

[2] - پێشتر تەخریج کرا.

[3] - ئەحمەد(١/ ١٩٥ و ١٩٦) و حــاکم(٣/ ٢٦٥) و ئــەبو یــەعلا(٨٧٨)ئیخراجیــان کـردووەو ئیسنادەکەشــی حەسەنە.

کـاره چـاکەو گوێڕایەڵییـەکان پلـەو مـەقام بـەرز دەکەنـەوەو کۆسـت و ناخۆشییەکانیش لەتاوانەکان دەسڕنەوە، لەمەدا پەیامبەری خوا(صـلی الله علیـه وسلم)دەفەرمووێت:«من یرد الله بـه خـیراً یُصـب منـه»[1]،واتـا: هەرکەسـێ خـوای گەوره خۆشبووێ تووشی بەڵاو ناخۆشیی دەبێ. هەروەها فەرموویەتی:«مَنْ یُـرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ»[2]،واتا: خـوای گـەوره خێـرو خۆشـیی هەرکەسـێکی بووێ لەئایین شارەزای دەکات.

یەزیدەی کوڕی مەیسـەره ئـەڵێ: بەنـدەی وا هەیـە نـەخۆش دەکـەوێ و هـیچ چاکەیەکی لای خوای گەوره نییە، خوای گـەوره هەنـدێ لەتاوانـەکانی پێشـووی بیردەخاتەوەو کەسەکە بەئەندازەی سەره مێشێك لەترسی خوا فرمێسك لەچاوی دێتەخوارەوە، خوای گەورەش فریشتەی بۆ دەنێرێ یـان بەپاکبوونـەوە لـەتاوان شـیفای بـدات یـان بەپاکبوونـەوە لـەتاوان بیمرێنـێ[3]، هـیچ شـتێك بەئەنـدازەی فەرموودەکەی ئەبو موسـای ئەشـعەریی(خوای لـێ بـێ) بـۆی پاڵپشـت نییـە کـە لەبارەی پاداشتی ئەو کەسەوەیە کە خوای گەوره منداڵەکـەی، بـەروبوومی دڵـی دەباتەوەو لەبری ئەوە لەبەهەشتدا خانوویـەکی بـۆ دروسـت دەکـات و نـاوی لـێ دەنێ:ماڵی سوپاسگوزاری(بیت الحمد)[4].

زیـادی کـوڕی زەیـدی خزمـەتکاری ئـیبن عـەبیاش(خوای لـێ رازیـی بـێ) و لـەهاوەڵانی پەیامبـەری خواشەوە(صـلی الله علیـه وسـلم)ئەڵێ: چـووینەلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) تای بوو وتمان: ئای ئـای دەردت لـەدایك و

---

[1] - بوخاریی ئیخراجی کردووه(٥٦٤٥).
[2] - بوخاریی (٣١١٦) و موسلیم(١٠٣٧)(١٧٥)ئیخراجیان کردووه.
[3] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا له المرض والکفارات(١٧) و ئەبو نەعیم له الحلیة(٥/ ٢٤٠) و ئیسنادەکەی حەسەنە.
[4] - پێشتر تەخریج کرا.

باوکمان بکەویّ ئەی پەیامبەری خوا ئێش و تات چەندە سەختە! فەرمووی:"انا معاشر الانبياء يضاعف علينا البلاء تضعيفا"،واتا:ئێمەی کۆمەڵی پەیامبەران بەڵاو کۆستمان چەند جارەیە، وتمان: سبحان الله! فەرمووی:" أفعجبتم ان كان النبي من الانبياء ليقتله القمل"،واتا: پێتان سەیرە کە پەیامبەری وا هەبووە ئەسپیّ بووەتە هۆکاری مردنی،وتمان: سبحان الله! ،فەرمووی:" أفعجبتم ان أشد الناس بلاء الانبياء ثم الصالحون ثم الامثل فالامثل"،واتا: ئایە پێتان سەیرە کە سەختترین ناخۆشیی تووشی پەیامبەران دەبیّ پاشان چاکەکاران و پاشان باشترین و پاشان باشترین،وتمان:سبحان الله، فەرمووی:" أفعجبتم ان كانوا ليفرحون بالبلاء كما تفرحون بالرخاء "، واتا: ئایە پێتان سەیرە ئەوان بەبەڵاو ناخۆشیی خۆشحاڵبوون هەروەك ئێوە بەخۆشیی خۆشحاڵن[1].

نەسائیی باسیکردووە لەئەبی عوبەیدەی کوڕی حوزەیفەوە، ئەویش لەفاتیمەی پووریيەوە(خوشکی باوکی) وتوویەتی: لەگەڵ کۆمەڵێك لەژنان چووینە سەردانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)دڵۆپ دڵۆپ ئاوی دەکرا بەسەردا ئەوەندە تایەکەی سەخت بوو فێنکی نەدەکردەوە، وتمان: ئەی پەیامبەری خوا خۆزگە لەخوا دەپاڕایتەوە تاوەکو ئەم تایەت نەمابایە، ئەویش فەرمووی:"إن أشد الناس بلاءً الانبياء، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم"[2]،واتا: سەختترین ئەوانەی ناخۆشییان هەبیّ پەیامبەرانن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان.

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئیخراجی کردووە لە(المرض والكفارات ١٥)، لەئیسنادەکەیدا لاوازیی هەیە.

[2] - ئەحمەد(٦/ ٣١٩) و نەسائییش لە السنن الكبرى(٤/ ٣٥٥) و حاکم(٤/ ٤٠٤)ئیخراجیان کردووە.

مەسروق لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ)دەگێڕێتەوە ئەڵێ: هیچ کەسێکم نەبینیووە بەئەندازەی پەیامبەری خوا تاو ئازاری هەبووبێ[1]. کە نەخۆش بکەوتبایە سەخت نەخۆش دەکەوت تائەوەی رەنگە پانزە رۆژ نەدەخەوت و کەمەرو گورچیلەی ژانی دەکرد، ئێمەش وتمان: ئەی پەیامبەری خوا خۆزگە لەخوای گەورە دەپاڕایتەوە بەڵکو شیفات بدات، ئەویش فەرمووی:"إنا معاشر الانبیاء یشدد علینا الوجع لیکفر عنا"[2]،واتا: ئێمەی کۆمەڵی پەیامبەران ئێش و ئازارمان زۆرە تاوەکو لەهەڵە پاکبینەوە.

لەموسنەدو نەسائییشدا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەبی سەعیددا، ئەڵێ: پیاوێك وتی:ئەی پەیامبەری خوا، ئەم نەخۆشییانەی ئێمە تووشی دەبین سوودی هەیە؟ فەرمووی: مایەی سڕینەوەی تاوانەکانە، ئوبەیی کوڕی کەعب وتی: ئەی پەیامبەری خوا گەر نەخۆشییەکە کەم و سووکیش بێ؟ فەرمووی: گەر دڕکێکیش بێت. ئەڵێ ئوبەیی کوڕی کەعب دوعای نەخۆش کەوتنی لەسەر خۆی کرد تائەوکاتەی ئەمرێ تای لێ نەبڕێت، تایەك بێ لەحەج و عومرەو جیهاد لەپێناوی خواو نوێژە فەرزە بەکۆمەڵەکانی دانەبڕێت...ئەڵێ ئوبەیی تاوەکو مرد پێستی گەرم و تادار بوو[3].

عبداللەی کوڕی عامر ئەڵێ:پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:"ان العبد اذا کان علی طریقة حسنة من العبادة ثم مرض قیل

---

[1] - بوخاری(٥٦٤٦) و موسلیم(٢٥٧٠)ئیخراجیان کردووە.

[2] – لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والکفارات(٩)ئیخراجی کردووە، عبداللەی کوڕی لوهەیعەی تێدایە کەسێکی لاوازە.

[3] - حەسەنە، ئەحمەد(٣/ ٢٣) و نەسائیی لە السنن الکبری(٣/ ٥٠٢ تحفة الأشراف)ئیخراجیان کردووە.

للملك الموكل به أكتب له مثل عمله اذا كان طلقا أو أكفته إلي"[1]، واتا: ئەگەر بەندە پەرستشێکی باش و جوانی کردبێ و پاشان نەخۆشبکەوێ، ئەوە بەو فریشتەیە دەوترێ کە کردەوەکانی دەنووسێتەوە، نمونەی کردەوەکانی پێشووتری بۆ بنووسە تاوەکو چاکدەبێتەوە یان دەگەڕێتەوە لای من.

هەروەها باسکراوە لەئەبی ئومامەی باهیلییەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی: "ان الله ليجرب أحدكم بالبلاء وهو أعلم به كما يجرب أحدكم ذهبه بالنار فمنهم من يخرج كالذهب الابريز فذلك الذى نجاه الله من السيئات ومنهم من يخرج كالذهب دون ذلك فذلك الذى يشك بعض الشك ومنهم من يخرج كالذهب الأسود فذلك الذى قد أفتتن"[2]،واتا:خوای گەورە یەکێك لەئێوە بەبەڵاو ناخۆشیی تاقیدەکاتەوەو دەشزانێ و ئاگاداری سرووشت و توانای کەسەکەشە، هەروەك یەکێك لەئێوە ئاڵتوونەکەی بەئاگر تاقیدەکاتەوە، هەندێکتان لەو تاقیکردنەوەدا وەك ئاڵتوونی پووخت دەردەچێ، ئەوە ئەوانەتانن کە خوای گەورە لەخراپەکان رزگاریکردوون، هەندێکی ترتان ئاڵتوونی نمرە نزمتر دەردەچێ، ئەوانەتانن کە هەندێ گومانیان هەیە، هەندێکی ترتان وەك ئاڵتوونی رەشن، ئەوە ئەوانەتانن کە بەفیتنەدا چوون.

لە(مراسیل)ەکانی حەسەنی بەسرییدا لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)ەوە کە فەرموویەتی:"ان الله ليكفر عن المؤمن خطاياه كلها بحمى

---

[1] - صەحیح، عبدالرزاق لە مصنف(٢٠٣٠٨) و ئەحمەد(٢/ ٢٠٣) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٢٦)ئیخراجیان کردووە.

[2] - لاوازە، تەبەرانیی لە المعجم الكبير(٧٦٩٨) و حاكم(٤/ ٣١٤) ئیخراجیان کردووە، عفیری کوڕی معدانی تێدایە کەسێکی لاوازە.

لیلـة"[1]،واتـا: خـوای گـەورە بـەتای یـەك شـەو لەتـەواوی تاوانـەكانی بـاوەڕدار خۆشدەبێ.

ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا ئـەڵێ: ئـیبن موبـارەك وتوویـەتی: ئەمـە نمونەیـەكی فەرموودەی باشە[2]، ئەڵێ: ئومێدیان هەبووە بەتای یەك شەو تاوانەكانیان لەسەر بسڕدرێتەوە[3].

لەئەنەسەوە باسدەكرێت: كە پەیامبـەری خوا(صلى الله عليه وسلم)چـووەتە لای پیاوێــك شــكایەتی حــاڵی نەخۆشــییەكەی كــردووە، پەیامبــەریش فەرموویەتی:"اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ تَعْجِيلَ عَافِيَتِكَ، أَوْ صَبْرًا عَلَى بَلِيَّتِكَ، أَوْ خُرُوجًا مِنَ الدُّنْيَا إِلَى رَحْمَتِكَ"[4]،واتـا: بـەڵكو بڵـێ: خوایـە گیـان داوات لێدەكـەم شـیفای خۆتم بۆ پێشبخەی یان ئارامیم پێ بدەی یـان لـەدونیا بـۆ سـۆزو بـەزەیی خـۆت دەربچم.

عائیشــە(خوای لــێ رازیــی بــێ) ئــەڵێ: پەیامبــەری خوا(صــلى الله علیــە وسلم)فەرمووی: "ان الحمى تحط الخطايا كما تحط الشجرة ورقها "[5]، واتـا: تـا تاوانەكان لەسەر بەندە هەڵدەوەرێنێ هەروەك چۆن دارو درەخـت گـەڵای خـۆی دەوەرێنێ.

---

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٢٨)ئیخراجی كردووە،كەسی نەناسراوی تێدایە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٤٠)ئیخراجی كردووە.

[3] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٢٩)و ئەحمەد لە الزهد ئیخراجیان كردووە.

[4] – لاوازە، ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا لـە المـرض والكفـارات(٣٠)ئیخراجـی كـردووە، یونسـی كـوڕی عەتبیـەی ئەلصەفاری تێدایە كەسێكی لاوازە.

[5] - صحیح لغیرە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٣٢)ئیخراجی كردووە.

ئەبو هورەیرە جارێکیان کە سەردانی نەخۆشێك دەکات بەنەخۆشەکە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:"ان الله عز وجل یقول هی ناري أسلطها علی عبدی المؤمن في الدنیا لتکون حظه من النار في الآخرة"[1] ،واتا:خوای گەورە دەفەرمووێ، ئاگری منە لەدونیادا بەسەر بەندەی باوەڕدارمدا زاڵی دەکەم تاوەکو لەئاگری ئاخیرەت رزگاری بێ.

موجاهید ئەڵێ[2]: تا پشکی دۆزەخی هەموو باوەڕدارێکەو پاشان ئەم ئایەتەی خوێندووەتەوە:﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ﴾ مریم: ٧١، واتا: کەس نییە لە ئێوە نەڕوات و تێنەپەڕێت بەسەر دۆزەخدا(ئەو تێپەڕینە)بڕیارێکی بڕاوەیە لە پەروەردگارتەوە.

موجاهید لەتەفسیرەکەیدا ئەوەی باس نەکردووە، یەکلاکراو نییە کە دەبێ هەموو مرۆڤێك بچێتە دۆزەخەوە، بەڵکو خوای گەورە بەڵێنی داوە هەموو بەندەکانی دۆزەخ ببینن، ئەوەشی مرۆڤی باوەڕدار تووشی دەبێ لە تا، باوەڕدارەکە لەگوناهـ پاکدەکاتەوەو ئیتر لەقیامەتتدا ناچێتە دۆزەخەوەو خێرا لەدۆزەخ رزگاری دەبێ، خواش زاناترە، بەڵگە بۆ ئەمەش فەرموودەکەی ئەبو ریحانەیە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)کە فەرموویەتی:،واتا: "الحمی کیر من کیر جهنم وهی نصیب المؤمن من النار"[3]،واتا: تا بەشێکی دۆزەخە، پشکی باوەڕدارە لەو ئاگرە.

---

[1] - صەحیحە، ترمیزی(٢٠٨٨) و ئیبن ماجە(٣٤٧٠) و ئەحمەد(٢/ ٤٢٠)ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئەبو ئەلحەجاج موجاهیدی کوڕی جەبری ئەلمالیکی، تابیعی و موفەسیر(ساڵی٢١کۆچیی لەدایکبووە، ئەڵێ:١٠٤ك).

[3] - ئیبن جەریر لەتەفسیرەکەیدا(١٦/ ١١١)ئیخراجی کردووە، یەحیای کوڕی یەمانی تێدایە لاوازە.

ئەنەس(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) فەرمووی:"مثل المؤمن اذا برأ وصح من مرضه كمثل البردة تقع من السماء في صفائها ولونها"[1]، واتا: نمونەی باوەڕدارێك كە لەنەخۆشییەكەی رزگاری دەبێ، نمونەی تەرزەكەیە لەئاسمان بەربووبێتەوە لەپاك و رەنگدا، ئیبن ئەبی ئەلدونیا باسی كردووە.

هەر ئیبن ئەبی ئەلدونیا باسیكردووە لەئەبی ئومامەوە بەمەرفوعی:"ما من مسلم يصرع صرعة من مرض الا بعث منها طاهرا "[2]،واتا: هەر موسڵمانێك تووشی نەخۆشیی بێ، ئەو نەخۆشییە بۆی پاكبوونەوەیە لەتاوان.

هەر لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیە وسلم)گێڕدراوەتەوە فەرموویەتی:"مثل المؤمن حيث يصيبه الوعك مثل الحديدة تدخل النار فيذهب خبثها ويبقى طيبها "[3]،واتا: نمونەی ئەو باوەڕدارەی تووشی لەرزو تا دێت، نمونەی ئاسنێكە بخرێتە ئاگرەوە كە پیسییەكەی نامێنێ و بەشە چاكەكەی دەمێنێتەوە.

هەر لەپەیامبەری خواوە بەمەرفوعی:"ان العبد اذا مرض أوحى الله إلى ملائكته يا ملائكتي أنا قيدت عبدي بقيد من قيودي فإن أقبضه أغفر له وان

---

[1] - بوخاری لە التاريخ الكبير(٤/ ١/ ٦٣) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٢١)ئیخراجیان كردووە.

[2] - زۆر لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٢٢)ئیخراجی كردووە،بڕوانە: الموضوعات ی ئیبن ئەلجەوزی.

[3] - صحيح لغيره، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٢٤) و حاكم(١/ ٣٤٨) و بەیهەقییش(٣/ ٣٧٤)ئیخراجیان كردووە.

أعافه فجسد مغفور لا ذنب له"[1]،واتا: بەندە کە نەخۆش دەکەوێ، خـوای گـەورە نیگا بۆ فریشتەی خۆی دەکات، ئەی فریشتەکەم مـن بـەکۆت و بەنـدێك بەنـدەی خـۆمم کـۆت و بەنـد کـردووە، گـەر ژیـانم لـێ سـەندەوە لێیخـۆش دەبم و گـەر لەنەخۆشـییەکەش هەسـتایەوە ئەوەیـە جەسـتەیەکی لێخۆشـبوونی بـێ تـاوان دەردەچێ.

موعـازی کـوڕی سـەهلی کـوڕی ئەنەسـی ئەلجوهـەنی، ئـەویش لەباوکییـەوە ئەویش لەباپیرییەوە ئەڵێ: چوومە لای ئەبو دەرداء لەنەخۆشییەکەیدا، وتم:ئـەی ئەبو دەرداء ئێمە حەز دەکەین لاشە ساغبین و نەخۆش نەکەوین، ئـەویش وتـی: گوێم لێبوو پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)ئەیفەرموو:"ان الصـداع والمليلـة لا يزالان بالمؤمن وان كان ذنبه مثل أحد حتى لا يدعان عليه من ذنبه مثقال حبـة مـن خـردل"[2]،واتـا: سەرئێشـەو تـا لەگـەڵ بـاوەڕداردا دەبـێ گـەر بەئەنـدازەی ئوحودیش تاوانی پێوە بێ تاوانی لەسەر ناهێڵن، بەنمونەی تۆزقاڵێکیش.

ئوم سەلەمە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليـه وسـلم):" مـا ابتلـى الله عبـدا بلاء وهو على طريق يكرهها الا جعل الله ذلك البلاء له كفارة وطهورا ما لم ينزل مـا أصـابه مـن الـبلاء بغـير الله أو يـدعو غـير الله يكشـفه"[3]،واتـا: خـوای گـەورە کـە بەندەی خۆی تاقیدەکاتەوەو حەزی پێ ناکات مایەی سڕینەوەی تاوانـەکانێتی، تائەوەی ئەو بەڵایەی بۆی دابەزیووە هی جگە لەخوای گەورە نەبێ یان لەغەیری خوا لەکەسی تر نەپاڕێتەوە شیفای بدات.

[1] - حسن لغيره، حاكم(٤/ ٣١٣) و تەبەرانی لە المعجم الكبير(٧٧٠١)ئیخراجیان کردووە.
[2] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٤١) و ئەحمەد(٥/ ١٩٨)ئیخراجیان کردووە.
[3] لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٤٣)ئیخراجی کردووە.

عەتییـەی کـوڕی قـەیس ئـەڵێ: کـەعب نەخۆشـکەوت، کۆمـەڵێکی خـەڵکی دیمەشـق سـەردانیان کـردو وتیـان: وەزعـت چـۆنە ئـەی ئـەبو ئیسـحاق؟ وتـی: جەستەیەکە و بەهۆی تاوانی خۆیەوە نەخۆشکەوتووە، گەر بیەوێ پەروەردگاری سزای دەدات و گەر بشیەوێ بەزەیی پـێ دەکـات، ئەگـەر هەڵیشـی بسـتێنێتەوە بەدروستبوونێکی نوێ و بێتاوان دەیخاتەوە سەر پێ[1].

سەعیدی کوڕی وەهـب ئـەڵێ: لەگـەڵ سـەلمانی فارسـییدا چـووینە سـەردانی پیاوێکی کیندە کە نەخۆش بوو، سەلمان وتی: مرۆڤی موسڵمان تاقیدەکرێتەوەو نەخۆشکەوتنی کەفارەتی تاوانـەکانی پێشـوویەتی و لێـی پاکدەبێتـەوە، مرۆڤـی بێباوەڕیش تاقیدەکرێتەوە، مرۆڤی بێباوەڕ نمونەی وشترێکە کە بـەرەڵای بکـەی ناتوانێ بڕوات و جڵەویش بکرێ نازانێ بۆ جڵەوکراوە[2].

هەروەها لە ئەبو ئەیووبی ئەنصارییەوە گێڕاویەتییەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا سەردانی نەخۆشـێکی ئەنصـاریی کـردو چـەمییەوە بـۆ سـەر سـەری و ئـەحواڵی پرسی، ئەنصارییەکە وتی: پەیامبەری خوا بۆ چەند هەفتەیەکە چاوم لەسەریەك نەناوە، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:"أي أخي أصبر أصـبر تخرج من ذنوبك كما دخلت فيهـا"،واتـا: براکـەم ئـارامبگرە تـاوەکو لـەو تاوانانـە دەربچی کە ئەنجامت داون. پاشان فەرمووی:"سـاعات الأمـراض يـذهبن سـاعات الخطايا "[3]،واتا: کاتەکانی نەخۆشیی، کاتەکانی تاوان دەسڕنەوە.

---

[1] - لاوازە، بەیهـەقیی لـە شـعب الإيمـان(٩٨٢٣) ئیخراجـی کـردووە، ئـەبو بـەکری کـوڕی ئـەبی مەریـەمی ئەلغەسسانیی ئەلشامیی تێدایە لاوازە.

[2] - بوخاریی لە الادب المفرد(٤٩٣) و ئیبن ئەبی شەیبە لە المصنف(٣/ ٢٣١)ئیخراجیان کردووە.

[3] - لاوازە، بەیهەقیی لـە شـعب الإيمـان(٩٩٢٥)دا ئیخراجـی کـردووە، هەیسـەمی کـوڕی ئەشعەسـی تێدایـە نەناسراوە.

لەنەسائیییەوە لەفەرموودەیەکی ئەبی هورەیرەدا: کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)بەئەعرابییەکی فەرمووە:"هل أخذتك أُمُّ مِلْدَمٍ؟"،واتا: ئایە تووشی أم ملدم هاتووی؟ وتی:أم ملدم چییە؟ فەرمووی:"حَرٌّ يَكُونُ بَيْنَ الْجِلْدِ وَاللَّحْمِ "،واتا: گڕ و گەرمییەکە ئەکەوێتە نێوان پێست و خوێنەوە. کابرا وتی: نەخۆشیی لەو جۆرەم نەبینیووە. فەرمووی:" فَهَلْ أَخَذَكَ الصُّدَاعُ؟" ،واتا: ئەی ئەعرابی تووشی سەرئێشە هاتووی(صُداع)؟ وتی: صُداع چییە؟ فەرمووی:" عُرُوقٌ تَضْرِبُ عَلَى الْإِنْسَانِ فِي رَأْسِهِ "،واتا: ژانەسەرێکە تووشی سەر دەبێ. وتی: ئەو نەخۆشییەم نەبینیووە، کە کابرا پشتی هەڵکردو رۆیشت، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:"مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا "[1]،واتا: هەرکەسێ حەز دەکات پیاوێکی دۆزەخیی ببینێ با بڕوانێتە ئەو پیاوە.

ئوم سەلیم ئەڵێ: نەخۆشکەوتم و پەیامبەری خوا سەردانیکردم و فەرمووی:" یا أم سلیم أتعرفین النار والحدید وخبث الحدید؟"،واتا: ئەی ئم سەلیم ئاگرو ئاسن و پیسیی ئاسن دەزانی؟ وتم: بەڵێ ئەی پەیامبەری خوا، فەرمووی:"فأبشري یا أم سلیم فإنك إن تخلصي من وجعك هذا تخلصي من الذنوب کما یخلص الحدید من خبثە" واتا: دە مزگێنیی بدە ئەی ئوم سەلیم، تۆ بەم ئازارەت لەتاوان پاکدەبیتەوە هەروەك چۆن ئاگر ئاسن لەپیسییەکەی پاکدەکاتەوە.

[1] - صحیح لغیرە، بوخاری لە الادب المفرد(٤٩٥) و ئەحمەد(٢/ ٣٣٢) و ئیبن حیبان(٢٩١٦) و حاکم(١/ ٣٤٧)ئیخراجیان کردووە.

هاوەڵێك بۆ سەردانی برایەکی دەرچوو، پێش ئەوەی بگاتەلای هەواڵی پێگەیشت کە برا نەخۆشەکەی شکایەتی حاڵی نەخۆشییەکەی کردووە، بۆیە ئەڵێ: بەسەردانیکارو دڵدەرەوەو مزگێنییەوە بۆلای تۆ هاتووم. وتی: چۆن ئەو هەموو شتانەت پێکەوە کۆکردەوە؟ وتی: من بەنیازی سەردانیکردنت هاتم، پێمگەیشت کە شکایەتی حاڵی خۆتت کردووە بۆیە بووە سەردانیکردنی نەخۆش(دڵدانەوە)، مزگێنیی شتێکت پێ دەدەم کە لەپەیامبەری خوام بیستووە(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:" إِذا سبقت للْعَبد من الله منزلَة لم يبلغهَا بِعَمَلِه ابتلاه الله فِي جسده أَو فِي مَاله أَو فِي وَلَده ثمَّ صبره حَتَّى يبلغهُ الْمنزلَة الَّتِي سبقت لَهُ من الله"[1]، واتا: ئەگەر بەندە لای خوای گەورە بەپێگەو پلەیەك بگات و کرداری ئەو پێگەیەی نەبێ، ئەوە خوای گەورە لەجەستەی یان منداڵی یان بەسەروەتەکەی تاقیدەکاتەوە، ئارامگرییشی دەکات تاوەکو بگاتە ئەو پێگەیەی کە پێشتر بۆی داناوە.

ئەلحەسەن کاتێك باسی ئێش و ئازارو لەرزو تای کردووە وتوویەتی: سوێند بەخوا لەو رۆژگارە نەخۆشییە هیچ شتێکی تر نییە مزگێنیتربێ بۆ موسڵمان، ئەوەی بیردەکەوێتەوە لەکاری چاکە نەیکردووەو قیامەتی بیردەکەوێتەوەو لەتاوانەکانیشی لێبووردن دەستدەخات[2].

---

[1] - حسن، خەتیبی بەغدادی(٣/ ٤١٠) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض و الكفارات(٣٣)ئیخراجیان کردووەو کەسانێکی تێدایە نەناسراونەتەوە.

[2] - ئەحمەد لە الزهد(لا٣٢٨) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٥٥) و بەیهەقیی لە الشُعب الإيمان(٩٩٩١)ئیخراجی کردووە.

هەندێ لەپێشین وتوویانە: گەر كۆست و ناخۆشییەكانی دونیا نەبووایە، ئەوە ئاخیرەتمان مایە پووچ دەبوو[1].

ئەنەسی كوڕی مالیك(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)گەیشتە لای دارێك، لەراندییەوە تاوەكو خوا بیەوێ گەلای لێ بەربوویەوە، پاشان فەرمووی:"المصائب والاوجاع في إحباط ذنوب أمتي أسرع مني في هذه الشجرة "[2]،واتا: سەخت و ناڕەحەتی و ئێش و ئازارەكان لەسڕینەوەی تاوانی ئوممەتەكەمدا لەمن خێراترن لەلەراندنەوەی ئەم دارەو وەراندنی گەڵاكانی.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا باسیكردووە لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ) بەمەرفوعی:"ما من مسلم إلا وكل الله به ملكين من ملائكته لا يفارقانه حتى يقضي الله بأمره بإحدى الحسنيين اما بموت واما بحياة فإذا قال له العواد كيف نجدك قال أحمد الله أجدني والله المحمود بخير قال له الملكان أبشر بدم هو خير من دمك وصحة هي خير من صحتك وان قال أجدني مجهودا في بلاء شديد قال له الملكان ابشر بدم هو شر من دمك وبلاء أطول من بلائك"[3]،واتا: هەر موسڵمانێك خوای گەورە دوو فریشتەی بۆ تەرخان كردووە و لێی نابنەوە تاوەكو خوای گەورە بڕیاری یەكێك لەدوو كارە شیرینەكە دەدات، یا مردن یان ژیان، كاتێك یەكێ سەردانی نەخۆشەكە ئەكات و ئەڵێ: حاڵت چۆنە؟ ئەویش ئەڵێ: الحمدلله

[1] - بەیهەقیی ئیخراجی كردووە لە شعُب الإيمان(٩٩٩٣).

[2] - لاوازە، ئەبو یەعلا(٤٢٩٩) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرج والكفارت(٥٧) و بەیهەقیی لە الشعب(٩٨٦٤) ئیخراجی كردووە، جابر ئەلجەعفیی تێدایە مەتروكە.

[3] - لاوازە، بەیهەقیی لە شعب الإيمان(٩٤٤٠) یەحیای كوڕی ئەلموتەوەكیل، لاوازە.

ئەمبینی سوپاس بۆ خوا باشم. دوو فریشتەکە ئەڵێن: موژدە بدە بەخوێنێك باشتر بێ لەم خوێنەی ئێستاو بەلەشساغییەك باشتربێ لە لەشساغیی ئێستات. ئەگەر بڵێ: ئەمبینی لەبەڵاو ناخۆشییدا ماندوو بووم، دوو فریشتەکە پێی ئەڵێن: موژدە بدە بەخوێنێك خراپتر لەم خوێنەی ئێستات و بەڵاو ناخۆشییەکی درێژترت لەمەی ئێستات.

ئەمەش دژ نییە بەوەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) لەسەرئێشەو ئازارەکەیدا فەرمووی:"وا رأساه"[1]،واتا: ئای ئێشی سەرم، هەروەها قسەی سەعد: ئەی پەیامبەری خوا من ئێش و ئازارم هەیەو خاوەن سەروەت و سامانیشم[2]، هەروەها قسەی عائیشە(خوای لێ رازیی بێ): :"وا رأساه"[3]،واتا: ئای ئێشی سەرم.

ئەلحەسەن ئەڵێ: ئەمڕۆ باوکت گۆشت و خوێنی بەنەخۆشیی تووشبێ باشترە لەوەی خۆڵ گۆشت و خوێنەکەی بخوات[4].

ثابتیش ئەڵێ:چووینە سەردانی رەبیعەی کوڕی ئەلحاریث کە نەخۆشییەکەی گران بوو،وتی: هەرکەسێ ئەم حاڵەی منی هەبێ ئاخیرەت دڵی پڕ دەکات و دونیای لەبەرچاو لەمێشێ بچووکتر دەبێتەوە[5].

[1] - بوخاری(٥٦٦٦)ئیخراجی کردووە.

[2] - بوخاری(١٢٩٥) و موسلیم(١٦٢٨)ئیخراجیان کردووە.

[3] - بوخاری(٥٦٦٦)ئیخراجی کردووە.

[4] - صەحیحە، ئەحمەد لە الزهد(٢٥٧) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والکفارات(٥٠)ئیخراجیان کردووە.

[5] - صەحیحە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والکفارات(٥١)ئیخراجی کردووە.

لـــەئەنەسەوە بـــاسدەکرێ ئـــەویش لەپەیامبـــەری خواوە(صـــلی الله علیـــە وسلم):« إِذَا مَرِضَ الْعَبْدُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ خَرَجَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهِ »[1]،واتا:ئەگەر بەندە سێ ڕۆژ نەخۆشکەوت، ئـەوە لەتاوانـەکانی ڕزگـاری دەبـێ و وەك یەکـەم ڕۆژی لەدایکبوونی لێ دێت.

هەر لەپەیامبـەری خواوە(صـلی الله علیـە وسـلم)دەگێڕدرێتەوە:(لا تـرد دعـوة المـریض حتـى يـبرأ)[2] ، واتـا: پاڕانـەوەی نـەخۆش ڕەتناکرێتـەوە تـاوەکو چـاك نەبێتەوە.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا باسدەکات لەئیبن مەسعودەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەڵێ: لەتـەك پەیامبـەری خوادا(صـلی الله علیـە وسـلم) دانیشـتبووم، بزەیـەکی کـرد، وتمان: ئەی پەیامبەری خوا بۆچی بزەت کرد؟ فەرمووی:((سـەیرم بـەباوەڕدارێك دێت لەدەست نەخۆشیی دەکڕوزێتـەوەو حـەزی پـێ ناکـات، گـەر دەیزانـی چـی خێرو چاکەیەك لەنەخۆشییدا هەیە، ئەوە حەزی دەکرد تاوەکو دەمـرێ نـەخۆش ببووایە))، پاشان بزەیەکی تری کردو سەری بەرزکردەوە بـۆ ئاسمـان و ئێمـەش وتمان: ئەی پەیامبەری خوا بـۆ بـزەت کـردو سـەرت بـۆ ئاسمـان بـەرز کـردەوە، فـــەرمووی: ســـەیرم لـــەدوو فریشـــتە دەهـــات لەئاسمانـــەوە دابـــەزین بەشـــوێن بەندەیەکی باوەڕدارەوە کە پێشتر سەرقاڵی نوێژەکانی دەبـوو ئێسـتا لەشـوێنی

---

[1] - لاوازە، ئەحمەد(٣/ ١٧٤) و بەیهەقیی لەشُعب الإیمان(٩١٨١) ئیخراجیان کردووە، هـارونی کـوڕی ئـەبی داوودی ئەلحبطیی تێدایە کە نەزانیی تێدا هەبووە.

[2] -بەیهەقیی ئیخراجی کردووە لەشُعب الإیمان(١٠٠٢٩) ئیخراجی کردووە، سوەیدی کوڕی سـەعیدی تێدایـە لاوازەو عەبدولڕەحمانی کوڕی زەیدی ئەلعەمی کە ئیبن موعین بەدرۆزنی داناوە.

نوێژدا نەیانبینی، بەرزبوونەوە بۆلای خوای گەورەو وتیان: ئەی پەروەردگار فلانە بەندەت لەشەوو رۆژێکدا ئەوەندەو ئەوەندە کاری چاکەمان بۆ دەنووسی، ئێستا نەخۆشت خستووەو هیچ کارو کردەوەیەکی نییە بۆی بنووسین، پەروەردگاریش فەرمووی: ئەو کارانە بۆ بەندەکەم بنووسن کە شەو و رۆژی جاران دەیکردن و هیچی لێ کەم مەکەنەوە، پاداشتی ئەو نەخۆشخستن و پەککەوتنەی لای منەو پاداشتی جارانی دەدەم))[1].

لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)دەگێردرێتەوە: "مَنْ وَعَكَ لَيْلَةً فَصَبَرَ ، وَرَضِيَ بِهَا عَنِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ خَرَجَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ"[2]،واتا: هەرکەسێ یەك شەو تا بیگرێ و ئارامبگرێ و بەرانبەر بەخوای گەورە رازیی بێ لەسەر ئەو نەخۆشییە، لەتاوانەکانی پاکدەبێتەوەو وەك یەکەم رۆژی لەدایکبوونی لێدێتەوە.

لەمەراسیلەکانی یەحیای کوڕی ئەبی کەثیرەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)چەند رۆژێ سەلمانی نەبینیبوو، لەبارەیەوە پرسیاری کرد، هەواڵی پێ درا بەوەی نەخۆشە، پەیامبەریش رۆیشتووەتە سەردانی و فەرموویەتی:" شفى الله سقمك وعظم أجرك وغفر ذنبك ورزقك العافية في دينك وجسمك إلى منتهى أجلك إن لك من وجعك خلالا ثلاثا أما الأولى فتذكرة من ربك يذكرك بها وأما الثانية فتمحيص لما سلف من ذنوبك وأما الثالثة فادع بما شئت

---

[1] - لاوازە، بەیهەقیی ئیخراجی کردووە لەشُعب الإيمان(٩٩٣٨) ئیخراجی کردووە،ئەلهەیسەمییش باسی کردووە لە مجمع الزوائد(٢/ ٣٠٤) و موحەممەدی کوڕی ئەبی حەمیدی تێدایە زۆر لاوازە.

[2] - لاوازە، بەیهەقیی لەشُعب الإيمان(٩٨٦٨) ئیخراجی کردووە.

فإن المبتلى مجاب الدعوة "[1]، واتا: خوای گەورە شیفات بدات و پاداشتت بداتەوەو لێتخۆشبێ و لەئایین و لاشەت و تاکاتی مردنی سەلامەتییت پێ بدات، بێگومان لەم ئازارەتدا سێ شتت بۆ هەیە، یەکەمجار بەم نەخۆشییە خوات بیردەکەوێتەوە، دووەم شت لەتاوانەکانی پێشووت دەسڕدرێتەوە، سێیەم شتیش: چۆنت دەوێ بپاڕێرەوەو داوا بکە، چونکە کەسی تاقیکراو پاڕانەوەی قبوڵکراوە.

زیادی کوڕی ڕەبیع ئەڵێ: بە(ئوبەیی کوڕی کەعب)م وت[2]: ئایەتێك لەکتێبی خوا خەفەتباری کردووم، وتی: کام ئایەت؟ وتم:﴿مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ﴾ النساء: ١٢٣، واتا: هەرکەسێك خراپەیەك بکات پادشت دەدرێتەوە.

وتی: من بۆ ئەوە لەخۆم تێگەیشتووتر دەتبینم، باوەڕدار تووشی هەر پێخزان و ئێش و ئازارێك بێتەوە بەهۆی تاوانەکانەوەیەتی، لێبووردنی خوای گەورەش لەوە زۆرترە[3].

لەعائیشەم پرسی لەبارەی ئەو ئایەتەوە، فەرمووی: لەوەتەی لەپەیامبەری خوام پرسیووە کەس ئەو پرسیارەی لەبارەوە لەمن نەکردووە، پەیامبەری

---

[1] – تەبەرانیی ئیخراجی کردووە لە المعجم الكبير(٦١٠٦)، عەمری کوڕی خالیدی ئەلقورەیشیی تێدایە مەتروکە.

[2] - ئوبەیی کوڕی کەعبی کوڕی قەیسی کوڕی عوبەید لەنەوەی نەجاڕ بوو لەخەزرەجەکان، ئەبو ئەلمونزیر: هاوەڵێکی ئەنصاریی بوو، پێش ئیسلام یەکێك بوو لەزاناکانی جولەکەو کتێبە کۆنەکانی خوێندبووەوە، خوێندنەوەو نووسینی دەکرد ئەگەرچی لەسەردەمی ئەودا ژمارەی ئەوانەی خوێندەواری و نووسینیان دەزانی زۆر کەم بوون، کە بووە موسڵمان بووە یەکێك لەنووسەرانی وەحی، ساڵی(٢١)کۆچیی مرد.

[3] - صەحیحە، بەیهەقیی ئیخراجی کردووە لەشُعب الإيمان(٩٨١٤) ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات ئیخراجیان کردووە.

خوا(صلى الله عليه وسلم) لەوەلامی پرسیارەکەمدا فەرمووی:"ئەمە سزای خـوای گەورەیە بۆ بەندەکەی کە تووشی دەکـات بـەتاو کۆسـت و بـەلاو درك و پچڕانی پەتی نەعلەکەی، تەنانەت کـە شـتێکی لەبەرچـاو لـێ ونـدەبێ و بـۆی دەکەوێتـە پەژارەوەو بۆی دەردەکەوێ کەوتووەتە ژێر دەستییەوە، بەوانە مرۆڤی بـاوەڕدار لەتاوانــەکانی پاکدەبێتــەوە هــەروەکو چــۆن ئــاڵتوونی ســوور لــەکوورەدا پاکدەبێتەوە.

وەهبی کوڕی مونبیە ئەڵێ:هیچ مرۆڤێك نابێتـە شەرعناسـێکی کامـڵ تـاوەکو بەلاو موسیبەت بەنیعمەت و خۆشگوزەرانییش بەبەلاو موسیبەت نەزانێ، چـونکە کەسی کۆستبار چاوەڕێی خۆشگوزەرانییەو خۆشگوزەرانیش چاوەڕێی کۆسـت و بەلایە[1] .

لەهەندێ کتێبی خوای گەورەدا هاتووە:((خوای گەورە بەندەی تووشی کارێك دەکات کە بەندەکە حەزی پێ ناکات، بەلام خوای گـەورە ئـەوەی دەوێ تـاوەکو ببینێ بەندەکەی چۆن لێیدەپارێتەوە))[2].

کەعب ئەڵێ: لەتەوراتدا ئەوەم بینیووە:ئەگـەر بەنـدەی بـاوەڕدارم خەفـەتبار نــەدەبوو، گــاڵۆکێکی ئاســنینم لــەبێباوەڕ دەدا هــەرگیز سەرئێشــەی تــووش نەبووایە[1].

---

[1] - ئەبو نەعیم لە الحلية(٤/ ٥٦) و ئەحمەد لە الزهد(٣٧٣) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٩٣) ئیخراجی کردووە، کەسی نەناسراوی تێدایە.

[2] - لاوازە، بەیهەقیی لە شُعب الإیمان(٩٧٨٧) و ئەبو نەعیم لـە الحليـة(٤/ ١٨٠) و ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا لـە المرض والكفارات ئیخراجیان کردووە.

مەعروفی کەرخیی ئەڵێ:خوای گەورە بەندەی باوەڕداری خۆی بەنەخۆشـی و سەرئێشـەو ئـازار تاقیدەکاتـەوەو باوەڕدارەکـە لای هاوڕێکـانی گازنـدەی حـاڵی خۆی دەکات، خوای گەورەش دەفەرمووێت:سوێند بەعیزەت و مەزنیی خۆم، من تۆم تووشی ئەم نەخۆشی و سەرئێشەیە کردووە تەنیا بـۆ ئـەوەی لەتاوانـەکانت پاکبکەمەوە، بۆیە گازندەم لێ مەگرە.

ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا ئـەڵێ: پیاوێـك وتی:ئـەی پەیامبـەری خـوا: نەخۆشـیی چییە؟ یان پەیامبەر فەرمووی: قەت نەخۆش کـەوتوویی؟ وتـی: نـە، فـەرمووی: هەستە تۆ لەئێمە نییت[2].

عبداللـەی کـوڕی مەسـعود نەخۆشـییەکەی لەسـەر قـوورس هاتـەوە، هەنـدێ لەهاوڕێکانی سەردانیان کرد و خێزانەکەی دەیووت:من بەفیدات بم نـان و ئاومـان پێ نەدای؟ ئەویش بەدەنگێکی کـز وتـی: سمـتم لەکارکـەوت و لەجێگـە کـەوتنم درێژەی کێشا، سوێند بەخوا ئەوەی جێی خۆشحاڵییم بێ ئەوەیە کە بەئەندازەی سەرە نینۆکێك خوای گەورە گوناهی لەسەر کەمکردبێتمەوە[3].

خالیدی کوڕی وەلید خێزانێکی خۆی تەلاق دا، پاشان پیاهەڵدانی زۆر باشـی کرد، پێیانوت: ئەی باوکی سولەیمان کەوابوو لەبەرچی تـەلاقت دا؟ وتـی: لەبـەر

---

[1] - ئەبو نەعیم لە الحلیة(٥/ ٣٨١) و ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا لـە المـرض والکفـارات(١٠٣) ئیخراجـی کـردووە، ئیسنادەکەی صەحیحە.

[2] - لاوازە، ئـەبو داوود(٣٠٨٩) و ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا لـە المـرض والکفـارات(١٩٦) و بەغـەوی لـە شـرح السنة(١٤٤٠)ئیخراجیان کردووە.

[3] - ئەحمـەد لـە الزهـد(لا٣٥٩) و ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا لـە المـرض والکفـارات(١٩٧)ئیخراجیـان کـردووەو ئیسنادەکەشی صەحیحە.

ئەنجامدانی شتێکی ناخۆش نەبوو تەلاّقم دا، تەنیا لەبەر ئەوە بوو لەسەردەستی تووشی بەلاّو ناخۆشیی نەهاتم[1].

لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) دەگێڕدرێتەوە فەرموویەتی:"ما ضرب على مؤمن عرق الا كتب الله له به حسنة وحط به عنه سيئة ورفع له به درجة"[2]،واتا: هەر ئێش و ئازارێك لەباوەڕدارێكدا دروست بێ، خوای گەورە بۆ باوەڕدارەكە چاكەیەك دەنووسێ و خراپەیەكی بۆ دەسڕێتەوەو پلەیەكیش پێی بەرزدەبێتەوە.

هەموو ئەمانە دژ نیین لەگەڵ ئەوانەی پێشوودا كە باسمان كرد، بەوەی كۆست و ناخۆشییەكان تەنیا تاوانەكان دەسڕنەوە، چونكە دەستخستنی چاكە بەئارامگرتن لەكاری سەرپشكییدا دێتەدی، كاری ئازادانەی باوەڕدارەو ناچاریی نییە.

پیاوێكی موهاجیران سەردانی نەخۆشێكی كرد وتی:نەخۆش چوار شتی بۆ هەیە: پێنووسی تاوانی لەسەر هەڵدەگیردرێ، نمونەی پاداشتی كارە باشەكانی پێشووتری بۆ دەنووسرێ كە پێش نەخۆشییەكە ئەنجامی دابوون، نەخۆشییەكە یەك بەیەك تاوانەكان لەجومگەكانی دەردەكات، ئەگەر لەو نەخۆشییە هەستایەوە، ئەوە بەسڕینەوەی تاوانەوە هەڵدەستێتەوە، ئەگەریش مرد، ئەوە

---

[1] - حسن، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٢٠٣)ئیخراجی كردووە.

[2] - لاوازە، تەبەرانیی لە المعجم الأوسط(١١٥٧) و حاكم(١/ ٣٤٧) و ئیبن شاهین لە(الترغیب في فضائل الأعمال)ئیخراجیان كروە، یەحیای ئەلملائی ئەلطەویلی تێدایە كەسێكی لاوازە.

بەلێخۆشبوونەوە دەمرێت، نەخۆشەکەش وتی: خوایە گیان جارێك لەجێگەدا بمخە[١].

لەموسنەددا لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: "وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَا يَقْضِي اللَّهُ لِلْمُؤْمِنِ قَضَاءً إِلَّا كَانَ خَيْرًا لَهُ، وَلَيْسَ ذَلِكَ لِأَحَدٍ إِلَّا لِلْمُؤْمِنِ، إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ، فَكَانَ خَيْرًا لَهُ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ، فَكَانَ خَيْرًا لَهُ"[٢]،واتا:سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، خوای گەورە لەهەموو قەزاو بڕیارێکدا چاکەی باوەڕداری دەوێ، ئەوەش تەنیا بۆ باوەڕدارە، گەر خۆشیی بهێنێتەڕێ سوپاسگوزار ئەبێ و خێرو چاکەیە بۆ باوەڕدار، ئەگەر تووشی ناخۆشییشی بکات، باوەڕدارەکە ئارام دەگرێ و ئەوەش هەر خێرو چاکەیە بۆی.

***

---

١ - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە المرض والكفارات(٢٠٩)ئیخراجی کردووەو نەزانی تێدایە.

٢ - موسلیم(٢٤٩٩) و ئەحمەد لەموسنەدەکەیدا(٥/ ٢٦)ئیخراجیان کردووە.

## تەوەری حەڤدەیەم

## لەو باسانەی لەهاوەڵان و خەڵکانی دوای ئەوانەوە هاتووە لەفەزڵ و گەورەیی ئارامگرتن

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ:وەکیع بۆی باسکردین، ئەویش لەمالیکی کوڕی میغوەلەوە، ئەویش لەئەبی ئەلسەفەرەوە وتی:ئەبو بەکر(خوای لێ رازیی بێ)نەخۆشکەوت، سەردانیان کردو وتیان: ئایە بانگی پزیشکت بۆ بکەین؟ وتی: پزیشك بینیمی، وتیان: ئەی پزیشك چیی وت؟ وتی: من هەرچی شتێکم بووێ ئەوە دەکەم[1].

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: ئەبو موعاویە بۆی باسکردین، وتی: ئەعمەش بۆی باسکردین، ئەویش لەموجاهیدەوە وتی: عومەری کوڕی خەتاب(خوای لێ رازیی بێ) وتی: باشترین ژیانمان لەئارامگرتندا دۆزییەوە[2].

هەروەها وتوویەتی: باشترین ژیان لەئارامگرتندا پەی پێبردووە، ئەگەر ئارامگرتن لەڕیزی پیاواندا بووایە ئەوە بەڕێزترین دەبوو[3].

عەلیی کوڕی ئەبو تاڵیب(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: ئارامگرتن لەئیماندا وەك شوێنی سەرە لەجەستەدا، کە سەر بڕا جەستە دەپووکێتەوە، پاشان دەنگی

---

[1] - ئەحمەد لە الزهد(١٤٠) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(١/ ٣٤)ئیخراجیان کردووە.

[2] - صەحیحە، ئەحمەد لە الزهد(١٤٦) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(١/ ٥٠)ئیخراجیان کردووە، ئەلحافیظ ئیبن حەجەریش لە فتح الباري(١١/ ٣٠٣)بەڕاستی داناوە.

[3] - لاوازە، ئەبو نەعیم لە الحلیة(٨/ ٢٩٠)ئیخراجی کردووە،ئەلعێراقیی لە(المغني)دا ئەڵێ: صەبیحی کوڕی دیناری تێدایە، ئەلعەقیلیی لاوازی داناوە.

هـەڵبڕی و وتـی: ئـەو کەسـە ئیمـانی نییـە کـە ئـارامگریی نـەبێ[1]. وتوویـەتی: ئارامگرتن ولاخێکی پێ نەخلیسکاوە[2].

ئەلحەسـەن ئـەڵێ: ئـارامگرتن گەنجینەیەکـە لەگەنجینـەکانی خێـرو خۆشـی، خوای گەورە تەنیا بەو بەندانەی دەدات کە لای خۆی بەڕێزن[3].

عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز ئـەڵێ: خـوای گـەورە هـەر نـازو نیعمـەتێك بەبەندەیـەك بـدات و لـێ وەربگرێتـەوەو لەجێگەیـدا ئـارامگریی دابنێـت، ئـەوە بەباشتر لەوەی لێی وەرگرتووە قەرەبووی کردووەتەوە[4].

مـەیمونی کـوڕی میهـران ئەڵێ:جگـە لـەئارامگری، هـیچ کەسـێ لـەکاری تـردا پاداشتی زۆر زۆری وەرنەگرتووە[5].

سولەیمانی کوڕی ئەلقاسم ئەڵێ: پاداشـتی هـەموو کاروکردەوەیـەك دەزانـرێ جگـە لـە ئـارامگری، پـەروەردگار دەفـەرموویت: ﴿ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ۝١٠ ﴾ الزمـر: ١٠، واتـا: بەڕاسـتی تـەنها دان بـەخۆدا گـران بـێ ژمـارە پاداشتیان دەدرێتەوە.

ئەڵێ: وەکو ئاوی بەردەوام و لەبەر ڕۆیشتووە[6].

---

[1] - زۆر لاوازە، ئیبن ئەبی شەیبە لە الإیمـان(١٣٠) و ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا لـە الصـبر(٨) و ئـەبو نـەعیم لـە الحلیة(١/ ٧٥- ٧٦)ئیخراجیان کردووە.

[2] - الرسالة القشیریة(١٨٥).

[3] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الصبر(١٦)ئیخراجی کردووە.

[4] - بەیهەقیی لە الشُعب الإیمان(١٠٠٣٨) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الصبر(٢٢) ئیخراجیان کردووە.

[5] - ئەبو نەعیم لە الحلیة(٤/ ٩٠) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الصبر(١٩) ئیخراجیان کردووە.

[6] - پێشتر تەخریج کرا.

خواناسێك پارچە کاغەزێك(پێستێك)ی لەگیرفاندا دەبێ و هەمیشە تەماشای کردووە، تیایدا نووسراوە: ﴿وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ﴾ الطور: ٤٨، واتا: ئارام بگرە بۆ بڕیاری پەروەردگارت ئەوسا بێگومان تۆ لە ژێر چاودێری ئێمەدایت.

عومەری کوڕی خەتاب(خوای لێ رازیی بێ)وتوویەتی: ئەگەر ئارامگرتن و سوپاسگوزاریی دوو وشتر بوونایە، کێشەم نەبوو سوار کامەیان ببوومایە[١].

موحەممەدی کوڕی شبرمە گەر ناخۆشیی و بەلاّی بەسەردا بهاتبایە دەیووت: هەوری هاوینەو دەڕەوێتەوە.

سوفیانی کوڕی عویەینە[٢] لەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا: ﴿وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْۖ﴾ السجدة: ٢٤، وتوویەتی: لەبەر ئەوەی لوتکەی کارەکانیان وەرگرتبوو کە ئارامگرتنە، ئەوە خوای گەورە ئەوانی گێڕا بەگەورەو پێشەوای خەڵك.

بەئەحنەفی کوڕی قەیس وتراوە: نەرموونیانی(الحِلْم)چییە؟ ئەڵێ: ئارامگرتن لەسەر شتێك کەمێك حەزت پێی نییە[٣].

وەهب ئەڵێ: لەداناییدا نووسراوە: بەرهەمی گێلی: تووڕەیە، بەرهەمی نەرموونیانی: حەسانەوەییە، بەرهەمی ئارامگرییش: برانەوەیە[٤].

---

[١] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الصبر(٧) ئیخراجی کردووە.

[٢] - سوفیانی کوڕی عویەینەی کوڕی مەیمونی ئەلهیلالیی ئەلکوفی، ئەبو موحەممەد(ساڵی١٠٧ك لەدایکبووەو ساڵی١٩٨ك مردووە): فەرموودەناسی حەرەمی مەککە بووە، حافیظی متمانەدارو زانست فراوان و قەدر گران بووە.

[٣] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الحلم(٧٣)ئیخراجی کردووە.

[٤] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الحلم(٧٢)ئیخراجی کردووە.

عورووەی کوڕی زوبەیر هاتەلای وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك و موحەممەدی کوڕیشی لەگەڵدا بوو، کە جوانترینی خەڵك بوو، ڕۆژێك هاتەلای وەلیدو بەرگێکی نەخشداری لەبەردابوو، دوو پرچی هەبوو، بەدەستی لێی دەدا، وەلید وتی:لاوانی قورەیش ئا بەو جۆرەن، ئیرەیی پێ بردو بەخەواڵوویی لای ئەو دەرچوو کەوتە گەوڕی ئاژەڵەکانەوە، ولاخ و ئاژەڵەکان قاچیان پێدا دەنا و لەقەیان لێ دەدا تاوەکو مرد. پاشان قاچی عورووە تووشی نەخۆشیی خۆرە هات، وەلید پزیشك گەلێکی ناردە دیاری، پزیشکەکان وتیان: گەر قاچی نەبڕینەوە تەواوی جەستەی دەگرێتەوەو لەنێودەچێ، عورووەش پێداگرو ئامادەبوو بۆ بڕینەوە، بەهەرە دەستیان کردە بڕینەوەی، کە هەڕەکە گەیشتە سەر ئێسقانەکە سەری خستەسەر سەرین و بوورایەوە، پاشان بەهۆش هاتەوەو عەرەق بەدەمووچاویدا دەچۆڕا و (لا إله إلا الله و الله أكبر)ی دەکرد، قاچە بڕاوەکەی خۆی هەڵگرت و بەدەستی ئەمدیوو ئەودیووی پێ دەکرد، پاشان وتی:ئەو کەسەی وەهای کرد منی لەسەر تۆ هەڵگرت و بەتۆ دەسووڕامەوە، دەزانێ بە تۆ بۆ هیچ حەرام و تاوانێك نەڕۆیشتووم، بە تۆ هەنگاوم بۆ شوێنێك هەڵنەگرتووە جێی ڕەزامەندیی خوای گەورە نەبێ.

پاشان فەرمانی دا قاچەکە شۆردرایەوەو بۆنی خۆشی لێ دراو خرایە پارچە قوماشێکەوەو ناردی لەگۆڕستانی موسڵماناندا نێژرا، کە لای وەلید دەرچوو، خزم و کەس و هاوڕێیانی هاتنە پێشوازی و دڵدانەوەیان دەکرد، ئەویش ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە:﴿ لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾ ﴾ الكهف: ٦٢، واتا: سوێند بەخوا بەڕاستی لەم سەفەرەماندا دووچاری ماندوویی و زەحمەت بووین.

هیچی تری نەوت، پاشان وتی: نایەمە مەدینەوە، من لەمەدینەدا کەوتوومەتـە نێوان کەسێك چاوی تێبڕیووم بۆ ناخۆشی و کەسێك ئیرەییم پێ دەبات و مایـەی لەنێوچـوونی نازونیعمەتـە، بۆیـە ڕۆیشـت بـۆ کۆشـکێك لـە ئەلعـەقیق و لەوێـدا مایەوە.

کە چووە کۆشکەکەیەوە، عیسای کوڕی تەڵحە پێیووت: بەختەوەر نەبێ ئـەو کەسەی رقی لەتۆیەو تۆی تووڕە کردوە، ئەو کۆست و بەڵایـەم پێشـان بـدە کـە ئێمـە لەبارەیـەوە دڵدانـەوەی تـۆ دەکـەین، ئـەویش قاچـی پیشـان دا، عیسـا پێیووت:سوێند بەخوا ئێمە وەهامان دانـەنابوو ململانـێ و تەقـەلا بکـەی، خـوای گەورە زۆر شتی بـۆ هێشـتوویتەوە، عـەقڵ و زمـان و بیـنین و هـەردوو دەسـت و قاچـێکی بـۆ هێشـتوویتەوە، ئـەویش وتـی: ئـەی عیسـا کـەس بەنمونـەی دڵدانەوەکەی تۆ دڵدانەوەی نەکردووم.

کاتێك ویستیان قاچـی ببڕنـەوە پێیـان وت: بـا عـەرەقت پـێ بـدەین تـاوەکو هەست بەئازار نەکەی، ئەویش وتی: خوای گەورە منی تاقیکردووەتـەوە تـاوەکو ئارامگرییم ببینێ، من دژایەتیی ئەو فەرمانەی بکەم؟! لەهیشامی کوڕی پرسـیار کرا: باوکت کاتێ دەستنوێژی دەشۆرد بـۆ قاچـە بڕاوەکـەی چـی دەکـرد؟ وتـی: مەسحی لەسەر دەکرد.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: عەبدولصەمەد بۆی باسکردین، سەلام بۆی باسـکردین وتی: گوێم لێبوو قەتادە دەیووت: کابرایەك پرسیاری لە لوقمان کرد: چی شـتێك خێرە؟ وتی: ئارامگرییەك ئازاری لەدوا نـەبێ. پرسـی: چـی خـەڵکێك باشـترینە؟ وتی: ئەو کەسەی رازییە بە بەشی خوا. پرسـی: چـی خـەڵکێك زاناترینـە؟ وتـی:

ئـەوەی لەزانسـتی خـەڵك وەردەگریٚ و ئەیخاتـە پـاڵ زانسـتی خـۆی. پرسـیاری لێکرا: چی شتێك باشـترین گەنجینەیـە: سـەروەت و سـامان یـان زانسـت؟ وتـی: سـبحان الله، بـاوەڕداری زانـا ئـەو کەسـەیە کـە لای بەشـوێن چـاکەدا بگـەڕێی دەیدۆزیتەوە، گەر چاکەشی لا نەدۆزرێتەوە، ئـەوە دەروونـی جڵـەوگیر کـردووە، باوەڕدار بەپێی جڵەوگیرکردنی دەرونی حسابی بۆ دەکرێت.

حیبـانی کـوڕی ئـەبی جەبەلـە ئـەڵێ: هەرکەسـێ خـەم و پـەژارەی خـۆی لای خـەڵك باسـکرد،ئەوە نـاتوانێ ئـارامبگریٚ، ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا بەمـەرفوعیی گێڕاویەتییەوە لای پەیامبەری خوا(صـلی الله علیـه وسـلم)[1]، ئەگـەر دروسـت بـێ واتای ئەوەیە حاڵی خۆی لای مەخلوقەکان باس کردووە نەك لای خوای گەورە.

هەروەها حیبانی کوڕی ئەبی جەبەلـە ئـەڵێ لـەبارەی ئـەم ئایەتـەوە: ﴿ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ﴾ یوسف: ١٨، واتا: ئارامێك دەگرم گازندەو گلەیی تێدا نەبێ[2].

موجاهید ئەڵێ: ﴿ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ﴾ یوسف: ١٨، واتا: بەبێ کڕوزانەوە[3].

عەمری کوڕی قەیسیش ئـەڵێ: ﴿ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ﴾ یوسـف: ١٨، واتـا: رازیبـوون بەکۆست و بەڵایەکەو ملکەچبوون.

هەندێ پێشین وتوویانە: ﴿ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ﴾ یوسف: ١٨، واتا: گازندەو شـەکوای تێدا نەبێ.

---

[1] - لاوازە، بەیهەقیی لە الشُعب الإيمان(١٠٠٤٧)ئیخراجی کردووە، عەبدولعەزیزی کوڕی ئـەبی روادی تێدایـە لاوازە.

[2] - لاوازە، ئیبن جەریر لەتەفسیرەکەیدا هێناویەتییەوە(١٢/ ٩٩) و بەهۆی ئیرسـال بوونـەوە ئیسـنادەکەی لاوازە.

[3] - لاوازە، ئیبن جەریر لەتەفسیرەکەیدا هێناویەتییەوە(١٢/ ٩٩) و عەبدولڕەزاقیش لەتەفسیرەکەیدا(١/ ٢/ ٣١٨).

هەممام لەقەتادەوە لەبارەی ئەم ئایەتەوە ئەڵێ: ﴿وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ ٨٤﴾ یوسف: ٨٤، واتا: خەفەتی خۆی خواردەوەو جگە لەخێرو چاکە هیچی تری نەوتەوە.

یەحیای کوڕی ئەلموختار لەئەلحەسەنەوە کە وتوویەتی: الكظيم: واتا: الصبور(زۆر ئارامگر)[1].

هەر هەممام لەقەتادەوە لەبارەی ئەو ئایەتەوە ئەڵێ: گریی خەم و خەفەت.

هیچ دەرمانێك لەوە خۆشەویستر نییە بەلای خوای گەورەوە لەدەردو دەرمانی کۆستێکی سەختی بەئێش، کە مەینەتبارەکە بەدڵئارامی و خۆڕاگرتنەوە بەرانبەری رابووەستێ و نەرموونیان بێ.

عبداللەی کوڕی موبارەك ئەڵێ: عبداللەی کوڕی ئەبی لهیعە هەواڵی پێداین، ئەویش لەعەتائی کوڕی دینارەوە: کە ئەبا سەعیدی کوڕی جوبەیر وتی: ئارامگرتن، داننانی بەندەیە بەخوای گەورە بەوەی لەلایەن خوای گەورەوە تووشی هاتووەو چاوەڕێی پاداشتی خوایە. پیاوی وا هەیە ئازار دەچێژێ و خۆی دەنووشێنێتەوەو تەنیا ئارامگریی لێ دەبینرێ[2].

(ئارامگرتن، داننانی بەندەیە بەخوای گەورە بەوەی لەلایەن خوای گەورەوە تووشی هاتووە) وەك راڤەکردنی(إنا لله)یە، دان بەوەدا دەنێت کە خۆی موڵکی خوای گەورەیەو خوای گەورە چۆنی بووێ هەڵسوکەوت بەموڵکی خۆیەوە دەکات، هەروەها بەئومێدی پاداشتی خوای گەورەش وەك شیکردنەوەی ئەم ئایەتەیە(إنا لله وإنا إليه راجعون)، واتا: خەمی خۆمانی بۆ دەگێڕینەوەو لەسەر

---

[1] - ئیبن جەریر لەتەفسیرەکەیدا هێناویەتییەوە(١٣/ ٢٧) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الصبر(١١٧).

[2] - عبدالله کوڕی موبارەك لە الزهد(١١١) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الصبر(١١٣).

ئارامگرتنمـان پاداشـتمان دەداتـەوەو پاداشـتی ئـەم کۆسـت و ناخۆشـییەمان بەفیڕۆنادات، هەروەها(پیاوی وا هەیە ئـازار دەچێژێ و خـۆی دەنووشـێنێتەوەو تـەنیا ئـارامگریی لـێ دەبینـرێ)، واتـا: دڵڕاگرتنـە لەبـەردەم توورەبـوون و دوورخستنەوەیەتی لەناڕەزایی دەربڕین و دڵیشی تـووڕە نییـە، بۆیـە هەرکەسـێ خۆی بگرێ و دڵی لەسەر قەدەرەکە تووڕە بێ ئارامگر دانانرێت.

یونسی کوڕی یەزید ئـەڵێ: لەڕەبیعـەی کـوڕی ئـەبی عەبـدولڕەحمانم پرسـی: ئەوپەڕی کۆتایی ئارامگرتن چی شـتێکە؟ وتـی: ڕۆژی کۆسـت و مەینەتێکـە وەك ڕۆژانی پێش کۆست و مەینەتییەکە بێ[1].

قەیسی کوڕی حەجاج لەبارەی ئەم ئایەتەوە ئەڵێ: ﴿ فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا ۝٥ ﴾ المعارج: ٥، واتا: خاوەن کۆست و ناخۆشییەکە لەنێو خەڵکەکەدا نەناسرێتەوە[2].

شەمەر کاتێك دڵدانەوەی مەینەتبارێکی بکردبایە ئـەیووت: لەبـەردەم بڕیـاری خوا ئارامگربە.

ئەبو عـەقیل ئـەڵێ: سـالمی کـوڕی عبداللـەی کـوڕی عومـەرم بینـی لـەمردنی واقیدی کوڕی عبداللـەی کـوڕی عومـەردا قامچییەکی بەدەسـتەوەبوو رووپۆشـی پێوە بوو، هەرکەسێ هاوارو قیژەی بکردبایە قامچییەکی لێ دەدا.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: موحەممەدی کوڕی جەعفـەری کـوڕی میهـران بـۆی باسکردم وتی: ئافرەتێکی قورەیش وتوویەتی:

أما والذي لا خلد إلا لوجهه ومن ليس في العزِّ المنيع له كفو
لئن كان بدء الصبر مراً مذاقه لقد يجنى من غبته الثمرُ الحلو[1]

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الصبر(١١٤)ئیخراجی کردووە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الصبر(١١٥)ئیخراجی کردووە.

واتا: ئەو خوایەی کە جگە لەو هەموو شتەکانی تر لەنێو دەچن و نەمریی بۆ خۆیەتی و لەشکۆمەندی و دەسەلاتدا هاوشێوی نییە، ئەگەرچی سەرەتای کۆست و ناخۆشیی ئارامگرتن تاڵ و سەختە، بەلام سەرەنجام بەرهەمی شیرین و خۆشی لا دەچنرێتەوە.

ئەڵێ: عەمری کوڕی بوکەیر لام وتی:

صبرتُ فكان الصبر خير مغبة — وهل جزع يجدي عليّ فأجزعُ
ملكت دموع العين حتى رددتها — إلى ناظري فالعين في القلب تدمعُ

واتا: ئارامگرت، بێگومان ئارامگرتن باشترین ئەنجامی هەیە، ئاخۆ هیچ مرۆڤێك هەبووە بکڕوزێتەوەو چارەی کڕوزانەوەی کردبێ تاوەکو منیش بکڕوزێمەوە، جڵەوی فرمێسکەکانی خۆمم کردو گەڕاندمنەوە، چاو لەدڵدا خەریکی فرمێسك ڕێژان بوو.

ئەڵێ: ئەحمەدی کوڕی موسای سەقەفیی شیعرێکی بۆ وتم:

نبئت خولة أمس قد جزعت — من أن تنوب نوائب الدهر
لا تجزعي يا خول واصبري — إن الكرام بنوا على الصبر

واتا: دوێنێ خەولە کۆستبار بوو دەکڕوزایەوە، پێموت: ئەی خەولە مەکڕوزێرەوەو ئارامبگرە، چاکەکاران بەئارامگرتن خۆیان بوونیاتنا.

ئەڵێ: عبداللەی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی تەمیمیی بۆی باسکردم وتی: پیاوێك دڵدانەوەی پیاوێکی تری کرد کە کوڕەکەی مردبوو،وتی: واجیبە لەسەر خوا بەڵێنی خۆی بەجێبگەیەنێ بۆ کەسێك ئارامی گرتبێ، بۆیە

[1] - بڕوانە: ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الصبر(١٦٩).

بەلەدەستدانی ئەو پاداشتە گەورەیە مەینەتییەکی گەورەتر بەسەر خۆتدا مەهێنەو بیکەیتە دوو مەینەتی و لێقەومان بەسەر خۆتەوە، ئیتر والسلام.

ئیبن ئەلسەمماك دڵدانەوەی پیاوێکی کردو وتی: ئارامبگرە، چونکە ئەو کەسەی چاوەڕێی پاداشت بێ کاری پێ دەکات و ئەوەشی خەریکی کڕوزانەوە بێ لەدواییدا هەر ئەوە دەکات و ناچارە ئارام بێتەوە.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ئەڵێ: رازیبوون پێگەیەکی قایم و ناوازەیە، بەڵام خوای گەورە ئارامگریی پشت ئەستوورو چاك کاریگەر کردووە. کە کوڕەکەی عەبولمەلیك مرد، عەبدولمەلیك نوێژی لەسەر کردو پاشان وتی: بەزەیی خوات لەسەربێ، بێگومان تۆ وەزیرو یاریدەدەری من بووی. ئەڵێ: خەڵکیی دەگریان و ئەویش دڵۆپە فرمێسکێك بەچاویدا نەدەهاتەخوار.

موتەڕیفی کوڕی عبداللە کوڕێکی مرد، خەڵکێك هاتن دڵدانەوەیان کردو سەرەخۆشییان لێکرد، ئەویش بەجوانرین رووخۆشییەوە دەرچوو بۆ لایان و پاشان وتی: شەرم لەخوا دەکەم بۆ مەینەتییەك بکڕوزێمەوەو ئازار دەربخەم.

عەمری کوڕی دینار ئەڵێ: عوبەیدی کوڕی عومەیر وتی: کڕوزانەوەو ناڕەزایی دەربڕین، فرمێسك رێژان و خەفەتباریی دڵ نییە، بەڵکو کڕوزانەوەو ناڕەزایی قسەی ناخۆش و گومانی خراپە.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: حەسەنی کوڕی عەبدولعەزیزی ئەلجەرەویی بۆی باسکردم وتی: کوڕێکی زۆر نرخدارم مرد، بەدایکیم وت: لەخوا بترسەو چاوەڕێی پاداشتی خوا بکەو ئارامبگرە، ئەویش وتی: مەینەتییەکەم لەوە گەورەترە بەکڕوزانەو ناڕەزایی پاداشتەکەی پووچەڵ بکەمەوە.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: عومەری کوڕی بوکەیر هەواڵی پێدام لەبارەی زانایەکی قورەیشەوە وتی: ئەلحەسەنی کوڕی ئەلحوصەین ئەبو عوبەیدوڵلەی کوڕی ئەلحەسەن مرد، عوبەید قازی و ئەمیری بەسرە بوو، بۆیە دڵدەرەوەو سەرخۆشیکارانی زۆر بوون، باسی ئەوەیان کرد کە چی شتێك کڕوزانەوەو ئارامگریی لەیەك جیا دەکاتەوە، یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوەی، گەر شتێکیشی نەکرد دەیتوانی بەزۆر لەخۆیدا دروستی بکات، ئەوە کڕوزاوەتەوە.

خالیدی کوڕی ئەبی عوسمانی قورەیشیی ئەڵێ: سەعیدی کوڕی جوبەیر سەرەخۆشیی لێکردم بەهۆی مردنی کوڕکەمەوە، بینیی بەڕووپۆشەوە بەدەور کەعبەدا دەسووڕێمەوە، رووپۆشەکەی لەسەرم لابردو وتی: سەرکزکردنیش کڕوزانەوەو ناڕەزاییە.

## بەش

قسەی زۆربەی شەرعناسانی هاوەڵی ئێمەو ئەوانی تر ئەوەیە: کێشەیەکی تێدا نییە گەر کەسی کۆستکەوتوو شتێك بەسەر سەریدا بدات و پێی بناسرێتەوەو وتوویانە: سەرەخۆشییکردن سوونەتە، ئەو رووپۆشەش کارئاسانییەکە تاوەکو کەسەکە بناسرێتەوەو دڵدانەوە بکرێت، ئەمەش جیاوازیی لەسەر هەیە، زانای ئێمە رەتیکردووەتەوە.

روونە سەلەف(پێشین)هیچ کارێکی لەو جۆرەیان نەکردووەو لەهاوەڵان و تابیعینییشەوە شتی لەو جۆرە نەهاتووە، هەموو بەڵگەکان روون و راشکاوانە رەتیدەکاتەوە ئەو کارە ئاسایی بێ. ئیسحاقی کوڕی راهەویە رەتیکردووەتەوە

کەسێك ئەو بەرگ و پۆشاکە بگۆڕێ کە وەك نەریت لەبەری کردووەو بۆ ئەو ڕۆژانە شتی تر لەبەر بکات و ئەڵێ: ئەوە کرووزانەوەو ناڕەایی دەرخستنە.

**بەتێکڕا:** نەریتی ئەوان وەها بووە لە کۆست و مەینەتییدا بەرگ و پۆشاکی خۆیانیان نەگۆڕیووە و وازیان لەشتێك نەهێناوە پێشتر کردبێتیان، خوای گەورەش زاناترە.

***

## تەوەری هەژدەیەم

## لەبارەی ئەو شتانەی پەیوەندییان بەکۆست و مەینەتییەوە هەیە لەگریان و شیوەن و سنگ دادڕین و قسەی نەفامانەو شتانی ترەوە

لەوانە، گریان لەسەر مردن:مەزهەبی ئەحمەد و ئەبی حەنیفە: بەجائیزیان داناوە لەپێش مردن و دوای مردن بۆ کەسێك بگری، ئەبو ئیسحاقی شیرازییش ئەم بۆچوونەی هەڵبژاردووە، بەڵام شافیعی و زۆرێك لەهاو مەزهەبەکانی گریانی دوای مردنی کەسێك کەراهەتی هەیە و تەنیا رێگەیان داوە پێش دەرچوونی روحی کەسێك بۆ کەسەکە بگری، بەبەڵگەی فەرموودەکەی جابری کوڕی عەتیك کە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)هاتە سەردانی عبداللەی کوڕی ثابت و بینی ئاگای لەخۆی نەماوە، بانگی لێکرد وەڵامی نەدایەوە، بۆیە گەڕایەوەو فەرمووی: "غُلِبْنَا عَلَيْكَ يَا أَبَا الرَّبِيعِ"، واتا: بێ هۆش کەوتی ئەی ئەبا رەبیع، ئافرەتەکان دەستیانکردە قیژەو گریان، کوڕەکەی عەتیکیش بێدەنگی دەکردن، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:" دَعْهُنَّ فَإِذَا وَجَبَ فَلاَ تَبْكِيَنَّ بَاكِيَةٌ"، واتا: بهێڵە بگرین، کە پێویست بوو ئیتر نەگرین، وتیان: ئەوەی پێویست بێ چییە ئەی پەیامبەری خوا؟ فەرمووی: مەرگ. ئەبو داوودو نەسائیی گێڕاویانەتەوە[1].

وتوویانە: لەصەحیحەیندا لەفەرموودەی ئیبن عومەردا هاتووە: کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی:«إِنَّ المَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ

[1] - صەحیحە، ئەبو داوود(٣١١١) و ئەحمەد(٥/ ٤٤٦) و نەسائیی(٤/ ١٣) و مالیك(١/ ٢٣٣/ ٣٦) و حاکم(١/ ٣٥١)ئیخراجیان کردووە.

عَلَيْهِ»[1]،واتا: کەسی مردوو بەگریانی خزم و کەسانی سزا دەدرێت. ئەمە دوای مردنی کەسەکە، ئەگینا لەپێش مردنی کە نەخۆشە بۆی بگرین سزای لەسەر نییە.

لەئیبن عومەرەوە: کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)کاتێك لەئوحود گەڕایەوە، گوێی لێ بوو ژنانی بەنی عەبدولئەشهەل بۆ کوژراوەکانی خۆیان دەگریان، فەرمووی:«لَكِنَّ حَمْزَةَ لَا بَوَاكِيَ لَهُ»،واتا: بەلاّم کەسێك نییە بۆ کوژرانی حەمزە بگرێت. بۆیە ئافرەتانێکی ئەنصار هاتن لای پەیامبەری خوا دەستیانکردە گریان، پەیامبەر خەوتبوو هەستاو فەرمووی:" يَا وَيْحَهُنَّ، أَنْتُنَّ هَاهُنَا تَبْكِينَ حَتَّى الْآنَ، مُرُوهُنَّ فَلْيَرْجِعْنَ وَلَا يَبْكِينَ عَلَى هَالِكٍ بَعْدَ الْيَوْمِ "، واتا: لەبار دایکیان بچن هاتوونەتە ئێرە تاوەکو ئێستا بگرین! فەرمانیان پێ بکەن بگەڕێنەوەو لەمڕۆ بەدواوە بۆ مردوو نەگرێن. پێشەوا ئەحمەد گێڕاویەتییەوە[2].

جیاوازیی گریانی پێش مردن و دوای مردن ئەوەیە، لەپێش مردن ئومێدێك هەیە، بەلاّم کە مرد ئومێدی مانەوە نامێنێ و قەزای خوا جێبەجێ بووەو گریان بێ سوودە.

ئەوانەی ڕێگەیان داوە دوای مردنیش بۆ کەسی مردوو بگرێی ئەڵێن: جابری کوڕی عبدالله وتوویەتی:باوکم لەئوحوددا کوژرا و منیش دەگریام، خەڵك نەهی گریانیان لێم دەکردو پەیامبەریش ڕێگریی نەدەکرد، وەهامکرد فاتیمەی

---

[1] - بوخاری(١٢٨٦) و موسلیم(٩٢٨)ئیخراجیان کردووە.

[2] - صحیح لغیره، ئیبن ماجە(١٥٩١) و ئەحمەد(٢/ ٤٠ و ٨٤) و ئەبو یەعلا(٣٥٧٦) و حاکم(٣/ ١٩٥) ئیخراجیان کردووە.

پووریشم(خوشکی باوکم)بگری، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:
" تَبْكِينَ – أَوْ لَا تَبْكِينَ – مَا زَالَتِ الْمَلَائِكَةُ تُظِلُّهُ بِأَجْنِحَتِهَا حَتَّى رَفَعْتُمُوهُ "[1]،
واتا: بگریی یان نەگریی، ئەوە فریشتە بەباڵەکانیان سێبەریان بۆ کرد
تائەوکاتەی بەرزتان کردەوە.

هەر لەصەحیحەیندا هاتووە: لەئیبن عومەرەوە ئەڵێ: سەعدی کوڕی عوبادە
نەخۆشکەوتبوو، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ عەبدولڕەحمانی
کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عبداللەی کوڕی مەسعوددا هاتنە
سەردانی، کە چووە ژوورەوە بۆلای بینی ئاگای لەخۆی نەماوە، فەرمووی:
مردووە؟ وتیان: نەمردووە ئەی پەیامبەری خوا، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه
وسلم)گریا، کە خەڵکەکە بینیان پەیامبەر دەگری ئەوانیش گریان،
پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:" ألا تَسْمَعُونَ أَنَّ اللَّهَ لَا يُعَذِّبُ بِدَمْعِ
الْعَيْنِ وَلا بِحُزْنِ الْقَلْبِ وَلَكِنْ يُعَذِّبُ بِهَذَا وَأَشَارَ إِلَى لِسَانِهِ أَوْ يَرْحَمُ"[2]،واتا: ئایە
نەتابیستووە کە خوای گەورە لەپای فرمێسکی چاو و خەفەتی دڵ سزا نادات،
بەڵکو بەمە(ئاماژەی کردە زمانی)سزاو بەزەیی دەدات.

هەر لەصەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئوسامەی کوڕی زەیدەوە: کە
پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەرچوو بۆ چوونەلای یەکێك لەکچەکانی
کە منداڵێکی لەسەرەمەرگدا بوو، منداڵەکەی بۆ بەرزکرایەوە، هەناسەی سوارو
بەحاڵ نووزەی لێوە دەهات، هەردوو چاوی پڕ فرمێسك بوون، سەعد وتی: ئەم

[1] –بوخاری(١٢٢٤ ) و موسلیم(١٤٧١) (١٣٠)ئیخراجیان کردووە.
[2] –بوخاری(١٣٠٤) و موسلیم(٩٢٤)ئیخراجیان کردووە.

فرمێسكانه چییه ئەی پەیامبەری خوا؟ پەیامبەریش فەرمووی:"هذه رحمة جعلها الله في قلوب عباده وانما يرحم الله من عباده الرحماء "،واتا:ئەمە سۆزو بەزەیی خوایە ئەیخاتە دڵی بەندەكانییەوە، بێگومان خوای گەورە تەنیا بەزەیی بەبەندە بەبەزەییەكانی خۆیدا دێتەوە.

لەموسنەدی پێشەوا ئەحمەددا لەفەرموودەیەكی ئیبن عەباسدا هاتووە ئەڵێ:روقیەی كچی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)مرد، ئافرەتان گریان، عومەریش بەقامچیی لێیانی دەدا، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:"دعهن يا عمر يبكين وإياكن ونعيق الشيطان ثم قال انه مهما كان من العين ومن القلب فمن الله ومن الرحمة وما كان من اليد ومن اللسان فمن الشيطان "[1]، واتا: بیانهێڵە بگرین ئەی عومەر، ئێوەش ئەی ئافرەتان وریا بن قیژە و هاواری شەیتان مەكەن..پاشان فەرمووی: تاوەكو بەفرمێسكی چاو و خەفەتباریی دڵ بێ ئەوە لەلایەن خواوەیەو رەحمەتە، كە بووە لەخۆدان و قسەكردن، ئەوە لەلایەن شەیتانەوەیە.

هەر لەموسنەددا هاتووە لەعائیشەوە كە كاتێ سەعدی كوڕی موعاز مرد، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و ئەبو بەكرو عومەر لای ئامادەبوون، ئەڵێ: سوێند بەخوا من لەدیوو و ماڵی خۆمدابووم گوێم لەگریانی ئەبو بەكرو عومەر بوو[2].

---

[1] - حسن لغيره، ئەحمەد(١/ ٢٣٧)ئیخراجی كردووە.

[2] - حسن، ئەحمەد(٦/ ١٤١- ١٤٢)ئیخراجی كردووە.

لەموسنەددا لەئەبو هورەیرەوە ئەڵێ: تەرمێك بەلای پەیامبەری خوادا تێپەڕکرا خەڵكێك لەسەری دەگریان، من و عومەری کوڕی خەتابیشی لەگەڵدابوو، عومەر هەڵشاخا بەو ژنانەی دەگریان، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:"دعهن یا عمر فإن النفس مصابة والعین دامعة والعهد قریب"[1]،واتا: ئەی عومەر وازیان لێبهێنە، لەئێستادا دەروون مەینەتبارو چاویش بەفرمێسك و مەینەتییەکەش تازەیە.

لەجامیعی ترمیزییدا لەجابری کوڕی عبداللەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)دەستی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفی گرت و ڕۆیشت بۆلای ئیبراهیمی کوڕی، بینیی گیان دەدات، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)خستیە باوەشی خۆی و گریا، پێیووت: ئاخۆ تۆ دەگری؟ ئایە ڕێگرییت لەگریان نەکرد؟ فەرمووی:"لا ولكن نهیت عن صوتین أحمقین فاجرین صوت عند مصیبة خمش الوجه وشق الجیوب ورنة الشیطان"، واتا: نە ڕێگرییم لەگریان نەکردووە جگە لە دوو دەنگی ناشیرینی خراپ: هاوارو دەنگی کاتی کۆست و مەینەتی: روومەت رنین و سنگ دادڕین و ئاوازو قیڕەی شەیتان)، ترمیزیی ئەڵێ: ئەمە فەرموودەیەکی حەسەنە[2].

سەلماوە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سەردانی گۆڕی دایکی کردووەو گریاوەو کەسەکانی دەورووبەریشی گریاون[3].

[1] - حسن لغیره، ئیبن ماجە(١٥٨٧) و ئەحمەد(٢/ ٣٣٣) و نەسائیی(٤/ ١٩)ئیخراجی کردووە.

[2] - حسن، ترمیزیی ئیخراجی کردووە(١٠٠٥).

[3] – موسلیم(٧٩٦) (١٠٦) ئیخراجی کردووە.

هەروەها سەلماوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، عوسمانی کوڕی مەزعونی ماچکردووەو فرمێسك بەچاویدا لێزمەی کردووە[1].

هەروەها سەلماوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)،جاڕی مردنی جەعفەرو هاوەڵانی دا و هەردوو چاویشی فرمێسکیان لێ دەباری[2].

بەدروستیی هاتووە لەئەبو بەکری صدیقەوە(خوای لێ رازیی بێ): کە پەیامبەری خوای بەمردوویی ماچکردووەو گریاوە[3].

ئەو دوانزە بەڵگەی حەرام نەبوونی گریانە، ئەو فەرموودانەی رێگرییان لەگریان کردووە، ئەوەیە کە شیوەن و هەرای لەگەڵدابێ، بۆیە لەهەندێ بێژەی لەفەرموودەکەی عومەردا هاتووە:"الميت يعذب ببعض بكاء أهله عليه"،واتا: مردوو بەهەندێ گریانی کەس و کاری بۆی سزا دەدرێت. لەهەندێکی تریدا هاتووە:"يعذب بما ينح عليه"،واتا: بەو شیوەن و هاوارەی لەسەری دەکرێ سزا دەدرێت.

بوخاریی لەصەحیحەکەیدا ئەڵێ: عومەر وتی: بهێڵن با ئافرەتان بۆ مردنی ئەبا سولەیمان(مەبەستی خالیدی کوڕی وەلید بوو)بگرین تائەوەی خۆڵ بەسەرداکردن و دەنگ و هاواری لەگەڵدا نەبێ.

---

[1] - صەحیحە، ئەبو داوود(٣١٦٣) و ترمیزی(٩٨٩) و ئیبن ماجە(١٤٥٦) و ئەحمەد(٦/ ٤٣)ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٣٦٣٠)ئیخراجی کردووە.

[3] - بوخاری(٤٤٥٥ و ٤٤٥٦)ئیخراجی کردووە.

ئـەوەی ئـەوترێ لەفـەرموودەی تایبـەت بەحـەمزە بـەوەی رێگـەدان نەسـخ بووتەوە شتێكی دروست نییە، واتا: لەمڕۆ بەدوا بـۆ كـوژراوانی ئوحـود نـەگرێن، ئیتر لەوە بەدوا رێگەی گریان نەدراوە.

بەڵگە زۆرە كە لەدوای شـەڕی ئوحـود رێگـە دراوە بـۆ مـردوو بگـرێن، لەوانـە فەرموودەكەی ئەبو هورەیرەیە، چـونكە موسـڵمانبوون و بـەهاوەڵبوونی لەسـاڵی حەوتی كۆچیی بووە، لەوانە گریان بۆ كوژرانی جەعفەرو هاوڕێكانی كـە لەسـاڵی هەشـتی كۆچـیی شـەهید بـوون، لەوانـە گریـان بـۆ مردنـی زەینـەب كـە لەسـاڵی هەشتی كۆچییدا مردووە، لەوانە گریان لەسەر سەعدی كوڕی موعاز كـە لەسـاڵی پێنج كۆچییدا مردووە، لەوانە گریانی پەیامبەری خوا(صلی الله علیـه وسـلم) لای گۆڕی دایكی كە لەساڵی فەتحدا بووە.

قسەی ئەوان: (رێگەی داوە لەپێش مردنی كەسەكە بۆی بگرین وەك وریاییەك نەوەك دوای مردنی)، وەڵام بۆ ئەمە: گریان لەپێش مردن بۆ خەفەتبارییە، بەڵام خەفەتباریی دوای مردنی سـەختترەو گریـان لـەدوای مـردن زیـاتر رێگـە دراوتـرو بیانووی زۆرترە. پەیامبەریش(صلی الله علیه وسلم)ئاماژەی بەسەختیی حاڵـەتی لەدەستدانی خۆشەویستانی كردووەو فەرموویەتی:"تدمع العین ویحـزن القلـب ولا نقول ما یسخط الرب وانا علیك یا ابراهیم لمحزونون"[1]،واتا: چاو فرمێسك دەڕێژێ و دڵ خەفەتبارەو شتێك ناڵێین جێی تووڕەكردنی خوای گەورەبێ، بۆ مردنی تـۆ خەفەتبارین ئەی ئیبراهیم.

**هەرچی تایبەت بەشیوەن و هاواربێ:** ئەوە ئەحمەد دەقـی حـەرامبوونی ئـەو كـارەی هێناوەتـەوە، لەگێڕانەوەیەكـدا: شـیوەن و هـاوار تاوانە(مەعسـییەتە)،

[1] - بوخاری(١٣٠٣) و موسلیم(٢٣١٥) ئیخراجیان كردووە.

هاوەڵانی شافیعی و کەسانی تر وتوویانە: قیژەو هاوار حەرامە. ئیبن عەبدولبیڕ ئەڵێ: زانایان یەکدەنگن کە قیژەو شیوەن بۆ ژنان و پیاوان حەرامەو جائیز نییە. هەندێ زانایانی دواترینی مەزهەبی ئەحمەد وتوویانە: کەراهەتی تەنزیهیی هەیە. ئەمە قسەی ئەبی ئەلخەتابە لە(الهداية)دا ئەڵێ: شیوەن و قیژەو هەراو رومەت رنین و سنگ دادڕین و پەلوپۆکوتان کەراهەتی هەیە.

دروستترین بۆچوون، ئەوەیە قیژەو شیوەن و هاوارو پەلوپۆکوتان حەرامە، بەبەڵگەی فەرموودەکەی عبداللەی کوڕی مەسعود کە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ»[1]، واتا: لەئێمە نییە کەسێك لەگۆنای خۆی بدات و سنگ دابدڕێ و قسەی سەردەمی نەفامیی دووبارە بکاتەوە(وەك هەی هاوار و شتانی تر).

هەر لەصەحیحەیندا هاتووە لەئەبی بوردەوە ئەڵێ: ئەبو موسا نەخۆشییەکی سەختی گرت و بێ هۆشکەوت و سەری لەباوەشی خێزانێکیدا بوو، ئافرەتەکە هاوارو قیژەی کرد ئەبو موسا نەیتوانی هیچ وەڵامێکی بداتەوە، کە بەئاگاهاتەوە وتی: من لەو کارە بەدوورم(بەرییم) هەروەك چۆن پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)لێی بەریی و بەدوور بوو، پەیامبەری خوا بەریی بوو لەو ئافرەتەی لەکاتی کۆست و بەڵادا دەقیژێنێ(الصالقة) و ئەو ئافرەتەی قژی دەڕنێ و لێی

---

[1] - بوخاری(١٢٩٧) و موسلیم(١٠٣) ئیخراجیان کردووە.

دەكاتــەوە(الحالقــة) و ئــەو ئافرەتــەی كراســی بــەری خــۆی دەدڕێنــێ لــەكاتی مەینەتییدا(الشاقة)[1].

لەصــەحیحەیندا هــاتووە لــەموغیرەی كــوڕی شــوعبەوە ئــەڵێ: گــوێم لێبــوو پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)ئەیفەرموو:"إن من نِیْحَ علیه یُعذَّب بما نـِیْحَ علیه"[2]،واتا: هەركەسێ قیژەو هاواری لەسەر بكرێ،ئەوە لەسەری سزا دەدرێت.

هــەر لەصــەحیحەیندا هــاتووە لــەئوم عەتییــەوە ئــەڵێ: پەیامبــەری خــوا لەبەیعەتدا ئەو بەڵێنەی لێمان وەرگرت كە شیوەن و قیژەو هاوار نەكـەین، تـەنیا پێنج ئافرەتمان پێوەی پابەند بوو[3].

لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە لەئیبن عومەرەوە، كە پەیامبەری خوا(صلی الله علیــه وسـلم)فەرموویەتی:"أربـع في أمـتي مـن أمـر الجاهلیـة لا یتركـونهن "الفخـر بالاحساب والطعن في الانسـاب والاستسـقاء بـالنجوم والنیاحـة"،واتـا: چـوار شـت لەئوممەتەكەمدا هەیە هـی سـەردەمی نـەفامیین و وازی لێنـاهێنن: شـانازییكردن بەڕەچـەڵەك و بنەماڵـەوە، تانــەدان لەڕەچـەڵەكی یـەكتر، كـاركردن بەجووڵـەی ئەستێرەكان، شیوەن و قیژەی سەر مردوو. هـەروەها فەرموویـەتی:"النائحـة اذا لم تتبِ قبل موتها، تقام یوم القیامة وعلیها سِرْبالٌ من قَطِـران ودِرْعٌ مـن جَـرَب"[4]، واتا: ئەو كەسەی قیژەو هاواری كردووە پێش مردنی تەوبە نەكات، ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا پۆشاكێكی لەقیرو زرێیەكی گەڕو گولی لەبەردایە.

---

[1] - بوخاری(١٢٩٦) و موسلیم(١٠٤) ئیخراجیان كردووە.

[2] - بوخاری(١٢٩١) و موسلیم(٩٣٣) ئیخراجیان كردووە.

[3] - بوخاری(١٣٠٦) و موسلیم(٩٣٦) ئیخراجیان كردووە.

[4] - موسلیم(٩٣٤)ئیخراجی كردووە.

لەسوونەنی ئەبو داوددا هاتووە لەئوسەیدی کوڕی ئەسیدەوە، ئەویش لەیەکێك لەو ئافرەتانەی بەیعەتیان بەپەیامبەری خوا دابوو وتوویەتی: لەیەکێك لەو شتە باشانەی بەیعەتمان بەپەیامبەری خوا کردو دەبوو سەرپێچی نەکەین، ئەوەبوو: دەمووچاو نەڕنین و وەی و واوەیلا نەکەین و سنگ دانەڕنین و قژمان هەڵنەکەین و نەبڕینەوە))[1].

لەموسنەددا هاتووە لەئەنەسەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا لەکاتی بەیعەتدانی ئافرەتاندا بەیعەتی لێ وەرگرتن: کە قیژەو شیوەن نەکەن، وتیان: ئەی پەیامبەری خوا لەسەردەمی نەفامییدا ئافرەتان دەگریان و ئاوازیان دەوتەوە، ئایە لەئیسلامیشدا ئەوەمان بۆ بکەن؟ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:"لَا إسعاد فِي الإِسلام"[2]، واتا: لەئیسلامدا ئاوازو بەیتو بالۆرە بوونی نییە.

پێشتریش باسمان کرد کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی:"وما كان من اليد ومن اللسان فمن الشيطان"[3]،واتا: کە بووە لەخۆدان و قسەکردن، ئەوە لەلایەن شەیتانەوەیە. هەروەها فەرموویەتی:" نهيت عن صوتين أحمقين فاجرين صوت عند مصيبة خمش الوجه وشق الجيوب ورنة الشيطان"،واتا: رێگرییم لەگریان نەکردووە جگە لە دوو دەنگی ناشیرینی خراپ:

---

[1] - صەحیحە، ئەبو داوود (٣١٣١) و بەیهەقیی لە السنن الكبرى(٤/ ٦٤)ئیخراجیان کردووە.

[2] - صەحیحە، عبدالرزاق لەمصنف (٦٦٩٠) و ئەحمەد(٣/ ١٩٧) و نەسائییش(٤/ ١٦)ئیخراجیان کردووە.

[3] - حسن لغیره، ئەحمەد (١/ ٢٣٧)ئیخراجی کردووە.

هاوارو دەنگی کاتی کۆست و مەینەتی: روومەت رنین و سنگ دادرِین و ئاوازو قیژەی شەیتان)[1].

لەموسنەدەی پێشەوا ئەحمەد لەفەرموودەیەکی ئەبو موسادا هاتووە، کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی:« الميِّتُ يُعذَّبُ بِبُكاءِ الحيِّ، إذا قَالتِ النَّائحَةُ: واعَضُداهُ، ونَاصِراهُ، وكَاسِيَاهُ حَبَّذا الميِّتُ، قيل لهُ: أنْتَ عَضُدهَا، أنْتَ نَاصِرُهَا، أنْتَ كَاسِيهَا؟!»[2]،واتا: مردوو بەگریانی کەسە زیندووەکانی سزا دەدرێت، کاتێ شیوەنگێڕ ئەڵێ: پشتم شکا، پشتیوانم نەماو داپۆشەرم رۆ، بەمردووەکە دەوترێ تۆ پشت و بازوو سەرخەرو داپۆشەری بووی؟!

لەصەحیحی بوخاریدا لەنوعمانی کوڕی بەشیرەوە ئەڵێ: عبداللەی کوڕی رەواحە چووە حاڵەتی بێ هۆشییەوە، عەمرەی خوشکی دەستی کردە گریان و وتی: ئەی هاوار چیای من رۆ و ئەمەو ئەمەوەی وت، کە عبدالله هۆی هاتەوە وتی: هەرچیت وت بەمن وترایەوە، کە مرد، عەمرەی خوشکی لاوانەوەی نەکرد[3].

چۆن ئەم رەوشت و هەڵسوکەوتانە حەرام نابن، کە نیشانەی تووڕەیین بەرانبەر بەپەروەردگارو کار گەلێکی دژ بەئارامگریین و زیان بەدەروون دەدەن لەلێدانکردنی روومەت و قژ رنین و دوعای لەنێوچوون و نەگبەتیی بۆ خودی خۆی و هەستکردن بەوەی لەلایەن خوای گەورەوە ستەمت لێکراوەو بەسنگ دادرِین و کراس درِین سەروەتی خۆت بەفیڕۆ دەبەیت و مردوو بەجۆرێ وەسف

---

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

[2] - حسن، ئەحمەد(٤/ ٤١٤) ئیخراجی کردووە.

[3] - بوخاری(٤٢٦٧)ئیخراجی کردووە.

دەکەی کە وەها نەبووە، بێگومان حەرامبوونی توندی ئەمە، بەو کارانە زیاتر دەسەلمێ.

ئەوانەی ڕێگەیان داوە تەنیا بگرین و قیژەش هەبێ گەرچی بەکەراهەتیان داناوە، ئەوە دەگێڕنەوە لەحەربی کوڕی وائیلەی کوڕی ئەسقەع و ئەبی وائیلەوە: کە گوێیان لەقیژە بووەو قسەیان نەکردووە.

وتوویانە: لەصەحیحەیندا هاتووە[1] لەئوم عەتییەوە وتوویەتی: کە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾ (الممتحنة: ١٢)

واتا: ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)هەر کاتێك ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆ لات کە پەیمانت لەگەڵ ببەستن لەسەر ئەوەی کە دانەنێن بەهاوبەشی خوا هیچ شتێك و دزی و داوێن پیسی نەکەن و منداڵانی خۆیان نەکوژن هیچ جۆرە بوختانێك هەڵنەبەستن لە نێوان دەست و پێ یاندا وە بێ فەرمانیت نەکەن لە کاری چاکدا ئەوسا پەیمانیان لەگەڵ ببەستە وە لە خوا داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکە بەڕاستی خوا لێ خۆشبووی میهرەبانە.

لەنێو حەرامکراوەکاندا قیژەو لاوانەوە هەبوو، منیش وتم: ئەی پەیامبەری خوا تەنیا بۆ بنەماڵەی فلان با لاواندنەوە بکەم، ئەوان لەسەردەمی نەفامییدا بۆ منیان کرد، دەبێ منیش لاواندنەوەیان بۆ بکەم؟ فەرمووی: باشە تەنیا بۆ بنەماڵەی فلان.

---

[1] - بوخاری(٤٨٩٢) و موسلیم(٩٣٧)ئیخراجیان کردووە.

لەگێڕانەوەیەکی هەردووکیاندا هاتووە کە ئوم عەتییە وتوویەتی: بەیعەتمان بەپەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)دا، ئەویش ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندینەوە:﴿ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴾ و ڕێگریی لێکردن لەشیوەن و گریان، ئافرەتێك لەئێمە دەستی کشانەوەو وتی: فلانە ئافرەت لاوانەوەی بۆ کردووم، من دەمەوێ قەرزەکەی بدەمەوە. ئەڵێ: پەیامبەر هیچی بەو ئافرەتە نەوت، ئافرەتەکە ڕۆیشت و پاشان گەڕایەوەو بەیعەتی دا. وتوویانە: ئەوەی پەیامبەر مۆڵەتی بەهەندێ لەو ئافرەتانە داوە ئەو کارە بکەن، نیشانەو بەڵگەی ئەوەیە بۆ تەنزیهیی نەهی لێکردووە نەك حەرامبوون و ئەو کارە لەتەواوی کارەکانی تری شیوەنگێڕان و خراپییەکانی تر جیاکرایەوە و هەندێ ئافرەت کردوویانە.

ئەوانەی کاری لەو جۆرەیان حەرام داناوە وتوویانە: قسەی هیچ کەسێك بەرێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) بەراورد و بەرانبەر بەیەك دانانرێت، فەرموودەش نادەین بەگژ یەکدا، دەقەکان روون و راشکاون و لێکدانەوەی تر هەڵناگرن و کۆدەنگییان لەسەر هەیە، ئەو ئافرەتەی کە وتوویەتی: تەنیا بۆ بنەماڵەی فلان لاوانەوە دەکەم و ئەو ئافرەتەش کە پەیامبەر لەبەرانبەریدا هیچی نەوتووە، لەدوو رووەوە شتێکی تایبەتن:

یەکەم: بەجگە لەو دوو ئافرەتەی فەرمووە: "لَا إسعاد فِي الإِسلام"، واتا: لەئیسلامدا ئاوازو بەیتو بالۆرە بوونی نییە.

دووەم: کە ڕێگەی ئەو دوو ئافرەتەی داوە لەبەرئەوەی تازە موسڵمان ببوون و جارێك جائیزو حەرامیان لەیەکتر جیانەکردبووەوە، ناکرێ لەکاتی پێویستدا حوکمەکە روون نەکرێتەوە، دەزانرێ ئەو حوکمە تەنیا بۆ ئەو دوو ئافرەتە بووەو بۆ ئافرەتانی تر تێپەڕی نەکردووە.

ئەگەر وشەیەکی سادە بووتریٚ و راستگۆیانە بێ و بەیت و بالۆرەو تووڕەیی دەرخستن نەبێ،ئەوە حەرام نییەو لەگەڵ ئارامگرتنیشدا دژ نییە، ئەحمەد لەموسنەدەکەیدا دەقی لەسەر داوە لەفەرموودەکەی ئەنەسدا: کە ئەبو بەکر چووەتە لای پەیامبەری خوا کاتێك کۆچی دوایی کردبوو، دەمی لەسەر هەردوو چاوی داناو دەستی خستەسەر هەردوو لاچەناگەی و وتی: ئای پەیامبەری شیرینم، ئای خۆشەویستەکەم، ئای هەڵبژاردەکەی خوای گەورەم[1].

لەصەحیحی بوخاریدا هەر لەئەنەسەوە ئەڵێ: کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)ئازاری لەسەر قوورس بوویەوەو ناخۆشیی زۆری هەبوو، فاتیمە وتی: ئای لەئازارو ناخۆشیی باوکم، پەیامبەر فەرمووی: لەمڕۆ بەدوا باوکت ئازارو ناخۆشیی نابینێ، کە پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)کۆچی دوایی کرد وتی: ئەی باوکە گیان کە خوا پاڕانەوەی تۆی قبوڵکرد، ئەی ئەو باوکەی کە بەهەشت جێگەو ئارامییتە،ئەی ئەو باوکەی جیبریل هەواڵی مردنی پێگەیاند، کە نێژرا فاتیمە وتی:ئەی ئەنەس دڵتان ئارامبوویەوە کە خۆڵتان بەسەر پەیامبەری خوادا کرد(صلی الله علیه وسلم)؟[2].

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:"وإنَّا بك يا ابراهيم لمحزونون"[3]،واتا: بۆ مردنی تۆ خەفەتبارین ئەی ئیبراهیم. ئەم جۆرە قسانە لەو قسانەن کە خراپە بەرانبەر قەدەر و تووڕەیی دژ بەخوداو رقبوون لەفەرمانی خودای تێدا نییە، تەنیا وەك گریانێکە.

---

[1] - ئەحمەد(٦/ ٣١و ٢٢٠) لەفەرموودەی عائیشە(خوای لێ رازیی بێ).

[2] - بوخاری(٤٤٦٢)ئیخراجی کردووە.

[3] - پێشتر تەخریج کرا.

## بەش

ئەوەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:« إِنَّ المَيِّتَ لَيُعذَّبُ بالنياحة عَلَيْهِ»[١]،واتا: کەسی مردوو بەقیژەو شیونکردن بۆی سزا دەدرێت. ئەوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)سەلماوە لەعومەری کوڕی خەتاب و عبداللەی کوڕی و موغیرەی کوڕی شوعبەوە، هاوشێوەی ئەوەش گێڕدراوەتەوە لەعیمرانی کوڕی حەصین و ئەبی موساوە(خوای لێ رازیی بێ) و شێوازەکانی خەڵکیش لەو رووەوە جیاوازن، بۆیە کۆمەڵێك وتوویانە: خوای گەورە چۆنی بووێ مامەڵە بە مەخلوقاتی خۆی دەکات و هۆکار بۆ کاری خوا ناهێنرێتەوەو جیاوازیی نییە لەسزادانی مردوو بەهۆی ئەوەی شیوەنی بۆ دەکرێ لەگەڵ سزادان لەسەر کارێك درابێتە پاڵی، چونکە خوای گەورەیە هەمووی دروستکردووە، خوای گەورە ئازاری منداڵ و ئاژەڵ و شێت دەدات بێ ئەوەی کارێکیان کردبێ.

کۆمەڵێکی تر ئەڵێن: ئەوانە فەرموودەی پەیامبەری خوا نیین، عائیشەی دایکی ئیماندارانیش ئەوەی رەتکردووەتەوەو بەڵگەی هێناوەتەوە بەم فەرمایشتەی خوای گەورە:﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾ الأنعام: ١٦٤، واتا: هیچ کەسێکی گوناهکار گوناهی کەسێکی تر هەڵناگری.

کە ئەو گێڕانەوەیەی عومەرو عبداللەی کوڕی پێگەیشت وتی: ئێوە بێ ئەوەی درۆ بکەن و تۆمەتبار بن ئەوەتان گێڕاوەتەوە، بەڵام هەندێجار گوێ و بیستن درۆ دەکات و هەڵە تێگەیشتوون. ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه

[١] - پێشتر تەخریج کرا.

وسلم)بەلای گۆڕی جولەکەیدا تێپەڕی و فـەرمووی:"ان صـاحب هـذا القـبر يعـذب وأهله يبكون عليه "[1]،واتا: خاوەن ئەم گۆڕە سزا دەدرێ و کەس و کاریشی بۆی دەگرین.

لەگێڕانەوەیەکدا کە(متفق عليه)و لەدایکە عائیشـەوە گێڕدراوەتـەوە هـاتووە: بێگومان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسـلم)فەرموویەتی:"ان الله ليزيـد الكـافر عذابا ببكاء أهله عليه "[2]، واتا: خوای گـەورە بـەگریانی کـەس و کـاری مـردووی بێباوەڕ، سزای بێباوەڕەکە زۆرتر ئەکات. ئەڵێ:قورئاننتان بۆ بەسە بەڵگـە بـدات: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾ الأنعـام: ١٦٤، واتـا: هـیچ کەسـێکی گوناهکـار گوناهی کەسێکی تر هەڵناگری.

کۆمەڵێکی تر وتوویانە، موزەنی[3] و کەسانی تریشیان لەنێواندایە: ئەو مردووە سزا دەدرێت کە لەژیاندا وەسێتی کردووە شیوەنی بۆ بکرێ، خەڵکانێکی زۆریش لەشیعرەکانیاندا ئەو وەسێتەیان کردووە، لەوانە تەرفە[4]:

اذا مت فانعيني بما أنا أهله ... وشقي على الجيب يا إبنة معبد

واتـا: کـە مـردم شـیاو بەپێگـەو ناوبـانگیی مـن شـیوەن و لاواندنـەوەو سـنگ دابدڕە ئەی کچی مەعبەد.

---

[1] - بوخاری(١٢٨٩) و موسلیم(٩٣١)ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(١٢٨٨) و موسلیم(٩٢٩)ئیخراجیان کردووە.

[3] - ئیسماعیلی کوڕی یەحیای ئەلمیسری، ئەبو ئیبراهیم،پێشەنگ بووە لەفیقهدا(ساڵی١٧٥ ك لـەدایکبووەو ساڵی٢٦٤ك مردوە)و قوتابی و هاوەڵی پێشەوا شافیعیی بووە، زاهیدو زاناو موجتەهیدو بەڵگە بەهێز بووە.

[4] - تەرفـە(طرفـة)ەی کـوڕی ئەلعەبـد: یـەکێك بـووە لەشـاعیرانی موعەلـەقات، ئـەو دێـڕە شـیعرەش لەموعەلەقاتەکەیدایە.

لوبەیدیش لەسەرەمەرگدا بەهەردوو کچەکەی ئەڵێ:

فقوما فقولا بـالذی قد علمتمـا ... ولا تخمشا وجها ولا تحلقا شعر

وقولا هو المرء الـذی لا صدیقه ... أضـاع ولا خـان الامین ولا غدر

إلی الحول ثم اسم السلام علیکما ... ومن یبك حولا کـاملا فقد اعتذر

واتا: هەستنە سەر پێ و ئەوە بڵێن کە فێری بوونەو روومەت مەڕنن و قژ لەخۆتان مەکەنەوە و بڵێن باوکمان ئەو پیاوە بووە کە هیچ هاوڕێیەکی لەدەست نەداو ستەم و ناپاکیی نەکرد و بۆ یەك ساڵ ئەمە بکەن، ئیتر سەلامتان لەسەربێ و هەرکەسێکتان ساڵێك بگرێ گلەیی و بیانووی لەسەر نامێنێ.

کۆمەڵێکی تر وتوویانە: ئەمە وەستاوەتەوە سەر خۆی و نـەریتی قەومەکـەی کـە مردووەکـە نـەهی لـێ نەکردوون،چـونکە وازهێنـانی لەنەهییەکـە بەڵگـەی رازیبوونێتی، ئەمە قسەی ئیبن موبـارەك و کەسـانی تریشـە، ئـەبو ئەلبـەرەکات ئیبن تەیمییە ئەڵێ: ئەمە دروستترینی هەموو بۆچوونەکانە، چونکە گەر کەسەکە لەگومانیدا ئەوە زاڵبوو کە کەس و کارەکەی شیوەنی بۆ دەکـەن و وەسـێتی بـۆ نەکردن کاری وەها نەکـەن، واتـا بـەو شـیوەن و هەرایـە رازییـە و وەك کەسـێکە ئەتوانێ رێگریی لەخراپە بکات و نایکات، بەڵام ئەگەر وەسێتی پێکردن شـیوەنی بـۆ نـەگێڕن و کەسـوکارەکەی بـەگوێیان نـەکرد، ئـەوە خـوای گـەورە لـەوە بەخشندەترە تاوەکو سزای بدات، بۆیە کار بەئایەتەکە دەکرێ و رەتکردنـەوەی عائیشەش بۆ ئەوە فەرموودەکان عەیبدار ناکات، چونکە ئـەوان ئامـادەی شتێك بوونە کە ئـەو لەوێدا ئامـادە نـەبووە و ئەگـەری بەهەڵەداچوونی پێـنج هـاوەڵی گەورە بەدوورە.

ئەوەی دایکە عائیشە وتوویەتی مردووەکە جولەکە بووە، رێگر نییە لەوەی ئەو پێنج هاوەڵە لەکاتی تردا هێناویانەتەوەو مەرج نییە تەنیا بۆ کەسی بێباوەڕ بێ، خوای گەورە کە ستەم لەموسڵمانێك نەکات ستەم لەبێباوەڕێکیش ناکات، خوای گەورەش زاناترە.

## بەش

ئەم فەرموودانە پێویست بەم زۆر لەخۆکردن و خۆماندووکردنانە ناکات، سوپاس بۆ خوای گەورە کێشە و ناڕوونی و پێچەوانەی رواڵەتی قورئان و هیچ رێسایەکی شەرعییان تێدا نییە، سزای هیچ مرۆڤێکیان لەخۆ نەگرتووە کە بەهۆی کاری کەسێکی ترەوە سزا بدرێن، پەیامبەری خوا نەیفەرمووە: مردوو بەهۆی گریان و شیوەنی کەس و کارییەوە سزا دەدرێ، بەڵکو فەرموویەتی ئازار دەبینێ، ئەو ئازارەی کە بۆی دێتەدی و گشتگیرترە لەسزا، هەر پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی:"السفر قطعة من العذاب"،واتا:گەشت و سەفەر کردن پارچەیەکە لەئازار.

ئازارێکە تووشی باوەڕدارو بێباوەڕیش دەبێ، تەنانەت مردوو بەو مردووەی تەنیشتیشی ئازار دەبینێ کە سزا دەدرێت، هەروەك چۆن مرۆڤ لەدونیادا بەسزادانی هاوسێکەی ئازار دەبینێ.

کە کەس و کاری مردووەکە گریانی حەرام ئەنجام دەدەن، ئەو گریانەی کە خەڵکانی سەردەمی نەفامیی ئەنجامیان دەداو لەشیعرو پەخشانیاندا دیارو روونە، ئەوە مردوو لەگۆڕەکەیدا بەداخ و ئازارە، ئازار دەبینێ کە کەسوکاری بۆی دەگرین، ئەمە شێوازی تێگەیشتنی زانای ئێمەیە بۆ ئەو فەرموودانە، سەرکەوتنیش بەپشتیوانیی خوای گەورەیە.

## تەوەری نۆزدەیەم

## ئیمان ئارامگرتن و سوپاسگوزارییە

ئیمان دوو بەشە:نیوەیەکی ئارامگری و نیوەکەی تریشی سوپاگوزارییە، زیاتر لەپێشینێك وتوویانە:ئارامگرتن نیوەی ئیمانە، عبداللەی کوڕی مەسعودیش(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: ئیمان دوو نیوەو بەشە: نیوەیەکی ئارامگرتنە، نیوەکەی تریشی بریتییە لەسوپاسگوزاری، بۆیە خوای گەورە ئارامگری و سوپاسگوزاریی پێکەوە کۆکردووەتەوەو ئەفەرمووێ:﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ۝ ﴾ إبراهیم: ٥، واتا: بەڕاستی لەو(بیر خستنەوە)دا پەندو بەڵگەی زۆر هەیە بۆ هەموو خۆڕاگرێکی سوپاس گوزار.

هەروەها لەسورەتی حم عسق ئایەتی:٣٣ و سورەتی سەبەء ئایەتی:١٩، سورەتی لوقمان ئایەتی:٣١، بۆ ئەو پۆلێنکردنە کۆمەڵێ شت باسکراوە:

**یەکەم:** ئیمان ناوێکی کۆ و لەخۆگری وتەو کردارو نییەتە، بۆ دوو بەش دەگەڕێتەوە: کردار، وازهێنان، کردارکردن واتا کارکردن لەگوێڕایەڵیی خوای گەورەدا کە حەقیقەتی سوپاسگوزارییە، وازهێنانیش بریتییە لەئارامگرتن لەبەردەم تاوان و قەدەغەکراوەکاندا، ئایینیش هەمووی لەو دوو شتەدا کۆدەبێتەوە: ئەنجامدانی کارێك فەرمان دراوە ئەنجام بدرێ و وازهێنان لەئەنجامدانی کارێکی قەدەغەکراو.

**دووەم:** ئیمان لەسەر دوو پایەو بنەما دامەزراوە: دڵنیایی(یەقین) و ئارامگری، دوو پایەن و لەقورئانی پیرۆزدا باسکراون:﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً

﴿... يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا ۖ وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾﴾ السجدة: ٢٤، واتا: لەنێو ئەواندا پێشەوایانێكمان دانا رێنمونی خەڵكیان دەكرد بەفرمانی ئێمە كاتێ خۆیان گرت و لەئایەتەكانی ئێمە دڵنیابوون(باوەڕی پتەویان هێنا).

بەهۆی دڵنیاییەوە حەقیقەتی فەرمان و نەهی و پاداشت و سزا دەزانین، بەهۆی ئارامگرییەوە كاری فەرمانپێكراو ئەنجام دەدرێ و مرۆڤ دەتوانێ لەكاری قەدەغەكراو دووربگرێ و زۆر لەخۆی بكات بۆ دووركرتن لەتاوان. مرۆڤ بەیەقینەوە دەتوانێ فەرمان و نەهی بەڕاستبخاتەوە كە لەلای خواوە هاتووەو پاداشت و سزاشی هەیە، تەنیا بەهۆی ئارامگرتنەوە دەتوانێ لەئەنجامدانی فەرمانەكان و دووركرتن لەقەدەغەكراوەكان بەردەوام بێ، بەوە ئارامگریی بووەتە نیوەی ئیمان و سوپاسگوزارییش نیوەی دووەمە بەئەنجامدانی كاری واجیب و وازهێنان لەكاری قەدەغەكراو.

سێیەم: ئیمان قسەو كردارە، قسە قسەی دڵ و زمانە، كرداریش كرداری دڵ و ئەندامەكانی لاشەیە، روونكردنەوە بۆ ئەوە، هەركەسێ بەدڵ خوا بناسێ و بەزمان دانی پێدانەنێ باوەڕدار نییە، هەروەك لەبارەی قەومی فیرعەونەوە ئەفەرمووێ: ﴿وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾﴾ النمل: ١٤، واتا:ئەو موعجیزانەیان دان پێدا نەدەنا كە لە دڵی خۆیاندا ئەو(موعجیزانە)یان بەڕاست دەزانی لەبەر ستەمكاری و خۆبەزل زانین(یان)ئینجا سەرنج بدە سەرئەنجامی خراپەكاران چۆن بووە.

لەبارەی قەومی عادو قەومی سالحیشەوە ئەفەرمووێ: ﴿وَعَادًا وَثَمُودَا وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَاكِنِهِمْ ۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ

﴿ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُواْ مُسۡتَبۡصِرِينَ ۝٣٨ ﴾ العنكبوت: ٣٨، واتا: گەلی عادو سەموودیشمان(لەناو برد)بەڕاستی(ئەو لەناو بردنە)ڕوون بۆتەوە بۆتان لە شوێنەوارە(وێرانە)کانیانەوە شەیتان کردەوە خراپەکانیانی بۆ ڕازاندبوونەوە بەهۆی ئەوەوە بەرگری کردن لە ڕێگای ڕاست لە کاتێدا ئەوان توانای بیرکردنەوەیان هەبوو(ژیر) بوون.

موساش بەفیرعەون ئەڵێ: ﴿ قَالَ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ بَصَآئِرَ ﴾ الإسراء: ١٠٢، واتا: مووسا(علیه السلام)فەرمووی سوێند بەخوا بێگومان تۆ دەزانی هیچ کەس ئەم موعجیزانەی نەناردۆتە خوارەوە بێجگە لە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی کە ڕوون کەرەوەن.

ئەوانە بەدڵ خوایان دەناسی، بەوەش نەبوونە یەکێك لەباوەڕداران.

هەروەها کەسێك بەزمانی باسی خواناسیی بکات و لەدڵیدا ئەو باوەڕەی نەبێ ئەویش باوەڕدار نییە، بەڵکو یەکێکە لەدووڕووەکان، هەروەها کەسێك بەدڵ خوایناسی و بەزمانیش دەربڕی بەوە نابێتە باوەڕدار تاوەکو کاری دڵ ئەنجام نەدات لەڕووی خۆشویستن و ڕقلێبوونەوەوە، دەبێ خواو پەیامبەری خوای خۆشبووێ و دۆستانی خوای خۆشبووێ و دوژمنایەتیی دوژمنانی خوا بکات، دەبێ دڵی تەنیا ملکەچی خوا بێ و شوێنکەوتەو گوێڕایەڵی پەیامبەرەکەی بێ و بەناخ و ڕواڵەتیش پابەندی شەریعەتی خوا بێ، ئەگەر ئەوانەشی هەبوو ئیمانی کامڵ نابێ تاوەکو فەرزو واجیبەکان ئەنجام نەدات.

ئەوە چوار پایەکەن، پایەکانی ئیمان کە ئیمانیان لەسەر راوەستاوە و سەرچاوەکانیان بۆ زانست و کردار دەگەڕێتەوە، دەستهەڵگرتن لەتاوانیش لەڕیزی کارکردندایە، هەردوو حاڵەتەکە کە ئەنجامدانی فەرزەکان و دوورگرتن

لەتاوانەکانە بەهۆی ئارامگرتنەوە دێتەدی، بۆیە ئیمان بووەتە دوو بەش: یەکێکیان ئارامگرتنە، دووەمیش ئەو شتانەیە کە لەو زانست و کردارەوە دروست دەبێ و دێتەبوون.

**چوارەم:** دەروون دوو هێزی هەیە: هێزی پێ هەلگرتن و هێزی خۆگرتن، هەمیشە لەنێوان ئەو دوو هێزەدا رارایە، حەزدەکات پێ هەلگرێ بۆ ئەو شتەی حەزی لێ هەیەو خۆیشی دەگرێ لەبەرانبەر ئەو شتەی حەزی پێ نییە. ئایین هەمووی پێهەلگرتن و خۆگرتنە: پێهەلگرتنە بۆ گوێڕایەلّیی خوای گەورەو خۆگرتنە لەبەردەم ئەو شتانەی مایەی سەرپێچیی فەرمانەکانی خوان، ئەو دووانەش تەنیا بەئارامگریی دێنەدی.

**پێنجەم:** ئایین هەمووی حەز و ترسە، باوەڕدار کەسێکی حەزدارو ترساوە، پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ﴾ الأنبياء: ٩٠، واتا: بێگومان ئەوانە(ی باسکران لە پێغەمبەران)پێشبڕکێیان دەکرد لە(ئەنجامدانی)هەموو خێرو چاکەکەیەکداو هاواریان لە ئێمە دەکرد بە ئومێدی(بەهەشت) و لەترسی(دۆزەخ).

لەپاڕانەوەی کاتی خەوتندا کە بوخاریی لەصەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە هاتووە:«اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَهْبَةً وَرَغْبَةً إِلَيْكَ»[1]، واتا: خوایە گیان خۆمم رادەستی تۆ کردو رووم کردە تۆ و کاری خۆمم بەتۆ سپارد و پەنام بۆ تۆ هێنا بەحەزو ترسەوە بۆ لای تۆ هاتووم.

---

[1] - بوخاری(٦٣١٣) و موسلیم(٢٧١٠) ئیخراجیان کردووە.

باوەڕدار حەزو ترسی هەیە، ئەو دووانەش لەسەر لقی ئارامگریی خۆیان رادەگرن، ترسانی لەخوا هانیدەدات بۆ ئارامگری و حەزیش(رەغبەت) دەیگەیەنێتە سوپاسگوزاری.

**شەشەم:** هەموو ئەو شتانەی دێنە رێگەی بەندە لەم دونیایەدا، لەوە دەرناچێ، یان بۆ دونیاو ئاخیرەتی بەسوودە، یان زیان لەدونیاو ئاخیرەتی دەدات، یان سوودی بۆ یەکێکیان هەیەو زیانی بۆ ئەوی تر، بۆیە باشترین و بەڕێزترینی ئەوانە، ئەنجامدانی ئەو کارەیە کە بۆ ئاخیرەت بەسوودەو وازهێنان لەشتێك زیانی ئاخیرەتی تێدا هەیە، ئەوەیە حەقیقەتی ئیمان.

ئەنجامدانی ئەوەی سودی پێ دەگەیەنێ سوپاسگوزارییە، وازهێنان لەو شتەش کە زیانی ئاخیرەتی تێدایە بریتییە لەئارامگری.

**حەوتەم:** بەندە لێنابێتەوە لەکارێك کە دەبێ ئەنجامی بدات و قەدەغەکراوێك دەبێ وازی لێبهێنێ و قەدەرێك بەسەریدا دێت، لەو سێ شتەدا دەبێ ئارامگرو سوپاسگوزاربێ، بۆیە ئەنجامدانی کارە فەرزەکان واتا سوپاسگوزاری، وازهێنان لەقەدەغەکراو و ئارامگرتن لەسەر قەدەریش واتا ئارامگری.

**هەشتەم:** بەندە دوو پاڵنەری هەیە: پاڵنەرێك بانگەوازی دەکات بۆ دونیاو ئارەزوو خۆشییەکانی دونیا، بانگەوازکارێکی تریش بانگەوازی دەکات بۆلای خواو ئاخیرەت و ئەو خۆشی و حەسانەوەیەی لەنازونیعمەتی هەمیشەییدا بۆ دۆستانی خۆی داناوە. یاخیبوون و بەگوێنەکردنی بانگەوزکەری شەهوەت و هەواو ئارەزوو ئارامگرییە، وەڵامدانەوەی بانگەوازکاری خواو ئاخیرەتیش واتا سوپاسگوزاری.

نۆیەم: ئایین لەسەر دوو بنەما دەوەستێتەوە: پێداگری(العزم) و دامەزراوی(الثبات)، دوو بنەمان لەو فەرموودەیەدا باسیان هاتووە کە ئەحمەدو نەسائیی لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)گێڕاویانەتەوە کە فەرموویەتی:" اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الثَّبَاتَ فِي الْأَمْرِ وَالْعَزِيمَةَ عَلَى الرُّشْدِ"[1]،واتا: خوایە گیان داوای دامەزراوییت لێ دەکەم لەسەر ئەم کارەو عەزیمەت(پێداگریی)م پێ بدە لەسەر فامیدەیی.

ساغیی عەزیمەت و پێداگریی بناغەی سوپاسگوزارییە، هێزی دامەزرابوونیش بناغەی ئارامگرییە، هەرکات بەندە بەعەزیمەت و دامەزراوییەوە پشتگیریی کرا، ئەوە بەهاوکاریی و سەرکەوتن هاوکاریی کراوە.

دەیەم: ئایین لەسەر دوو بنەما دامەزراوە: حەق و ئارامگری، ئەو دووانەش لەم ئایەتەدا ئاماژەیان پێکراوە:﴿ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلصَّبْرِ ۝٣ ﴾ العصر: ٣، واتا: ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بەئایینی ڕاست وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئارام گرتن.

لەبەرئەوەی لەبەندە داواکراوە لەخودی خۆی و خەڵکییدا بەحەق کاربکات، ئەوەش کە حەقیقەتی سوپاسگوزارییەو بەبێ ئارامگرتن ئەوەی پێ ناکرێ، بۆیە ئارامگرتن بووەتە نیوەی ئیمان، خوای گەورەش زاناترە.

***

[1] - حسن بشواهده، نەسائی(٣/ ٥٤) و تەبەرانی لە المعجم الكبير(٧١٨٠) ئیخراجیان کردووە.

# تەوەری بیستەم

## روونکردنەوەی جیاوازیی خەڵك، ئایە ئارامگری و سوپاسگوزاریی کامەیان فەزڵیان زۆرترە

ئەبو ئەلفەرەج ئیبن ئەلجەوزی[1] لەوەدا سێ قسەی گێڕاوەتەوە: یەکەم: ئارامگرتن باشترە. دووەم: سوپاسگوزاریی باشترە. سێیەم: ئارامگریی و سوپاسگوزاریی وەك یەکن. هەروەك عومەری کوڕی خەتاب(خوای لێ رازیی بێ)وتوویەتی: ئەگەر ئارامگری و سوپاسگوزاریی دوو وشتربوونایە، کێشەم نەبوو سواری کامەیان ببوومایە.

ئێمە هەموو ئەوانە باس دەکەین کە هەر کۆمەڵێك بۆ خۆیان بەبەڵگەیان کردووە، بەبەڵگەکردنەکانیان کامەیان لەجێی خۆیدایەو کامەیان بەو جۆرە نییە، ئەوەش بەپشتیوانی خوای گەورە.

ئارامگران وتوویانە: خوای گەورە ستایشی ئارامگرتن و ئارامگرانی کردووە، فرمانی بەئارامگریی داوەو خێرو خۆشیی دونیا و ئاخیرەتی بەئارامگرییەوە پەیوەست کردووە، لەقورئانەکەیدا لە نزیکەی نەوەد شوێندا باسی کردووە، لەدەق و فەرموودەکانی پێشتریشدا نمونەکانمان لێهێنانەوە، کە بەڵگەی ئەوە دەدەن لەسوپاسگوزاریی فەزڵی زیاترە.

---

[1] – عەبدولڕەحمانی کوڕی عەلیی کوڕی موحەممەدی ئەلجەوزیی ئەلقورەیشیی ئەلبەغدادی، ئەبو ئەلفەرەج(ساڵی٥٠٨ك لەدایکبووەو ٥٩٧ك مردووە)زانا و عەللامەی سەردەمی خۆی بووە لەمێژوو فەرموودەدا، لەدایکبوون و مردنی لەبەغدا بووە، نزیکەی سێ سەد دانراوی هەیە.

هەر ئەوە بەسە پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)فەرموویەتی: "الطَّاعِمُ الشَّاكِرُ بِمَنْزِلَةِ الصَّائِمِ الصَّابِرِ"[1]،واتا: ناندەرێکی سوپاسگوزار وەك كەسێكی بەڕۆژووی ئارامگرە.

لەباسی فەزڵدانی ئارامگری و بەرزیی پلەی بەسەر سوپاسگوزارییدا، سوپاسگوزاری بە ئارامگر گەیاندووەو بەوی شوبهاندووە، دیارە پێ شوبهێندراو(ئارامگر)پلەی بەرزترە لەو شتەی پێ شوبهێندراوە كە(سوپاسگوزارە)، وەك ئەم فەرمایشتەیە:«مُدْمِنُ خَمْرٍ كَعَابِدِ وَثَنٍ»[2]،واتا: گیرۆدەبووی عەرەقخۆریی وەك بتپەرست وایە. ئەمە هاوشێوەی ئەوەیە.

وتوویانە: ئەگەر بەراورد بكەین لەنێوان ئەو دەقانەدا كە باسی ئارامگرییان تێدا هاتووەو ئەوانەشی كە باسی سوپاسگوزارییان تێدا هاتووە، دەبینین دەقەكانی تایبەت بەئارامگریی چەندان ئەوندەی سوپاسگوزارییە، لەوەدا نوێژكردن و جیهادكردن باشترینی كارەكانن، لەهەموو بەشەكاندا فەرمودەیان لەبارەوە هاتووە و زۆربەی فەرموودەكان لەبەشی نوێژو جیهادكردندان.

هەروەها وتوویانە: لەهەموو بەش و بابەتێكی ئایندا ئارامگریی بەشدارە، بۆیە ئیمان وەك شوێنی سەرە بۆ جەستە.

هەروەها وتوویانە: خوای گەورە زیاتركردنی شتەكانی بۆ مرۆڤ بەسوپاسگوزارییكردنەوە پەیوەست كردووە و فەرموویەتی:﴿ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾ إبراهیم: ٧، واتا: سوێند بێ بێگومان ئەگەر ئێوە سوپاسی(چاكەی)من بكەن بۆتان زیاد دەكەم.

---

[1] - صەحیحە، ترمیزی(٢٤٨٦) و ئەبو یەعلا(٦٥٨٢) و حاكم(٤/ ١٣٦)ئیخراجیان كردووە.

[2] - حسن، ئەحمەد(١/ ٢٧٢) و عەبدولڕەزاق لەمصنف(١٧٠٧٠) و بەزار(١٩٣٤) و ئیبن حیبان(٥٣٤٧) ئیخراجیان كردووە.

بەڵام پاداشتی بێ ئەژماری بەئارامگرتنەوە پەیوەست کردووەو، پاداشتی سوپاسگوزارانەی رەها دیاریکردووەو فەرموویەتی: ﴿ وَسَيَجْزِي ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ آل عمران: ١٤٤، واتا: بەزوویی خوا پاداشتی سوپاس گوزاران دەداتەوە.

پاداشتی ئارامگرانیشی بەچاکەکاریی پەیوەست و سنووردار کردووەو فەرموویەتی: ﴿ وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ النحل: ٩٦، واتا: سوێند بەخوا ئەوانەی کە بە ئارام بوون پاداشتیان دەدەینەوە بە پاداشتی چاکترین کردەوەیان.

وتوویانە: لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)ەوە سەلماوە فەرموویەتی:((يقول الله تعالى:كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلَّا الصَّوْمُ فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ))[1]، واتا: خوای گەورە ئەفەرمووێ: هەموو کارێکی نەوەی ئادەم بۆ خۆیەتی جگە لەڕۆژووگرتن، بەڕۆژووبوونەکەی بۆ منەو هەر خۆیشم پاداشتی دەدەمەوە.

بەجۆرێکی تریش هاتووە:"كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ يُضَاعَفُ لَهُ الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، قَالَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ:«إِلَّا الصَّوْمَ فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ»[2]، واتا: هەموو کارێکی نەوەی ئادەم چەندان ئەوەندەی خۆی پاداشتی هەیە، هەر چاکەیەك بە دە ئەوەندە پاداشتی هەیە، پەروەردگار فەرموویەتی: تەنیا ڕۆژووگرتن نەبێ، ڕۆژووگرتن بۆ منەو هەر خۆیشم پاداشتی لەسەر دەدەمەوە. ئەمە تەنیا لەبەر ئەوەیە دەروون ئارامی گرتووە و لەشەهوەت و حەزەکانی خۆی بەدوورگرتووە،

---

[1] - بوخاری(٥٩٢٧) و موسلیم(١١٥١)(١٦١) ئیخراجیان کردووە.

[2] - موسلیم(١١٥١) (١٦٤)ئیخراجی کردووە.

هەروەك لەهەمان فەرموودەدا هاتووە:"يدع شهوته وطعامه وشرابه من أجلي"،واتا: وازی لەشەهوەت و خواردن و خواردنەوەی خۆی هێناوە لەبەر من.

لەمەدا پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەوەلامی ئەو پرسیارەی لێی دەکرێت کە چی کارێك باشترینی کارەکانە، ئەفەرمووێ:"عليك بالصوم فإنه لا عدل له"[1]،واتا: بەڕۆژوو بە چونکە هیچ شتێك لەپاداشتدا هاوشانی نییە.

ئارامگرتن جڵەوکردنی دەروونە لەبەردەم پاڵنەری هەواو ئارەزوودا، ئەوەشە حەقیقەتی بەڕۆژووبوون، دەروون جڵەوگیر دەکرێ لەبەردەم پاڵنەرو حەزی شەهوەتی خواردن و خواردنەوەو جووتبوون، لەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا ئارامگرتن بەڕۆژوو راڤەکراوە:﴿ وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ ﴾ البقرة: ٤٥، واتا: پەنا ببەنە بەر ئارام گرتن و نوێژ.

مانگی رەمەزانیش ناونراوە: مانگی ئارامگری.

هەندێ لەپێشین وتوویانە: بەڕۆژووبوون نیوەی ئارامگرییە، چونکە دەروون جڵەو دەکرێ لەبەردەم پاڵنەرو ویستی شەهوەت و توورەیی، دەروون شتێکی دەوێ تاوەکو پەی بەچێژو خۆشییەکەی ببات، لەشتێك توورە دەبێ کە ئازاری دەدات، بەڕۆژووبوونیش ئارامگرتنە لەسەر شەهوەت و ئارەزووەکان، ئارەزووەکانی سك و داوێن نەك ئەوانەی توورەیی دروست بکەن، بەلام تەواوێتیی رۆژووگرتن، واتا ئارامگرتنی دەروون لەبەردەم پاڵنەرەکانی شەهوەت و توورەیی.

[1] - صەحیحە، نەسائی(٢٢٢٠) و ئەحمەد(٥/ ٢٤٨) و عەبدولڕەزاق(٧٨٩٩) و ئیبن حیبان(٣٤٢٥)ئیخراجیان کردووە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەفەرموودەی صەحیحدا ئامـاژەی پـێ داوەو ئەفەرمووێ: "إذا كان يوم صوم أحدكم فلا يجهل ولا يصخب فإن أحد سابه أو شاتمه فليقل اني صائم "[1]،واتا: گەر یەکێکتان بەڕۆژوو بوو بـا نـەفامیی نـەکات و تـووڕە نـەبێ و هـاوار نـەکات، ئەگـەر یـەکێکیش قسـەی نـاخۆش یـان جنێوی پێ دا با بڵێ: من بەڕۆژووم.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیـه وسـلم)لەو فەرموودەیـەدا داوای کـردووە هێـزی شەهوەت و تووڕەیی هاوسەنگ و ڕێکبخرێ، مرۆڤی بەڕۆژوو دەبێ خۆی بپـارێزێ تاوەکو هێزی شەهوەت و تووڕەییەکەی بەڕۆژووبوونەکـەی مایـە پـووچ نەکـەن، شـەهوەت ڕۆژووەکـەی مایـەپووچ دەکـات و تـووڕەییش لەپاداشـتەکەی کـەم دەکاتەوە، هەروەك لەفەرموودەیەکی تردا ئاماژەی پێ داوە: "مـن لم يـدع قـول الزور والعمل به فليس لله حاجة في أن يدع طعامه وشرابه "[2]،واتـا: هەرکەسـێ واز لەشـایەتیی و قسـەی درۆ نـەهێنێ و کـار بـەدرۆ بکـات، ئـەوە خـوای گـەورە پێویستیی بەبرسیبوون و تینووبوونی ئەو نییە.

ئەوە بەسە ببێتە فەزڵی ئارامگریی بەسەر سوپاسگوزارییدا کە خـوای گـەورە فەرموویـــــــەتی:﴿ إِنِّي جَزَيْتُهُمُ ٱلْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمْ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿١١١﴾ ﴾ المؤمنون: ١١١، واتا: بێگومان ئـەمڕۆ پاداشـتم داونەتـەوە بـەهۆی خۆگرییانـەوە بەڕاستی هەر ئەوانن سەرکەوتوو.

---

[1] - بوخاری(١٩٠٤) و موسلیم(١١٥١)(١٦٣)ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(١٩٠٣) ئیخراجی کردووە.

خــوای گــەورە لــەبری ئارامگرتنیــان ســەرکەوتوویی کــردوون، هــەروەها ئەفــەرمووێ: ﴿ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ ﴾ البقــرة: ٢٤٩، واتــا:خوا لەگــەڵ خۆڕاگرانە.

هیچ شتێك بەرانبەر نابێ بەوەی خوا لەگەڵ بەندەکەیدا بێ، هـەروەك هەنـدێ لەعاریفان وتوویانە: ئارامگران بەکۆکردنەوەی خێرو خۆشیی دونیاو ئاخیرەتـەوە ڕۆیشتوون، چونکە لەتەکابوونی خوای گەورەیان دەستخستووە. پەروەردگاریش ئەفەرمووێت:﴿ وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ ﴾ الطور: ٤٨، واتا: ئارام بگـرە بـۆ بڕیاری پەروەردگارت ئەوسا بێگومان تۆ لە ژێر چاودێری ئێمەدایت.

ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە ئارامگرتن لەبـەردەم بڕیـاری خـوا، پاسـەوانێتی و پارێزگاری و چاودێریی خوایی بەدوادا دێت.

خوای گەورە بەسێ شـت بـەڵێنی بـەئارامگران داوە، هەریـەك لـەو سـێ شـتە لەدونیاو ئەوەی لەسەریدایە خێری زیـاترە، ئـەویش: سـەڵاواتی خـوا لەسـەریان، بـــەزەیی بەرانبـــەریان، تایبـــەتکردنیان بەهیدایـــەت و ڕێنیشـــاندان، وەك دەفـــــــەرمووێت:﴿ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ البقرة: ١٥٧، واتا:ئا ئەوانە درووددوو بـەزەیی بەسـەر ئەوانـدا دەبـارێ لـە لایـەن پەروەردگاریانــەوە و ئەوانــە ئــەو کەســانەن هیدایــەتیان وەرگرتووە.

ئەوەی تێدەگەین ئەوەیە هیدایەتی لەوانـدا کورتکردووەتـەوە، لـەدوو ئایـەتی قورئانەکەیدا هەواڵی داوە کە ئارمگرتن لەکارە پێداگری و سەختەکانە، فـەرمانی بەپەیامبەرەکەشــی کــردووە بــەئارامگرتنی پەیامبــەرانی ئولولعەزمــەوە خــۆی بشوبهێنێ، پێشتریش باسمان لەوە کرد.

وتوویانــە: بەڵگــە هــاتووە لەســەر ئــەوەی چــەندە بتــوانی لــەدونیا بــێ نیازیی(زوهد)بکــەی و لەخۆشــییەکانی کــەم بکەیتــەوە، باشــترە لــەزۆرکردنی خۆشــییەکانی، بــێ نیــاز لــەحاڵی ئــارامگرو زۆرکــەری دونیــاش لــەحاڵی سوپاسگوزاردایە.

وتوویانە: لەمەسیح(سەلامی خوایـان لەسەربێ)پرسـیار کـراوە گـەر دوو پیـاو بەلای گەنجینەیەکدا تێپەڕبوون، یـەکێکیان بەسـەریدا هـەنگاوی نـاو لای بەلایـدا نەکردەوە، ئەوی تریان هەڵیگرت و لەگوێڕایەڵیی خـوای گـەورەدا خـەرجی کـرد، ئایە کام لـەو دوو کەسـە باشـترن؟ فـەرمووی: ئـەوەی تەماشـای نـەکردو پشـتی لێکرد لای خوای گەورە بەڕێزترینە.

وتوویانە: بەڵگە بۆ دروستیی ئەمە، ئەوەیە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسـلم)کلیلی گەنجینــەکانی ســەر زەویــی خرایــە بەردەســتی و هیچــی لێیــان هەڵنەگرت و فەرمووی:"أجوع یوماً وأشبع یوماً"[1]،واتـا: بـەڵکو دەمـەوێ ڕۆژێ برسـیی بم و ڕۆژێ تێـربم. ئەگـەر کلیلـی گەنجینـەکانی بەهەشـتی هەڵبگرتبایـە بەدڵنیاییــەوە لەڕەزامەنـدی و گوێڕایـەڵیی خـوای گـەورەدا دەیبەخشـی، بـەڵام پێگەو پایەی ئارامگرتنی بەباشتر زانی و بێ نیاز بوو لەدونیا.

وتوویانە: ئەزانین کە کەماڵی مرۆیی لەسێ شتدایە: زانسـت گـەلێك دەزانـرێ، کار گەلێك کاری پـێ دەکرێـت، حـاڵ و بـار گـەلێك بـەپێی ئـەو زانسـت و کارانـە ڕێکـدەخرێت. باشـترین زانسـت و کـارو حاڵێـك: ناسـینی خـوای گـەورەو نـاو و سیفەت و کارەکانێتی، کارکردنە بەڕەزامەنـدیی خـوای گـەورەو کێشـکردنی دڵـە

[1] - زۆر لاوازە، ئەحمەد(٥/ ٢٥٤) و ترمیزی(٢٣٤٧)ئیخراجیان کردووە.

بۆلای بەهۆی خۆشویستن و ترس و ئومێدەوە، ئەوەشە باشترین و بەڕێزترینی شتەکانی دونیا، باشترین پاداشتی ئاخیرەتیشی هەیە.

باشترین و پیرۆزترینی نێو مەبەستەکان: ناسینی خوای گەورەو خۆشویستن و دڵئارامبوونە لەنزیکیی خوای گەورەو تامەزرۆبوون بۆ لیقای خواو نازو خۆشیبینین بەیادی خوای گەورە، ئەوە گەورەترین بەختەوەریی دونیاو ئاخیرەتە،ئامانجە، بەندە تەواوی هەست دەکات بەوەی خودی بەختەوەرییە کاتێك پەردەی غەیبی لەبەرچاو هەڵدەگیردرێ و دونیا بەجێدەهێڵێ و دەچێتە ئاخیرەتەوە کە جارێك هەر لەدونیادایە.

ئەگەر هەستی بەهەندێ لەو شتە کرد لەو شتانەی دێنە ڕێی و پێی تاقیدەکرێنەوە، ئەوە هەستێکی تەواو نییەو بەختەوەریی ڕاستەقینە هەر ئەوەیە کە باسمان کرد.

هەموو زانست و مەعریفەکان پاشکۆی ئەو ناسینەی بەندەن بۆ خوای گەورەو ناو و سیفەتەکانی، جیاوازیی زانستەکانیش لەفەزڵدا بەپێی دووری و نزیکییەوەیەتی لەو مەعریفەیەوە، بۆیە هەر زانستێك نزیکبوو بەزانستی ناسینی خواو و ناو و سیفەتەکانییەوە، ئەوە بەرزترە لەزانستێکی تر، حاڵی دڵیش هەر بەو شێوەیەیە، ئەگەر لەو مەبەستە نزیکتربێ کە لەبەر ئەوە بۆی دروستکراوە، ئەوە بەڕێزتر و پیرۆزترە لەحاڵێك نزیك لەمەبەست نییە.

کارو کردەوەکانیش هەر بەو شێوەیەن، هەر کردەوەیەك نزیکبێت بەدەستخستنی مەبەست، ئەوە فەزڵدارترە بەسەر کاری تردا، لەمەدا نوێژو جیهادکردن باشترن لەکارەکانی تر، چونکە نزیکترن لەمەبەست، دەبێ هەر بەو

شێوەیەش بێ، هەرکات شتەکە لەئامانجەوە نزیکتربێ، ئەوە باشترە لەو کارەی لەمەبەست دوورترە.

بەندەیەك دڵی رەخساندبێ و ئامادەسازکردبێ بۆ ناسینی خواو ناو و سیفەت و خۆشویستن و ترس و ئومێدی خوای گەورە، ئەوە باشترە لەو کەسەی لەحاڵی ئەودا نییە. ئەگەر کۆمەڵێ کارت لەو گەیاندنەدا بەشدار کرد، ئەوە باشترینیان ئەوەیە کە نزیکترە بەلای خوای گەورەوە.

لێرەدا شتێك هەیە دەبێ باش لێی وردبینەوەو لێی تێبگەین، ئەوەیە رەنگە هەندێ کاری دیاریکراو باشتربێ لەکاری تر، بۆ نمونە ئەو دەوڵەمەندەی کە بەسەروەتێکی زۆر گەیشتووەو رێگە نادات هیچی لێ خەرج بکرێ، ئەوە بەخشینی لەپارەکەی خێری زۆرترە لەشەونوێژو رۆژووی سوونەتی.

کەسێك ئازاو چاونەترسەو دوژمن لێی دەترسێ، وەستانی یەك کاتژمێری لەسەنگەردا و جیهادکردنی لەپێناو خوای گەورە باشترە لەحەج و رۆژوو سەدەقەو ئەنجامدانی سوونەت. ئەو زانایەی کە سوونەتی ناسیووەو حەلاڵ و حەرام و رێگەکانی باشەو خراپەی زانیووە، تێکەڵبیکردنی خەڵکی و فێرکردن و ئامۆژگاریکردنیان لەئایینەکەیان بۆی خێردارترو باشترە لەدوورکەوتنەوەی لێیان و دابڕانی بۆ نوێژو قورئان خوێندن و تەسبیحکردن.

ئەو دەسەلاتدارەی کە خوای گەورە دایناوە بۆ حوکمکردن لەنێوان بەندەکانی، دانیشتنی یەك کاتژمێری بۆ تەماشاکردنی کێشەو داواکاریی خەڵکەکەو وەرگرتنەوەی مافی ستەملێکراوان و نەبەزاندنی سنوورەکانی خواو سەرخستنی حەق و سەرکوتکردنی ناڕەوا، باشترە لەپەرستشی چەندان ساڵ. هەرکەسێ ئارەزووی بۆ ئافرەت زاڵهاتبێ، ئەوە بەڕۆژووبوونی بەسوودو خێردارترە لەبەخشین و کاری تر.

بڕوانەو بیربکەرەوە لەوەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) کە عەمری کوڕی عاص و خالیدی کوڕی وەلیدو کەسانی تری کردە ئەمیرو هەڵسوڕاوی کارەکانی،ئەبو زەڕی ڕانەسپاردو پێی فەرموو:« إِنِّي أَرَاكَ ضَعِيفًا وَإِنِّي أُحِبُّ لَكَ مَا أُحِبُّ لِنَفْسِي لَا تَأَمَّرَنَّ على اثنين ولا تلين مال يتيم»[1]،واتا: من ئەبینم تۆ بۆ ئەو کارە لاوازی و توانای ئەوەت نییە، ئەوەم بۆ تۆ ئەوێ کە بۆ خۆمم ئەوێ و حەزم لێ هەیە: مەبەرە ئەمیری تەنیا دوو کەسیش و سەروەتی هیچ هەتیوێك مەخەرە ژێر دەستی خۆت. فەرمانی بە ئەو و کەسی تریش دا بەڕۆژووبێ و فەرمووی:"عليك بالصوم فإنه لا عدل له"[2]،واتا: بەڕۆژوو بە، هیچ شتێك هاوشانی ڕۆژوو نییە. فەرمانی بەکەسێکی تردا کە تووڕە نەبێ[3]، بەسێیەم کەسیش فەرمانی کرد کە زمانی بەیادی خواوە تەڕو پاراوبێ[4].

هەرکاتێ خوای گەورە ویستی هەبێ بەندەکەی کامڵ بێ، سەرکەوتووی دەکات تاوەکو تواناو بواری فراوان و یەکلابێتەوە بۆی، بۆی ئامادەسازو شیاوی دەکات و بەسەر کەسانی تردا بەتوانای دەکات، هەروەك وتراوە:

ما زال يسبقُ حتى قال حاسده      هذا طريق إلى العلياء مختصر

واتا:لەبرانەوەو پێبڕکێدا بەردەوامە، تاوەکو ئیرەییبەری ئەڵێ، ئەمە ڕێگەی کورتکراوی باڵاو مەزنییە.

---

[1] - موسلیم(١٨٢٦)ئیخراجی کرد.

[2] - صەحیحە، پێشتر تەخریج کرا.

[3] - بوخاری(٦١١٦)ئیخراجی کردووە.

[4] - صەحیحە، ترمیزی(٣٣٧٥) و ئیبن ماجە(٣٧٩٣) و ئەحمەد(٤/ ١٩٠)ئیخراجیان کردووە.

ئەمە نمونەی ئەو نەخۆشەیە کە گازندەی ئازاری سکی دەکات، ئەگەر دەرمان بخوات سوودی لێ دەبینێ، بەڵام گەر دەرمانی ژانەسەر بخوات سوودی لێ نابینێ، بۆ نمونە چرووکییەك کە مرۆڤ ملی بۆ کەچ بکات لەکارە لەنێوبەرەکانە، لەو کارانەیە کە شەونوێژو ڕۆژووی سەد ساڵ لەنێوی نابات، هەروەها دەردی شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو بەخۆ سەرسامبوونیش، ئەمانە زۆر خوێندنەوەی قورئان و کات تەرخانکردن بۆ زانست و یادو زوهدبوون چارەو گونجاو نین بۆ چارەکردنی، بەڵکو بەوە چارە دەکرێن بەبوونی دژەکانیان لەدڵدا دەرپەڕێنرێن و بە هۆکاری دژ لەدڵ دەربکرێن. ئەگەر بووترێ: کامەیان باشترە: نان یان ئاو؟ وەڵامەکە بەم شێوەیە دەبێ: هەریەکە لەو دووانە لەشوێن و دۆخی خۆیاندا باشترینن.

ئەگەر ئەم ڕێسایەت ناسی، ئەوە بزانە سوپاسگوزاریی لەبەخشینی سەروەتدا کارێکی چاکە و دڵ یەکسەر بەدەستی دەهێنێ، بەدەستهاتنەکە نەمانی چروکی و دەستنووقاوییە، بۆیە خۆت ئامادەسازو ڕەخساو بکە بۆ ناسین و خۆشویستنی خوای گەورە، ئەوەیە دەرمانی ئەو دەردەی کە لەدڵدایە و ناهێڵێ مرۆڤ بەمەبەست بگات.

هەژاری دونیانەویست لەبوونی ئەو دەردو دەرمانە دوور لەدەردەسەرییە، هێزی زۆرتری بۆ هەیە تاوەکو بواری فراوانتری هەبێ بۆ دەستخستنی مەبەست و بەئامانج گەیشتن.

پاشان پرسیارێکیان لەدەروونی خۆیاندا دروستکردووەو وتوویانە: ئەگەر بووترێ: شەرع بۆ کارکردن هاندانی کردووە، ئەوە لێی دابڕاون و وتوویانە: پزیشك گەر پیاهەڵدانی دەرمان بکات، ئەوە ناگەیەنێ خودی دەرمانەکە

مەبەست بیّ و باشتر نییە لەو چارەسەرەی لەدەرمانەکەوە بەدەستدیّ، بەلاّم کارەکان چارەسەری نەخۆشیی دلاّنن، جا لەبەر ئەوەی زۆر جار هەست بەنەخۆشییەکانی دلاّن ناکریّ، ئەوە هاندان کەوتووەتەسەر کاری مەبەست، ئەویش چارەسەری دلّە. ئەو هەزارەی بەخشینی تۆ وەردەگریّ دەردی چروکییت لیّ دەردەهێنیّ، وەك کەلّە شاخە کە خوێنی پیست لەجەستە بۆ دەردەهێنیّ.

وتوویانە: گەر ئەم زانرا، ئەوکات دەزانریّ کە حالّی مرۆڤی ئارامگر وەك حالّی کەسێکە لەشساغی و هێزی خۆی بپارێزیّ، حالّی کەسی سوپاسگوزاریش وەك حالّی تیمارکەرە کە جۆر گەلێکی دەرمان بەکاردەهێنیّ بۆ نەهێشتنی دەردەکان.

## بەش

سوپاسگوزاران وتوویانە: بێگومان سنووری خۆتانتان بەزاندو پێگەیەکتان بەسەر پێگەیەکی لەو باشتر هەلّنا، ئامرازتان پێش ئامانج خست، ئەوەی بۆ شتێکی تر مەبەستە بەسەر خودی مەبەستدا پێشخست، کاری تەواوتان بەسەر کاری تەواوترو باش بەسەر باشتردا پێشخست، مافی شیاوی سوپاسگوزارییتان نەداو نەناسی و شوێن و پێگەی خۆیتان پیّ نەدا.

خوای گەورە لەگەلّ یادی خۆیدا باسی سوپاسگوزاریی کردووە،باسی دروستکردنی گەردوون و شتەکان و بڕیاری خۆی هێناوەتەوە، ئارامگرتن حزمەتکاری ئەو دوو شتەیەو ئامرازی گەیشتنە بەو دوو شتە و یارمەتیدەریانە، ئەفەرمووێ: ﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ١٥٢ ﴾

البقرة: ١٥٢، واتا: کەواتە یادم بکەن تامنیش لەبیرتان نەکەم وە سوپاسم بکەن پێ نەزان و ناسوپاسییم مەکەن.

خوای گەورە سوپاسگوزاریی بەئیمانەوە بەستووەتەوە، هەواڵی داوە گەر بەندەکانی سوپاسی بکەن و پێی باوەڕداربن، ئەوە هیچ نیازێکی نییە بەسزادانیان و ئەفەرمووێ: ﴿ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ﴾ النساء: ١٤٧، واتا: ئەگەر ئەوە بەجێبگەیەنن کە بۆی دروستکراون، کە سوپاسگوزاربوون و ئیمانە، ئیتر چی پێویستییەکم بەسزادانتان هەیەو چی لەسزادانتان بکەم؟!

خوای گەورە هەواڵی داوە کە لەنێو بەندەکانیدا سوپاسگوزاران تایبەتن بەمنەتی خوا بەسەریانەوەو ئەفەرمووێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾ الأنعام: ٥٣، واتا: بەو جۆرە هەندێکیانمان بە هەندێکی تریان تاقی کردەوە بۆ ئەوەی بڵێن ئایا ئەوانە خوا ڕێز و بەهرەی پێ بەخشیوون لە ناو ئێمەدا؟ ئایا خوا لە هەموو کەس زیاتر نی یە بەوانەی شوکرانە بژێرن؟.

خەڵکیی دابەشکردووە بۆ سوپاسگوزارو سپڵە(بێباوەڕ)، ناشیرینترین شتێك بەلایەوە سپڵەیی و سپڵەکانە، خۆشەویسترین شتێکیش بەلایەوە سوپاس و سوپاسگوزارانە و ئەفەرمووێ: ﴿ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾ ﴾ الإنسان: ٣، واتا: بێگومان ئێمە ڕێنموونیمان کرد بۆ ڕاستە ڕێ، سا یا سوپاس گوزارە وە یا نا سوپاس گوزارە.

سولەیمانی پەیامبەریشی(سەلامی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی:﴿ هَٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّي لِيَبۡلُوَنِيٓ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيّٞ كَرِيمٞ ﴿٤٠﴾ ﴾ النمل: ٤٠، واتا: ئەمە لەفەزڵی پەروەردگارمەوەیە بۆ ئەوەی تاقیم بکاتەوە ئایە شوکری(ئەم نیعمەتە)دەکەم یان پێ نەزان و سپڵە دەبم وە هەر کەسێ سوپاسی خوا بکات ئەوە بێگومان سوپاس بۆ خۆی دەکات وە هەر کەسیش ناسوپاسی بکات(زیانی بۆ خۆیەتی) چونکە بێگومان پەروەردگارم دەوڵەمەندو بێ نیازە.

پەروەردگار ئەفەرمووێ:﴿ وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكُمۡ لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡۖ وَلَئِن كَفَرۡتُمۡ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٞ ﴿٧﴾ ﴾ إبراهيم: ٧، واتا: بیریان بخەرەوە کاتێ کە پەروەردگارتان ڕای گەیاند سوێند بێ بێگومان ئەگەر ئێوە سوپاسی (چاکەی)من بکەن بۆتان زیاد دەکەم بەلاّم بێگومان ئەگەر نا سوپاسی بکەن ئەوە بەڕاستی سزای من زۆر بەتینە. هەروەها فەرموویەتی:﴿ إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡۖ وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَۖ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡۗ ﴾ الزمر: ٧، واتا: ئەگەر ئێوە بێ باوەڕبن ئەوە بێگومان خوا بێ نیازە لە ئێوەو ڕازی نی یە بە بێ باوەڕی بۆ بەندەکانی وە ئەگەر سوپاسی خوا بکەن(گەردن کەچ بن) بەوە لێتان ڕازی دەبێت.

ئەمە لەقورئاندا زۆرە، خوای گەورە زۆرجار بەراوردی نێوان سوپاسگوزاریی و بێباوەڕیی دەکات، بێباوەڕیی دژ بەسوپاسگوزارییەو ئەفەرمووێ: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوۡ قُتِلَ ٱنقَلَبۡتُمۡ عَلَىٰٓ

أَعۡقَـٰبِكُمۡۚ وَمَن يَنقَلِبۡ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيۡـًٔاۗ وَسَيَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ ( آل عمران: ١٤٤)

واتا: موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)پێغەمبەرێکە(نەمر نی یە) بێگومان لەپێش ئەو پێغەمبەرانی تر ڕابوردون جا ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا دەگەڕێنەوە بۆ دواوەی خۆتان(پاشگەز دەبنەوە)هەر کەس هەڵگەڕێتەوە بۆ دواوەی خۆی(بت پەرستی)ئەوە هەرگیز(ئەو کەسە) هیچ زیانێك ناگەیەنێت بەخوا وە بەزوویی خوا پاداشتی سوپاس گوزاران دەداتەوە.

سوپاسگوزاران ئەوانەن کە لەسەر نازونیعمەتی ئیمان دامەزراون و هەڵنەگەڕاونەتەوە.

خوای گەورە پشك و بەشی زیاتری بەسوپاسگوزارییەوە پەیوەست کردووە، زیاترکردنیش کۆتایی بۆ نییە، هەروەك سوپاسکردنیشی کۆتایی بۆ نییە.

خوای گەورە پشك و پاداشتی زۆرتری خۆی بەویست و مەشیئەی خۆی پەیوەست کردووەو ئەفەرمووێ: ﴿ فَسَوۡفَ يُغۡنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦٓ إِن شَآءَۚ ﴾ التوبة: ٢٨، واتا: ئەوە لەمەو پاش خوا دەوڵەمەندتان دەکات لە چاکەو بەهرەی خۆی ئەگەر ویستی.

لەبابەت بەدەمەوەچوونی داواو پاڕانەوەشدا فەرموویەتی: ﴿ فَيَكۡشِفُ مَا تَدۡعُونَ إِلَيۡهِ إِن شَآءَ ﴾ الأنعام: ٤١، لەبابەت ڕۆزیشەوە ئەفەرمووێ: ﴿ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ ﴾ آل عمران: ٣٧، واتا: بەڕاستی خوا ڕۆزی دەدات بە هەر کەسێك کە بیەوێت.

لەبابەت لێخۆشبوونیشەوە ئەفەرمووێ: ﴿ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ ﴾ آل عمران: ١٢٩، واتا: خۆش ئەبێ لە هەر کەس خۆی بیەوێ.

لەبارەی تەوبەشەوە ئەفەرمووێ: ﴿ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ﴾ التوبة: ١٥، واتا: خوای گەورە تەوبە وەردەگرێ لەهەر کەسێك کە بیەوێت.

پاداشتی سوپاسگوزاریی ڕەها داناوەو سنووری بۆ دانەناوەو ئەفەرمووێ: ﴿ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ آل عمران: ١٤٤، واتا: بەزوویی خوا پاداشتی سوپاس گوزاران دەداتەوە.

﴿ وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ ﴾ آل عمران: ١٤٥، واتا: بەزوویی پاداشتی سوپاس گوزاران دەداتەوە.

کە ئیبلیسی دوژمنی خوا گەورەیی پێگەی سوپاسگوزاریی زانی، زانی کە گەورەترین و نرخدارترین پێگەی هەیە، ئامانجی خۆی لەوەدا داڕشت خەڵکیی لەسوپاسگوزاریی دابڕێ و وتی: ﴿ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ الأعراف: ١٧، واتا: ئینجا سوێند بێ بێگومان بۆیان دەچم لە پێشیانەوەو لە دوایانەوە، وە لەلای ڕاستیان و لەلای چەپیانەوە ئەوسا نابینی زۆربەیان سوپاس گوزار بن.

خوای گەورە بەندە سوپاسگوزارەکانی خۆی وەسفکردووە کە کەمینەی نێو بەندەکانی پێکدەهێنن و ئەفەرمووێ: ﴿ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ﴾ سبأ: ١٣، واتا: کەمێ لە بەندەکانم(بۆ خوا) سوپاس گوزارن.

پێشەوا ئەحمەد باس دەکات لەعومەری کوڕی خەتابەوە(خوای لێ ڕازیی بێ): کە گوێی لەپیاوێك بوو دەیووت: (اللهم اجعلني من الأقلين)، واتا: خوایە

گیان بمگێڕە بەیەکێك لەڕیزی کەمەکان، عومەر وتی: ئەمە چییە؟ وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَمَنْ ءَامَنَۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٞ ۝٤٠ ﴾ هود: ٤٠، واتا: خەڵکێکی کەم نەبێت بڕوایان نەهێنا لەگەڵی دا. هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ۝١٣ ﴾ سبأ: ١٣، واتا: کەمێ لەبەندەکانم(بۆ خوا)سوپاسگوزارن. هەروەها: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٞ مَّا هُمۡۗ ﴾ ص: ٢٤، واتا: بێجگە لەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە ئەوانەش زۆر کەمن.

عومەریش وتی: راستت وت[١].

خوای گەورە پیاهەڵدانی یەکەم پەیامبەری خۆی بۆ لای خەڵکی سەر زەویی دەکات، ستایش و پیاهەڵدانی دەکات بەسوپاسگوزاری و ئەفەرمووێ: ﴿ ذُرِّيَّةَ مَنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٍۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبۡدٗا شَكُورٗا ۝٣ ﴾ الإسراء: ٣، واتا: ئەی نەوەی ئەو کەسانەی کە لەگەڵ نووح(لە کەشتیدا)هەڵمان گرتن بەڕاستی نووح بەندەیەکی زۆر سوپاس گوزار بوو.

لێرەدا نوحی بەیادکردن تایبەت کردووە، بەندەکان دەدوێنێ بەوەی وەچەی نوحن، ئاماژەیە بەوەی چاوی لێ بکەن و بیکەنە پێشەنگی خۆیان، باوکی دووەمی مرۆڤەکانە، لەدوای لافاوەکەی نوح هەموو ئەو مرۆڤانەی لەسەر زەوییدان وەچەی نوحن، هەروەك فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلۡبَاقِينَ ۝٧٧ ﴾ الصافات: ٧٧، واتا: تەنیا نەوەکانی ئەومان(لەسەر زەوی)هێشتەوە.

---

[١] - ئەحمەد لە الزهد(لا١٤٢)ئیخراجی کردووە.

بۆیە خوای گەورە فەرمان بەوەچەکانی دەکات کە لەسوپاسکردندا چاو لەباوە گەورەیان بکەن، کە بەندەیەکی سوپاسگوزار بووە.

خوای گەورە هەواڵی داوە کە نوح سوپاسگوزارانە بەندایەتیی بۆ خوای گەورە ئەنجام داوە، بۆیە گەر هەرکەسێك سوپاسگوزارانە بەندایەتیی نەکات،ئەوە لەڕیزی بەندەکانی خوادا نابێ و ئەفەرمووێ: ﴿ وَٱشْكُرُوا۟ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ ﴾ البقرة: ١٧٢، واتا:سوپاسی خوا بکەن ئەگەر ئێوە هەر ئەو دەپەرستن.

فەرمانی بەموسای بەندەی خۆی کردوە کە سوپاسگوزارانە پەیامبەرایەتی و پەیامداری و لیقای خوا پێشوازیی بکات و ئەفەرمووێ: ﴿ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّى ٱصْطَفَيْتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِى وَبِكَلَٰمِى فَخُذْ مَآ ءَاتَيْتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ الأعراف: ١٤٤، واتا:پەروەردگار فەرمووی: ئەی مووسا بێگومان من تۆم هەڵبژاردووە بەسەر هەموو خەڵکی دا بە پەیامەکانم و قسەکردنم(لەگەڵت ڕاستەوخۆ)کەواتە ئەوەی پێم بەخشیوی توند دەستی پێوە بگرە وە لەسوپاس گوزاران بە.

یەکەمین ڕاسپاردە و ئامۆژگارییەکیشی بۆ مرۆڤ، ئەوەیە بەرانبەر خوا و دایك و باوك سوپاسگوزاریێ: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾ لقمان: ١٤، واتا: فەرمانمان داوە بەئادەمی(بە چاکی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ)دایك و باوکی دا، دایکی هەڵی دەگرێ بە دووگیانی(پێ ی لاواز دەبێ)لاوازی لەدوای

لاوازی و بڕینەوەی لەشیر(دوا تەمەنی)دوو ساڵیەوە(وە فەرمانمان بە ئادەمی دا) کە سوپاس گوزاری من(خوا)و باوك و دایکت بکە تەنها بۆ لای منە گەڕانەوەتان.

هەواڵی داوە کە رازیبوونی خۆی پەیوەستە بەسوپاسکردنیەوە لەلایەن بەندەوە: ﴿ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡۗ ﴾ الزمر: ٧، واتا: ئەگەر سوپاسی خوا بکەن(گەردن کەچ بن)بەوە لێتان ڕازی دەبێت.

پیاهەڵدنی ئیبراهیمی خۆشەویستی خۆی کردووە بەوەی سوپاسی نازو نیعمەتی خوای کردووە: ﴿ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةٗ قَانِتٗا لِّلَّهِ حَنِيفٗا وَلَمۡ يَكُ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٢٠ شَاكِرٗا لِّأَنۡعُمِهِۚ ٱجۡتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ١٢١ ﴾ النحل: ١٢٠ – ١٢١، هەواڵی داوە بەوەی ئیبراهیم بەتەنیا ئوممەتێك بووە، واتا: پێشەواو پێشەنگێك لەخێرو چاکەدا چاوی لێ دەکرێت و گوێڕایەڵ و دامەزراو بووە لەسەر گوێڕایەڵیکردنی بۆ خوای گەورە، بەرەو لای خوا ڕۆیشتووەو پشتی لەشتەکانی تر کردووە، پاشان بەو سیفەتانە ئایەتەکەی کۆتایی پێهێناوە بەوەی سوپاسگوزار بووە بەرانبەر نیعمەتەکانی خوای گەورە، بۆیە سوپاسگوزاریی کردووەتە ئامانجی خۆشەویستەکەی.

خوای گەورە هەواڵی داوە، کە لەبەرانبەر دروستکردنی مەخلوقات و شەرع و بڕیاریدا ئامانجی سوپاسگوزاریی هەبووە، ئەو ئامانجە بووە کە بەندەکانی بۆ دروستکردوەو ئەفەرمووێ: ﴿ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٧٨ ﴾ النحل: ٧٨، واتا: خوا ئێوەی لەسکی دایکتان دەرهێناوە کە هیچتان نەدەزانی بەڵام(خوا)گوێ و چاو و دڵی پێدان بۆ ئەوەی سوپاسی(خوا)بکەن.

ئـەوە ئامـانجی ئـەو بـووە لەدروسـتکردنی مـەخلوقات و شـەریعەتەکەیدا، ئەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ ﴾ آل عمـران: ١٢٣، واتـا: سـوێند بـە خـوا بێگومـان خـوا ئێـوەی سەرخست لە(جەنگی)بەدەردا لە کاتێکدا ئێوە کەم و لاواز بوون دەی لە خوا بترسـن بـەڵکو سوپاس گوزاری بن.

خـوای گـەورە داوایـان لـێ دەکـات سوپاسـگوزاربن بـەهۆی ئـەوەی سەریخسـتوون، هـەروەها فـەرمانی داوە لەخوابترسـن، بۆیـە دەبیـنین سوپاسگوزارییکردن، ئامانجی پشت دروستکردنی مەخلوقات و یاساو شەریعەتی خوایەو راشکاوانە فەرموویـەتی: ﴿ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾ البقـــرة: ١٥١ — ١٥٢، واتا: وەك ڕەوانەمان کرد لە ناوتاندا پێغەمبەرێك لە خۆتان کە ئایەتـەکانی ئێمـەتان بەسـەردا بخوێنێتـەوە، وە پاکتـان بکاتـەوە وەفێرتـان کـات قورئـان و دانایی(فەرموودەی خۆی) وە فێرتان کات ئەو شتانەی کە نەتان دەزانی. کەواتە یادم بکەن تامنیش لەبیرتان نەکەم وە سوپاسم بکەن پـێ نـەزان و ناسوپاسـییم مەکەن.

وتوویانە: سوپاسکردن بۆ خودی خۆیەتی، بـەڵام ئـارامگرتن بـۆ شـتی تـرە و خودی خـۆی مەبەسـت نییـە، بۆیـە پیاهەڵدانی ئـارامگریی کـراوە چـونکە مـرۆڤ بەسوپاسگوزاریی دەگەیەنێ و خزمەتکاری سوپاسگوزارییە.

لەصەحیحەیندا سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم): کە ئەوەندە نوێژی کردووە هەردوو قاچی تۆقەڵەی کردووە، پێیانوتووە: ئەمە دەکەی لەکاتێکدا خوای گەورە لەتاوانی پێش و پاشت خۆشبووە؟ ئەویش فەرموویەتی:"أفلا أكونُ عبداً شكوراً"[1]،واتا: ئاخۆ نابێ بەندەیەکی سوپاسگوزاربم.

لەموسنەد و ترمیزییدا سەلماوە: لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) بەموعازی فەرمووە:"والله اني لأحبك فلا تنسَ أن تقول دبر كل صلاة: اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك"[2]،واتا: ئەی موعاز سوێند بەخوا خۆشتمدەوێ، بۆیە لەبیرت نەچێ لەدوای هەموو نوێژێك بڵێ: خوایە گیان یارمەتیم بدەی لەسەر ئەوەی یادت بکەم و سوپاست بکەم و جوان بتپەرستم.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: ئیسحاقی کوڕی ئیسماعیل بۆی باسکردین، ئەبو موعاویەو جەعفەری کوڕی عەون بۆیان باسکردین لەهیشامی کوڕی عوروەوە ئەویش لەئیبن ئەلمونکەدیرەوە وتی: یەکێك لەپاڕانەوەکانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)ئەمە بوو:"اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك"[3]،واتا: خوایە گیان یارمەتیم بدەی لەسەر ئەوەی یادت بکەم و سوپاست بکەم و جوان بتپەرستم.

ئەڵێ: مەحمودی کوڕی غەیلان بۆی باسکردین، موئەمیلی کوڕی ئیسماعیل بۆی باسکردین، حەمادی کوڕی سەلەمە بۆی باسکردین، حومەدی تەویل بۆی

---

[1] - بوخاری(٤٨٣٦) و موسلیم(٢٨١٩)ئیخراجیان کردووە.

[2] - صەحیحە، ئەبو داوود(١٥٢٢) و ئەحمەد(٥/ ٢٤٤) و بوخاری لە الادب المفرد(٦٩٠) و نەسائی(٣/ ٥٣)ئیخراجیان کردووە.

[3] - لاوازە، بەیهەقیی لە الشعب الايمان(٤٤١١) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٤)ئیخراجیان کردووە.

باسکردین لەتەلیقی کوڕی حەبیبەوە، ئەویش لەئیبن عەباسەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی: "أربع من أعطيهن فقد أعطي خير الدنيا والآخرة: قلباً شاكراً ولساناً ذاكراً وبدناً على البلاء صابراً وزوجةً لا تبغيه خوناً في نفسها ولا في ماله"[1]،واتا: چوار شت هەیە بەهەرکەسێك بدرێ، ئەوە خێری دونیاو ئاخیرەتی پێ دراوە: دڵێکی سوپاسگوزار، زمانێك یادی خوای گەورە بکات، جەستەیەك لەبەردەم نەخۆشی و بەلآدا ئارامگربێ، هاوسەرێك ناپاکیی لەخۆی و سەروەتەکەی نەکات.

هەروەها لەفەرموودەیەکی ئەلقاسمی کوڕی موحەممەدەوە باسکراوە، ئەویش لەعائیشەوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی:«مَا أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَى عَبْدٍ نِعْمَةً فَعَلِمَ أَنَّهَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ إِلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ شُكْرَهَا قَبْلَ أَنْ يَحْمَدَهُ عَلَيْهَا، وَمَا أَذْنَبَ عَبْدٌ ذَنْبًا فَنَدِمَ عَلَيْهِ إِلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ مَغْفِرَةً قَبْلَ أَنْ يَسْتَغْفِرَهُ، وَمَا اشْتَرَى عَبْدٌ ثَوْبًا بِدِينَارٍ، أَوْ نِصْفِ دِينَارٍ، فَلَبِسَهُ فَحَمِدَ اللَّهَ عَلَيْهِ إِلَّا لَمْ يَبْلُغْ رُكْبَتَيْهِ حَتَّى يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُ»[2]،واتا: خوای گەورە هەر نازونیعمەتێك بەبەندەیەك بدات و بەندەکە بزانێ و پێزانینی هەبێ کە لەلایەن خوای گەورەوەیە، ئەوە خوای گەورە سوپاسی خۆی بۆی دەنووسێ. خوای گەورە بزانێ بەندە لەتاوانەکەی پەشیمانە، پێش ئەوەی داوای لێخۆشبوون بکات خوای گەورە لێیخۆش دەبێ، پیاوی وا هەیە بەرگێك دەکرێت بەدینارێك، لەبەری

[1] - لاوازە، بەیهەقیی لە الشعب الايمان(٤٤١١) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٤) و تەبەرانی لە المعجم الكبير(١١٢٧٥)ئیخراجیان کردووە.

[2] - لاوازە، بەیهەقیی لە الشعب الايمان(٤٣٧٥) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٤٧) ئیخراجیان کردووە، هیشامی کوڕی زیادی تێدایە مەتروکە.

دەكات و سوپاسی خوا دەكات، جارێ بەئەژنۆی نەگەیشتووە خوای گەورە لێیخۆش دەبێ.

لەصەحیحی موسلیمدا سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی:«إن الله ليرضى عن العبدِ أن يأكلَ الأكْلَةَ فيحمَدَه عليها، ويشربَ الشَّربةَ فيحمدَه عليها»[1]،واتا: خوای گەورە لەبەندەكەی خۆشدەبێ كە خواردن دەخوات سوپاسی خوای لەسەر دەكات، كە ئاو دەخواتەوە سوپاسی خوای لەسەر دەكات. ئەمە پاداشتی مەزن و گەورەترین جۆرەكانی پاداشتە، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ وَرِضْوَانٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ﴾ التوبة: ٧٢، واتا: ڕەزامەندیش لە لایەن خواوە كە گەورەترە(لە هەموو شتێك).

ئەم پاداشتە گەورەیەی خوای گەورە، بەرانبەر بەسوپاسگوزاریی بەندەیە بۆ پەروەردگار.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا لەفەرموودەی عبداللەی كوڕی سالحەوە باسدەكات و ئەڵێ: ئەبو زوهەیر یەحیای كوڕی عەطاردی قورەیشیی بۆی باسكردین ئەویش لەباوكییەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:" لَا يَرْزُقُ اللهُ عَبْدًا الشُّكْرَ فَيَحْرِمَهُ الزِّيَادَةَ لِأَنِ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ: {لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ} ﴿إبراهيم: ٧﴾ "،واتا: خوای گەورە سوپاسكردن نابەخشێتە هەر بەندەیەك، لەزیاتر كردن و نما كردنی سەروەت و شتەكانی بێ بەشی بكات، چونكە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾ إبراهيم: ٧،[2]واتا: بێگومان ئەگەر ئێوە سوپاسی(چاكەی)من بكەن بۆتان زیاد دەكەم.

---

[1] - موسلیم(٢٧٣٤) ئیخراجی كردووە لەفەرموودەی ئەنەسەوە(خوای لێ ڕازیی بێ).

[2] - لاوازە، بەیهەقیی لە الشعب الایمان(٤٢٠٨) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٣) ئیخراجیان كردووە، ئیسنادەكەی مورسەل و لاوازە.

حەسەنی بەسریی ئەڵێ:"خوای گەورە چۆنی بووێ نازونیعمەت دەبەخشێ، هەرکەسێ بۆ ئەو نازونیعمەتانە سوپاسی نەکات هەڵیدەگێڕێتەوەو دەیکاتە سزاو ئازار"[1]، بۆیە سوپاسکردنیان ناوناوە(الحافظ- پارێزگار)، چونکە پارێزگاریی نیعمەتەکە ئەکات، ناونراوە(الجالب- راکێشەر)نیعمەتی ونبوو دەهێنێت.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا دەگێڕێتەوە لەعەلیی کوڕی ئەبو تالیبەوە(خوای لێ رازیی بێ)کە بەپیاوێکی هەمەزانی وتووە: نازونیعمەت بەسوپاسگوزارییەوە دەگات و بەردەوام دەبێ، ئەگەر سوپاسگوزاریی هەبێ گەش و نماو زیاترکردنیش بەردەوام ئەبێ، کەی بەندە لەسوپاسکردنی خوای گەورە دابڕا، ئەوکات زیاترکردن و گەش و نماش نامێنێ[2]. عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش وتوویەتی: نیعمەتی خوا بەسوپاسکردنی خوای گەورە گرێ بدەن[3]. ئەوترا: سوپاسگوزاریی کۆتکەری نازونیعمەتە.

موتەریفی کوڕی عبداللە وتوویەتی: سەلامەت بم و سوپاسی خوا بکەم بەلامەوە خۆشترە لەوەی نەخۆش بکەوم و بکەومە تاقیکردنەوەوەو ئارام بگرم[4].

---

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٧) ئیخراجی کردووە، موبارەکی کوڕی فوزالەی تێدایە،(مدلس) و (عنعن)ەیە.

[2] - لاوازە(معضل)ە،بەیهەقیی لە الشُعب الإيمان(٤٢١٤) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٨)ئیخراجیان کردووە.

[3] - لاوازە، ئەبو نەعیم لە الحلية(٥/ ٣٤٠) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٢٧) و بەیهەقیی لە الشُعب(٤٢٢٦)ئیخراجیان کردووە، عبداللەی کوڕی خراشی تێدایە، کەسێکی لاوازە.

[4] - ئەحمەد لە الزهد(لا٢٤٢) و وەکیع لە الزهد(٢٠١) و هەناد لە الزهد(٤٤٢)ئیخراجیان کردووە.

ئەلحەسەن وتوویەتی: زۆر باسی ئەم نیعمەتە بکەن، چونکە باسکردنی سوپاسگوزارییە[1].

خوای گەورە فرمانی بەپەیامبەرەکەی خۆی داوە کە باسی نیعمەتەکانی پەروەردگاری بکات و ئەفەرمووێ:﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ۝١١ ﴾ الضحى: ١١،واتا: نیعمەت و بەخششی پەروەردگارت دەربخە بەیارمەتی هەژاران.

خوای گەورە حەزدەکات شوێنەواری نیعمەتی خۆی لەعەبدەکەیدا ببینێ، ئەوەش بەزمانی حاڵ سوپاسکردنی خوای گەورەیە.

عەلیی کوڕی ئەلجەعد ئەڵێ: گوێم لەسوفیانی سەوریی بوو ئەیووت: داوود سەلامی خوای لەسەربێ وتوویەتی: الحمد لله حمداً كما ينبغي لكرم وجهه وعزّ جلاله، واتا: سوپاس و ستایشێك بۆ خوای گەورە شیاو و پێویست بێ بەبەخشندەیی و شکۆمەندیی پەروەردگار. خوای گەورە وەحیی بۆ داوود کردو فەرمووی: ئەی داوود فریشتەکانت ماندوو کرد[2].

شوعبە ئەڵێ: فوزەیلی کوڕی فەزالە لەئەبی رەجائی ئەلعەطاردەوە ئەڵێ: عیمرانی کوڕی ئەلحەصین دەرچوو بۆ لامان و بەرگێکی ئەورێشمی نەخشداری لەبەر بوو(خوری و ئاورێشم یان ئاورێشمی پوخت)، نە پێشترو نەدواتر نەمانبینی لەبەری بکات، وتی: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:"إذا أنعم على عبد نعمة يُحِبُّ أَنْ يَرَى أَثَرَ نِعْمَتِهِ عَلَى

[1] - لاوازە، بەیهەقیی لە الشعب الايمان(٤١٠٧) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٣٣) ئیخراجیان کردووە، موبارەکی کوڕی فوزالەی تێدایە،(مدلس)ە.

[2] - صەحیحە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٣٧) و بەیهەقییش لە الشُعب(٤٢٦٢).

عَبْدِهِ"[1]،واتا: خوای گەورە کە نازونیعمەتێکی بە هەر بەندەیەکی بەخشی، حەز دەکات شوێنەواری نیعمەتەکەی لە بەندەکەیدا ببینێ.

لەصەحیفەی عەمری کوڕی شوعەیبدا هاتووە، ئەویش لەباوکییەوە ئەویش لەباپیرییەوە، ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی:«كُلُوا وَاشْرَبُوا وَتَصَدَّقُوا فِي غَيْرِ مَخِيلَةٍ وَلَا سَرَفَ، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُحِبُّ أَنْ يَرَى نِعْمَتَهُ عَلَى عَبْدِهِ»[2]،واتا: بخۆن و بخۆنەوە بەبێ چرووکی و زیادەڕۆییکردن، بێگومان خوای گەورە پێیخۆشە شوێنەواری نیعمەتی خۆی لەبەندەیدا ببینێ.

شوعبە لەئەبی ئیسحاقەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش لەئەبی ئەلئەحوصەوە ئەویش لەباوکییەوە ئەڵێ: هاتمە لای پەیامبەری خوا بەرگێکی پەڕپووتم(کۆن)م لەبەردا بوو، پەیامبەری خوا فەرمووی: هیچ سەروەت و ماڵێکت هەیە؟ وتم: بەڵێ: فەرمووی: چی سەروەتێك؟ وتم: لەهەموو سەروەتێکم هەیە، خوای گەورە وشترو ئەسپ و کۆیلەو مەڕو ماڵاتی پێ داوم، فەرمووی:"فَإِذَا آتَاكَ اللَّهُ مَالًا فَلْيُرَ عَلَيْكَ"[3]،واتا: کە خوای گەورە سەروەتێکی پێت بەخشی، بە بەکارهێنان پیشانی بدەو لەبەرتدا بیبینێ.

---

[1] - صەحیحە، ئەحمەد(٤/ ٤٣٨) و ئیبن سەعد لە الطبقات(٤/ ٢٩١) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٥٠) و بەیهەقیی لە السنن(٣/ ٢٧١)ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئەحمەد(٢/ ١٨١) و حاکم(٤/ ١٣٥) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٥١) و بەیهەقیی لە الآداب(٦٦٣) ئیخراجیان کردووە.

[3] - صەحیحە، ئەبو داوود(٤٠٦٣) و ترمیزی(٣٠٠٦) و نەسائی(٨/ ١٩٦) و ئەحمەد(٣/ ٤٧٣) و ئیبن حیبان(٣٤١٠) ئیخراجیان کردووە.

لەهەندێ فەرموودەی مورسەلدا هاتووە:(إن الله يحب أن يرى أثـر نعمتـه علـى عبده في مأكله ومشربه)[1]،واتا: خوای گـەورە حـەز دەکـات شـوێنەواری نیعمـەتی خۆی لەخواردن و خواردنەوەی بەندەکەیدا ببینێ.

عبداللـەی کـوڕی یەزیـدی ئـەلموقریء گێڕاویەتییـەوە لەئـەبی موعەممـەرەوە ئەویش لەبەکری کوڕی عبداللەوە بەمەرفوعی:"هەرکەسێك خێرو خۆشییەکی پێ بەخشراو شوێنەواری خۆشـییەکەی لـێ بینـرا، نـاودەبرێ بەخۆشەویسـتی خـواو باسی نازونیعمـەتی خـوای گـەورە کـردووە، هەرکەسـێکیش نازونیعمـەتێکی پـێ بەخشراو شوێنەواری لێ نەبینرا، ئەوە نـاوی لـێ دەنـرێ دوژمنـی خـواو دوژمنـە بەنازونیعمەتی خوای گەورە"[2].

فوزەیلی کوڕی عەیاز ئەڵێ: وتراوە: هەرکەسێ بەدڵ نازونیعمەتی خوا بناسێ و دانی پێدا بنێ و بەزمانیش دەریببڕێ، تەواوی ناکات تاوەکو زیاترو نما کردنـی نـەبینێ، چـونکە پـەروەردگار فەرموویـەتی:﴿ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾ إبراهيم: ٧، واتا: بێگومان ئەگەر ئێـوە سوپاسی(چـاکەی)من بکـەن بۆتـان زیـاد دەکەم.

ئەڵێ: یەکێك لەنیشانەکانی سوپاسگوزارییکردنی نازونیعمەت، باسکردنێتی[3].

---

[1] - زۆر لاوازە، ئیبن ئـەبی ئەلـدونیا لـە الشـکر(٥٣)ئیخراجـی کـردووە، بـەهۆی مـوڕەوە ئیسـنادەکەی بـێ بنەمایە(واە).

[2] - زۆر لاوازە، ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا لـە الشـکر(٥٤)ئیخراجـی کـردووە، لەئـەبی بـەکری کـوڕی عبداللـەوە بەمورسەلی.

[3] - زۆر لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٥٦)ئیخراجی کـردووە، ئیبراهیمـی کـوڕی ئەشعەسـی تێدایـە، بابەتەکانی غەریب و تاکن و هەندێجار هەڵەو پێچەوانە ئەکات.

پەروەردگار فەرموویەتی: "یا ابن آدم إذا كنت تتقلب في نعمتي وأنت تتقلب في معصيتي فاحذرني لأصرعك بين معاصي يا ابن آدم اتقني ونم حيث شئت"[1]، واتا: ئەگەر تۆ بەرانبەر نازونیعمەتی من هەڵگەڕێیتەوەو بکەویتە سەرپێچیکردنەوە، وریابە لەتاوان و سەرپێچیدا لەنێوت ببەم، ئەی ئەوەی ئادەم لێم بترسێ و چۆنت دەوێ ئارام بخەوە.

شەعبیی ئەڵێ: سوپاسگوزاریی نیوەی ئیمانە، یەقینیش تەواوی ئیمانە[2].

ئەبو قیلابە ئەڵێ: دونیا زیانتان لێ نادات ئەگەر سوپاسگوزاری خوا بن[3].

ئەلحەسەنیش ئەڵێ: گەر خوای گەورە نازو نیعمەتێکی بەهەر قەومێك دا داوای سوپاسگوزارییان لێ دەکات، گەر سوپاسیان کرد، ئەوە خوای گەورە توانای هەیە نیعمەتەکەیان بۆ زیاتر بکات، بەڵام گەر سپڵەیان کرد، ئەوە توانای ئەوەی هەیە نیعمەت و خۆشییەکەیان بۆ بگێڕێ بەسزاو ناخۆشی[4].

خوای گەورە سەرزەنشتی بەدنمەکی کردووە، ئەو کەسەی کە سوپاسی نیعمەتی خوا ناکات، ئەلحەسەن ئەڵێ: ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ ۝٦ ﴾ العادیات: ٦، واتا: بەڕاستی ئینسان بۆ پەروەردگاری نا سوپاسە.

خوای گەورە سەرزەنشتی ئەوانەی کردووە کە کۆست و ناخۆشییەکان دەژمێرن و نیعمەت و خۆشییەکانیش لەبیر دەکەن[5].

---

[1] - زۆر لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٥٧) و بەیهەقیی لە الشعب(٤٢١٥) ئیخراجیان کردووە.

[2] - حسن، بەیهەقیی لە الشُعب الإیمان(٤٤٤٨) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٥٨) ئیخراجیان کردووە.

[3] - حسن، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٥٩)ئیخراجی کردووە.

[4] - صەحیحە، بەیهەقیی لە الشُعَب الإیمان(٤٢١٦) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٦٠)ئیخراجیان کردووە.

[5] - صەحیحە، بەیهەقیی لە الشُعَب الإیمان(٤٦٢٩) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٦٢)ئیخراجیان کردووە.

پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم)ئاماژەی بەوە داوە،کە بەهۆی ئەم کارەوەیە زۆربەی ئافرەتان لەدۆزەخدان و فەرموویەتی:" لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ، ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا، قَالَتْ: والله مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَطُّ"[1]، واتا: گەر بەدرێژایی تەمەن لەتەکیدا باش بی، یەك شتی لێت بینی و بەدڵی نەبوو ئەڵێ: قەت خێرو خۆشییم لە تۆ نەبینی.

ئەمە لەبری بەدنمەکیی کردن و سوپاس نەکردنی نیعمەت و خۆشیی مێردەوە کە لەڕاستییدا نیعمەتی خوایە، ئەی چی بۆ ئەو کەسەی سوپاسی نازونیعمەتی خوا ناکات و بەدنمەك ئەبێ؟!

| | |
|---|---|
| يـا أيهـا الظالمُ في فعله | والظلم مـردود علـى مـن ظلم |
| إلى متى أنت وحتى متى | تشكو المصيبات وتنسى النعم |

واتـا: ئـەی ئـەو کەسـەی لـەکارو کردەوەتـدا سـتەم ئەکـەی، بزانـە سـتەمکردنەکەت بـۆ خـۆت دەگەڕێتـەوە، تـۆ تـاوەکو کـەی لەکۆسـت و ناخۆشییەکان ناڕازی و بەگلەییت و نازونیعمەتەکانیش لەبیر دەکەی.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا باسیکردووە لەفەرموودەیەکی ئەبی عەبدولڕەحمانی شامییەوە، ئەویش لەشەعبییەوە ئەویش لەنوعمانی کوڕی بەشیرەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی: "التحدث بالنعمة شكر وتركها كفر ومن لا يشكر القليل لا يشكر الكثير ومن لا يشكر الناس لا يشكر الله والجماعة

---

[1] - بوخاری(٢٩) و موسلیم(٩٠٧) ئیخراجیان کردووە.

برکة والفرقة عذاب"[1]، واتا: باسکردنی نیعمەتی خوا سوپاسکردنەو باس نەکردنیشی سپڵەیی و بێباوەڕییە، هەرکەسێ بەرانبەر بەشێکی کەم سوپاسگوزار نەبێ بۆ زۆریش سوپاسگوزار نابێ، هەرکەسێ سوپاسی خەڵکیی نەکات سوپاسی خواش ناکات، کۆمەڵبوون بەرەکەتەو تەنیا بوونیش ئازارو سزایە.

موتەڕیفی کوڕی عبدالله ئەڵێ: ڕوانیمە عافیێت و سوپاسگوزاری، بینیم خێری دونیاو ئاخیرەتیان تێدایە، بۆیە گەر سەلامەت بم و سوپاسگوزاربم پێم خۆشترە لەوەی نەخۆشبم و لەتاقیکردنەوەدابم و ئارامگربم[2].

بەکری کوڕی عبداللەی ئەلموزەنیی کۆڵبەرێکی بینی کۆڵێکی هەڵگرتبوو ئەیووت: الحمدلله، أستغفر الله، ئەڵێ: چاوەڕێمکرد تاوەکو کۆڵەکەی لەسەر پشت دانا، پێمووت: ئایە لەوتنی ئەمە باشتر نازانی؟ وتی: بەڵێ خێری زۆرترم پێ دراوە، قورئانی خوا دەخوێنمەوە، بەڵام بەندە لەنێوان نیعمەت و تاواندایە، بۆیە منیش لەسەر نیعمەتەکان سوپاسی خوا ئەکەم و بۆ تاوانەکانیشم داوای لێخۆشبوون ئەکەم، منیش وتم: کۆڵبەرێك لەبەکر شارەزاترە[3].

ترمیزیی باسیکردووە لەفەرموودەیەکی جابری کوڕی عبداللەوە(خوا لەخۆی و باوکی ڕازیی بێ)ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)دەرچوو بۆلای

---

[1] - حسن، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٦٤) و بەیهەقیی لە الشُعب(٤١٠٥)ئیخراجیان کردووە، عەمری کوڕی ئیسماعیلی ئەلهەمەذانیی تێدایە مەتروکە، بەڵام بەبێ ڕستەی کۆتایی لای الخرائطي لەفەزڵی سوپاسگوزارییدا (فضیلة الشکر٨٣)هاتووە.

[2] - پێشتر تەخریج کرا.

[3] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئیخراجی کردووە لە الشکر(٦٦) و پچڕان لەئیسنادەکەیدا هەیە.

هاوەڵەکانی و تەواوی سورەتی(الرحمن)ی بەسەریاندا خوێندەوە لەسەرەتاوە تاوەکو کۆتایی، هاوەڵانیش بێدەنگ بوون، ئەویش فەرمووی:«لَقَدْ قَرَأْتُهَا عَلَى الْجِنِّ لَيْلَةَ الْجِنِّ فَكَانُوا أَحْسَنَ مَرْدُودًا مِنْكُمْ، كُنْتُ كُلَّمَا أَتَيْتُ عَلَى قَوْلِهِ: فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ قَالُوا لَا بِشَيْءٍ مِنْ نِعَمِكَ رَبَّنَا نُكَذِّبُ فَلَكَ الْحَمْدُ»[1] ئەو شەوەی بەسەر جنۆکەکاندا خوێندمەوە باشتر لەئێوە وەڵامیان دایەوە، هەرچکاتێ دەگەیشتمە ئەم ئایەتە:﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ الرحمن: ١٣، واتا:جا بە کام نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟.

ئەیانووت: نە بەرانبەر هیچ نیعمەتێکی خوای گەورە سپڵە نابین و بەدرۆی نازانین، خوایە گیان سوپاس و ستایش بۆ تۆ.

میسعەر ئەڵێ: کە بەبنەماڵەی داوود وترا:﴿ ٱعْمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ﴾ سبأ: ١٣، واتا:ئەی ئالی داوود شوکرانە بژێری خوا بکەن.

کات بەسەر ئەو بنەماڵەیەدا تێنەپەڕی هەموویان دەستیان کردە نوێژ کردن[2].

عەونی کوڕی عبدالله ئەڵێ: هەندێ شەرعناس وتوویانە: لەهەموو کارێکمدا لەگەڵ خێرێکدا شەڕێکیشم بینیووە تەنیا سەلامەتی(عافێت) و سوپاسگوزاریی نەبێ، ڕەنگە کەسێك هەبێ لەنەهامەتی و ناخۆشییەکەیدا سوپاسگوزاربێ و کەسێکی لەشساغیش سوپاسگوزار نەبێ، ئەگەر داوای شتێکتان لەخوای گەورە کرد، پێکەوە داوای سەلامەتیی و سوپاسگوزاریی بکەن[3].

---

[1] - حسن لغیرە، ترمیزی(٣٢٩١) و حاکم(٢/ ٤٧٣) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٦٩).

[2] - صەحیحە، بەیهەقیی لە الشُعب الإیمان(٤٥٢٤) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٧٤) ئیخراجیان کردووە.

[3] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئیخراجی کردووە لە الشکر(٧٧) و عەبدولڕەحمان ئەلمەسعودیی تێدایە تێکەڵ و پێکەڵی کردووە.

ئەبو ئومامە ئەڵێ: عومەری کوڕی خەتاب قەمیسێکی لەبەرکرد، کە گەیشتە دەفەی شانی فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەمە عەورەتی بۆ داپۆشیم و لەژیانمدا خۆمی پێ جوان دەکەم. پاشان هەردوو دەستی درێژکردو بینی شتێك لەهەردوو دەستی دەرچووە، ئەو زیادەیەی بڕی و وتی:گوێم لێبوو پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی: "من لبس ثوبا أحسبه جديدا فقال حين يبلغ ترقوته أو قال قبل أن يبلغ ركبتيه مثل ذلك ثم عمد إلى ثوبه الخلق فكسا به مسكينا لم يزل في جوار الله وفي ذمة الله وفي كنف الله حيا وميتا ما بقي من ذلك الثوب سلك"[1]، واتا: هەرکەسێ بەرگ و پۆشاکێکی نوێ لەبەر بکات کە گەیشتە دەفەی شانی یان فەرمووی: پێش ئەوەی بگەیەتە ئەژنۆی و بەرگەکەی پێشووی بداتە هەژارێك و هەژارەکەی پێ داپۆشێ، ئەوە لەپەناو هاوسێتیی خوای گەورەدایە بەزیندوویی و بەمردوویی تائەوکاتەی دەزوویەکی ئەو بەرگ و پۆشاکە مابێ.

عەونی کوڕی عبدالله ئەڵێ: پیاوێك قەمیسێکی نوێی کڕی، سوپاسی خوای لەسەر کرد، بەوهۆیەوە خوای گەورە لێیخۆش بوو، پیاوەکە وتی: ناگەڕێمەوە تاوەکو قەمیسێکی تر نەکڕم و سوپاسی خوا نەکەم[2].

شورەیح ئەڵێ: هەر کۆست و نەهامەتییەك تووشی بەندە بچێ، سێ نیعمەتی خوای گەورەی تێدایە:یان بەڵاو ناخۆشییەکە لەئایینەکەی نەکەوتووەتەوە، یان بەڵایەکی لەوە گەورەترو سەختتر نەبووە، یان مایەی سڕینەوەی تاوانە[1].

---

[1] - لاوازە، ترمیزی(٣٥٦٠) و ئەحمەد(١/ ٤٤) و ئیبن ماجە(٣٥٥٧)ئیخراجیان کردووە.

[2] - زۆر لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٧٦)ئیخراجی کردووە، خالیدی کوڕی عەمری کوڕی موحەممەدی ئەلئەمەویی تێدایە، بەدرۆزن تۆمەتبار بووە.

عبداللـەی کـوڕی عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز ئـەڵێ: عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز چـاوی بڕیبێتـە هـەر نازونیعمـەتێك کـە خـوای گـەورە پێیـدابێ فەرموویەتی: خوایە گیـان مـن پـەنات پـێ دەگـرم ئـەم نیعمەتـەت بەسپڵەیی و بێباوەڕیی بگۆڕمەوە دوای ئەوەی ناسیبێتم، پەنات پێ دەگرم کە لـەبیری بکـەم و ستایشت نەکەم[2].

روحـی کـوڕی ئەلقاسـم ئـەڵێ: پیاوێـك گۆشـەگیریی کـردو دەسـتیکردە خواپەرستی و وتی: خورماو رۆن ناخۆم و سوپاسیشی ناکەم، ئەلحەسـەن وتـی: ئەوە گەمژەیە، ئاخۆ سوپاسی ئاوی سارد دەکات؟[3].

لەهەندێ دەقـی ئایینیـدا هـاتووە: خـوای گـەورە ئەفـەرمووێ: ئـەی نـەوەی ئادەم: خێرو خۆشیی من بۆ تۆ دادەبەزێ و هاوبەش پەیداکردنی تـۆ بـۆلای مـن بەرزدەبێتەوە، بەنازونیعمەت خۆشەویستیبت بۆ دەردەبڕم و تـۆش بـەتاوان لای مـن خـۆت دەخەیتـە جێـی تـووڕەیی و بـەردەوام فریشـتەیەکی بـەڕێز بـەتاوانی ناشیرینی تۆ بۆ لای من بەرزدەبێتەوە))[4].

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: ئەبو عەلیی بۆی باسکردم وتی: گوێم لەهاوسێیەکم بوو لەشەواندا دەیووت: خوایە گیان خێرو خۆشیی تۆ بۆ من دادەبەزێ و تـاوانی

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٨٠) ئیخراجی کردووە.

[2] - زۆر لاوازە، ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا لـە الشـكر(٧٦)ئیخراجـی کـردووە، وەلیـدی کـوڕی موسـلیمی تێدایە(مدلس)ە.

[3] - صـەحیحە، ئەحمـەد لـە الزهـد(٢٦٤) و ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا لـە الشـكر(٧٢) و بەیهـەقیی لـە الشُعب(٤٢٦٣)ئیخراجیان کردووە.

[4] - لاوازە، بەیهـەقیی لەالشُـعب(٤٢٦٩) و ئـەبو نـەعیم لـە الحلیـە(٢/ ٣٧٧) و ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا لـە الشكر(٤٣)ئیخراجیان کردووە.

منیش بۆلای تۆ بەرزدەبێتەوە، ئاخۆ چەندە فریشتەی بەڕێز بەتاوانی قێزەونی من بۆلای تۆ بەرزبووبێتەوە، تۆش سەرەڕای دەوڵەمەندی و بێ نیازییت بەمن بەنازونیعمەت لای من خۆت خۆشەویست دەکەی، کەچی منی هەژار بەتۆ و بێ توانا بەخراپە خۆم ئەخەمە جێی تووڕەیی تۆ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمپارێزی و شەرمەزارم ناکەی و رزق و رۆزییشم دەدەی[1].

ئەبو موغیرە کە پێیدەوترا: چۆنی ئەی ئەبا موحەممەد؟ ئەیووت: چۆن بین، لەنازونیعمەتدا رۆچووینەو ناتوانین سوپاس و ستایشی خوای لەسەر بکەین، خوای گەورە خۆیمان لا شیرین و خۆشەویست دەکات لەکاتێکدا پێویستی بە ئێمە نییە، کەچی کارێك دەکەین جێی تووڕەیی ئەو بێت لەکاتێکدا ئێمە پێویستمان پێیەتی[2].

عبداللەی کوڕی سەعلەبە ئەڵێ: خوایە گیان لەبەخشندەیی خۆتە گوێڕایەڵیی دەکرێی و سەرپێچییت ناکرێ، لەنەرموونیانیی خۆتە سەرپێچیی فەرمانت دەکرێ وەك ئەوەی نەبینی، ئایە چی سەردەمێك هەبووە دانیشتوانی زەویی سەرپێچیی فەرمانت نەکەن و تۆش هەر خێرو خۆشییت بەسەریاندا نەڕژاندبێ[3]؟!

موعاویەی کوڕی قوڕە کە بەرگ و پۆشاکێکی نوێی لەبەر بکردبایە دەیووت: بسم الله والحمد لله[4].

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٤٤)ئیخراجی کردووە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٤٥)ئیخراجی کردووە.

[3] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٤٦)ئیخراجی کردووە.

[4] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٤٨)ئیخراجی کردووە.

ئەنەسی کوڕی مالیك ئەڵێ: هەر بەندەیەك بەبەندایەتیکردنی خوای گەورە پشتی بەستبێ، خوای گەورە ئاسمانەکان و زەویی کردووەتە رزق و رۆزیی ئەو، خستوویەتییە دەستی بەندەکانی و کاری پێ دەکەن، گەر بەندە قبوڵی کرد، پێویستە سوپاسی خوای لەسەر بکات، گەر رەتیشی کردەوە، ئەوە خوای گەورە بەندە گەلێکی هەژاری بۆ دەدۆزێتەوە رزق و رۆزییەکەی وەربگرن و سوپاس و ستایشی بکەن"[1].

یونسی کوڕی عوبەید ئەڵێ: پیاوێك بە ئەبی تەمیمەی وت: چۆن بەیانییت کردەوە؟ وتی: لەنێوان دوو نیعمەتدا بەیانییم کردەوە کە نەمزانی کامەیان باشترن: تاوان گەلێك کە خوای گەورە داپۆشیم و کەس نەیبینی بەهۆیانەوە ریسوام بکەن، هەروەها خۆشەویستییەك کە خوای گەورە خستوویەتییە دڵی بەندەکانییەوە کە بەکارو کردەوەی خۆم بەو خۆشەویستییە نەدەگەیشتم[2].

ئیبن ئەبی ئەلدونیا گێڕاویەتییەوە لەسەعیدی ئەلمەقبوریی لەباوکییەوە ئەویش لەباپیرییەوە ئەویش لەعبداللەی کوڕی سەلامەوە ئەڵێ: موسا(سەلامی خوای لەسەربێ)وتی: پەروەردگارا، سوپاسی شیاو بەتۆ کامەیە؟ خوای گەورە فەرمووی: بەو جۆرەیە کە هەمیشە زمانت بەیادی من تەڕو پاراو بێ[3].

---

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٤٩) بەمەرفوعیی ئیخراجی کردووە.

[2] - صەحیحە، ئیبن ئەبی شەیبە لە(مصنف)ەکەیدا(١٣/ ١١٢) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٣٩)ئیخراجیان کردووە.

[3] - حسن، بەیهەقیی لە الشعب(٤٠٦٧) و حاکم(١/ ٥٤٦) و نەسائیی لە عمل اليوم والليلة(٣٠١)ئیخراجیان کردووە.

سوهەیلی کوڕی ئەبی صالح لەباوکییەوە ئەویش لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ)ئەگێڕێتەوە وتوویەتی:"پیاوێکی ئەنصاریی خەڵکی قوباء پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)ی دەعوات کرد، ئێمەش لەگەڵیدا ڕۆیشتین، کە چێشتی خواردو هەردوو دەستی شۆرد فەرمووی:"الحمد لله الذي يطعم ولا يطعم من علينا فهدانا وأطعمنا وسقانا وكل بلاء حسن أبلانا الحمد لله غير مودع ربي ولا مكافأ ولا مكفور ولا مستغنى عنه الحمد لله الذي أطعم من الطعام وسقى من الشراب وكسى من العرى وهدى من الضلالة وبصر من العمى وفضل على كثير من خلقه تفضيلا الحمد لله رب العالمين"[1]،واتا: سوپاس بۆ ئەو خوایەی خۆی خواردن دەبەخشێ و خواردنی پێ نابەخشرێ، منەتی خستەسەرمان بەهیدایەت دانمان و خواردن و خواردنەوەی پێداوین و بەهەموو تاقیکردنەوەیەك پاداشتی باشی داوین، سوپاس بۆ ئەو خوایەی جگە لەو کەسی تر نامانپارێزێ و هاوتاو لێخۆشبوویەکی تری جگە خۆی بوونی نییەو بێ ئەو نامانکرێ، سوپاس بۆ ئەو خوایەی لەخواردن خواردنی پێداوین و لەخواردنەوەی پێداوین و داپۆشیووین و لەگومڕایی ڕزگاری کردین و بەچاو لەنابینایی ڕزگاری کردین و بەڕێز لێنان بەسەر زۆرێك لەمەخلوقاتەکانی خۆیدا ڕێزی لێناین، سوپاس بۆ پەروەردگاری هەردوو جیهانیان.

لەموسنەدی ئەلحەسەنی کوڕی ئەلسەباحدا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله

---

[1] - لاوازە: تەبەرانیی لە معجم الأوسط(٤٢٦١) و بەیهەقیی لە الأسماء والصفات(٢٢٨)ئیخراجیان کردووە.

علیه وسلم)فەرموویەتی:"ما أنعم الله علی عبد نعمة في أهل ولا مال أو ولد فیقول ما شاء الله لا قوة إلا بالله فیری فیه آفة دون الموت"[1]، واتا:هەر بەندەیەك، خوای گەورە نیعمەتێکی پێ دابێ لەکەسوکارو ماڵ یان کوڕێك و بڵێ ما شاء الله ولا قوة إلا بالله، ئەوە جگە مردن بەڵاو ناخۆشیی تیادا دەبینێ.

باسدەکرێ لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ)وتوویەتی: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)هاتووەتە ژوورەوە بۆلای و دەبینێ پارچە نانێك فرێ دراوە، دەستی پێدا دەهێنێ و ئەفەرمووێ:"یا عائشة أحسني جوار نعم الله فإنها فلما نفرت عن أهل بیت فكادت أن ترجع الیهم"[2]،واتا:ئەی عائیشە باش مامەڵەی نیعمەتی خوا بکە، چەندە لەخەڵکانێك هەڵبێی پێویستت پێیان دەبێ و بۆلایان دەگەڕێیتەوە. ئیبن ئەبی ئەلدونیا باسیکردووە.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: هاشمی کوڕی ئەلقاسم بۆی باسکردین، سالح بۆی باسکردین لەئەبی عیمرانی ئەلجونییەوە ئەویش لەئەبی ئەلخولدەوە ئەڵێ: لەبابەت داووددا خوێندوومەتەوە داوود وتوویەتی: خوایە گیان چۆن سوپاسی تۆ بکەم لەکاتێکدا بەبێ نیعمەتەکانت ناتوانم بەسوپاس و ستایشت بگەم؟ وەحیی بۆ داوود دێ: ئەی داوود ئاخۆ نازانی ئەو نیعمەتەی لە تۆدایە هی منە؟ ئەڵێ: بەڵێ بێگومان ئەی پەروەردگار. پەروەردگار ئەفەرمووێ: بەسوپاسکردنت لەبەرانبەر ئەوەدا منیش لە تۆ رازیی دەبم))[3].

---

[1] - لاوازە، بەیهەقیی لە الشعب(٤٢٣٦)دا ئیخراجی کردووە، وەلید ئەلموقریی تێدایە کەسێکی لاوازە.

[2] - زۆر لاوازە، ئەحمەد لە الزهد(٩١) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٦/ ٥٦) و بەیهەقیی لە الشعب(٤١٠١)ئیخراجیان کردووە

[3] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٤٠)ئیخراجی کردووە.

عبداللەی کوڕی ئەحمەد ئەڵێ: ئەبو موسای ئەنصاریی بۆی باسکردین، ئەبو ئەلوەلید بۆی باسکردین لەسەعیدی کوڕی عەبدولعەزیزەوە ئەڵێ: یەکێك لەپاڕانەوەکانی داوود ئەمە بوو: پاك و بێگەردیی بۆ ئەو خوایەی لەبەخشیندا سوپاسگوزاری و لەنەهامەتییشدا پاڕانەوەی هێناوەتە بوون))[١].

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: ئەبو موعاویەی بۆی باسکردین کە ئەعمەش بۆی باسکردین لەمنهالەوە ئەویش لەعبداللەی کوڕی ئەلحاریثەوە ئەڵێ: خوای گەورە وەحیی بۆ داوود کرد:((منت خۆشبووێ و بەندەکانی منیشت خۆشبووێ و لای بەندەکانیشم خۆشەویستم بکە. داوود وتی: خوایە گیان ئەوە خۆشەویستیی من بۆ تۆ و بۆ بەندەکانیشت، بەڵام چۆن لای بەندەکانت خۆشەویستت بکەم؟ خوای گەورە فەرمووی: لای ئەوان یادی من بکە، ئەوکات بەباش و جوان یادی من دەکەنەوە[٢]، بۆیە مەزنیی بۆ پەروەردگارمان، ناوی گەورەو بڵند و پیرۆزبێ و هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە جگە لەخۆی)).

ئەحمەد ئەڵێ: عەبدولڕەزاق بۆی باسکردین، ئەویش لەعیمرانەوە وتی: گوێم لەوەهب بوو دەیووت:((لەکتێبی بنەماڵەی داوودا بینیوومە: سوێند بەعیزەت و شکۆدارییم، هەرکەسێ پشت بەمن ببەستێ و پەنا بۆ من بهێنێ، گەر ئاسمانەکان و زەویی لەسەری هاتبێتە یەك، لەو نێوەندەدا دەروازەی ڕزگاربوونی بۆ دەکەمەوە، هەرکەسێکیش پەنا بۆ من نەهێنێ، دەستی لەهەموو

---

[١] - لاوازە، عبداللەی کوڕی ئەحمەد لە زوائد الزهد(لا٩٨)ئیخراجی کردووە، وەلیدی کوڕی موسلیمی تێدایە(مدلس)ە.

[٢] - ئەحمەد ئیخراجی کردووە لە الزهد(لا٩١).

هۆکارێکی ئاسمان دەبڕم و لەزەویی پێی دەبڕم و ئەیخەمە هەواوەو دەیدەمە دەست دەرروونی خۆیەوەو بەخۆی دەیسپێرم، من بۆ بەندەکەم بەسم و هەموو شتێکی پێ دەدەم، ئەگەر بەندەکەم لەگوێڕایەڵیی مندا بێ، پێش ئەوەی لێم داوا بکات پێی دەبەخشم، بەدەم داوایەوە دەڕۆم پێش ئەوەی لێم بپارێتەوە، من لەخۆی زیاتر بەپێویستییەکەی ئاگادارو زانام))[1].

ئەحمەد ئەڵێ: یەسار بۆی باسکردین، کە حەفس بۆی باسکردین، ثابت بۆی باسکردین وتی:داوود کاتەکانی شەو و ڕۆژی بەسەر کەسوکارەکەیدا دابەشکرد، هیچ کاتێك نەبووە لەبنەماڵەکەیدا کەسێك نەبێ سەرقاڵی نوێژ نەبێ، ئەڵێ: بۆیە خوای گەورە هەموویانی گشتگیر کردووە لەم ئایەتەدا:﴿ ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ١٣ ﴾ سبأ: ١٣، واتا[2]: ئەی ئالی داوود شوکرانە بژێری خوا بکەن بەڵام کەمێ لە بەندەکانم(بۆ خوا) سوپاسگوزارن.

ئەحمەد ئەڵێ: عەبدولڕەحمان بۆی باسکردین کە جابری کوڕی یەزید بۆی باسکردین لەموغیرەی کوڕی عوتەیبەوە وتی: داوود وتی: خوایە گیان ئەمشەو هیچ مەخلوقێکی تۆ هەبووە لەمن زیاتر یادی تۆی کردبێ؟ خوای گەورە وەحیی بۆ کرد: بەڵێ، بۆق لە تۆ زیاتر یادی منی کرد، خوای گەورە ئەمەی بۆ دابەزاند: ﴿ ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ١٣ ﴾ سبأ: ١٣، داوود وتی: من چۆن بتوانم سوپاسی تۆ بکەم، نیعمەتێکم پێ ڕزق دەدەی و منیش سوپاست دەکەم، نیعمەت بەدوای نیعمەت، نیعمەت و سوپاسەکە لە تۆوەیە،

---

[1] - ئەبو نەعیم لە الحلیة(٤/ ٢٥– ٢٦) و ئیبن موبارەك لە الزهد(٣١٨)ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئەحمەد لە الزهد(١/ ١٤١) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٢/ ٣٢٧)ئیخراجیان کردووە.

ئایە من چۆن بتوانم سوپاست بکەم؟ خوای گەورە فەرمووی: ئێستا منت ناسیی ئەی داوود[1].

ئەحمەد ئەڵێ: عەبدولڕەحمان بۆی باسکردین کە ڕەبیعی کوڕی صەبیح بۆی باسکردین لەئەلحەسەنەوە وتی: داوودی پەیامبەری خوا وتی: خوایە گیان گەر هەر تاڵە موویەکی جەستەی من دوو زمانی هەبووایەو شەو و ڕۆژ پاك و بێگەردییان بۆ تۆ بنردبایە مافی یەك نیعمەتیان نەدەدا[2].

ئیبن ئەبی ئەلدونیا باسیکردووە لەئەبی عیمران ئەلجونییەوە ئەویش لەئەبی ئەلخولدەوە وتی: موسا وتی: پەروەردگارا من چۆن سوپاسی تۆ بکەم لەکاتێکدا تەواوی کارەکانی ژیانم پاداشتی بچووکترین نیعمەتێکی تۆ نییە؟ ئەڵێ: وەحیی بۆ هات: ئەی موسا ئێستا سوپاسی منت کرد[3].

بەکری کوڕی عبدالله ئەڵێ: بەندە هەرکاتێ بڵێ"الحمد لله" نیعمەتێکی بۆ پێویست دەبێ و پێیدەبەخشرێ، لەپاداشتی ئەو نیعمەتەدا بڵێ"الحمد لله" نیعمەتێکی تری بۆ دێت، بۆیە نازونیعەتەکانی خوا بە"الحمد لله" بەردەوام بهێڵنەوە[4].

[1] - ئەحمەد لە الزهد(٨٨) و بەیهەقیی لە الشُعب(٤١٠٠)ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئەحمەد لە الزهد(٨٨) و بەیهەقیی لە الشُعب(٤٢٥٩)ئیخراجیان کردووە.

[3] - ئەحمەد لە الزهد(٥٨) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٦/ ٥٦) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٦) ئیخراجیان کردووە.

[4] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٧) ئیخراجی کردووە، یەحیای کوڕی بەحر ئەلمروزیی تێدایە قسەی لەسەر هەیە.

ئەلحەسەن ئەڵێ: پەیامبەری خوا گوێی لەپیاوێك بوو ئەیووت: سوپاس بۆ خوا لەسەر نیعمەتی ئیسلام، ئەویش فەرمووی:"إِنَّكَ لَتَحْمَدُ اللَّهَ عَلَى نِعْمَةٍ عَظِيمَةٍ"[1]، واتا: تۆ لەسەر نیعمەتێکی مەزن سوپاس و ستایشی خوا دەکەی.

خالیدی کوڕی مەعدان ئەڵێ: گوێم لەعەبدولمەلیکی کوڕی مەروان بوو وتی: بەندە هیچ وشەیەکی خۆش و سوپاسگوزارییەك دەرنابڕێ لای خوا خۆشەویستر بێ لەوتنی: سوپاس بۆ خوای گەورە کە نیعمەتی خۆی بەسەرماندا رژاندو هیدایەتی داین بۆ ئیسلام))[2].

سولەیمانی تەیمیی ئەڵێ: خوای گەورە بەئەندازەی توانای خۆی، نیعمەتی بە بەندەکانی داوەو بە ئەندازەی توانای خۆیان ئەرکی سوپاسکردنی خستووەتە ئەستۆیان[3].

ئەلحەسەن قسەو وتاری بەم جۆرە دەستپێدەکردو ئەیووت: سوپاس بۆ خوای گەورە، خوایە گیان سوپاس بۆ تۆ کە ئێمەت دروستکردو رۆزیت داین و هیدایتت داین و ئێمەت فێر کردو رزگارمانت کرد و دەرووت لێکردینەوە، سوپاس بۆ تۆ لەسەر نیعمەتی ئیسلام و قورئان، سوپاس بۆ تۆ کە کەسوکارو سەروەت و سەلامەتیت بەئێمە دا، دوژمنانمانت سەرکوتکرد و چیمان لێت ویست بەئێمەت دا، خوایە گیان سوپاسی زۆر لەسەر هەموو ئەو شتانە، سوپاس بۆ تۆ لەسەر هەر شتێك بە ئێمەت بەخشی لەکۆن و نوێ و بەنهێنی و ئاشکراو تایبەت و

---

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٩) و بەیهەقیی لە الشعب(٤١٧٩) ئیخراجیان کردووە و بەهۆی نیرسالبوونییەوە ئیسنادەکەی لاوازە.

[2] - حسن، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٠)ئیخراجی کردووە.

[3] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٨)ئیخراجی کردووە.

گشتی و بەزیندوویی یان مروودیی بەئامادەبوون و ئامادەنەبوون، سوپاس بۆ تۆ تاوەکو لێمان رازیی دەبی و سوپاس بۆ تۆ کاتێك لێمان رازیی بووی[1].

ئەلحەسەن ئەڵێ:موسا وتی: پەروەردگارا، ئادەم چۆن توانی سوپاسی ئەوە بکات کە تۆ بۆ ئەوت کرد، بەدەستی خۆت ئەوت دروستکرد، لەڕوحی خۆت فووت پێدا کرد، لەبەهەشتی خۆتدا نیشتەجێت کرد و فەرمانت دا فریشتەکان کڕنۆشیان بۆ برد؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەی موسا، ئادەم بەوەی زانیی کە بۆم کردووە بۆیە سوپاس و ستایشی منی کرد، ئەوەش سوپاسکردنی ئەوە بوو کە بۆم کرد[2].

سەعدی کوڕی مەسعودی سەقەفیی ئەڵێ: نوح بۆیە ناونراوە بەندەیەکی سوپاسگوزار، چونکە هەر بەرگێکی نوێی لەبەرکردبێ و هەر خواردنێکی خواردبێ سوپاسی خوای کردووە[3].

عەلیی کوڕی ئەبو تاڵیب کە لەئاودەست دەردەچوو دەستی بەسکیدا دەهێناو ئەیووت: ئەمە چی نیعمەتێکە، گەر بەندە بیزانیبایە سوپاسی دەکرد[4].

مەخلەدی کوڕی حوسێن ئەڵێ: ئەوترا: سوپاسگوزاری، واتا: وازهێنان لەتاوان[5].

ئەبو حازم ئەڵێ: هەر نیعمەتێك مرۆڤ لەخوا نزیك نەخاتەوە، بەڵاو نەگبەتییە[1]

---

[1] - حسن، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١١)ئیخراجی کردووە.

[2] - لاوازە، بەیهەقیی لە الشعب(٤٤٢٧)دا ئیخراجی کردووە، عەمری کوڕی ئیسماعیلی هەمەدانیی تێدایە مەتروکە.

[3] - حسن، تەبەرانیی لە المعجم الکبیر(٥٤٢٠) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٤)ئیخراجیان کردووە.

[4] - بەیهەقیی لە الشُعب(٤٤٦٨) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٣)ئیخراجیان کردووە.

[5] - بەیهەقیی لە الشُعب(٤٥٤٧) ئیخراجی کردووە.

ئـەبو سـولەیمان ئـەڵێ: باسـکردنی نیعمـەت، خۆشەویسـتیی خـوای گـەورە ئەهێنێتەدی[2].

حەممادی کوڕی زەید ئـەڵێ: لـەیث بـۆی باسـکردین لەئـەبی بـوردەوە وتـی: هاتمـە مەدینـە و بەعبداللـەی کـوڕی سـەلام گەیشـتم و پێـی وتم: ئایـە ناچـیتەماڵێکــەوە کــە پەیامبــەری خوا(صــلی الله علیــە وسلم)تێیچــووەو ئــاردو خورمات(سویق) بـۆ بکـەین؟ پاشـان وتـی: خـوای گـەورە کـە بەیانیی(قیامـەت) هەموو خەڵکی کۆکردەوە ئەو نیعمەتەیان بۆ بـاس دەکـات کـە بەئـەوانی دابـوو. بەندەی وا هەیە ئەڵێ: بەڵگەی ئەو نیعمەتـە کامەیـە؟ پـەروەردگار ئەفـەرمووێ: بەڵگەی ئەوە فلان و فلان ناخۆشییتان بوو، داواتان لەمن کردو پاڕانـەوە منـیش دەرووی خێرم لێکردنەوە، بەڵگـەی ئـەوە، تـۆ لـەفلان و فلانـە گەشـتدا بـووی و داوات کـرد لەگەڵتـدا بم منـیش لەگەڵتـدا بـووم، خـوای گـەورە بـیری دەخاتـەوە تاوەکو هـەمووی بیرەکەوێتـەوە، ئینجـا ئەفـەرمووێ: بەڵگـەی ئـەوە، ئـەوە بـوو داوای کچی فلانە کەست کردو کەسێکی تریش خوازبێنیی کرد، لـەتۆم مـارەکردو خوازبێنیکارەکەی ترم رەتکردەوە[3].

بەنـدە لەبەردەسـتی خـوای گـەورە دەوەسـتێ و خـوای گـەورە یەکـە یەکـە نیعمەتەکانی بۆ دەژمێرێ، گریاو پاشان گریـا، پاشـان وتـی: ئومێـدەوارم خـوای گەورە هیچ بەندەیەك لەبەردەستی خۆیدا رانەگرێ و ئینجا سزای بدات[4].

---

[1] - لاوازە، بەیهەقیی لە الشُعب(٤٥٣٧) و ئەبو نەعیم لـە الحلیـة(٣/ ٢٣٠) ئیخراجیـان کـردووە، نەناسـراوی تێدایە.

[2] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٢١)ئیخراجی کردووە، کەسی نەناسراوی تێدایە.

[3] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٢٢)ئیخراجی کـردووە، لـەیثی کـوڕی سـەلیمی تێدایـە، شـتەکانی تێکەڵ و پێکەڵ کردووە.

[4] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٢٣)ئیخراجی کردووە.

لەیثی کوڕی سەلیم گێڕاویەتییەوە لەعوسمانەوە، ئەویش لەئیبن سیرینەوە، ئەویش لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)فەرمووی:"یؤتی بالنعم یوم القیامة والحسنات والسیئات فیقول الله عزوجل لنعمة من نعمه خذي حقك من حسناته فما تترك له من حسنة الا ذهبت بها"[1]،واتا: لەڕۆژی قیامەتدا، نازو نیعمەت و چاکەو خراپەکان دەهێنرێن، خوای گەورە بەنیعمەتێك لەنیعمەتەکانی ئەفەرمووێ:لەچاکەکانی ئەم بەندەیە مافی خۆت هەڵبگرە، یەك نیعمەتەکە هەموو چاکەکانی بەندەکە هەڵدەگرێ.

بەکری کوڕی عبداللەی ئەلموزەنیی ئەڵێ: بڕیاری خوا بۆ سەر بەندە دادەبەزێ و لەخوا دەپاڕێتەوە لەسەری لایبدات، خوای گەورەش بەلاو ناخۆشیی لەسەر لادەبات، ئینجا شەیتان دێتەلای بەندەکەو وەهای لێدەکات سوپاسکردنی لاواز بێ و پێی ئەڵێ: کارەکە لەوە ئاسانترە کە تۆ بۆچوونت کردبوو. ئەڵێ: بەندەکەش ناڵێ: کارەکە لەوە سەختتر بوو کە من بۆچوونم دەکردو خوای گەورە لەسەرم لایبرد[2].

ئیبن ئەبی ئەلدونیا باسیکردووە لەصەدەقەی کوڕی یەسارەوە ئەڵێ: داوود(سەلامی خوای لەسەربێ)لەمیحرابی خۆیدا بوو، گەردیلەیەك بەلایدا تێپەڕی و داوود تەماشایەکی کرد، بیری لەدروستبوونی کردەوەو پێی سەرسام بوو وتی: خوای گەورە چۆن ئەمە کۆدەکاتەوە؟ خوای گەورە گەردیلەکەی بەگۆ هێناو وتی: ئەی داوود تۆ بەخۆت سەرسامی، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە

---

[1] - زۆر لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٢٤)ئیخراجی کردووە، ساڵحی کوڕی موسای ئەلطەلحیی تێدایە، مەتروکە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٢٦)ئیخراجی کردووە.

من بەوەی خوا پێیداوم لەفەزڵی خۆی لە تۆ سوپاسگوزارترم سەرباری ئەو فەزڵەی خوا پێیداوی[1].

ئەیووب ئەڵێ: پارێزگاریکردنی ئەو پەیامەی کە پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)هێناویێتی، یەکێك لەگەورەترین نیعمەتەکانی خوای گەورەیە بەسەر بەندەکەیەوە[2].

سوفیانی سەوریی ئەڵێ: ئەوترا: ئەو کەسە شەرعناس و تێگەیشتوو نییە، بەلاو ناخۆشییەکان بەنیعمەت و خۆشییەکانیش بە بەلا نەژمێرێ[3].

زاذان ئەڵێ: لەمافی خوای گەورە بەرانبەر ئەو نیعمەتەی بەبەندەکەی بەخشیویێتی، ئەوەیە بەندەکەی بەو نیعمەتە بەتاوان و خراپە نەگات[4].

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: مەحمود ئەلوەڕاق ئەم شیعرەی بۆ وتم:

إِذَا كَانَ شُكْرِي نِعْمَةَ اللَّهِ نِعْمَةً ... عَلَيَّ وَفِي أَمْثَالِهَا يَجِبُ الشُّكْرُ
فَكَيْفَ وُقُوعُ الشُّكْرِ إِلَّا بِفَضْلِهِ ... وَإِنْ طَالَتِ الْأَيَّامُ وَاتَّصَلَ الْعُمْرُ
إِذَا مَسَّ بِالسَّرَّاءِ عَمَّ سُرُورُهَا ... وَإِنْ مَسَّ بِالضَّرَّاءِ أَعْقَبَهَا الْأَجْرُ
وَلَا مِنْهَا إِلَّا لَهُ فِيهِ مِنَّةٌ ... تَضِيقُ بِهَا الْأَوْهَامُ وَالْبَرُّ وَالْبَحْرُ

واتا: گەر سوپاسکردنم بۆ نیعمەتی خوا نیعمەتێك بێ، ئەوە لەسەر من و هاوشێوەکانی سوپاسکردن واجیبە،هەموو سوپاس و ستایشێکیش هەر بەفەزڵ و منەتی خۆی بۆ بەندە روودەدات سوپاسی بکات، کە خۆشییەکی بدات فراوانی

[1] - بەیهەقیی لە الشُعب الإيمان(٤٢٦٠)ئیخراجی کردووە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٣٥)ئیخراجی کردووە.

[3] - ئەبو نەعیم لە الحلية(٧/ ٥٥) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٨١)ئیخراجیان کردووە.

[4] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٨٣)ئیخراجی کردووە.

ئەکات، کە ئازارو ناخۆشییش بدات پاداشتی بەدوادا دەنێرێ و لەهەموو شتێکدا فەزڵ و منەتی خۆی هەیە.

دراوەردیی گێڕاویەتییەوە لەعەمری کوڕی ئەبی عەمرەوە ئەویش لەسەعیدی ئەلمەقبورییەوە ئەویش لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:« إِنَّ الْمُؤْمِنَ عِنْدِي بِمَنْزِلَةِ كُلِّ خَيْرٍ، يَحْمَدُنِي وَأَنَا أَنْزِعُ نَفْسَهُ مِنْ بَيْنِ جَنْبَيْهِ»[1]،واتا: باوەڕدار لای من لەپێگەو شوێنی هەموو خێرو خۆشییەکدایە، ئەو خەریکی سوپاسکردنی منە لەکاتێکدا گیانی لێ دەکێشم.

موحەممەدی کوڕی ئەلمونکەدیر بەلای گەنجێکدا تێپەڕی، سەیر دەکات گەنجەکە خەریکە چاو لەئافرەتێك دادەگرێ، بەگەنجەکەی وت: ئەی گەنج و لاو ئەمەی تۆ دەیکەی کەی پاداشتی ئەو نیعمەتەیە کە خوای گەورە بە تۆی داوە[2].

حەممادی کوڕی سەلەمە ئەڵێ لەثابتەوە، ئەبو ئەلعالیە وتی: ئومێدم هەیە بەهۆی دوو شتەوە بەندە لەنێو نەچێ: نیعمەتێك سوپاسی خوای لەسەر دەکات، تاوانێك بەهۆیەوە داوای لێخۆشبوون لەخوای گەورە دەکات[3].

ئیبن ئەلسەمماك نامەی بۆ موحەممەدی کوڕی ئەلحەسەن نووسی کاتێك کرایە قازیی رەقە: پاشان، با لەهەموو کات و حاڵێکتدا لەخوابترسێی، بترسە

---

[1] - صەحیحە، ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا(٢/ ٣٤١- ٣٦١) و بەزار(٧٨١) ئیخراجیان کردووە هەروەك لە (كشف الأستار)دا هەیە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٨٦)ئیخراجی کردووە.

[3] - بەیهەقیی لە الشعب الإيمان(٤٥١٣) و ئەبو نەعیم لە الحلية(٢/ ٢١٩)ئیخراجیان کردووە.

لەکەم سوپاسگوزارییت بەرانبەر هەر نیعمەتێك لەنیعمەتەکانی خوای گەورە، بترسێ لەگەڵ ئەوەی کەم سوپاسگوزاربی تاوانیشی لەگەڵدا بکەی، چونکە هەموو نیعمەتێك بەڵگەو بیانووی بەدواوەیە، بیانوو دانەدەست تاوانکردنە بەرانبەر نیعمەتەکە، ئەوەشی بەدوادادێت و سزای لەسەر ئەبێ کەم سوپاسگوزار بوونە، بۆیە خوای گەورە لێت ببورێ بەرانبەر ئەو سوپاسگوزارییەی جاران لەدەستت چووە یان تاوان و کەمتەرخەمییەکت کردبێ لەبەرانبەر مافی نیعمەتێکدا[1].

رەبیعی کوڕی ئەبی راشید بەلای پیاوێکدا تێپەڕیی کە نەخۆشییەکی ماوە درێژی هەبوو، دانیشت و سوپاسی خوای کردو گریا، پێیوترا: چی شتێك تۆ دەگرێنێ؟ وتی: خەڵکانی بەهەشت و دۆزەخم بیرکەوتەوە، خەڵکانی بەهەشتم بەلەشساغەکان و دۆزەخییەکانیش بەدەردو بەلاَدارەکان شوبهاند، ئەوە منی خستە گریان[2].

ئەبو هورەیرە(خوای لێ رازیی بێ)گێڕاویەتییەوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی:"ئەگەر کەسێك لەئێوە حەزی کرد ئەندازەی نیعمەتی خوا بەسەر خۆیەوە ببینێ، با بڕوانێتە کەسانی لەخۆی خوارتر نەك کەسانی سەرووی خۆی".

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٨٩)ئیخراجی کردووە.

[2] – لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٩٠)ئیخراجی کردووە، نەضری کوڕی ئیسماعیلی تێدایە کەسێکی بەهێز نییە.

عبداللـەی کـوڕی موبـارەك ئـەڵێ[1]: یەزیـدی کـوڕی ئیـبراهیم بـۆی باسـکردین لەئەلحەسـەنەوە وتــی: ئــەبو دەرداء وتــی: هەرکەســێ نیعمــەتی خــوا تــەنیا لەخواردن و خواردنەوەیدا ببینێ، ئەوە کارو کردەوەی کەمەو سزاو ئەشکەنجەی بۆ خۆی ئامادەکردووە[2].

ئـیبن موبـارەك وتوویـەتی: مـالیکی کـوڕی ئەنـەس بـۆی باسـکردین، ئـەویش لەئیسحاقی کوڕی عبداللەی کوڕی ئەبی تەڵحەوە، ئەویش لەئەنەسەوە(خوای لێ ڕازیی بێ)وتی: گوێم لە عومەری کوڕی خەتاب بوو(خوای لێ ڕازیی بـێ) سـەلامی لەپیاوێك کـرد، ئـەویش وەڵامـی سـەلامەکەی دایـەوە. عومـەر بەپیاوەکـەی وت: چۆنی؟ ئەویش وتی: سوپاسی خوا دەکەم. عومەریش وتی: منیش ئەوەم لە تـۆ دەویست[3].

ئیبن موبارەك ئەڵێ: مەسعود هەواڵی پێداین لە عەلقەمـەی کـوڕی مـرثـدەوە، ئەویش لەئیبن عومەرەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی ڕازیی بـێ) وتـی: ڕەنگـە زیاتر لەجارێك لەڕۆژێکدا بەیەك بگـەین و پرسـیاری حـاڵی یـەکتر بکـەین، خـوای گەورە بەمە تەنیا ئەوەی بووێ سوپاسی بکەین[4].

[1] - عبداللەی کوڕی موبارەکی کوڕی واضـحی حـەنظـەلـی لـەڕێی وەلائـەوە، ئەلتـەمیمی، ئـەلمروزی، ئـەبو عەبدولڕەحمان(ساڵی١١٨ك لـەدایکبووەو ١٨١ك مـردووە: حـافـیظ و شـێخی ئیسـلام و موجاهیـد و خـاوەن دانراو و گەشتی زۆر بووە.

[2] - ئیبن ئەلموبارەك لە الزهد(١٥٥١) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(١/ ٢١٠)ئیخراجیان کردووە.

[3] - مالیك لە الموطأ(٢/ ٩٦١) و بوخاریی لە الأدب المفرد(١١٣٢)ئیخراجیان کردووە.

[4] - لاوازە، ئیبن موبارەك ئیخراجی کردووە لە الزهد(٢٠٧) لەڕشتەی گێرانەوەدا پچڕان هەیە.

موجاهید لەبارەی ئەم ئایەتەوە ئەڵێ:﴿ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً ﴾ لقمان: ٢٠، واتا: نیعمەتەکانی بە فراوانی ڕشتووە بەسەرتاندا چ دیارو ئاشکراو چ پەنهان.

ئەڵێ: لا إله إلا الله[١]. ئیبن عوەیەینە ئەڵێ: خوای گەورە نیعمەتی باشتری بە بەندەکانی خۆی نەداوە باشتر بێ لەوەی(لا إله إلا الله)پـێ ناسـاندوون، لا إلـە إلا الله لەئاخیرەتدا بۆیان وەك ئاوی دونیایە[٢].

کەسـێکی پێشـین لـەوتاری ڕۆژی جەژنـدا وتوویـەتی: ئێـوە بوونـە گـوڵ و خەڵکانی تریش بوونە تەم و تـۆز، خـەڵکیی دەڕێسـن و ئێـوەش لەبـەر دەکـەن، خەڵکیی دەدەن و ئێوەش وەریدەگرن، خەڵکیی بەرهەمدەهێنن و ولاّخ رادەگـرن ئێوەش سوار دەبن، خەڵکیی دەچێنن و ئێوەش دەخۆن، خۆی گریاو ئەوانیشـی خستە گریان[٣].

عبداللەی کوڕی قورتی(قُرط) ئەزدی(یەکێك بوو لەهاوەڵان)لەسەر مینبـەرەوە لەڕۆژی جەژنی قورباندا کە بینیی خەڵکی بە بەرگ و پۆشاکی ڕەنگاو ڕەنگـەوە بینیی وتی: ئەمە چی نیعمەتێك و ڕێزێکە بۆی دەرخسـتووین، هـیچ شـتێك لـەوە سـەختتر نییـە کۆمـەڵێك نـەتوانن بـەجوانیی وەڵامـی ئـەم نیعمەتانـە بدەنـەوە، نازونیعمەت ئەوکات سەقامگیرو تەمەن درێژ دەبێ کە بتـوانی بـەجوانیی وەڵامـی خاوەن نیعمەتەکە بدەیتەوە[٤].

---

[١] - بەیهەقیی لە الشعب(٤٥٠٢) و لە الأسماء والصفات(١٠٩)ئیخراجی کردووە.

[٢] - بەیهەقیی لە الشعب(٤٥٠٠) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٧/ ٢٧٢)ئیخراجیان کردووە.

[٣] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٩٧)دا ئیخراجی کردووە: ئیسـحاقی کـوڕی داوودی تێدایـە قسـەی بێ بنەمای هەیە(مناکیر).

[٤] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٩٨)ئیخراجی کردووە.

سەلمانی فارسی(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: پیاوێك لەسەروەتی دونیا زۆری پێ درابوو، خوای گەورە هەمووی لەدەست سەند و کابرا هەر خەریکی سوپاس و ستایشکردنی خوای گەورە بوو تائەوەی حەسیرێکی بۆ مابووەوە هەر سوپاس و ستایشی خوای گەورەی دەکرد....کابرایەکی تریش لەسەروەتی دونیای زۆر پێ درابوو، بەخاوەن حەسیرەکەی وت: ئەبینم تۆ سوپاسی خوا دەکەی، پێم ناڵێی ئەم سوپاسکردنەت لەپای چییە؟ وتی: سوپاسی ئەکەم لەسەر ئەو شتەی کە مەخلوقات ناتوانن نمونەی بدەن. وتی: ئەوە چییە؟ وتی: چاوت نابینی؟ زمانت؟ هەردوو دەستت؟ هەردوو قاچت؟[1].

پیاوێك هات بۆلای یونسی کوڕی عوبەید گازندەی هەژاری و دەستکورتیی خۆی ئەکرد، یونس وتی: حەز ئەکەی چاوت نەمێنێ و سەد هەزار درهەمت پێ بدرێ؟ کابرا وتی: نە. یونس وتی: ئەی لەبری هەردوو دەستت سەد هەزارت پێ بدرێ؟ وتی: نە. وتی: ئەی لەبری هەردوو قاچت سەد هەزار؟ وتی: نە. ئەویش نیعمەتەکانی خوای گەورەی بیرهێنایەوەو وتی: تۆ خاوەن سەدان هەزار درهەمیو گازندەی هەژاریی خۆت ئەکەی![2].

ئەبو دەرداء ئەیووت: لەشساغیی پادشایەتییە[3].

جەعفەری کوڕی موحەممەد(خوای لێ رازیی بێ): ئێسترێکی ونبوو، وتی: گەر بگەڕێتەوە بەجۆرێ سوپاس و ستایشی خوا ئەکەم جێی رازیبوونی بێ،

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٠٠)ئیخراجی کردووە.

[2] - لاوازە، بەیهەقیی لە الشعب(٤٤٦٣) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٣/ ٢٢) ئیخراجیان کردووە، کەسی نەناسراوی تێدایە.

[3] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٢٠)ئیخراجی کردووە.

زۆری نەخایاند بە زین و حەبلی خۆیەوە گەڕایەوە، ئەویش سواری بوو، کە لەسەری دانیشت و بەرگ و پۆشاکەکەی کۆکردەوە، سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و وتی: هەموو سوپاسێك بۆ خوای گەورە و هیچی تری نەوت، لەوەدا پێی وترا هەر ئەوەندە بوو، ئەویش وتی: ئایە هیچ شتێکی ترم بەجێهێشتووە، من هەموو سوپاس و ستایشێکم بۆ خوای گەورە دانا[1].

ئیبن ئەبی ئەلدونیا گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەیەکی سەعدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی کەعبی کوڕی عوجرەوە ئەویش لەباوکییەوە ئەویش لەباپیرییەوە ئەڵێ:پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)کۆمەڵێك لەپشتیوانانی ناردو فەرمووی:"ئەگەر خوای گەورە سەلامەت و خاوەن دەسکەوتیان بکات قەرزداری سوپاس و ستایشی دەبم". ئەڵێ: زۆری نەخایاند سەلامەت و خاوەن دەسکەوت بوون و هەندێ لەهاوەڵانی وتیان: بیستمان دەتفەرموو:"ئەگەر خوای گەورە سەلامەت و خاوەن دەسکەوتیان بکات قەرزداری سوپاس و ستایشی دەبم؟"، فەرمووی: بەڵێ سوپاسم کرد، اللهم لك الحمد شكراً، ولك المَنُّ فضلاً"[2].

عەبدولڕەحمانی کوڕی یەزیدی کوڕی ئەسلەم ئەڵێ: موحەممەدی کوڕی ئەلمونکەدیر بەئەبی حازمی وت: ئەی ئەبا حازم، زۆربەی ئەوانەی پێم دەگەن دوعای چاکەم بۆ دەکەن و نایانناسم و هیچ چاکەیەکیشم بۆ نەکردوون؟ ئەبو حازم وتی: وا مەزانە ئەوە بەکاری خۆت بووبێ، بەڵکو بڕوانە ئەو کەسەی هۆکاری ئەوەیەو سوپاسی بکە، ئەبو عەبدولڕەحمانیش ئەم ئایەتەی

[1] - بەیهەقیی لە الشعب(٤٠٨٢) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٣/ ١٨٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] - لاوازە، بەیهەقیی لە الشعب(٤٠٨١) لاوازو حاڵ نەناسراوی تێدایە.

خوێندەوە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا ﴿٩٦﴾ ﴾ مریم: ٩٦[1]، واتـا: بەڕاسـتی ئەوانـەی کـە باوەڕیـان هێنـاوەو کـردەوە چاکەکانیشیان کردووە زۆر زوو خوای میهرەبان خۆشەویستیان دەکـات لـە دڵـی باوەڕداراندا.

عــەلیی کــوڕی ئەلجەعــد ئــەڵێ: عەبدولعــەزیزی کــوڕی ئــەبی ســەلەمەی ئەلماجیشون بۆی باسکردین، کە کەسێکی متمانەدار بۆی باسکردین: ئەبو بـەکر لەپاڕانەوەکانیدا دەیووت:" أسألك تَمام النِّعْمَة فِي الْأَشْيَاء كلهَا وَالشُّكْر لَك عَلَيْهَا حَتَّى ترْضى وَبعد الرِّضَا والخِيرةُ فِي جميع ما يكون فيه الخِيرةُ بجميع مُيسَّر الأمور كلها لا معسورها يا كريم"[2].

ئەلحەسەن ئەڵێ: خوای گـەورە هـەر نیعمـەتێکی بـە بەندەیـەك داو بەندەکـە وتی: (الحمد لله)، ئەوە زیاتر لەوەی داوە کە وەریگرتووە[3].

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: پێمگەیشتووە لەسوفیانی کـوڕی عویەینـەوە وتـی: ئەمە هەڵەیە ناکرێ کاری بەندە لـەکاری خـوای گـەورە باشـتربێ، پاشـان ئـەڵێ: هەندێ ئەهلی زانست وتوویانە: لێکدانەوەکەی بەم جۆرەیە: کەسێك نیعمـەتێکی پێ بدرێ پێویستە لەسەری سوپاسگوزاربێ،جا بەو نیعمەتەی زانی و لەبەرچاوی گرت و بەدنمەك نەبوو، ئەوکات وەك پێویست و شیاو بـەخوای گـەورە سوپاسـی

[1] - لاوازە، ئەبو نـەعیم لـە الحلیـة(٣/ ٢٣٣) ئیخراجـی کـردووە، عەبـدولڕەحمانی کـوڕی ئەسـلەمی تێدایـە مەتروکە.

[2] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١١٠)ئیخراجی کردووە، نەناسراوی تێدایە.

[3] – ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١١١) و بەیهەقیی لە الشعب(٤٠٩٤)ئیخراجیان کردووە.

خوای گەورە دەكات، بەوەش خوای گەورە سوپاس و ستایشی ئەو پەرستشەی پێ دەبەخشێ كە لەو نیعمەتەدا هەیە، بەوە سوپاسگوزارییەكی زیاترە.

منیش ئەڵێم: ئەوەی لەئیبن عویەینەوە باسكراوە ئەلحەسەن پابەند ناكات، چونكە وتنی الحمد لله نیعمەتێكە لەنیعمەتەكانی خوای گەورە، ئەو نیعمەتەش كە لەسەری سوپاسی خوای گەورەی كردووە ئەویش هەر نیعمەتێكە لەنیعمەتەكانی، هەندێ نیعمەت لەیەكتر گەورەترو گرنگترن، نیعمەتی سوپاسگوزاریی گرنگتر و بایەخدارترە لەنیعمەتی ماڵ و منداڵ و ناوبانگیی و هاوسەرو شتەكانی تر، خواش زاناترە.

ئەمە ئەوە ناگەیەنێ كاری بەندە لەكاری خوای گەورە باشتربێ، ئەگەرچی كاری بەندە بەرانبەر سوپاسكردنی خوای گەورە باشتربێ لەكاری خوا، ئەوە كاری بەندەش هەر یەكێكە لەكارەكانی خوای گەورە، گومان لەوەشدا نییە هەندێ لەكارەكانی لەیەكتر باشترن.

هەندێ ئەهلی زانست وتوویانە: هەندێ لەو نیعمەتەی كە خوای گەورە لەدونیادا لێمانی وەرگرتووەتەوە ، باشترە لەو نیعمەتانەی تر كە لەدونیادا پێی داوین، ئەوەش لەبەر ئەوەی خوای گەورە دونیای بۆ پەیامبەرەكەی نەویستووە ، منیش یەكێك بم لەوانەی كە بۆ پەیامبەرەكەی پێ رازیی بووەو حەزی پێ بووە بەلامەوە باشترە لەوەی یەكێك بم لەوانەی لێیان تووڕە بووەو كارەكانیان جێی رقی خوا بووە[1].

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١١٢) ئیخراجی كردووە.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا باسیکردووە: لەهەندێ زاناوە پێمگەیشتووە وتوویانە: پێویستە زانا سوپاسی خوا بکات لەسەر هەر شەهوەت و ئارەزوویەکی دونیایی کە لێ وەرگرتووەتەوە، هەروەك چۆن لەسەر بەخششەکانی سوپاسی دەکات.

لەئیبن ئەبی ئەلحەوارییەوە باسکراوە وتوویەتی: فوزەیلی کوڕی عەیازو سوفیانی کوڕی عویەینە شەوێکیان تاوەکو بەیانیی دانیشتن و یادی نیعمەتەکانی خوای گەورەیان دەکرد، سوفیان ئەیووت: خوای گەورە لەفلان و فلانە شتدا نیعمەتی بەسەرماندا رژاندو لەفلانە شتدا وەهای بۆ کردین[1].

موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی ئەبی حاتەم بۆی باسکردین، عبداللەی کوڕی داوود بۆی باسکردین لەسوفیانەوە لەفەرمایشتی خوای گەورەدا: ﴿ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٢﴾ ﴾ الأعراف: ١٨٢، واتا: نزیکیان دەکەینەوە لە تیاچوون بەجۆرێك کە خۆشیان بەخۆیان نازانن.

وتی: (نیعمەتیان بەسەردا دەڕێژێ و سوپاسکردنیان لێ دەگرێتەوە)[2]. جگە لەسوفیانیش خەڵکانی تر وتوویانە: هەر تاوانێکیان ئەنجام دابێ تیعمەتێکیان پێ دراوە. لە(ثابت البناني)ەوە لەبارەی(استدراج)ەوە پرسیار کراوە، ئەویش وتوویەتی:پیلانی خوایە بەرانبەر بەندە فەوتاوەکان[3].

یونس لەتەفسیرەکەیدا وتوویەتی:ئەگەر بەندە لای خوای گەورە پێگەو مەقامێکی هەبوو، بەندەکە مەقامی خۆی پارێزگاریی کردو سوپاسی خوای کرد لەسەر بەخششەکانی، ئەوە خوای گەورە باشتر لەوەی پێ دەبەخشێ، بەڵام

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١١٤) ئیخراجی کردووە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١١٥) و ئەبو نەعیم لە الحلية(٧/٧)ئیخراجیان کردووە.

[3] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١١٦) ئیخراجی کردووە، راویی نەشارەزایی هەبووە لەبارەی (ثابت البناني)ەوە.

گـەر سوپاسـی خـوای گـەورەی نـەکردو لەدەستیچـوو، ئـەوە بەنزیکبوونـەوە لەتیاچوون دادەنرێت.

ئەبو حازم ئەڵێ: ئـەو نیعمەتـەی خـوای گـەورە لـەدونیادا لەدەستی بـردووم بەلامەوە گەورەترە لەو نیعمەتەی پێی داوم، چونکە بینیوومـە ئـەو نیعمەتانـەی بەهەندێ کەس داوەو لەنێوچوون، بێگومان هەر نیعمەتێك مرۆڤ لە خـوای گـەورە نزیك نەکاتەوە بـەلاو نەهامەتییـە، کـە بینیـت خـوای گـەورە نیعمـەتت بەسـەردا دەڕژێنێ و تۆش سەرپێچیی خوای گەورە دەکەی، ئەوە وریای خوای گەورە بە.

کاتب اللیث باسـیکردووە لەهقلـەوە ئـەویش لەئەوزاعییـەوە[1] کـە ئامۆژگـاریی کـردوون و ئـەڵێ: ئـەی خەڵکینـە بـەم نیعمەتـەی کـە تیایـدان خۆتـان لـەئاگری سـووتێنەری دۆزەخ بپارێزن،بڕواننـە ئەوانـەی پـێش ئێـوە کـە لـەئێوە تەمـەنی زۆرترو جەستەی درێژترو شوێنەواری زۆرتریان هەبوو، لەچیایان دەبڕی و بـەردو تـاوێری چـیاکانیان دەهێنـاو تـەلارو کۆڵەکـەی گـەورەیان دروسـت دەکـردو چـیاکانیان هەڵـدەکۆڵی و هێـزو بازوویشـیان هـەبوو، وا ماوەیـان پێچـرایەوەو شـوێنەواریان نـەماو خانووەکانیـان کـاول و تـەخت بـوون، ناویـان نـەما، کـەس هەستیان پێ ناکات و هیچیان لەبارەوە نابیستن، لەکاتێکدا وەختی خـۆی ئـارام لەماڵەکانیاندا رایاندەبووارد.

---

[1] - عەبدولڕەحمانی کوڕی عەمری کوڕی یەحمودی ئەوزاعی، ئەبو عەمر(ساڵی٨٨ك لـەدایکبووەو ١٥٧ی ك مردووە) پێشەوای وڵاتی شام بووە لەفیقه و دونیا نەویستییدا.

ئێوه ئەوه ئەزانن کە سزای خوا دابەزیە شوێن و خاکیانەوه و لەماڵەکانیاندا ڕەق و بێ گیان بوون، ئەوانی تر ڕوانیانە شوێنەکانیان وا نیعمەت و خۆشییەکانیان نەماوەو ماڵەکانیان بووەتە کاوله، لەوەدا بەڵگەو نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی لەسزای سەخت دەترسن و پەندە بۆ کەسێك سڵ بکاتەوەو بترسێ، ئێوە لەدوای ئەوان تەمەنێکی کەم و کورتتان هەیە، دونیاش وەردەگێردرێتەوە، لەزەمەنێکدان پێشتر شوێنەواری نەمانی دەرکەوتووە، ئەوەی لێی ماوەتەوە خۆڵەمێش و تەپووتۆزو ناخۆشی و سزاو هاتنی فیتنەو بەدوای یەکداهاتنی بوومەلەرزەو ئومێدی پڕوپووچ ماوەتەوە، بەوان خراپە لەوشکانی و دەریادا سەریهەڵداو دەرکەوت، بۆیە مەبنە هاوشێوەی ئەوانەی ئومێدو خەونی تەمەن درێژیی لەخشتەی بردن، داوا لەخوای گەورە دەکەم ئێمەو ئێوە وشیار بکاتەوە لەئاگادارکردنەوەی خۆی و هۆشمان بەبەردا بهێنێ و خۆمانی بۆ ئامادە بکەین[1].

ئەوترا: سوپاسگوزاریی واتا وازهێنان لەتاوان[2].

ئیبن موبارەك ئەڵێ: سوفیان وتی: ئەو کەسە شەرعناس و تێگەیشتوو نییە، بەلاو ناخۆشیی بەنیعمەت و خۆشی و خۆشگوزەرانییش بەبەلاو ناخۆشیی نەژمێرێت[3].

---

[1] - لاوازە، بڕوانە(الشکر٣٠)ی ئیبن ئەبی ئەلدونیا، کاتب اللیثی تێدایە ئەزبەردەکردنی خراپ بووە.

[2] - پێشتر تەخریج کرا.

[3] - پێشتر تەخریج کرا.

مەروانی کوڕی ئەلحەکەم کە باسی ئیسلام بکرایە دەیووت: بەنیعمەتی خوای گەورە بەئیسلام گەیشتم نەك بەدەست و ویستی خۆم، چونکە من هەڵە کار بووم[1].

| | |
|---|---|
| وكم من مدخل لو مت فيه | لكنت فيــه نكــالا في العشيرة |
| وقيت السوء والمكروه فيه | وظفرت بنـعمــة منــه كبـيرة |
| وكـم مـــن نعمة لله تمسى | وتصبح في العيان وفي السريرة |

واتا: زۆرێك شوێن و کات هەبوو گەر تێیدا بمردبمایە لەعەشیرەت و هۆزدا مایەی شەرمەزاریی ئەبووم، بەڵام لەخراپە پارێزراو مامەوەو لەخواوە نیعمەتێکی گەورەم دەستخست، ئای بەچەندە نیعمەتی ئاشکراو شاراوە ئێوارەو بەیانییمان کردووەتەوە.

لەسەر گومانێك بانگی عوسمانی کوڕی عەفان کرا بۆ سەر کۆمەڵێك، عوسمان دەرچوو بۆ دەستگیرکردنیان، پێش ئەوەی پێیان بگات بڵاوەیان لێکردبوو، بۆیە وەك سوپاسێك بۆ خوای گەورە کۆیلەیەکی ئازاد کرد،وەك سوپاسێك کە لەسەر دەستی ئەو موسڵمانێك شەرمەزارو ریسوا نەبووە[2].

یەزیدی کوڕی هارون ئەڵێ: ئەصبەغی کوڕی یەزید بۆی باسکردین، نوح(سەلامی خوای لەسەربێ) کە لەئاودەست کردن دەردەچوو ئەیووت:

---

[1] – لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٢١)ئیخراجی کردووە.

[2] – لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٢٤) و ئەبو نەعیم لە الحلية ئیخراجیان کردووە،بەکری کوڕی ئەبی مەریەمی تێدایە کەسێکی لاوازە.

سوپاس بۆ خوای گەورە کە چێژی خواردنەکەی پێ بەخشیم و سوودەکەی لەجەستەمدا هێشتەوەو ئازارەکەشی لێم دوورخستەوە[1].

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: ئەلعەباسی کوڕی جەعفەر بۆی باسکردین، شاذی کوڕی فەیاز بۆی باسکردین، ئەویش لەئەلحارثی کوڕی سیبلەوە وتی: ئوم ئەلنوعمان بۆی باسکردین: کە عائیشە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)ەوە بۆی گێڕاوەتەوە: هەرکاتێ لەئاودەستکردن دەرچووبێ ئەوەی وتووە[2].

پیاوێك بە ئەبو حازمی وت: ئەی ئەبا حازم سوپاسگوزاریی هەردوو چاو چییە؟ وتی: کە چاکەت پێ بینی باسی بکەیت و کە خراپەشت بینی بیشارێتەوەو نەیدرکێنی. وتی: ئەی سوپاسگوزاریی هەردوو گوێ چییە؟ کە چاکەت پێیان بیست سوودی لێ بکەیت و کە خراپەشت بیست بەرپەرچی خراپەکە بدەرەوەو وەری مەگرە. وتی: ئەی سوپاسگوزاریی هەردوو دەست چییە؟ وتی: شتێکیان پێ هەڵمەگرە هی تۆ نەبێ و پێیانەوە رێگریی مافی خوا مەکە. وتی: ئەی سوپاسگوزاریی سك چییە؟ وتی: ئەوەیە خوارەوەی خۆراك بێ و سەرەوەشی زانست. وتی: ئەی سوپاسگوزاریی داوێن چییە؟ وتی: خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ۝٦ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ۝٧ ﴾ المؤمنون: ٥ – ٧، واتا: ئەوانەی کە پارێزەری داوێنیانن(لە شەڕواڵ پیسی)ی. مەگەر بۆ خێزانی خۆیان یا بۆ کەنیزەکێك کە بوو بن بە

[1] - بەیهەقیی لە الشُعب(٤١٥٥) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٢٨)ئیخراجیان کردووە.

[2] - بەیهەقیی لە الشُعب(٤١٥٤) و ئەلخەرائیطی لە(فضيلة الشكر٢١) ئیخراجیان کردووە.

خاوەنیان ئەوە بەڕاستی ئەوانە سەرزەنشت ناکرێن. ئینجا هەر کەسێ نیازی جگە لە لەو(دوو جۆرە ئافرەتە)بکات(و ئارەزووی تێر بکات) ئەوسا دەست درێژی کەرن.

وتی: ئەی سوپاسگوزاریی هەردوو قاچ چییە؟ وتی:ئەگەر شتێکی چاکت بینی ئەوە هەردوو قاچت لەئەنجامدانیدا بۆی بەکاربهێنە، گەر زانیت خراپەو خوا پێی خۆش نییە، قاچەکانت جڵەو بکەی و هەنگاویان پێ هەڵنەگری.

هەرکەسێ بەزمانی سوپاسگوزاریێ و بەتەواوی ئەندامەکانی جەستەی سوپاسگوزاریی نەکات، وەك کابرایەکە پۆشاکێکی هەبێ و تەنیا چمکێکی گرتبێ و نەیکردبێتە بەری، ئەوەش لەگەرماو سەرماو تەرزەو بەفرو باران نایپارێزێ و سوودی پێ ناگەیەنێ[1].

عبداللەی کوڕی موبارەك باسدەکات کە نەجاشیی رۆژێك دەنێرێ بەدوای جەعفەرو هاوەڵەکانیدا، ئەوانیش لەماڵی خۆیدا دێنەلای و ئەبینن بەرگێکی شڕی بەسەرەوەیە و لەسەر خۆڵ دانیشتووە، جەعفەر ئەڵێ: کە بەو حاڵەوە بینیمان بەزەییمان پێدا هاتەوە، کە ئەوەی بەدەمووچاومانەوە بینیی وتی: موژدەیەکتان پێ دەدەم پێی خۆشحاڵ بن، لەخاکی ئێوەوە سیخوڕێکم هەواڵی بۆ هێناوم کە خوای گەورە پەیامبەری خۆی سەرخستووەو دوژمنی خۆی بەدۆڕان داوە، فلاّن و فلاّنی دیلکردووەو فلاّن و فلاّنیشی کوشتووە، لەدۆڵێکدا بەیەك گەیشتوون پێی دەوترێ بەدرو درەختی ئەراکی زۆرە، من ئێستا وەك ئەوەی سەیری ئەو شوێنە بکەم وایە، وەختی خۆی بۆ گەورەیەکم لەوێدا

[1] - لاوازە، ئەبو نەعیم لە الحلیة(٣/ ٣٤٢) ئیخراجی کردووە، گێڕەرەوە لەبارەی ئیبن حازمەوە نەشارەزایی هەبووە.

شوانێتییم کردووە پیاوێك بوو لەنەوەی زەمرە، جەعفەریش پێی ئەڵێ: ئەی بۆ لەسەر خۆڵ دانیشتوویت و هیچت لەژێردا نییەو ئەم بەرگە شڕەش چییە بەسەرتەوە؟! ئەویش وتی: لەو کتێبەی بەسەر عیسا(سەلامی خوای لەسەربێ)دابەزیووە هاتووە: گەر خوای گەورە نیعمەتی خۆی بەسەر بەندەکانیدا رژاند، پێویستە بەندەکانیش سادەیی و خاکەرایی خۆیان پیشانی خوای گەورە بدەن، کە خوای گەورە ئەو نیعمەتی سەرکەوتنەی بەپەیامبەری خۆی دا، منیش ئەم خاکەراییەم بۆ خوای گەورە نواند[1].

حەبیبی کوڕی عوبەید ئەڵێ: خوای گەورە هەر بەندەیەکی بەناخۆشییەك تاقیکردەوە، ئیللا نیعمەتێکی تێدایە بۆ بەندەکە[2].

عەبدولمەلیکی کوڕی ئیسحاق ئەڵێ: هەموو مرۆڤێك تاقیدەکرێتەوە بەسەلامەتی و لەشساغییەك تاوەکو بزانرێ چەندە سوپاسگوزارەو بەناخۆشییەکیش تاوەکو بزانرێ چەندە ئارامگرە[3].

سوفیانی سەوریی وتوویەتی:بەزۆر پاڕانەوەی بەندە لەپێویستییەکیدا، خوای گەورە نیعمەتی بەو بەندەیە داوە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)کە هەواڵێکی دڵخۆشکەری بۆ بهاتبایە، یەکسەر دەچووە کڕنۆش بردن وەك سوپاسگوزارییەك بۆ خوای گەورە[4]، ئەحمەد باسیکردووە.

---

[1] - بەیهەقیی لە دلائل النبوة(٣/ ١٣٤) ئیخراجی کردووە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٣١)ئیخراجی کردووە.

[3] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٣٢) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٥/ ٨٥)ئیخراجیان کردووە.

[4] - حسن لغیره، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٣٤)ئیخراجی کردووە، لەڕشتەی گێڕانەوەدا کەسانی نەناسراو هەیە.

عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەرچوو بۆ لامان و روویکردە سەدەقەکەی و هاتە ژوورەوەو روویکردە قیبلە،ئینجا چووە کڕنۆش، کڕنۆشەکەی درێژەی کێشا، منیش وتم: ئەی پەیامبەری خوا کڕنۆشێکی درێژت برد وامزانی خوای گەورە گیانی کێشاوی و کۆچی دواییت کردووە، ئەویش فەرمووی:«إِنَّ جِبْرِيلَ أَتَانِي فَبَشَّرَنِي أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ لَكَ: مَنْ صَلَّى عليك صليت عليه، ومن سلم عليك سلمت عليه، فسجدت لله عز وجل شكرا»[1]،واتا: جیبریل هات بۆلام و موژدەی پێدام کە خوای گەورە پێت دەفەرمووێ: هەر کەسێ یەك سڵاوت لەسەر بدات منیش سڵاواتی لەسەر دەدەم، بۆیە منیش لەسوپاسی خوادا چوومە کڕنۆش)). ئەحمەد باسیکردووە.

لەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم)لەمەککەوە دەرچووین بەنیازی رۆیشتنە مەدینە، نزیکبووین لەعەزوەرەوە، دابەزی و پاشان دەستی بەرزکردەوەو ماوەیەك لەخوا پاڕایەوە پاشان چووە کڕنۆش و زۆری پێچوو، پاشان هەستایەوەو ماوەیەك دەستی بەرزکردەوە، پاشان چووە کڕنۆش و زۆری پێچوو، پاشان هەستایەوە و ماوەیەك پاڕایەوە، پاشان چووە کڕنۆش و ماوەیەکی زۆری پێچوو، سێجار ئەمەی ئەنجام داو فەرمووی:"إِنِّي سَأَلْتُ رَبِّي وَشَفَعْتُ لأُمَّتِي فَأَعْطَانِي ثُلُثَ أُمَّتِي فَخَرَرْتُ سَاجِدًا شُكْرًا لِرَبِّي ثُمَّ رَفَعْتُ رَأْسِي فَسَأَلْتُ رَبِّي لأُمَّتِي فَأَعْطَانِي الثُّلُثَ أُمَّتِي فَخَرَرْتُ سَاجِدًا لِرَبِّي شُكْرًا ثُمَّ رَفَعْتُ

[1] - حسن لغيره،ئەحمەد(١/ ١٩١) و حاكم(١/ ٥٥٠) و ئيبن ئەبی ئەلدونيا لە الشكر(١٣٨)ئيخراجيان كردووە، عەبدولواحيدی كوڕی موحەممەدی تێدايە نەناسراوە.

رَأْسِي فَسَأَلت رَبِّي لأمتي فَأَعْطَانِي الث الآخَرَ فَخَرَرْتُ سَاجِدًا لِرَبِّي "،واتا: لەخوای گەورەم داواکرد و تکام بۆ ئوممەتەکەم کرد، خوای گورە یەك لەسەر سێی ئوممەتەکەمی پێدام رزگاربن لەدۆزەخ، منیش وەك سوپاسێك بۆ پەروەردگارم چوومە کڕنۆش، پاشان سەرم بەرزکردەوەو تکام کرد یەك لەسەر سێی ئوممەتەکەمی پێدام و لەدۆزەخ رزگاریکردن، منیش وەك سوپاسێك بۆ پەروەردگارم چوومە کڕنۆش، پاشان سەرم بەرزکردەوەو پاڕامەوە، خوای گەورە سێیەکەکەی تریشی پێدام، بۆیە لەسوپاسی پەروەردگارمدا چوومە کڕنۆش. ئەبو داوود گێڕاویەتییەوە[1].

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق باسیکردووە لەکتێبی(الفتوح)داو ئەڵێ: کە لەرۆژی بەدردا موژدەدەر هات بەوەی ئەبو جەهل کوژراوە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)سێجار بە(الله)سوێندی دا(بالله الذي لا إله إلا هو)ئەبو جەهلم بینیی کوژراوە، موژدەدەرەکە سوێندی خوارد، ئینجا پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)لەسوپاسی خوای گەورەدا چووە کڕنۆش[2].

سەعیدی کوڕی مەنسور ئەڵێ: ئەبو بەکری سدیق(خوای لێ رازیی بێ)چووە کڕنۆش، کاتێك هەواڵی کوژرانی موسەیلەمەی پێگەیشت[3].

ئەحمەد باسیکردووە: عەلیی(خوای لێ رازیی بێ) چووە کڕنۆش کاتێك "ذو الثدیة "ەی خەواریجی بینی[1].

---

[1] - لاوازە، ئەبو داوود(٢٧٧٥) و بەیهەقیی(٢/ ٣٧٠) ئیخراجیان کردووە.

[2] - لاوازە، بەیهەقیی لە دلائل النبوة(٣/ ٨٩) لەئیسحاقەوە ئیخراجی کردووە بە(معضل)ی،هەواڵی کوژرانی ئەبو جەهل لەبوخاری(٣٩٦٢) و موسلیم(١٨٠٠)دا هەیە بەبێ باسی چوونە کڕنۆش.

[3] - لاوازە، ئیبن ئەبی شەیبە لە(مصنف)ەکەیدا(١٢/ ٢٩٥) و بەیهەقیی لە(٢/ ٣١٧)دا ئیخراجیان کردووە، پیاوێکی تێدایە نەناسێنراوە.

کەعبی کوڕی مالیك لەسەردەمی پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم)چووە کڕنۆش، کاتێك موژدەی پێ درا کە خوای گەورە تەوبەکەی قبوڵکردووە[2]، ئەو چیرۆکە لە صەحیحەیندا هەیە[3].

ئەگەر بووترێ: ئازونیعمەتی خوا هەمیشەو بەردەوامە بۆ بەندە، بۆ دەکرێ هەندێ نیعمەتی دروست بوو سوپاسی لەسەر بکرێ و بۆ هەمیشەییەکان ئەوە نەکرێ، لەکاتێکدا نیعمەتە بەردەوامەکان گەورەترن؟

وەڵام: وەڵامی ئەمە لەچەند ڕوویەکەوەیە:

**یەکەم:** نیعمەتی نوێکراو بە بەردەوام ناودەبردرێ، مرۆڤیش بەبەخشینی کەمترین شتێك ڕاسپێردراوە.

**دووەم:** ئەم نیعمەتە نوێیە پەرستشێکی نوێی پێویستە، جا ئاسانترینی پەرستشێك بەلای مرۆڤ و خۆشەویسترین شتێك بەلای خوای گەورەوە کڕنۆشی سوپاسگوزارییە.

**سێیەم:** نیعمەتی نوێ لەدڵ و دەرووندا جێگەی هەیە، دڵ پێوەی پەیوەستە، بەدەسکەوتنی خۆشحاڵ و بەلەدەستدانیشی خەمبارە.

**چوارەم:** نیعمەتی نوێ خۆشحاڵیی دەخوازێ، زۆرجار بەخراپەو لەخۆباییبوون و لەڕێ دەرچوون پاداشتی ئەو نیعمەتە دەدرێتەوە، بۆیە کڕنۆشبردن بۆ خوای گەورە زەلیلی و پەرستش و ملکەچکردنە بۆ خوای گەورە،

---

[1] - لاوازە، ئەحمەد(١/ ١٠٧- ١٠٨)ئیخراجی کردووە،(طارق بن شامة)ەی تێدایە نەناسراوە.

[2] - صەحیحە، ئیبن ماجە(١٣٩٣) و عەبدولڕەزاق لە المصنف(٩٥٦١)دا ئیخراجیان کردووە.

[3] - بڕوانە بوخاری(٤٤١٨) و موسلیم(٢٧٦٩).

جا گەر بەندە بەخۆشحاڵییەکی ڕەواو شەرعییەوە بەدەم ئەو نیعمەتەوە ڕۆیشت، ئەوە شیاوەو جێی خۆیەتی ئەو نیعمەتە بەردەوام بێ، بەڵام گەر خۆشییەکی ناڕەوای بۆ کردو بەخراپەو لادان وەڵامی ئەو نیعمەتەی دایەوە وەك ئەوەی نەفام و نەزانەکان لەبری پاداشتدانەوەی خوا خراپ بەدەم نیعمەتەکانەوە دەچن، ئەوە نیعمەتێکە خێرا لەنێودەچێ و دەبێتە بەڵاو نەهامەتی و نەریتێك وردە وردە بەسزای خوای گەورەیان دەگەیەنێ. پێشتر باسی نەجاشییمان کرد، گەر خوای گەورە نیعمەتێکی بۆ بەندەیەکی هێنایە بوون، حەز دەکات بەندەکەی سادەیی بنووێنێ[1].

عەلائی کوڕی موغیرە وتوویەتی: مـوژدەی مردنی حەجاجم بەئەلحەسەن دا کە خۆی حەشاردابوو، بۆ خوای گەورە چووە کڕنۆش[2].

---

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

[2] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٣٧) و ئەبو نەعیم لە الحلية(٢/ ١٩٥)ئیخراجیان کردووە، عەلیی کوڕی یەزیدی تێدایە کەسێکی لاوازە.

# بەش

یەکێك لەوردترین نیعمەتەکانی خوای گەورە بەسەر بەندەوە، ئەوەیە بەندە دەرگا لەسەر خۆی دابخات، خوای گەورە کەسێکی بنێرێتەلا و لەدەرگا بدات داوای خواردنێکی لێ بکات، ئەوەش تەنیا بۆ ئەوەی ئەو نیعمەتەی پێ بناسێنێ کە خوای گەورە پێی داوە.

سەلامی کوڕی ئەبی موتیع ئەڵێ: چوومە سەردانی نەخۆشێك ئازاری هەبوو ئای ئەکرد، منیش پێموت: ئەوانە بەبیری خۆتدا بهێنە کە فڕێدراونەتە سەر جادەکان، ئەوانەی کە شوێنێکیان نییەو کەسێکیان نییە خزمەتیان بکات. ئەڵێ: دواتر چوومە لای و گوێم لێبوو بەخۆی دەوت: ئەوانە بەبیری خۆتدا بهێنەرەوە کە فڕێدراونەتە سەر جادەکان و ئەوانەی شوێنێکیان نییە و کەسێکیان نییە خزمەتیان بکات[1].

عبداللەی کوڕی ئەبی نوح ئەڵێ: لەیەکێك لەکەناراوەکان پیاوێك پێیووتم: چەندە مامەڵەت لەگەڵ خوای گەورەدا کردووە بەجۆرێك حەزی پێ نەبێ و ئەویش مامەڵەی کردووی بەو جۆرەی حەزی پێ بکەی؟ وتم: ئەوەندە زۆرە نەژمێردرێ. وتی: ئایە لەهیچ ناخۆشی و تەنگییەکدا هەبووە رووی لێ بنێی و شەرمەزاری کربی؟ وتم: نە سوێند بەخوا، بەڵکو بەباشترین شێوە باشەی لەگەڵمدا کردووەو هاوکاریی کردووم. وتی: داوای هیچ شتێکت کردووە پێتی نەدابێ؟ وتم: ئایە داوای شتێکم کردووە پێی نەدابم؟ داوای هەرچییەکم کردبێ

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٤٠) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٦/ ١٨٩)ئیخراجیان کردووە، لەڕشتەی گێڕانەوەدا پچڕان هەیە.

پێی داوم، داوای هاوکارییم لێ کردبێ هاوکاریی کردووم. وتی: ئەی گەر هەندێ مرۆڤ ئاوەهایان لەگەڵتدا بکردبایە چۆن پاداشتی ئەوانت دەدایەوە؟ وتم: نەمدەتوانی پاداشتیان بدەمەوە. وتی: دەی پەروەردگارت مافدارترە بەوەی دەروونتی بۆ ملکەچ بکەی و فێری بکەی سوپاسی خوای گەورە بکات، لەکۆن و نوێدا هەر ئەو بووە چاکەی لەگەڵ تۆدا کردووەو ئەیکات، سوێند بەخوا سوپاسکردنی خوای گەورە ئاسانترە لەپاداشتدانەوەی بەندەکانی، خوای گەورە بەسوپاس و ستایشکردن لەبەندەکانی رازیی ئەبێ[1].

سوفیانی سەوریی ئەڵێ: خوای گەورە لەدونیادا نیعمەتێکی بە هیچ بەندەیەکی نەداوە تاوەکو لەئاخیرەتدا شەرمەزاری بکات، ئەو کەسەی نیعمەتەکەی داوە دەبێ نیعمەتی خۆی بەتەواوەتیی بدات[2].

ئیبن ئەبی ئەلحەواریی ئەڵێ: بە ئەبی موعاویەم وت: یەکتاناسینی خوای گەورە(تەوحید)چی نیعمەتێکی گەورەیە بۆ ئێمە، داوام لەخوای گەورەیە لێمانی وەرنەگرێتەوە. وتی: نیعمەت بەخش دەبێ نیعمەتی خۆی بەتەواوەتیی بداتە نیعمەت پێ بەخشراو، خوای گەورە لەوە بەخشندەترە و نیعمەتی خۆی بەتەواوەتیی دەبەخشێ.

ئیبن ئەبی ئەلحەواریی ئەڵێ: ئافرەتێك پێی وتم: لەماڵی خۆمدا دڵم بەشتێك سەرقاڵ بووە. وتم: ئەو شتە چییە؟ وتی: ئەمەوێ لەیەك چاو تروکاندا نیعمەتی خوا بەسەرمەوە ببینم، یان کەمتەرخەمیی خۆم بزانم بۆ لەیەك چاوتروکاندا

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٤١) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٦/٧)ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٤٢) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٦/٧)ئیخراجیان کردووە.

نیعمەتەکانی خوا نابینم. وتم: شتێکت دەوێ کە عەقڵی ئێمەش ڕێی پێ نابات و نایدۆزێتەوە[1].

ئیبن زەید ئەڵێ: لەمەجلیسێکدا یەك پیاو هەبێ سوپاسی خوا بکات، پێویستییەکانی تەواوی مەجلیسەکە جێبەجێ دەبێت[2]. ئەڵێ: لەهەندێ کتێبی ئاسمانییدا هاتووە: خوای گەورە ئەفەرمووێ: بەندە باوەڕدارەکەم خۆشحاڵ بکەن، جا هەر خۆشییەك ڕوو لەو بەندەیە دەکات ئەڵێ: الحمد لله ما شاء الله. ئەفەرمووێ: بەندە باوەڕدارەکەم بترسێنن، هەر شتێکی ناخۆشی بەسەردا دێت بەندەکە ئەڵێ: الحمد لله، الحمد لله. خوای گەورەش فەرمووی: بەندەکەم چۆن کاتێ خۆشحاڵم کرد سوپاسی کردم، کە خستمە ترس و ناخۆشییشەوە هەر سوپاسی کردم،بەندەکەم بخەنە ماڵی شکۆی خۆمەوە هەروەك لەهەموو حاڵەکانیدا سوپاسم دەکات[3].

وەهب ئەڵێ: بەندەیەك پەنجا ساڵ خواپەرستیی کرد، خوای گەورە وەحیی بۆ کرد: من لێت خۆش بووم، خواناسەکە وتی: ئەی پەروەردگارا لەسەرچی لە من خۆشدەبێ لەکاتێکدا من تاوانێکم نەکردووە؟ خوای گەورە وەهای لێکرد خوێنبەرێکی ملی بکەوێتە ئازارەوە، ئەوەندە ئازاری هەبوو نەیتوانی بخەوێ و نوێژ بکات، پاشان ئارامی کردەوەو خەوت، لەخەودا فریشتەیەك هاتەلای و گازندەی لای کردو وتی: ئازارێکی ناخۆشی هەبوو، فریشتەکەش وتی:

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٤٥) ئیخراجی کردووە، لەڕشتەی گێڕانەوەدا پچڕان هەیە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٤٦) ئیخراجی کردووە.

[3] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٤٧) و بەیهەقیی لە الشعب(٤١٧٤)ئیخراجیان کردووە، عەبدولرەحمانی کوڕی زەیدی تێدایە کەسێکی مەتروکە.

پەروەردگارت دەفەرمووێت: پەرستشی پەنجا ساڵت یەکسان و بەرانبەرە بەو ئارامبوونەوەی دەماری ملت[1].

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: داوود وتی: پەروەردگارا هەواڵم پێ بدە ئایە کەمترین نیعمەتی تۆ بەسەر منەوە کامەیە؟ خوای گەورەش وەحیی بۆ کرد:ئەی داوود هەناسەیەك هەڵمژە، داوود هەناسەیەکی هەڵمژی، فەرمووی: ئەوە کەمترین نیعمەتی منە بۆ تۆ[2].

## بەش

بەمە واتای ئەو فەرموودەیە روون دەبێتەوە کە ئەبو داوود گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەیەکی زەیدی کوڕی ثابت و ئیبن عەباسەوە:"ان الله لو عذب اهل سمواته واهل ارضه عذبه وهو غير ظالم لهم ولو رحمهم كانت رحمته خيرا لهم من أعمالهم "[3]،واتا: ئەگەر خوای گەورە خەڵکیی ئاسمان و زەوییەکەی سزا بدابانایە، ئەوە سزای دەدان و بۆ ئەوەش ستەمکار نەدەبوو بەرانبەرویان، گەر بەزەییشی پێیاندا بهاتبایەتەوە، ئەوە بەزەیی خوا بۆیان باشتر دەبوو لەکاروکردەوەی خۆیان.

ئەو فەرموودەیەش کە لەصەحیحدا هاتووە: "لن ينجي أحدا منكم عمله قالوا ولا أنت يا رسول الله قال ولا أنا الا أن يتغمدني الله برحمة منه وفضل فإن اعمال العبد لا توافي نعمة من نعم الله عليه"[4]،واتا: کارو کردەوەی خۆتان کەسی

---

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٤٨) و ئەبو نەعیم لە الحليه(٤/ ٦٨) ئیخراجیان کردووە: عبداللەی کوڕی صەفوانی تێدایە کەسێکی لاوازە.

[2] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٤٩) و بەیهەقیی لە الشعب(٤٣٠٣)ئیخراجیان کردووە.

[3] - صەحیحە، ئەبو داوود(٤٦٩٩) و ئیبن ماجە(٧٧) و ئەحمەد(٥/ ١٨٢)ئیخراجیان کردووە.

[4] - بوخاری(٦٤٦٣) و موسلیم(٢٨١٦)ئیخراجیان کردووە.

لەنێوەی رزگار نەدەکرد، وتیان: تۆیش ئەی پەیامبەری خوا؟ فەرمووی: تەنانەت منیش، تەنیا بەسۆزو فەزڵی خوا نەبێ. بێگومان کاروکردەوەی بەندە بەرانبەر نییە بەپاداشتدانەوەی نیعمەتێکی خوای گەورە.

هەرچی قسەی شەرعناسانە: هەرکەسێ سوێند بخوات کە بەباشترین جۆرەکانی سوپاس و ستایش، سوپاسی خوا بکات، دەبێ بەم جۆرە سوێندەکەی بەجێبگەیەنێ و بڵێ: "الحمد لله حمداً يوافي نعمه، ويكافئ مزيده"، واتا: سوپاسێك بۆ خوای گەورە شیاو بەنیعمەتەکان و بەرانبەر بەبەخشراوە زیادەکانی بێ. جا ئەمە فەرموودەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و قسەی هیچ هاوەڵێکیش نییە، باسێکی ئیسرائیلییە لەبارەی ئادەمەوە هاتووە. باشتر لەوە،ئەمەیە: " الحمد لله غير مكفي ولا مودع ولا مستغنى عنه ربنا"[1]،واتا: سوپاس بۆ خوای گەورە کە بەهیچ شتێك پاداشت نادرێتەوەو بێ ئەو نامانکرێ. سوپاس و ستایشی بەندە بەرانبەر نییە بەنیعمەتێك لەنیعمەتەکانی خوای گەورە چی جای بەرانبەر بێ بەهەموو نیعمەتەکانی، سوپاس و ستایشی بەندە بەرانبەر نابێ بەنیعمەتە زۆرو زیادەکانی خوای گەورە، بەڵام بەو دەربڕینە ستایش دەکرێ کە خوای گەورە لەسوپاس و ستایشکردن شیاوی بێ گەرچی بەندە نەتوانێ بەرانبەریان بدات، هەروەك دەوترێ:((سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە پڕ بەئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لەنێوانیاندا هەیەو پڕ بەهەر شتێکی تر بتەوێ، بەئەندازەی ژمارەی بەردو چەو و خۆڵ و خاك و دڵۆپە ئاوەکان و

[1] - بوخاری(٥٤٥٨)ئیخراجی کردووە.

بەژمارەی هەناسەی مەخلوقات))، ئەمە لەبارەی ئەو سوپاس و ستایشەوەیە کە شیاوی خوای گەورەیە، ئەوە نییە بەندە بتوانێ دانە بەدانە فەزڵی نیعمەتی خوا بداتەوەو دانە بەدانە سوپاس و ستایشی بکات.

## بەش

ئەبو ئەلمەلیح ئەڵێ: موسا وتی: ئەی پەروەردگار: باشترین سوپاسکردن(شکر)ێ چییە؟ فەرمووی: ئەوەیە لەهەموو حاڵێکدا سوپاسم بکەی[1].

بەکری کوڕی عبدالله ئەڵێ: بەبرایەکی خۆمم وت: ئامۆژگاریم بکە. ئەویش وتی: نازانم چی ئەڵێم، تەنیا ئەوە نەبێ کە دەبێ بەندە لەسوپاس و داوای لێخۆشبوون بێزار نەبێ و رانەکات، چونکە هەر نەوەیەکی ئادەم لەنێوان نیعمەت و تاوانێکدایە، نیعمەتەکە بەسوپاس و ستایشکردنی خوای گەورە چاك و رێکدێت و تاوانەکەش بەتەوبەو استغفر الله کردن چارە دەبێ،بۆیە چۆنت ویست زانستم فراوان و زۆر بکە.

عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبی رەواد ئەڵێ: لەدەستی موحەممەدی کوڕی واسیع تلۆقێکم بینی، بەدەموچاومەوە هەستی کرد بەتلۆقەکە تێکچوومە، بۆیە پێی وتم: ئەزانی لەم تلۆقەدا خوای گەورە چی منەت و نیعمەتێکی پێ داوم کە لەچاومدا دروستی نەکرد، لەسەر زمانم دەرنەکەوت و لەداوێنمدا نەبوو، بەوە تلۆقەکەی لامان ئاسایی بوویەوە[2].

---

[1] - زۆر لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٥١) ئیخراجی کردووە، عبادی کوڕی موسای تێدایە نەناسراوە، عوبەیدوڵڵەی کوڕی حەمیدیش مەتروکە.

[2] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٥٢) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٢/ ٣٥٢) ئیخراجیان کردووە، یەحیای کوڕی سەلیمی تێدایە کەسێکی لاوازە.

ئەلجەریریی لە ئەبی ئەلوەردەوە گێڕاویەتییەوە ئەویش لە ئەللجلاجەوە ئەویش لەموعازی کوڕی جەبەلەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)هاتەلای پیاوێك ئەیووت: خوایە گیان داوای تەواوترین نیعمەتت لێ دەکەم، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی: ئەی نەوەی ئادەم دەزانیی تەواوترین نیعمەت(تمامُ النعمة)چییە؟ وتی: ئەی پەیامبەری خوا دوعایەکم کردووەو ئومێدی خێرم پێی هەیە. پەیامبەریش فەرمووی:" ان تمام النعمة فوز من النار ودخول في الجنة"[1]،واتا: تەواوترین نیعمەت رزگاربوون لەدۆزەخ و چوونە بەهەشتە.

تەمیمی کوڕی سەلەمە ئەڵێ: بۆم باسکرا گەر کەسێك لەسەرەتای نانخواردندا بسم اللەی کردو لەتەواوبوونیشیدا الحمد للەی کرد، ئەوە لەبارەی نیعمەتی ئەو خواردنەوە پرسیاری لێ ناکرێت[2].

بەڵگەیەکی تری فەزڵی سوپاسگوزاریی لەسەر ئارامگری، ئەوەیە کە خوای گەورە حەز دەکات داوای عافییەتی لێ بکرێ،شتێکی تری زیاتر لەعافێت(سەلامەتی)خۆش نەویستووە، هەروەك لەموسنەددا هاتووە لەئەبی ساڵحەوە ئەویش لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: ئەبو بەکر لەسەر مینبەر هەڵسایە سەرپێ و پاشان وتی: داوای عافێت(سەلامەتی)لەخوا بکەن، لەدوای یەقین شتێکی تری بەبەندە نەداوە لەعافێت باشتربێ[3].

---

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٥٦): ئەبو ئەلوەردی کوڕی ثامەتی تێدایە نەناسراوە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٥٩)ئیخراجی کردووە.

[3] - صەحیحە، ئیبن ماجە(٣٨٤٩) و ئەحمەد(١/ ٣) و بوخاری لە الأدب المفرد(٧٢٤) و نەسائی لە السنن الکبری(٦/ ٢٢٠)ئیخراجیان کردووە.

لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە:" إن الناس لم يُعطَوا في هذه الدنيا شيئاً أفضل من العفو والعافية فسلوهما الله عز وجل"[1]،واتا: هیچ شتێك بەخەڵكی نەبەخشراوە لەلێبووردن و عافیێت باشتربێ، داوای ئەو دوو شتە لەخوای گەورە بکەن.

بەعەباسی مامیشی فەرموو:" يا عَمّ أكثرْ من الدعاء بالعافية"[2]،واتا: مامە گیان لەخوای گەورە زۆر دوعای عافیێت بکە. لەترمیزییدا هاتووە: وتم: ئەی پەیامبەری خوا فێری شتێکم بکە تاوەکو لەخوای گەورە بۆی بپاڕێمەوە، فەرمووی:" سَلِ اللهَ العافية": واتا: داوای عافیێت(سەلامەتی)لەخوا بکە، چەند ڕۆژێکی پێچوو پاشان هاتمەلای و وتم: شتێکم فێر بکە لەخوای گەورە داوای بکەم؟ پێی فەرمووم:" يا عباسُ يا عمَّ رسول الله، سَلِ اللهَ العافية في الدنيا والآخرة"[3]،واتا: ئەی عەباس ئەی مامی پەیامبەری خوا داوای عافیێت بکە لەخوای گەورە بۆ دونیاو ئاخیرەتت.

لەڕۆژی تائیفیشدا فەرمووی:"إنْ لم يكنْ بك عليَّ غضبٌ فلا أُبالي، ولكن عافيتك أوسع لي"[4]،واتا: ئەگەر تۆ لە من تووڕە نەبی ئەوە من هیچ خەمێکم نییە، بەڵام عافیێتی تۆ بۆ من زۆرو فراوان و دەوڵەمەندییە.

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٥٤) و نەسائیی لە السنن الكبرى(٦/ ٢٢١)ئیخراجیان کردووە.

[2] - حسن، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٥٣) و تەبەرانیی لە المعجم الكبير(١١/ ٢٦١) و حاکم(١/ ٥٢٩) ئیخراجیان کردووە.

[3] - صحيح لغيره، ترمیزی(٣٥١٤) و ئەحمەد(١/ ٢٠٩) و بوخاری لە الأدب المفرد(٧٢٦)ئیخراجیان کردووە.

[4] - پێشتر تەخریج کرا.

پەنای بردە بەر عافێتی خوا، هەروەك لەفەرموودەیەكی تریشدا پەنای پێ بردووەو ئەفەرمووێ: "اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَأَعُوذُ بِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ"[1]، واتا: خوایە گیان پەنا بەرازیبوونت دەگرم بەرانبەر تووڕەییت، بەرانبەر سزات پەنا بەعافێت و بەخشینی خۆت دەگرم، پەنا بەخۆت دەگرم لەبەرانبەر خۆت.

لەفەرموودەیەكی تردا هاتووە: "سلوا الله العفو والعافیة والمعافاة"[2]، واتا: لەخوای گەورە داوای لێبووردن و عافێت و بەخشین بكەن، ئەم پاڕانەوەیە ئەوە لەخۆ دەگرێ، لەخوای گەورە دەپاڕێینەوە لەتاوانی رابردوومان خۆش بێ و لێخۆشبوون و عافێت بۆ ئێستاو سەلامەتی و بەخشین(معافاة)بۆ داهاتوو تاوەكو عافێت و سەلامەتییەكە هەمیشە و بەردەوام بێ.

عبداللەی ئەلتەمیمیی ئەیووت: زۆر داوای سەلامەتی(عافێت)لەخوای گەورە بكەن، ئەو كەسەی لەناخۆشییدایە گەر ناخۆشی و بەڵایەكەی سەختتیش بێ شیاوترو شایستەتر نییە لەدوعاكردن بۆ عافێت و سەلامەتیی كە لەبەڵا رزگاربوونی نییە، ئەوانەی ئەمڕۆ لەناخۆشییدان دوێنێ سەلامەت و عافێتداربوون، ئەوانەی بەیانیی ئەكەونە تەنگانەو ناخۆشییەوە ئەمڕۆ لەخۆشی و سەلامەتییدان، ئەگەر بەڵاو ناخۆشیی خێری تێدا هەبووایە ئەوە ئێمە بەڵادار نەدەبووین، رەنگە بەڵاو ناخۆشیی وا هەبێ بۆ دونیا تاقەت پڕوكێن و شەرمەزاریی ئاخیرەتیشی بەدواوە بێ، كێ هەیە دڵنیابێ لەوەی گەر لەسەر سەرپێچی كردنی فەرمانی خوا بمێنێتەوە ئەو تەمەنەی ماوێتی لەدونیادا ماندووی ناكات و ئاخیرەتیش ریسوای ناكات، پاشان ئەیووت: سوپاس بۆ ئەو

[1] - موسلیم(٤٨٦) ئیخراجی كردووە لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ).

[2] - حسن، ترمیزی(٣٥٥٨) و ئەحمەد(١/ ٣)ئیخراجیان كردووە.

خوایەی گەر بمانەوێ نیعمەتەکانی بژمێرین ناتوانین و نیعمەتی ئەو لەژمارە نایەت و شەو و ڕۆژ لەسەر کارێك بمێنینەوە بۆ پاداشتدانەوەی،ئەوە پاداشتی نادەینەوە[1].

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)بەلای پیاوێکدا تێپەڕی، پیاوەکە داوای ئارامگرتنی لەخوای گەورە دەکرد، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:" لقد سألت البلاء فاسأل العافية"[2]، واتا: تۆ داوای بەلاو ناخۆشییت کرد، بەڵکو داوای سەلامەتیی(عافێت)بکە. لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە[3]:پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)سەردانی پیاوێکی نەخۆشی کرد وەك جووجەڵە دەلەرزی، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)فەرمووت: بەهیچ شتێك لەخوای گەورە پاڕاویتەوە؟ وتی: بەڵێ، ئەمووت: خوایە گیان گەر لەقیامەتتدا سزام دەدەی، ئەوە سزاکەیم بۆ بخەرە دونیا. پەیامبەریش(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:" سبحانه لا تطيقه ولا تستطيعه أفلا قلت اللهم ربنا آتنا في الدنيا حسنة وفي الاخرة حسنة وقنا عذاب النار؟!"،واتا: پاك و بێگەردیی بۆ خوای گەورە وا بەرگەو توانای ناگری، ئەی بۆ نەتووت: خوایە گیان لەدونیادا باشمان پێ بدەو لەئاخیرەتیش باشمان پێ بدەو لەدۆزەخ بمانپارێزە؟! لەخوای گەورە بۆی پاڕایەوەو خوای گەورەش شیفای دا.

لەترمیزییدا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەدا(خوای لێ ڕازیی بێ)ئەڵێ: پاڕانەوەیەك لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)وەرمگرتووە هەمیشە ئەیڵێمەوە:"اللهم اجعلني أعظم شكرك وأكثر ذكرك وأتبع نصيحتك

---

[1] -ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٥٧)ئیخراجی کردووە.

[2] - پێشتر تەخریج کرا.

[3] - موسلیم(٢٦٨٨) ئیخراجی کردووە لەئەنەسەوە(خوای لێ ڕازیی بێ).

وأحفظ وصيتك"[1]،واتا: خوایه گیان وەهام لێبکه سوپاس و ستایشی تۆ مەزن رابگرم و زۆر یادت بکەم و شوێن ئامۆژگارییت بکەوم و راسپاردەکانت بپارێزم.

شەیبان ئەڵێ: ئەلحەسەن که لە مەجلیسێکدا دابنیشتبایه ئەیووت: خوایه گیان سوپاس بۆ تۆ که ئیسلامت پێ بەخشین، سوپاس بۆ تۆ که قورئانت پێ بەخشین، سوپاس و ستایش بۆ تۆ لەسەر بوونی کەسوکارو سەروەت و سامان، رزق و رۆزییت بۆ ئێمه زۆرو فراوان کرد و ئارامییت پێ بەخشین و لەشساغ و سەلامەتت کردین، لەهەرشتێك داوامان کردبێ پێت بەخشین، بەئەندازەی نیعمەتەکانت سوپاس و ستایش بۆ تۆ، خێرو بێرێکی زۆرت بەخشیووه و نەهامەتی و ناخۆشیی زۆرت لەسەر لابردووین، سوپاس و ستایش بۆ تۆی هەمیشه زیندووی بەردەوام[2].

هەندێ لەپێشین ئەیانووت: خوایه گیان هەموو نیعمەت و عافێت و شکۆی ئاین و دونیامان تاوەکو ئێستا لەنێوماندا ماوەتەوەو فەزڵی خۆتە بەسەرمانەوه، تەنیا بەهێزو توانای تۆ بوونیان هەیەو هیچ هاوبەشێکت نییە، بەوه سوپاس و فەزڵ و منەتت بەسەرمانەوه هەیە، بەئەندازەی نیعمەتەکانت بەسەر ئێمەو تەواوی مەخلوقاتی خۆتەوه فەزڵ و منەتت هەیە لا إله إلا أنت[3].

پێشەوا ئەحمەد باسیکردووه: خوای گەورە وەحیی بۆ موسای کوڕی عیمران کرد(سەلامی خوای لەسەربێ):((ئەی موسا وریاو بەئاگابە بەرانبەر هاوڕێکانت،

[1] - لاوازە، ئەحمەد(٢/ ٣١١ و ٤٧٧) و تەیالسی له موسنەدەکەیدا(٢٥٥٣)ئیخراجیان کردووه: ئەلفەرەجی کوڕی فوزالەی تێدایه کەسێکی لاوازە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا له الشکر(١٦١)ئیخراجی کردووه.

[3] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا له الشکر(١٦٠)ئیخراجی کردووه.

هەر هاوڕێیەکت بۆ خۆشی و رازیکردنی من نەهاتە لات هاوڕێیەتیی مەکە، ئەوە دوژمنی تۆیە، دڵت رەق دەکات، بۆیە زۆر یادی من بکە تاوەکو سوپاسگوزاریی دەستدەخەیت و نیعمەتی زیاتر تەواو دەکەی))[1].

ئەلحەسەن ئەڵێ: کاتێ خوای گەورە ئادەمی دروستکرد، لەلای راستی پشتی بەهەشتییەکانی دەرکردو لەلای چەپیشی دۆزەخییەکان، بەسەر رووی زەویدا رۆیشتن، هەندێکیان نابیناو لاڵ بوون، ئادەم وتی: پەروەردگار بۆ نەوەکانمت وەك یەك لێ نەکردو یەکسان بن؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئادەم ئەمەوێ سوپاس بکرێم[2].

لەسوونەندا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)ەوە فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ اللَّهُمَّ مَا أَصْبَحَ بِي مِنْ نِعْمَةٍ أَوْ بِأَحَدٍ مِنْ خَلْقِكَ فَمِنْكَ وَحْدَكَ لَا شَرِيكَ لَكَ، لَكَ الْحَمْدُ، وَلَكَ الشُّكْرُ أَدَّى الشُّكْرَ ذَلِكَ الْيَوْمَ»[3]،واتا: هەرکەسێك بەیانیی کردەوە یان ئێوارەی کردەوەو وتی:«اللَّهُمَّ مَا أَصْبَحَ بِي مِنْ نِعْمَةٍ أَوْ بِأَحَدٍ مِنْ خَلْقِكَ فَمِنْكَ وَحْدَكَ لَا شَرِيكَ لَكَ، لَكَ الْحَمْدُ، وَلَكَ الشُّكْرُ»،ئەوە سوپاسگوزاریی شەوی بەجێگەیاندووە.

لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)ەوە دەگێڕدرێتەوە فەرموویەتی:«مَنِ ابْتُلِيَ فَصَبَرَ، وَأُعْطِيَ فَشَكَرَ، وَظَلَمَ فَاسْتَغْفَرَ، وَظُلِمَ فَغَفَرَ،أُولَئِكَ

---

[1] - صەحیحە، ئەحمەد لە الزهد(لا١٠٨) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٨/ ٢٢٢)ئیخراجیان کردووە.

[2] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٦٥) و بەیهەقیی لە الشعب(٤١٢٧)ئیخراجیان کردووە: حەکەمی کوڕی سینانی تێدایە لاوازە.

[3] - لاوازە، ئەبو داوود(٥٠٧٣) و نەسائیی لەالسنن الکبری(٦/ ٥) و ئیبن حیبان(٢٣٦١موارد)دەریانهێناوە.

لَهُمُ الأَمْنُ، وَهُمْ مُهْتَدُونَ»[1]،واتا: هەرکەسێ بەناخۆشییەك تاقیکرایەوە ئارامی گرت، پێی بەخشرا سوپاسگوزاربوو، ستەمی لێکرا لێبووردەو لێخۆشبووبوو، ستەمی کردو داوای لێخۆشبوونی کرد، ئا ئەوانە ئارامی و سەلامەتییان بۆ هەیەو ڕێنیشاندەرکراون.

هەر لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)ەوە دەگێردرێتەوە کە: ئامۆژگاریی پیاوێکی کردووەو فەرموویەتی:" أكثرْ من ذِكْر الموت يشغلك عما سواه وعليك بالدعاء فإنك لا تدري متى يستجاب لك وعليك بالشكر فإن الشكرَ زيادةٌ"[2]،واتا: زۆر یادی مردن بکە لەسەرقاڵبوون بەشتی ترەوە بەدوورت دەگرێ، بپاڕێرەوە چونکە نازانی چی کاتێك پاڕانەوەکەت گیرا دەبێ، سوپاسگوزاریش بە، چونکە سوپاسگوزاریی نیعمەتت بۆ زیاتر دەکات.

هەر لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە چێشتی خواردووە فەرموویەتی: "الحمد لله الذي أطعمني وسقاني وهداني وكل بلاء حسن أبلاني الحمد لله الرازق ذي القوة المتين اللهم لا تنزع منا صالحا أعطيتنا ولا صالحا رزقتنا واجعلنا لك من الشاكرين"[3]، واتا: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خواردن و خواردنەوەی رزق داوم و هیدایەتی دام و بەتاقیکردنەوەی باش تاقیکردمەوە، سوپاس بۆ خوای خاوەن ڕۆزی و هێزی قایم و بەهێز، خوایە گیان هەرچی چاکەیەکت پێمان بەخشیووە لێمانی وەرمەگرەوە و بمانگێڕە بەیەکێك لەسوپاسگوزاران.

---

[1] - زۆر لاوازە، تەبەرانیی لە المعجم الكبير(٦٦١٤) و بەیهەقیی لە شعب الإيمان(٤١١٧)ئیخراجیان کردووە.

[2] - زۆر لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٦٨) و ئەبو نەعیم لە الحلية(٧/ ٣٠٥)ئیخراجیان کردووە.

[3] - مەوزوعە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٧٠)ئیخراجی کردووە، خالیدی کوڕی مەحدوج ئەبو روحی تێدایە بەدرۆزن تۆمەتبار بووە.

هەر لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)دەگێڕدرێتەوە کە خواردنی خواردووە فەرموویەتی:"الحمد لله الذي أطعم وسقى وسوَّغه وجعل له مَخْرجاً"[1]،واتا: سوپاس بۆ خوای گەورە کە خواردن و خواردنەوەی پێداین و تێریکردین و لەسکماندا هەرسی کردو رێڕەوی دەرچوونیشی بۆ کردووەتەوە.

عوورەی کوڕی زوبەیر کە خواردن بهێنرابایە رووپۆشی سەر خواردنەکەی لا نەدەبرد تا ئەم وشانەی نەوتبایە: "الحمد لله الذي هدانا وأطعمنا وسقانا ونعمنا الله أكبر اللهم ألفتنا نعمتك ونحن بكل شر فأصبحنا وأمسينا بخير نسألك تمامها وشكرها لا خير إلا خيرك ولا إله غيرك اله الصالحين ورب العالمين الحمد لله لا اله الا الله ما شاء الله لا قوة الا بالله اللهم بارك لنا فيما رزقتنا وقنا عذاب النار"[2].

وەهبی کوڕی مونبیە ئەڵێ: گەورەی نیعمەتەکان سێ شتە: یەك نیعمەتی ئیسلام کە هەموو نیعمەتەکان بەوەوە کامڵ ئەبێ. دووەم: نیعمەتی عافێت(سەلامەتی)کە ژیان تەنیا بەوەوە خۆشە. نیعمەتی دەوڵەمەندی، کە بژێوی و گوزەرانیی بەوەوە خۆش و رێکدێت[3].

سەعیدی ئەلجەریریی لەحەجەوە هاتەوە ئەیووت: خوای گەورە لەم سەفەرەماندا فلاّن و فلاّنە نیعمەتی پێ بەخشین، پاشان وتی: نیعمەت ژماردن بەشێکە لەسوپاسگوزاری[4].

---

[1] - صەحیحە، ئەبو داوود(٣٨٥١) و نەسائیی لە السنن الكبرى(٤/ ٢٠١) و ئیبن حیبان(٥٢٢٠)ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٦٩)ئیخراجی کردووە.

[3] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٧٢) و ئەبو نەعیم لە الحلية(٤/ ٦٨)ئیخراجیان کردووەو گێڕەرەوە لەبارەی وەهبی کوڕی مونبیهەوە نەشارەزا بووە.

[4] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٧٣) و ئەبو نەعیم لە الحلية(٦/ ٢٠٠)ئیخراجیان کردووە.

وەهب بەلای کەسێکی نابینای بەڵەکی گەڕی کەوتوویی رووتدا تێپەڕی، کابرا ئەیووت: سوپاس بۆ خوای گەورە لەسەر نیعمەتەکانی، کابرایەك لەگەڵ وەهب بوو وتی: چی نیعمەتێکت بۆ ماوەتەوە وا سوپاسی خوای لەسەر ئەکەی؟ کابرای مەینەتبار وتی: بەچاوت بڕوانە خەڵکی شارو زۆریی خەڵکەکەی، ئەی سوپاسی خوا نەکەم لەوەی کەسێکی تێدا نییە بەقەد من بیناسیٚ[1].

باسدەکرێ لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی:"اذا أنعم الله علی عبد نعمة فحمده عندها فقد أدی شکرها"[2]،واتا:گەر خوای گەورە نیعمەتێکی بەبەندەیەکی خۆی داو بەندەکە ئەوکات سوپاسی خوای کرد، ئەوە سوپاسگوزاریی خۆی بەجێهێناوە.

عەلیی کوڕی ئەبو تاڵیب(خوای لیٚ رازیی بیٚ)باسیکردووە: دانیال بۆ بەختەنەسر هێنرا، فەرمانی کرد لەچاڵێکدا گیری بدەن، دوو شێری برسییکردو تێی بەرداو وازی لێهێنا، دوای پێنج رۆژ هات و سەر چاڵەکەی لابردو تەماشای کرد دانیال بەپێوە راوەستاوە نوێژ ئەکات، دوو شێرەکەش لەلایەکی چاڵەکەوەن و روویان لیٚ وەرگێڕاوەو پەلاماری نادەن، پێیووت: کاتێك ئەم دوو شێرەی لێت دووردەخستەوە چیت دەوت؟ وتی: ئەمووت: سوپاس بۆ خوای گەورە ئەو کەسە لەبیر ناکات کە خوای لەبیر نەکردووە، سوپاس بۆ خوای گەورە کە تکاکارانی خۆی بیٚ ئومێد ناکات، سوپاس بۆ خوای گەورە کە هەر کەسێك پشتی بەو بەستبیٚ رادەستی کەسی تری نەکردووە، سوپاس بۆ خوای گەورە کە متمانەی رزگاربوونی پێداوین لەکاتێکدا هیچ چارەیەکی رزگاربوون نەماوە،

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٧٤) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٤/ ٦٨)ئیخراجیان کردووە.

[2] - زۆر لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٧٥)ئیخراجی کردووە.

سوپاس بۆ ئەو خوایەی تکای ئێمەیە لەکاتێکدا کە بەرانبەر کرداری خۆمان بەدگومانین، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە دوای ناخۆشییمان خەم و پەژارەمان لەسەر هەڵدەگرێ، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەچاکە وەڵامی چاکەمان دەداتەوە، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەرزگاربوون، پاداشتی ئارامگریی دەداتەوە))[1].

لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)باسدەکرێ کە هەرکات تەماشای ئاوێنەی بکردبایە دەیفەرموو: "الحمد لله الذي أحسن خَلقي وخُلقي وزان مني ما شان من غيري"[2]،واتا: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەباشترین شێوە دروستی کردووم و باشترین رەوشتی پێ داوم و بەجۆرێ لەوێنەو رەوشتدا رازاندومیەتییەوە کەسی تر بەو جۆرە نەبێ.

ئیبن سیرین[3] ئەڵێ: ئیبن عومەر زۆر تەماشای ئاوێنەی دەکرد، لەگەشتەکانیشدا لەگەڵیدا بوو، پێمووت: ئەمە بۆچی؟ وتی: تەماشای ئەوەی پێ دەکەم گەر لەرووەمەتی خۆمدا جوان بوو لای کەسی تر ناشیرین و بێ بایەخ بوو، ئەوە سوپاسی خوای لەسەر دەکەم[4].

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٧٦)ئیخراجی کردووە، تەڵحەی کوڕی زەیدی تێدایە تۆمەتبارە بەقسە هەڵبەستن.

[2] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٧٧) و بەیهەقیی لە الشُعب(٤١٤٥)دا ئیخراجیان کردووە: پچڕان و ئیرسالیشی تێدایە.

[3] - موحەممەدی کوڕی سیرینی بەسری، ئەنصاریی بەهۆی وەلائەوە، ئەبو بەکر(ساڵی ٣٣ك لەدایکبووەو ١١٠ك مردووە) پێشەوای کاتی خۆی بووە لەزانستەکانی ئاین لەبەسرەدا، تابیعیی و یەکێك بووە لەگەورەو نووسەرە بەرێزەکان.

[4] - زۆر لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٧٨)ئیخراجی کردووە، موحەممەدی کوڕی عەونی ئەلخۆراسانیی تێدایە کەسێکی پەراوێز خراوە(متروك).

پرسیار لەئەبو بەکری کوڕی ئەبی مەریەم کرا: تەواوی نیعمەت چییە؟ وتی: ئەوەیە پیاوێك پێیەکی لەسەر سیرات بێ و پێیەکەی تری لەبەهەشت[1].

بەکری کوڕی عبدالله ئەڵێ: ئەی نەوەی ئادەم، گەر ئەتەوێ ئەندازەی نیعمەتی خوا بزانی بەسەرتەوە، ئەوە چاوەکانت دابخە[2].

موقاتیل لەبارەی ئەم ئایەتەوە وتوویەتی:﴿ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ﴾ لقمان: ٢٠، نیعمەتی ئاشکرای خوا ئەوەیە ئایینی ئیسلامی بۆ هێناوین، نیعمەتە شاروەکانیشی حەیا نەبردنتانە بەهۆی تاوانەکانتانەوە[3].

ئیبن شەوزەب ئەڵێ: عبدالله- واتا: ئیبن مەسعود-(خوای لێ رازیی بێ) وتی: خوای گەورە منەتی بەسەر دۆزەخییەکانیشدا هەیە، گەر بیویستبایە بەسەختترین ئاگر سزای دەدان[4].

ئەبو سولەیمانی ئەلدارانیی ئەڵێ: ئەوانەی لەڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ خوای گەورەدا دادەنیشن، ئەم سیفەت و رەوشتانەیان تێدا هەیە: بەخشندەیی، سەخاوەتی، نەرموونیانی، سۆز، بەزەیی، سوپاسکردن، چاکەکاری، ئارامگری[5].

ئەبو هورەیرە(خوای لێ رزیی بێ)ئەڵێ: هەرکەسێ مەینەتبارو خاوەن بەلآیەکی بینی و وتی:((الحمد لله الذي عافاني مما ابتلاك به، وفضّلني عليك

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٨١)ئیخراجی کردووە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٨٢)ئیخراجی کردووە.

[3] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٨٣) و بەیهەقیی لە الشُعب(٤١٤٨)دا ئیخراجیان کردووە: روحی کوڕی عەبدولواحیدی ئەلحەڕانیی تێدایە ئەزبەردەکردنی باش نەبووە.

[4] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٨٤) و بەیهەقیی لە الشُعب(٤٢٥٧)دا ئیخراجیان کردووە: موحەممەدی کوڕی موخەلیدی ئەلحەڕانیی تێدایە نەناسراوە.

[5] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٨٦) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٩/ ٢٢٦)ئیخراجیان کردووە.

وعلى جميع خلقه تفضيلاً)) ئەوە سوپاسی ئەو نیعمەتەی بەجێهێناوە. عبداللهی کوڕی وەهب ئەڵێ: گوێم لە عەبدولڕەحمانی کوڕی زەید بوو ئەیووت:سوپاسکردن(الشُکر) رەگ و ریشەی ستایش(حمد)ی گرتووە و ئەڵێ:ئەڕوانێتە نیعمەتی خوا لەجەستەو بیستن و بینین و هەردوو دەست و هەردوو قاچی و شتانی تری و لەهەموو شتێکیدا نیعمەتی خوای گەورە دەبینێ، مافە بەسەر بەندەوە مافی گوێڕایەڵیی خوا بدات لەسەر ئەو نیعمەتانە، هەروەها نیعمەتێکی تری لەڕزق و رۆزییەکەیدایە، دەبێ لەوەشدا مافی خواپەرستی و گوێڕایەڵیی خوا بدات، هەرکەسێ بەو جۆرەی کرد، ئەوە دەستی بەڕەگ و ریشەو لقەکانی سوپاسەوە(الشُکر) گرتووە[1].

کەعب ئەڵێ: هەر بەندەیەك لەدونیادا خوای گەورە نیعمەتێکی پێ داو بۆ ئەو نیعمەتە سوپاسی خوای کردو بەرانبەر خوای گەورە خاکەرایی نواند، ئەوە خوای گەورە لەدونیادا ئەو نیعمەتەی بۆ بەسوود دەکات و بۆ ئاخیرەتیش پلەیەك پێی بەرزی دەکاتەوە. گەر هەر بەندەیەکیش خوای گەورە نیعمەتێکی پێ داو سوپاسی خوای نەکردو پێیەوە سادەو خاکەرا نەبوو، ئەوە خوای گەورە لەسوودی دونیای بێ بەش دەکات و چین گەلێکی ئاگری دۆزەخی بۆ دەکاتەوە تاوەکو سزای بدات گەر خۆی بیەوێ، یان بیەوێ لێی دەبووری[2].

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٨٨)ئیخراجی کردووە.

[2] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(١٨٩) و ئەبو نەعیم لە الحلية(٦/ ٤٣)دا ئیخراجیان کردووە، ئەبو ئەلوەرد ئەمامەی تێدایە: کەسێکی لاوازەو عەمری کوڕی مرداسیش نەناسراوە.

ئەلحەسەن ئـەڵێ: هەرکەسـێ نیعمـەتی خـوا تـەنیا لـەخواردن و خواردنـەوەو بـەرگ و پۆشـاکیدا ببینـێ، ئـەوە زانسـتی کورتهاتووەتـەوەو سـزای بـۆ خـۆی ئامادەکردووە[1].

ئەلحەسەن رۆژێك بەبـەکری ئـەلموزەنیی ئـەڵێ: ئـەی ئـەبا عبداللـه دەی بـۆ براکانت بپارێرەرەوە، ئەویش سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو سەڵاواتی بەسەر پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)دا داو پاشان وتی: والله نازانم کام لـەو دوو نیعمەتە بۆ من و ئێوەش گەورەترن: نیعمەتی شوێنی چوونە ژوورەوەی خواردن و خواردنەوە یان نیعمەتی شوێنی دەرچوونی پاشەڕۆ؟ ئەلحەسـەن ئـەڵێ: ئـەوە نیعمەتی خواردنە[2].

عائیشە(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: هەر بەندەیـەك ئـاوێکی پووخـت بخواتـەوە بەبێ ئازارو بەبێ ئازاریش لەجەستەی دەربچـێ، دەبـێ سوپاسـی خـوای لەسـەر بکات[3].

ئەلحەسـەن ئـەڵێ: ئـەوە چـی نیعمەتێکـە هـەموو چـێژێك دەچـێتە ژوورەوەو بەئاسـانیی دەچـێتە دەرەوە، بێگومـان پادشـایەك لەپادشـاکانی ئـەو شـوێن و ئاوایيە خزمەتکارێکی خـۆی دەبینـێ دەچـێتە دەشـتایی و چـاڵاوێك و ئـاوی لـێ

---

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٩٠) ئیخراجی کردووە: رجاء صاحب السقط: کەسێکی لاوازە.

[2] – لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٩١) و بەیهەقیی لە الشُعب(٤١٥٨)ئیخراجیان کـردووە: هیشـامی کوڕی سەلمانی تێدایە قسەی لەسەر هەیە.

[3] - زۆر لاوازە، ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا لـە الشـکر(١٩٢)ئیخراجـی کـردووە: عـەمری کـوڕی واقیـدی تێدایـە پەراوێزخراوە(متروك) و شەهری کوڕی حەوشەبیش کەسێکی لاوازە.

هەڵدەکێشێ و ئەخواتەوە،پادشاش ئەڵێ: خۆزگە وەك تۆ دەبووم کە تینووت دەبوو ئەوجار ئاوت دەخواردەوە، کە ئاویشی دەخواردەوە رەنگە بۆت مردنی کتوپڕ بێ، ئای ئەوە چی نازو نیعمەتێکە[1].

زانایەك بۆ برایەکی دەنووسێ: پاشان، ئێمە لەنازونیعمەتێکی نەژمێردراوداین لەکاتێکدا تاوانی زۆریشمان هەیە، نازانین لەسەر کامەیان سوپاسگوزاربین: لەسەر نیعمەتەکانی کە خۆشحاڵمان ئەکات یان لەسەر ئەو کارو کردەوە ناشیرینانەی ئێمە دەیکەین و خوای گەورە بۆی داپۆشیوین[2].

بە ئەلحەسەن وترا: ئا لێرەدا پیاوێك هەیە لەگەڵ خەڵکدا دانانیشێ، ئەویش دێتەلای و بۆ ئەوە پرسیاری لێ دەکات، کابرا ئەڵێ: من لەنێوان تاوان و نیعمەتێکدا ئێوارەو بەیانیی ئەکەمەوە، بۆیە بەباشمزانی خۆم بەخەڵکەوە سەرقاڵ نەکەم، داوای لێخۆشبوون لەخوا بکەم لەسەر تاوانەکانم و سوپاسی بکەم لەسەر نیعمەتەکانی، ئەلحەسەن ئەڵێ: ئەی بەندەی خوا تۆ لای من لە ئەلحەسەن شارەزاتری، بەم کارەی خۆتەوە بمێنەرەوە[3].

ئیبن موبارەك ئەڵێ: گوێم لەعەلیی کوڕی سالح بوو لەبارەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەوە: ﴿ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾ إبراهيم: ٧، واتا: لەگوێڕایەڵیی و خواپەرستیتان بۆ زیاتر دەکەم گەر سوپاسگوزاربن[4]،

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٩٤)ئیخراجی کردووە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٩٤)ئیخراجی کردووە.

[3] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٢١٩٦) ئیخراجی کردووە: موحەممەدی کوڕی یەزیدی کوڕی خنیسی تێدایە کەسێکی لاوازە.

[4] - ئیبن موبارەك لە الزهد(٣٢٠) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٩٨) ئیخراجیان کردووە.

دروست و سەلماو: زیاتر کردنی نیعمەتە، گوێڕایەڵیکردنی خواش لەبەر ئەو نیعمەتەیە.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا باسدەکات کە موحاریبی کوڕی دیثار شەوان شەونوێژی دەکردو هەندێجار دەنگی بەرزدەکردەوەو ئەیووت: من ئەو بچووکە بووم کە تۆ منت پێگەیاند کەواتا سوپاس و ستایش بۆ تۆ، ئەو لاوازە بووم کە منت بەهێزکرد کەواتا سوپاس و ستایش بۆ تۆ، ئەو هەژار بووم کە دەوڵەمەندت کردم کەواتا سوپاس و ستایش بۆ تۆ، ئەو رەشو رووتە بووم کە هاوکارم بووی و منت داپۆشی کەواتا سوپاس و ستایش بۆ تۆ، ئەو سەڵتە بووم کە خێزاندارمت کرد کەواتا سوپاس و ستایش بۆ تۆ، ئەو برسییە بووم کە منت تێرکرد کەواتا سوپاس و ستایش بۆ تۆ، ئەو رێبوار بووم کە لەگەڵمدا بووی کەواتا سوپاس و ستایش بۆ تۆ، ئەو نادیارە بووم کە منت دیارخست کەواتا سوپاس و ستایش بۆ تۆ، ئەو نەخۆشە بووم کە شیفات دا کەواتا سوپاس و ستایش بۆ تۆ، ئەو داواکارە بووم کە بەدەم داواکەمەوە هاتی کەواتا سوپاس و ستایش بۆ تۆ، خوایە گیان سوپاس و ستایشی زۆر بۆ تۆ[1].

وتاربێژێ لەوتارەکەیدا ئەیووت: خوای گەورە لەپێشەوە لووتی بۆت دروستکرد چەماوەو ناشیرین بوو، رێك و جوانی بۆ کردیتەوە، پاشان لەنێو پێڵویەکی جوان و پرژانگی داخراودا چاوی بۆ دانای، لەچینێکەوە بۆ چینێك تۆی گواستەوە، دڵی دایك و باوکی بەرانبەرت نەرم و ناسك و بەسۆز کرد، بۆیە نیعمەتی خوا بەسەرتەوە سێبەری کردووەو دەستەکانیشی چوار دەوری داوی و دەتپارێزێ.

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(١٩٩) و بەیهەقیی لە الشعب(٤٢٧٦).

هەندێ زانا لەبارەی ئەم ئایەتەوە وتوویانە:﴿ وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ ﴾ إبراهيم: ٣٤، پاك و بێگەردیی بۆ خوای گەورە کە زانستی کەمی پێداوین بۆ ناسین و دەرككردنی نعمەتەكانی، لەبری ئەوە سوپاسكردنی داناوەو بەئیمانی ژماردووەو زانیوێتی بەندەكان توانای زیاتریان نییە[1].

لەعبداللەی كوڕی موبارەكەوە ئەڵێ: موسەنای كوڕی ئەلسەباح بۆی باسكردین لەعەمری كوڕی شوعەیبەوە ئەویش لەباوكییەوە ئەویش لەباپیرییەوە ئەڵێ: گوێم لەپەیامبەری خوا بوو(صلى الله عليه وسلم)ئەیفەرموو:" خصلتان من كانتا فيه كتبه الله صابراً شاكراً ومن لم يكونا فيه لم يكتبه الله صابراً شاكرًا من نظر في دينه إلى من هو فوقه فاقتدى به ومن نظر في دنياه إلى من هو دونه فحمد الله على ما فضله به عليه كتبه الله صابراً شاكراً ومن نظر في دينه إلى من هو دونه ونظر في دنياه إلى من هو فوقه فأسف على ما فاته منه لم يكتبه الله صابراً شاكراً"[2]،واتا: دوو سیفەت و ڕەوشت هەیە لەهەر بەندەیەكدا هەبن خوای گەورە بەئارامگری سوپاسگوزار ناوی دەنووسێ، لەهەركەسێكدا نەبن بەئارامگری سوپاسگوزار ناوی نانووسێت: هەركەسێ لەئاییندا بڕوانێتە كەسی سەرووی خۆی و بۆ كاروباری دونیای بڕوانێتە كەسی خوارووی خۆی و لەسەر فەزڵەكانی خوا سوپاسی خوا بكات، ئەوە خوای گەورەش بەئارامگری سوپاسگوزار ناوی دەنووسێت. هەركەسێكیش لەئاییندا بڕوانێتە كەسی خوار خۆی و لەدونیادا بڕوانێتە كەسی سەرووی خۆی و خەفەتبار بێ بەوەی لەدەستی چووە، ئەوە خوای گەورە بەئارامگری سوپاسگوزار ناوی نانووسێت.

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٢٠٢) و بەیهەقیی لە الشعب(٤٣٠٤).

[2] - لاوازە، ترمیزی(٢٥١٢) و ئیبن ئەلسنی لە عمل اليوم والليلة(٣١٠) و ئیبن ئەلموبارەك لە الزهد(١٨٠).

بەم رشتەی گێڕانەوەیە لەعبداللەی کوڕی عومەرەوە کە مەوقوفە بەسەر خۆیەوە: چوار رەوشت و سیفەت هەیە لەهەرکەسێکدا هەبن خوای گەورە لەبەهەشتدا خانوویەکی بۆ دروست دەکات: هەرکەسێ کۆڵەکەی ژیانی لا إلە إلا الله بێ، کە کۆست و مەینەتییەکی تووشهات بڵێ: إنا لله وإنا إليه راجعون، کە شتێکی پێ بەخشرا بڵێ: الحمد لله، کە تاوانێکیشی کرد بڵێ: استغفر الله[1].

ئیبن موبارەك ئەڵێ: لەشیبلەوە ئەویش لەئەبی نەجیح ئەویش لەموجاهیدەوە کە لەبارەی فەرمایشتی خوای گەورەوە:﴿ إِنَّهُۥ كَانَ عَبۡدٗا شَكُورٗا ۝٣ ﴾ الإسراء: ٣ وتوویەتی: نوح هەر کاتێك خواردنێکی خواردبێ سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردووە، هەر خواردنەوەیەکی خواردبێ ستایشی خوای کردووە، بەرێدا رۆیشتبێ سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردووە، لەهەرشتێکی دابێ(هەر پەلامارێکی دابێ) سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردووە، بۆیە خوای گەورە ستایشی کردووە بەوەی بەندەیەکی سوپاسگوزارە[2].

موحەممەدی کوڕی کەعب ئەڵێ: نوح کە خواردنێکی خواردبێ (الحمد لله)ی کردووە، کە خواردنەوەیەکی خواردبێ (الحمد لله)ی کردووە، کە سوار ولاخ بووبێ(الحمد لله)ی کردووە، ، بۆیە خوای گەورە ناوی لێناوە بەندەی سوپاسگوزار[3].

---

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٢٠٥) و ئیبن ئەلموبارەك لە الزهد(١٨٢)ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٢٠٦) و ئیبن ئەلموبارەك لە الزهد(٩٤١)ئیخراجیان کردووە.

[3] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشکر(٢٠٧) و ئیبن ئەلموبارەك لە الزهد(٩٤٠)ئیخراجیان کردووە.

ئـــیبن ئـــەبی ئەلـــدونیا ئـــەڵێ: لـــەبارەی دانایەکـــەوە پێمگەیشـــتووە وتوویەتی:گەرچی خوای گەورە لەسەر سەرپێچی کردنی لەدونیادا سـزای مرۆڤـی نەدا، دەبوو لەسەر سوپاسکردنی نیعمەتەکانی مرۆڤ تاوانی نەکردبایە[1].

خـوای گـەورە دوو جـۆر مـافی بەسـەر بەندەیـەوە هەیـەو دەسـتیان لـێ هەڵناگرێت:

**یەکـەم:** فـەرمان و نەهییـەکانی کـە پوختـەو تـەواوی مـافی خـوان بەسـەر بەندەوە.

**دووەم:** سوپاسکردنی ئـەو نیعمەتـەی کـە بـە بەنـدەی داوە، لەبەرانبـەر ئـەو نیعمەتـەدا خـوای گـەورە داوا دەکـات سـوپاس بکـرێ و فەرمانـەکانی جێبـەجێ بکرێ، بەنـدە هەمیشـە پێویسـتی بـەلێبووردن و لێخۆشـبوونی خوایـەو هەرچـی بکات بەرانبەر بە مافی خوای گەورە هەر کەمتەرخەمە، گەر بەوە کەمتەرخەمیی خۆی پـڕ نەکاتـەوە لەنێودەچێت، تـاوەکو بەنـدە لـەئایینی خـوادا شـارەزاتربێ ئەرکدارتر دەبێ و بەکەمتەرخەمییکردنیشی تاوانی گـەورەتر ئـەبێ، ئـایین تـەنیا دەستبەرداریکردنی حەرامە دیارەکان نییە، بـەڵکو دەبـێ ئـەو کارانـەش ئـەنجام بدرێن کە لای خوای گەورە خۆشەویسـتن و زۆربـەی ئاییـندارەکان حـەز دەکـەن تەنیابن لەوەدا.

هەرچـی جیهـادکردن و فـەرمانکردن بەچـاکەو رێگریکـردن لەخراپـەو دڵسـۆز بوونـە بـۆ خـواو پەیامبـەر و بەنـدەکانی خـوای گـەورە و سەرخسـتنی خـواو پەیامبەرو پەرتووکەکەی، واجیب و ئەرك گەلێکە پێی خەمبارو بێ تاقـەت نـابن، لەکاتێکدا خۆیـان دەیانـەوێ ئـەوە ئـەنجام بـدەن. کـەمترینی خـەڵکیی لـەڕووی

---

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الشكر(٢٠٨) ئیخراجی کردووەو پچڕان لەڕشتەی گێڕانەوەدا هەیە.

ئاینداری و جێی تووڕەیی خوای گەورە، کەسێکە دەستبەرداری ئەو واجیباتانە بێ گەرچی بەرانبەر هەموو شتێکی دونیا بێ نیازو دونیا نەویستیش بێ.

بەدەگمەن لەنمونەی ئەو کەسانە دەبینی بۆ خوا رووی سوور هەڵگەڕێ و لەبەزاندنی سنوورەکانی خوادا تووڕە ببێ و ناموس و ژیانی بخاتە خزمەت سەرخستنی ئایینی خواوە، ئەوانەی تاوانە گەورەکانیان هەیە لای خوای گەورە حاڵیان لەو جۆرە مرۆڤانە باشترە.

ئەبو عومەر و کەسانی تریش وتوویانە: خوای گەورە فەرمانی بەفریشتەیەك کرد ئاواییەك تەختی زەویی بکات، فریشتەکەش ئەڵێ: خوایە گیان خواپەرستێکی دونیانەویستیشیان لەنێواندا هەیە، خوای گەورە فەرمووی: بەڵکو لەوەوە دەستپێبکە، بهێڵە دەنگ و هاواری بگاتە لای من، ئەو بۆ رۆژێکیش لەبەر من رووی سوور هەڵنەگەڕاو تووڕە نەبوو[1].

ئەوانەی ئەو نیعمەتانەیان بینیووەو پێزانینیان هەیە، گەر کاری تەواوی جنۆکەو مرۆڤیش ئەنجام بدەن مافی نیعمەتەکانی خوا نادەنەوەو ئێمەش لەتەواوی نیعمەتەکانی خوا سوود دەبینین، بۆیە دەبێ بەندە هەمیشە چاوی لەسەر مافی خوا بێ بەسەرییەوە.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: حەجاج بۆی باسکردین، جریری کوڕی حازم بۆی باسکردین لەوەهبەوە وتی:پێمگەیشتووە کە موسای پەیامبەری خوا(سەلامی

[1] - لاوازە، تەبەرانیی لە المعجم الأوسط(٧٦٥٧) و بەیهەقیی لە الشعب(٧٥٩٥) ئیخراجیان کردووە:عوبەیدی کوڕی ئیسحاقی ئەلعەطاری تێدایە لاوازەو عەممار کوڕی سەیفیش پەراوێزخراوە(متروك).

خوای لەسەربێ)بەلای پیاوێکدا تێپەڕیی دەپاڕایەوەو لەخوا تکای دەکرد، موسا وتی: خوایە گیان بەزەییت پێیدا بێتەوە من وا بەزەییم پێدا هاتەوە، خوای گەورەش وەحیی بۆ کرد: گەر ئەوەندە بپاڕێتەوە تاوەکو هەناسەی لێ ببڕێت بەدەم داواکەیەوە ناچم تاوەکو نەڕوانێتە مافم بەسەرییەوە[1].

کەسێك نیعمەت ببینێ و پێزانین و بوونی ئەرك بەجێگەیاندن(واجیب)بزانێ، ئەوە هەر چاکەیەك ببینێ ناهێڵێ لەدەستی دەربچێ و هەمیشە سەرزەنشتی دەروونی خۆی دەکات، کاتێ لەو سۆزو بەزەییە نزیکدەبێتەوە کە مافی نیعمەت و واجیب(ئەرکی سەرشان)ی بەرانبەر بەخوا بەجێبگەیەنێ،خوای گەورەش پشت و پەنایە.

***

---

[1] - ئەحمەد لە الزهد(لا١١١)ئیخراجی کردووە.

## تەوەری بیست و یەك

## بڕیاردان لەنێوان هەردوولا و یەكلاكردنەوەی بابەتی نێوانیان

ئـەڵێین: هـەردوولا داوای كێشـاندن و ناسـینی بارسـەنگبوونی لایـەك بەسـەر ئـەوی تـردا دەكـەن، ئـەوەش كاتێـك دێتـەدی كـە هـەردوولا بناسـی، ئێمـەش حەقیقەتی ئارامگری و بەش و جۆرەكانییمان باسكرد،بۆیە ئێستاش حەقیقـەتی سوپاس(الشكر) و ماهییەتەكەی باس ئەكەین.

لەصیحاحدا هاتووە: الشكر: سوپاس و ستایشـكردنی چاكەكارە لـەبری ئـەو چاكەیەی كردوویەتی.

خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ ﴾ الإنسـان: ٩، رەنگە چاوگ(مصدر) بێ وەك(القعود)، رەنگـە كـۆ بـێ وەك(الـبرود) و (الكفـور)، الشُّـكران پێچـەوانەی(الكُفْـران) وتشـكرت لـە وەكـو (شـكرت لـە)ە، والشـكور لەئاژەڵاندا ئەو ئاژەڵانەن كە ئـالیكی كـەمیان پێویسـتە، واشـتكرت السـماء:واتـا بارانی سەختی داباراند،اشتكر الضرع:واتا: گوانی پڕ شیر بـوو. وشـكرت الشـجرة تشكر شكرا:واتا لەمدیوو ئەو دیووی درەختەكە لق و ریشكی تری لێ دروستبوو.

بڕوانە ئەو داڕێژانەو بەراورد بكە لـەنێوان ئـەو سوپاسكردنەی(شـكر) فـەرمان كراوە مرۆڤ ئەنجامی بدات و ئەو (شكر)ەی كە پاداشتی خوایە، دەبینی هەمووی واتای زیاترو گەش و نما دەدات، هەروەها دەوترێ: دابة شكور،واتـا: لەسـەرووی ئەو ئالیكەی پێی دراوە قەڵەویی و چەوریی دەرخستووە.

سوپاسـگوزاریی(شُـكْر)ی بەنـدە لەسـەر سـێ پایـە دەوەسـتێتەوەو بەكۆكردنەوەی هەرسێكی ئینجا بەندە دەبێتە سوپاسگوزار:

**یەکەم:** داننانی بەنیعمەتی خوای گەورە بەسەرییەوە. **دووەم:** ستایشکردنی خوا لەسەر ئەو نیعمەتە. **سێیەم:** بەکارهێنان و پشت پێ بەستنی لەڕەزامەندیی خوای گەورەدا.

هەرچی قسەی خەڵکە لەبارەی سوپاسەوە(الشکر)، ئەوە کۆمەڵێك وتوویانە[1]: داننانە بەنیعمەتی نیعمەت بەخشدا لەجۆرو شێوەی ملکەچکردندا. وتراوە: سوپاسکردن(الشکر): ستایشکردنی چاکەکارە بەباسکردنی چاکەکەی بۆی، بۆیە سوپاسکردنی بەندە: ستایشکردنێتی بەباسکردن و یادهێنانەوەی چاکەکانی. وتراوە: سوپاسکردنی نیعمەت: ئەوەیە خۆت بەمشەخۆریی ببینی،بەسەرخستنی ئەو خۆت سوپاسگوزار بینی، لەسەر سوپاس سوپاسی بکەی و بەردەوام لەسوپاسکردنیدا بی و خۆت بەشیاو و شایستەی ئەو نیعمەتە نەزانی کە خوا پێتی داوە.

وتراوە: سوپاسکردن(الشکر): وزە خاڵیکردنەوەیە لەگوێڕایەڵییدا. وتراوە: کەسی سوپاسگوزار(الشاکر): ئەو کەسەیە لەسەر شتی بوندار سوپاس دەکات. زۆر سوپاسکاریش(الشکور): کەسێك لەسەر شتە نەبوو ونبووەکانیش سوپاسگوزارە. وتراوە: الشاکر: کەسێکە لەسەر ئەو شتەی پێی دەدرێ سوپاسگوزارە، بەڵام الشکور کەسێکە لەسەر ئەو شتانەش سوپاسگوزارە کە چاکەو لێی وەردەگیردرێتەوە. وتراوە: الشاکر: کەسێکە لەسەر شتی بەسوود سوپاسگوزارە، بەڵام الشکور: کەسێکە لەسەر ئەو شتەی پێی نادرێ و لێی بەدووردەخرێ سوپاسگوزارە. وتراوە: الشاکر: کەسێکە لەپێ بەخشین سوپاسگوزارە، بەڵام الشکور: کەسێکە لەسەر بەڵاو ناخۆشیی سوپاسگوزارە.

---

[1] - ئەو پێناسانەی لەمەو دوا لەبارەی (الشکر)ەوە دەهێنرێنەوە، هەموویان وەرگیراوی کتێبی(الرسالة القشیریة)ەن ل١٧٤– ١٧٧.

جونەید ئەڵێ: لەبەردەستی ئەلسرپیدا(السَّري) یارییم دەکرد منداڵی حەوت ساڵان بووم، لەنێوانماندا کۆمەڵێك لەبارەی سوپاسکردنەوە(الشکر)ەوە قسەیان دەکرد، سرپی پێیوتم: ئەی هەرزەکار(غولام)شُکر(سوپاس) چییە: وتم: ئەوەیە بەنیعمەتی خوا سەرپێچیی فرمانی خوا نەکەی، ئەویش وتی: نزیکەو بەڵکو پشکی تۆ لای خوای گەورە بەپێی زمانت بێ، تاوەکو ئێستا لەسەر ئەو وشەیە دەگریم کە ئەلسرپی پێیوتم.

ئەلشیبلیی ئەڵێ: سوپاسکردن(الشُکر): بینینی خاوەن نیعمەتەکەیە نەك خودی نیعمەتەکە، ئەمەش تەواو نییە، بەڵکو تەواوی سوپاسگوزاریی ئەوەیە: نیعمەتەکە پیشانی خاوەن نیعەتەکە بدرێ.

وتراوە: الشکر: بەستنەوەی شتی بووندارو راوکردنی ونبووە.

ئەبو عوسمان ئەڵێ: سوپاسی گشتیی لەسەر خواردن و بەرگە، سوپاسی تایبەتیش لەسەر ئەو واتایانەیە کە بەسەر دڵیاندا دێت.

سوڵتان کابرایەکی بەند کرد، هاوڕێیەکی ناردەلای و وتی: سوپاسی خوا بکە، بەو هۆیەوە لێدان کرا، هەم هەواڵی نارد وتی: سوپاسی خوا بکە، کابرایەکی مەجوسیی سك زلی بەندکراو هێنراو بەسترایەوەو ئەڵقەیەکی کۆتەکەی بەسترایە قاچێکییەوە و ئەڵقەکەی تری بەسترایە قاچی ئەو پیاوەی ئەیووت: سوپاسی خوا بکە، کابرای مەجوسیی شەوان چەند جارێك بۆ میزکردن هەڵدەستا، دەبوو ئەم کابرایەش لەگەڵیدا هەڵسێ و لەسەر سەری رابووەستێ تاوەکو کابرای مەجوسیی خۆی بەتاڵ دەکردەوە، هاوڕێیەکەی نامەی بۆ نووسی: سوپاسی خوا بکە، ئەویش وتی: تاوەکو کەی ئەڵێی: سوپاسی خوا بکە، چی ناخۆشییەك لەمە سەختتر هەیە؟ ئەویش وتی: گەر ئەو قایشە پانەی نیشانەی غەیرە

موسڵمانێتییە و بەکابرای مەجوسییەوە هەیە، بەناوقەدی تۆوە بوایە وەك ئەو کۆتەی بەقاچتەوەیە چیت دەکرد؟ بۆیە سوپاسی خوا بکە.

پیاوێك رۆیشتەلای سەهلی کوڕی عبداللە[1] و وتی: دز چووەتە ماڵەکەمەوەو کەلو پەلەکەیان بردووم، سەهلیش وتی: سوپاسی خوا بکە، گەر شەیتانی دز بچووایەتە دڵتەوەو یەکتاناسینی خوای لێت تێکبدابایە چیت دەکرد؟

وتراوە: سوپاسکردن(الشکر): چێژوەرگرتنە بەستایشکردنی کە بەبەخشین ئەوە ناکرێت.

وتراوە: کە دەستت کورت بوو لەپاداشتدانەوە، بازمانت درێژ بێ بەسوپاسکردن.

وتراوە: چوار شت بێ بەرهەمن: راوێژکردنی کەڕو لاڵ، دانانی نیعمەت لای کەسێك سوپاسی نەکات، تۆو چاندن لەزەویی رووتەڵ و شۆڕەکاتدا، چرا دەمدان لەکاتی خۆرەتاودا.

سوپاسگوزاریی پەیوەستە بەدڵ و زمان و ئەندامەکانی جەستەوە، دڵ بۆ ناسین و خۆشویستن، زمان بۆ ستایش و سوپاسکردن، ئەندامەکانی جەستەش بۆ بەکارهێنانی ئەو نیعمەتە لەگوێڕایەڵیی خوای سوپاسکراو و دەستهەڵگرتن لەسەر پێچی کردنی، شاعیر ئەڵێ:

أفادتكم النَّعْماءُ مني ثلاثةً … يدي ولساني والضَّميرَ المُحَجَّبا

---

[1] - سەهلی کوڕی عبداللەی کوڕی یونسی ئەلتستری، ئەبو موحەممەد(ساڵی٢٠٠ك لەدایکبووەو ٢٨٣ك مردووە): یەکێك بووە لەپێشەواو زاناو موتەکلیمینی زانستەکانی دڵسۆزی(ئیخلاس) و بیرکاری و کردارە ناشیرینەکان.

واتا: سێ نیعمەتی پێ داوم هەموویم خستووەتە خزمەتی ئێوەوە، دەستم خزمەتی ئێوەی پێ دەکەم، زمانم باسی فەزڵی ئێوەی پێ دەکەم، دڵم کە باوەڕم بەفەزڵ و چاکەی ئێوە هەیە.

(الشكر) تایبەتە بەکاروکردەوەکانەوە، (الحمد)یش بەوتەکانەوە، هۆکاری حەمد گشتگیرترە لەهۆکاری شوکر، ئەوەی پەیوەستە بەشوکرەوە گشتگیرترە بەپەیوەستبوونەکانی حەمدەوە، ئەوەی لەسەری حەمدی خوا دەکرێ گشتگیرترە لەوەی سوپاسی(شوکر)ی دەکرێ، حەمدی خوا دەکرێ لەسەر ناو و سیفەت و کردارو نیعمەتەکانی، شوکری دەکرێ لەسەر نیعمەتەکانی، ئەوەی بەهۆیەوە حەمد دەکرێ تایبەتترە لەوەی بەهۆیەوە شوکر دەکرێ، بەدڵ و زمان و ئەندامەکانی جەستە شوکر دەکرێ، بەدڵ و زمان حەمد دەکرێ.

گەر ئەوە زانرا، ئەوە دەبێ بزانرێ کە ئارامگری و سوپاسگوزاریی تێکەڵ بەیەکن و بێ یەکتر بوونیان نییە، هەر یەکەو بەناوی تایبەت بەخۆیان دەربڕین دەکرێن، حەقیقەتی سوپاسگوزاریی لەئارامگرتن و ویست و کردارەوە سەرچاوە دەگرێ، سوپاسگوزاریی کارکردنە بەگوێڕایەڵیی خوای گەورەو وازهێنان لەسەرپێچی کردنی فەرمانەکانی، ئارامگرتن بناغەی ئەو کارەیە، بۆیە ئارامگرتن لەسەر ئەنجامدانی خواناسی و دوورگرتن لەتاوان سەرچاوەی سوپاسگوزارییە، ئەگەر ئارامگرتن کارێکی فەرمانپێکراو بێ، ئەوە بەجێهێنانی دەبێتە خودی سوپاسگوزاری.

گەر وترا: لەمەدا وەها تێدەگەین ئارامگرتن و سوپاسگوزاریی یەك شتن و دوو ناون بۆ یەك شت، ئەوەش لەڕووی عەقڵ و زمان و عورفیشەوە کارێکی مەحاڵەو خوای گەورە خۆی جیایکردوونەتەوە.

لەوەلامدا ئەوترێ: بەڵكو دوو واتای جیاوازن، ئێمە هاوپەیوەستەیی نێوان ئەو دوو شتەمان روونكردەوە كە هەریەكەو پێویستی بەوی تره، هەركاتێ سوپاسگوزاریی ئارامگرتنی تێدا نەبوو ئەوە سوپاسگوزاریی نییە، گەر ئارامگرتنیش سوپاسگوزاریی تێدا نەبێ ئارامگرتن نییە، ئەوە بۆ یەكەم دیارو ئاشكرایە، بۆ دووەم گەر ئارامگرتن سوپاسگوزاریی تێدا نەبێ دەبێتە بێباوەڕی و سپڵەیی، جا دژبوونی سپڵەیی بەرانبەر ئارامگرتن گەورەتره لەدژبوونی تووڕەیی لەبەرانبەر ئارامگرتن.

گەر بووترێ: بەڵكو لێرەدا بەشێكی تریش هەیە، كەسەكە نە سپڵەیەو نە سوپاسگوزاریشە، ئارامگرە لەسەر تاڵی و سەختییەك و سوپاسگوزارییش ناكات و لەماهییەتی ئارامگرتنیش دەرناچێ.

ئەوترێ: قسەمان لەبارەی ئارامگرتنەوەیە لەسەر ئەو كارانەی فەرمان كراوە ئەنجام بدرێن لەگوێڕایەڵیی خوادا، نەك لەو ئارامگرتنەی كە دەبێ وەك ئارامگرتنی ئاژەڵان مرۆڤ ئارامگربێ. ئارامگرتن لەسەر واجیبەكان تەنیا مرۆڤی سوپاسگوزار ئەنجامی دەدات، بەلام ئەم سوپاسگوزارییە لەئارامگرتنەكەیەوە دروست دەبێ و لەمەدا بڕیاردان هی ئارامگرتنە، هەروەك ئارامگرتنی مرۆڤی سوپاسگوزار لەسوپاسكردنەكەیەوە دروست دەبێ و ئەوكات بڕیارەكە هی سوپاسگوزاریی دەبێ.

بۆیە مەقام و پێگەكانی ئیمان رێگر نین لەتێكەڵبوونیان بەیەكتر، بەڵكو بەرزو نزم تێكەڵ بەیەك دەبن و یەكتر لەخۆ دەگرن، چۆن ئیمان لەنێو چاكەكردندایە، ئارامگرتنیش تێكەڵ بەمەقاماتەكانی رازیبوون دەبێ، ئەوە نییە ئارامگرتن نەمێنێ، رازیبوون خواردەبێتەوە ناو كار راسپاردن بەخوای گەورە،

ترس و ئومێدیش لەخۆشویستنی خوای گەورەدا تێکەڵ دەبن و بوونیان هەر دەمێنێ.

یەك قەدەرکراو، سوپاسگوزاری و ئارامگریی پێوەی پەیوەستە، جا ئەو شتە لەوانەبێ خۆشویستراوە یان نەویستراوە، بۆ نمونە هەژاری، هەژاریی ئارامگرتنی پێوەی پەیوەستە، لەمەدا ئارامگریی پێویستە چونکە ناخۆشیی تێدایە، سوپاسگوزارییش پێوەی پەیوەستە چونکە نیعمەتی تێدا هەیە، هەرکەسێ لەهەژارییدا بینینی نیعمەتی بەسەردا زاڵ بێ و چێژی لێ ببینێ و پێی دڵئارام بێ، ئەوە بەنیعمەتی دەزانێ و لەسەری سوپاسگوزار ئەبێ، هەرکەسێکیش شتەکانی بەتاقیکردنەوەو پێویستی و سەختیی ببینێ، ئەوە بەبەڵای دەبینێ و لەسەری ئارام دەگرێ، پێچەوانەی ئەمە دەوڵەمەندییە.

خوای گەورە بەندەکانی بەنیعمەت تاقیکردووەتەوە هەروەك بەکۆست و نەهامەتییەکانیش تاقیکردوونەتەوە، هەمووی بەتاقیکردنەوە دانـاوەو ئەفەرمووێ:﴿ وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ ﴾ الأنبياء: ٣٥، واتا:ئێمە تاقیتان دەکەینەوە بەخراپە وە بە چاکە و خۆشی تا دەرکەوێ(چاك و خراپ).

هەروەها فەرموویەتی:﴿ فَأَمَّا ٱلۡإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكۡرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَكۡرَمَنِ ١٥ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيۡهِ رِزۡقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ ١٦ ﴾ الفجر: ١٥ – ١٦، واتا: جا کاتێ کە خوا ئادەمی تاقی کردەوە و ڕێزی گرت و نازونیعمەتی بەسەردا ڕشت ئەوە دەڵێ پەروەردگارم ڕێزی گرتوم. وە ئەگەر تاقی کردەوەو ڕۆزی کەم پێدا ئەوسا دەڵێ پەروەردگارم ڕیسوای کردووم.

هەروەها فەرموویەتی:﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾ الكهف: ٧، واتا:بەڕاستی ئێمە هەرچی وا بەسەر زەوی یەوەیە کردوومانە بەزینەت و جوانی بۆ زەوی بۆ ئەوەی خەڵکی تاقی بکەینەوە کامیان کردەوەی جوانترو چاکترە؟.

هەروەها دەفەرمووێ:﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ الملك: ٢، واتا:ئەو زاتەی کە مردن و ژیانی داهێناوە تا تاقیتان بکاتەوە کە کردەوەی کامتان چاکترە وە هەر ئەوە بالاّ دەست و لێ خۆشبوو.

هەروەها دەفەرمووێت:﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ هود: ٧، واتا:ئەو(خوایە)زاتێکە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە لە شەش ڕۆژدا و عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کامتان کردەوەی چاکتر(دەکەن).

خوای پاك و بێگەرد، هەواڵی داوە کە جیهانی بالاّ و نزمی دروستکردووەو تەمەنی مەخلوقاتی دیاریی کردووەو مەخلوقاتی سەر زەویی دروستکردووە بۆ تاقیکردنەوە، بۆ تاقیکردنەوەی ئارامگری و سوپاسگوزاریی بەندەکان لەباش و خراپ، لەخۆشی و ناخۆشییدا، تاقیکردنەوە لەنازونیعمەت لەڕووی دەوڵەمەندی و لەشساغی و ناوبانگی و ڕێزەوە، هۆکارەکان گەورەترینی دوو تاقیکردنەوەکان دەهێنن. ئارامگرتن لەسەر فرمانەکانی خوای گەورە سەختترینی ئارامگرتنەکانە، هەروەك هاوەڵان(خوایان لێ رازیی بێ)وتوویانە: بەناخۆشیی تاقیکراینەوە ئاراممان گرت، بەخۆشیی تاقیکراینەوە ئارامان نەگرت[1].

---

[1] - حسن، ترمیزیی ئیخراجی کردووە(٢٤٦٤) لەعەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە(خوای لێ رازیی بێ).

نیعمەتی هەژاری و نەخۆشی و دونیا لێسەندنەوەو ئازاری خەڵك، گەورەترینی دوو نیعمەتەکەیە، سوپاسگوزاریی لێرەدا واجیبترە.

خـوای گـەورە مرۆڤـەکان بەنیعمـەتی خـۆی تاقیدەکاتـەوەو بەنەهامـەتییش نیعمەت دەبەخشێ، بەڵام ئەوە هەیە ئارامگرتن و سوپاسگوزاربوون دوو حاڵـەتی پەیوەست بەبەندەن لەفەرمان و نەهی و قەزاو قـەدەری خـوای گـەورەدا، دەبـێ بەندە هەردوو ئـەو شـتانەی تێـدا هـەبێ، پرسـیارکردن لـەوەی کـام لـەو دووانـە باشـترینە، وەك پرسـیارکردنە لـەوەی هەسـتکردن و جووڵـە کامیـان باشـترینە، خواردن و خواردنەوە کامیان باشترینە، ترس و ئومێـدی بەنـدە بـەخوا کامـەیان باشـــترینە، بۆیـــە ئـــەوەی فـــەرمانی لەســـەرە دەبـــێ ئـــەنجام بدرێ،ئـــەوەش بەئارامگرتن و سوپاسگوزارییەوە ئەنجام دەدرێ، قەدەغەکراویش بەئارامگرتن و سوپاسگوزاربوونەوە دەستبەرداریی لێ دەکرێت.

هەرچی ئەو قەدەرە ناخۆشانەیە کە دەکەونە سەر بەندە، کە ئارامیی لەسـەر کـــرد سوپاســـگوزارییش دروســـت دەبـــێ، هـــەروەك ئـــارامگریی مرۆڤـــی سوپاسگوزاریش لەسوپاسگوزاربوونییەوە سەرچاوە دەگرێ و دێتەبوون.

روونکردنەوە بۆ ئەوە، خـوای گـەورە بەنـدەی بـەدەروون و هـەواو ئـارەزووی خۆی تاقیکردووەتەوە، پێویستیشی کردووە لەبەر خوای گەورە شـەڕی ئـەو دوو شـــتە بکـــات. بەنـــدە هەمیشـــە لەشـــەڕکردنی دەروونـــی خۆیدایـــە تـــاوەکو سوپاسگوزاریی فـەرمانپێکراو بەدیـدێت، لـەدوورگرتن لەهـەواو ئارەزووەکانیشـی ئارام دەگرێ، بۆیە بەندە هـەژاربێ یـان دەوڵەمەنـد، لەشسـاغ بـێ یـان نـەخۆش لەشەڕکردنی دەروونی خۆی و ئارەزووە حەرامەکانی نابێتەوە.

لەم بابەتەدا ئایە دەوڵەمەندی سوپاسگوزار و هەژاری خۆڕاگر کامەیان باشترن؟ خەڵکیی لەبارەیەوە سێ قسەیان هەیە، ئەوەیە کە ئەبو ئەلفەرەج ئەلجەوزی و کەسانی تر لەبارەی گشتێتیی ئارامگرتن و سوپاسگوزارییەوە گێڕاویانەتەوە کە ئاخۆ کامەیان باشترن؟ هەر کۆمەڵێکیش بەڵگەو بیانووی قسەی خۆیانیان هێناوەتەوە.

سەلماو ئەوەیە: کامەیان لەخواترسینیان زیاتر بێ ئەوەیان باشترینە، گەر لە لەخواترساندا وەك یەك بوون، ئەوە لەفەزڵیشدا یەکسانن، خوای گەورە بەهۆی دەوڵەمەندی و هەژاری و لەشساغی و نەخۆشییەوە کەسی فەزڵدارتر نەکردووە، بەڵکو بەهۆی تەقواو لەخواترسانەوە مرۆڤەکانی بەسەر یەکتردا فەزڵدار کردووە، هەروەك فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ﴾ الحجرات: ١٣، واتا: بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا پارێزگارترینتانە.

پەیامبەری ئازیزیش(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی: "لَا فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى عَجَمِيٍّ، وَلَا لِعَجَمِيٍّ عَلَى عَرَبِيٍّ إِلَّا بِالتَّقْوَى، النَّاسُ مِنْ آدَمَ، وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ"[1]، واتا: هیچ عەرەبێك فەزڵی بەسەر غەیرە عەرەبدا نییەو هیچ غەیرە عەرەبێکیش فەزڵی بەسەر عەربدا نییە ئیللا بەهۆی لەخواترسانەوە نەبێ، هەموو خەڵکیی لەئادەمن و ئادەمیش لەخۆڵ دروست بووە.

لەخواترسان(تەقوا)ش لەسەر دوو بنەما دامەزراوە: ئارامگرتن و سوپاسگوزاری، هەموو هەژار و دەوڵەمەندێکیش دەبێ ئەو دوو شتەی تێدا هەبێ، هەرکەسێ سوپاس و ئارامگرییەکەی تەواو بوو، ئەوە باشترینە.

---

[1] - صەحیحە، ئەحمەد لە موسنەددا(٥/ ٤١١)ئیخراجی کردووە.

ئەگـەر بـووترێ: ئەگـەر ئـارامگرتنی هـەژارێك تـەواو بـێ و سوپاسـگوزاریی دەوڵەمەندێکیش تەواو بێ، ئایە کامەیان باشترینە؟

لەوەڵامدا ئەوترێ: هەرکامیان لەکارو حاڵی خۆیدا تەقوای زیاتری لەگەڵدا بـێ ئەوە باشترینە، بەبێ ئەوە نـاکرێ هـیچ فەزڵـدانێك بکـرێ، ئـەکرێ دەوڵەمەنـدێك لەسوپاسـگوزارییکردنیدا لـەخوا ترسـاوانەتربێ لـەئارامگرتنی هـەژارێك، رەنگـە هـەژارێك لەئارامگرتنیـدا لەخواترسـاوانەتر بـێ لەسوپاسـگوزاریی دەوڵەمەنـدێك، بۆیـە نـاکرێ بووترێـت: ئەمـە بـەهۆی دەوڵەمەندییەکەیـەوە باشـترە یـان ئەمـە بـــەهۆی هەژارییەکەیـــەوە باشـــترە، یـــان نـــاکرێ بـــووترێ: ئەمـــە بـــەهۆی سوپاسـگوزارییەکەیەوە باشـترە لەئارامگرییەکـەی ئـەم، یـان بەپێچـەوانەوە، چونکە ئەو دوو شتە لەپێویسـتییەکانی ئیمـانن و بـێ ئـەو دووانـە ئیمـان بـوونی نابێ.

دەبێ بووترێ: کامەیان بۆ ئەنجامدانی کاری واجیب و مەندوب بەهێزتر بوون، ئـەوەیان باشترینە،باشـتردانان لەسـەر ئـەو دوو شـتە وەسـتاوەتەوە، هـەروەك لەفەرموودەدا هاتووە: "ما تقرب اليَّ عبـدي بمثـل مداومـة مـا افترضـت عليـه ولا يزال عبدي يتقرب اليَّ بالنوافل حتى أحبه"[1]،واتا: بەندەکـەم بـە بـەردەوامبوون لەسەر سوونەتەکان لەمن نزیکدەبێتەوە. دوو کەس واجیبەکان بەجێدەگەیەنن، کامەیان سوونەتی زیاتر بوو ئەوەیان باشترینە.

---

[1] - بەشێکە لەفەرموودەیەك بوخاریی ئیخراجی کردووە(٦٥٠٢) لەفەرموودەیـەکی ئـەبو هورەیرەوە(خـوای لێ رازیی بێ).

ئەگــەر بــووترێ: لەپەیامبــەری خواوە(صــلى الله علیــە وسلم)ســەلماوە فەرموویەتی:"یدخل فقراء أمتي الجنة قبل أغنیائهم بنصف یوم وذلك خمسمائة عام"[1]،واتا: هەژارانی ئوممەتەکەم بەنیو رۆژ کە پێنجسەد ساڵی دونیا دەکات پێش دەوڵەمەندانی ئوممەتەکەم دەچنە بەهەشتەوە.

لەوەڵامدا ئەوترێ: ئەمە ئەوە ناگەیەنێ فەزڵیان بەسەر دەوڵەمەنداندا هەبێ و پلەیان بەرزتربێ با پێش ئەوان بچنە بەهەشتەوە، ئەکرێ بەهۆی لێپرسینەوەوە دەوڵەمەنـدو دەسـەلاتداری دادپـەروەریش درەنـگ بچـنە بەهەشـتەوە و پلـەو پێگەیان بەرزتریش بێ، هەروەك چۆن لـەدونیادا هـەزاری کۆڵبـەر پـێش خـاوەن گەنجینە لەگەنجینەکە دەردەچێ.

ئەگەر بووترێ: کاتێ کۆمەڵێ هەژار هاتنە لای پەیامبەری خوا(صلى الله علیە وسلم) گازندەی ئەوەیان کـرد کـە دەوڵەمەنـدەکان بـەهۆی رزگـارکردنی کۆیلـەو خێرکردنەوە پاداشتی زۆرتریان بەسەر ئەواندا هەیە، پەیامبەری خواش(صلى الله علیـە وسـلم)فەرمووی:"ألا أدلكـم علـى شـيء اذا فعلتمـوه أدركـتم بـە مـن سبقكم"،واتا: ئایە شتێکتان پیشان بدەم گەر ئەنجامی بـدەن بـەخێرو پاداشـتی ئەوانـدا بگەنــەوە. پەیامبــەری خوا(صــلى الله علیــە وســلم)ئامۆژگارییکردن دوا بەدوای هەموو نوێژێك(سبحان الله والحمد لله والله أكبر)بکەن، کە دەوڵەمەنـدەکان ئەوەیان گوێ لێبـوو ئـەوانیش دوای هـەموو نوێـژێك ئـەوەیان کـرد، جـارێکی تـر هاتنــەوە لای پەیامبــەری خوا(صــلى الله علیــە وســلم)کە دەوڵەمەنــدەکان هــەم پێشــیان کــەوتوون، ئــەویش فــەرمووی:﴿ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ ﴾

---

[1] - صحیح لغیره، ترمیزی(۲۳۵۳) و ئیبن ماجە(٤١٢٢) و ئەحمەد(۲/ ۲۹٦) ئیخراجیان کردووە.

الحدید: ٢١، [1] واتا:ئەو(پاداشتە)بەخششێکی خوای یە دەیدات بە هەرکەس کە خۆی بیەوێت.

ئەمە بارسەنگی حاڵی دەوڵەمەندێکی سوپاسگوزار ئەکات. لەوەلأمدا ئەوترێ: ئەمە بەڵگەی ئەو قسەیەیە کە پشتگیرمان کرد، کامەیان سوونەتی زۆرتر بوو ئەوەیان باشترینە، ئەگەر وەك یەك بوون، ئەوە وەك یەك یەکسانن، لێرەشدا دەوڵەمەندەکان لەگەڵ هەژارەکاندا یەکسانن لەکاری واجیب و سوونەتەکاندا، بەخێری رزگارکردنی کۆیلەو سەدەقەکردن پێشیان کەوتوون، هەژارەکانیش یەکسانیان بوونە بەئارامگرتنیان لەسەر جیهادکردن و ئازار چەشتن لەپێناو خوای گەورە و ئارامگرتن لەسەر قەدەرەکان، بەلأم دەوڵەمەندەکان پێشیان کەوتن بەسوپاسکردن لەبەخشینی سەروەتەکانیاندا، بۆیە گەر هەژارەکان بەئارامگرتنیان سوونەتی زیاتریان هەبووایە بەسەر دەوڵەمەندەکاندا، ئەوە فەزڵدارتر دەبوون.

ئەگەر بووترێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)کلیلی گەنجینەکانی بەهەشتی خرایە بەردەم، بەلأم رەتیکردەوەو فەرمووی: "أجوع یوماً وأشبع یوماً" [2]،واتا: بەڵکو دەمەوێ رۆژێ برسیی بم و رۆژێ تێربم.

هیشامی کوڕی عوروە لەباوکییەوە ئەویش لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) لەدونیا دەرچوو لەنانی گەنم

[1] - بوخاری(٨٤٣) ئیخراجی کردووە بەبێ(کە دەوڵەمەندەکان گوێیان لەوە بوویەوە...) و موسلیم(٥٩٥) لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ).

[2] - زۆر لاوازە، ئەحمەد(٥/ ٢٥٤) و ترمیزی(٢٣٤٧)ئیخراجیان کردووە.

تێری نەخوارد[1]، کۆچی دوایی زرێکەی لەپەهنی خواردنێکدا بوو بۆ خێزانەکانی هێنابووی لای کابرایەکی جولەکە[2].

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: وەکیع بۆی باسکردین، ئەعمەش بۆی باسکردین، ئەویش لەعەمارەی کوڕی قەعقاعەوە، ئەویش لەئەبی زورعەوە ئەویش لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ)وتی: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:«اللَّهُمَّ اجعل رِزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ قُوتـاً»[3]،واتا: خوایە گیان رزقی بنەماڵەی موحەممەد تووێشوو بێ.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: ئیسماعیلی کوڕی موحەممەد بۆی باسکردین کە عەبادی کوڕی عەباد بۆی باسکردین، موجالیدی کوڕی سەعید بۆی باسکردین ئەویش لەشەعبییەوە ئەویش لەمەسروقەوە ئەویش لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) وتوویەتی: ژنێکی ئەنصاریی هاتەلام و بینی جێ خەوی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)عەبایەکی دوو پارچەییە، گەڕایەوە ماڵی خۆی و جێ خەوێکی بۆ ناردم ناوەوەی خووریی بوو، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)هاتە دیووەکەم و فەرمووی:((ما هذا؟))،واتا: ئەمە چییە؟ وتم: فلآنە ئافرەتی ئەنصاریی هاتە ژوورەوە بۆلام جێ خەوەکەی تۆی بینی، بۆیە ئەمەی بۆ ناردم، فەرمووی: بۆی بگەڕێنەوە. منیش نەمگێڕایەوە حەزمکرد لەماڵەکەمدا هەبێ، سێ جار پێیووتم بیگێڕمەوە، فەرمووی:،ئەی عائیشە بیگێڕەرەوە،

---

[1] - ئەحمەد لە الزهد(١٠)ئیخراجی کردووەو بڕوانرێتە صەحیحی موسلیم(٢٩٧٠).

[2] - بوخاری(٢٩١٦) و (٤٤٦٧) و موسلیم(١٦٠٣)ئیخراجیان کردووە.

[3] - ئەحمەد لە المسند(٢/ ٤٤٦) و لە الزهد(١٣)ئیخراجی کردووە.

سوێند بەخوا گەر بمەوێ خوای گەورە چیای ئاڵتوون و زیووم لەگەڵ دەخات))
منیش گەڕاندمەوە[1]. خوای گەورە باشتری بۆ پەیامبەرەکەی هەڵبژارد، ئەمەو ئەگەر دونیای دەستبخستبایە ئەوە هەمووی لەڕەزامەندیی خوای گەورەدا دەیبەخشی، سوپاسگوزاربوونیشی پێی لەسەرووی سوپاسگوزاریی تەواوی جیهانیانەوە ئەبوو.

ئەوتریێ: هەردوو کۆمەڵ بەحاڵ و باری پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)بەڵگەیان هێناوەتەوە، دروست ئەوەیە خوای گەورە بەباشترین شێوە هەردوو پێگەو مەقامی لەپەیامبەردا کۆکردووەتەوە، گەورەی سوپاسگوزارە دەوڵەمەندەکان و گەورەی ئارامگرە هەژارەکان بووە، ئارامگرییەکی لەسەر هەژاربوون بەدەستهێناوە بۆ کەسی تر بەدەست نەهاتووە، لەسەر دەوڵەمەندییش سوپاسگوزارییەکی دەستخستووە بۆ دەوڵەمەندێکی تر دەست نەخراوە، هەرکەسێکیش بڕوانێتە ژیاننامەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)ئەوە دەبینێ، لەشوێنی ئارامگرتندا بەئارامترین مەخلوقێ بووە، لەشوێنی سوپاسگوزارییشدا سوپاسگوزارترین مەخلوق بووە، ئەوە پەروەردگاری بووە پلەو مەقامەکانی کامڵبوونی بۆ تەواو کردووەو خستوویەتییە بەرزترین پێگەی دەوڵەمەندە سوپاسگوزارو هەژارە ئارامگرەکانەوە، پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغۡنَىٰ ﴿٨﴾ ﴾ الضحى: ٨، واتا: تۆی نەدی بەهەژارو دەوڵەمەندی کردی.

---

[1] - لاوازە، ئەحمەد لە الزهد(لا٣٠)ئیخراجی کردووە، موجالیدی کوڕی سەعیدی تێدایە کەسێکی لاوازە.

راڤەوانان یەکدەگن لەسەر ئەوەی (العائل)واتا هەژار، ئەوتریؒ: عال الرجل یعیل، کە هەژار کەوت، وأعال یعیل، کاتێك بووە خاوەن خێزان و هەژار کەوت، وەك بووە خاوەن شیرو بەرووبووم و سەروەت، وعال یعول کە ستەمی کرد، لەوانە خوای گەورە دەفەرموویٚت: ﴿ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ ﴾ النساء: ٣، واتا:ئەوە نزیکترە کە ستەم نەکەن یا هەژار نەکەون.

وتراوە: واتای ئەوەیە: با منداڵ و بەخێوکراوتان زۆر نەبێ، لەچەند روویەکیشەوە قسەو بۆچوونی یەکەم ئەگەیەنێ:

**یەکەم:** لەڕووی زمانەوانییەوە(عال یعول) مەبەست زۆربوونی منداڵ و ژن و بەخێوکراو نییە، بەڵکو ئەوەی بزانرێ و بەناوبانگ بێ،ئەوەیە تەنیا ستەم دەگەیەنێ، ئەوەیە بەتێکڕایی و یەکلاکراوەیی زمانەوانان باسیان کردووە.

**دووەم:** خوای گەورە ئەوەی بەرانبەر بەدادپەروەری(العدل)داناوە، کە ئەگەر ترسان دادپەروەر نەبن تەنیا با یەك ژن و چەندی بووێ لەجاریە هەیان بێ، بۆیە ناکرێ بەژن و منداڵ نەبوون لێکبدرێتەوە.

**رووی سێیەم روونیدەکاتەوە:** لەو کاتەی ئەوان دەترسێن بەرانبەر کچانی هەتیوو دادپەروەر نەبن، خوای گەورە ئەیانگوازێتەوە بۆ ئافرەتانی تر، ئەوەش بۆ ئەوەی ستەم لەژنە هەتیوەکانیان نەکەن و رێگەی داون یەك ژن بخوازن و تاوەکو چوار ژن، پاشان لەکاتی بوونی ستەم و دادپەروەریی کردن لەنێوانیاندا مۆڵەتی یەك ژنی پێ داوون، ئەو ئافرەتانەشی کە لەچێژ وەرگرتن لێیان دادپەروەریی نەکردن لەپیاوان داواکراو نییە، جاریەکانن، بۆیە ئایەتەکە بابەتی جائیزبوونی کچانی هەتیوو و پێگەیشتووی روونکردووەتەوەو لەترسی

دادپەروەریی نەکردندا یەك ئافرەت لەوانە مارە بکرێ، بۆیە لێرەدا بابەتی زۆریی منداڵ و بەخێوکراو ناگەیەنێ.

**رووی چوارەم رووینیدەکاتەوە:** ئەگەر زۆربوونی ئافرەتان و منداڵی بەخێوکراو قەدەغە بووبێ، ئەی بۆ داوای لێکردوون و رێگەی داوون کەنیزەکیان زۆر بێ، ئەی کەنیزەکیش بەخێودەکرێ، تەنیا بۆ خزمەتکردنیش نا، بەڵکو بۆ خزمەتکردن و سەرجێیکردنیش لەگەڵیاندا.

**رووی پێنجەم رووینیدەکاتەوە:** زۆربوونی ژن و منداڵ کارێکی قەدەغە کراو نییە بەلای خوای گەورەوە، چۆن دەبێ وەهابێ لەکاتێکدا باشترینی ئەم ئوممەتە ئافرەتان زۆریان ئەکەن و ئەیانهێننە دونیاوە[1]، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی:«تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ، فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الْأُمَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[2]،واتا: کچانی منداڵ و تازەپێگەیشتوو بخوازن کە منداڵی زۆر ببێ، چونکە من بەئێوەوە لەنێو ئوممەتاندا زۆر دەبم لەرۆژی قیامەتدا. فەرمانی کردووە کچانی منداڵ مارە بکرێن تاوەکو لەنێو ئوممەتاندا لەرۆژی قیامەتدا ئوممەتەکەی زۆربێت.

مەبەست ئەوەیە، خوای گەورە پەیامبەرەکەی خۆی دەوڵەمەندو سوپاسگوزار کرد دوای ئەوەی هەژارێکی ئارامگر بوو،بۆیە هەر کۆمەڵێك حاڵی

---

[1] - هەروەك لەعبداللەی کوڕی عەباسەوە هاتووە(خوای گەورە لەخۆی و باوکیشی رازیی بێ) لەبوخارییەوە(٥٠٦٩).

[2] - صحیح لغيره، ئەبو داوود(٢٠٥٠) و نەسائی(٦/ ٦٥) و حاکم(٢/ ١٦٢) ئیخراجیان کردووە لەفەرموودەیەکی موعاویەی کوڕی قورەوە.

ئەو بکاتە بەڵگە بۆ خۆی، ئەوە کۆمەڵێکی تریش لەژیانی ئەو پەیامبەرەدا بەڵگەی خۆی هەیە.

ئەگەر بووترێ: عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف یەکێك بووە لەسوپاسگوزاران، پێشەوا ئەحمەدیش لەموسنەدەکەیدا ئەڵێ:عەبدولصەمەد بۆی باسکردین، عەممارە بۆی باسکردین، لەثابتەوە ئەویش لەئەنەسەوە(خوای لێ رازیی بێ)وتی: عائیشە لەماڵی خۆیدا بوو گوێی لەدەنگێك بوو لەمەدینە، وتی: ئەو دەنگە چییە؟ وتیان: کاروانی وشترەکانی عەبدولڕەحمانە لەشامەوە گەڕاوەتەوەو هەموو شتێکی هێناوە، ئەڵێ: حەوسەد وشتر بوو، بەدەنگی وشتر و کاروانەکە مەدینە ئەلەرییەوە، عائیشە وتی: گوێم لێبوو پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)ئەیفەرموو:" قَدْ رَأَيْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ حَبْوًا"[1]، واتا: عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفم بینی لەسەر سکە خشە دەچێتە بەهەشتەوە. ئەم فەرموودەیەی عائیشە بەعەبدولڕەحمان گەیشت وتی: گەر بتوانم و پێم بکرێ بە لەسەر پێ وەستانەوە دەچمە بەهەشتەوە،بۆیە هەموو کاروانەکەی بەوشترو شتە کەم و بچووکەکانیشییەوە لەڕێی خوادا بەخشی.

ئەوترێ: پێشەوا ئەحمەد وتوویەتی:ئەم فەرموودەیە درۆ و هەڵبەستراوە، ئەڵێن: عەممارە فەرموودەو باسی بێ بنەمای زۆری گێڕاوەتەوە، ئەبو حاتەمی رازیی ئەڵێ: عەممارەی کوڕی زاذان بەبەڵگە ناکرێ[2].

---

[1] - لاوازە، ئەحمەد(٦/ ١١٥) ئیخراجی کردووە، بڕوانە الموضوعات ی ئیبن ئەلجەوزی(٢/ ١٣).

[2] - هەروەك لە(الموضوعات)ی ئیبن ئەلجەوزی(٢/ ١٣) هاتووە.

ئــەبو ئەلفــەرەج[1] ئــەڵێ: جــەڕاحی کــوڕی منهــاڵ بەئیســنادی خــۆی لەعەبدولڕەحمانی کوڕی عەفـەوە گێڕاویەتییـەوە کـە پەیامبـەری خوا(صـلی الله علیه وسلم) پێـی فەرمووە:ئـەی کوڕی عـەوف تـۆ یـەکێکی لەدەوڵەمەنـدەکان و بەخشکە دەچیتە بەهەشتەوە، بۆیە قەرز بدەرە پەروەردگارت تاوەکو پێیەکانت ئــازاد بکــات لەڕۆیشــتن. ئــەبو عەبــدولڕەحمان ئەلنەســائیی ئــەڵێ: ئەمــە هەڵبەســتراوە، جــەڕاح کەسـێکی پــەراوێزخراوە(متروك)، یــەحیا ئـەڵێ: بـاس و فــەرموودەی جــەڕاح هــیچ نییــە، ئــیبن ئەلمــەدینیی ئــەڵێ: فــەرموودەکانی نانووســـرێنەوە، ئـــیبن حیبـــان ئـــەڵێ: درۆی دەدا. دارە قـــوتنیی ئـــەڵێ: پەراوێزخراوە(متروك)ە.

ئەگــەر بــووترێ: ئــەی چــی ئــەڵێن لــەو فەرموودەیــەی کــە بەیهــەقیی گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەیەکی ئەحمەدی کوڕی عەلیی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی موحەممــەدەوە: ســولەیمانی کــوڕی عەبــدولڕەحمان بــۆی باســکردین و وتــی: خالیدی کوڕی یەزیدی کوڕی ئـەبی مالیـك هـەواڵی پێـداین ئـەویش لەباوکییـەوە ئــەویش لەعــەتائی کــوڕی ئــەبی رەباحــەوە ئــەویش لــەئیبراهیمی کــوڕی عەبــدولڕەحمانی کــوڕی عەوفــەوە ئـەویش لەباوکییـەوە ئـەویش لەپەیامبـەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی:« يَا ابْنَ عَوْفٍ إِنَّكَ مِنَ الْأَغْنِيَاءِ، وَلَنْ تَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلَّا زَحْفًا، فَأَقْرِضِ اللَّهَ يُطْلِقْ لَكَ قَدَمَيْكَ »، واتا: ئەی کوڕی عەوف تۆ یەکێکی لەدەوڵەمەنـدەکان و تـەنیا بەخشـکە دەچـیتە بەهەشـتەوە، بۆیـە قـەرز

---

[1] - تەماشای هەمان سەرچاوە بکرێ.

بەخوا بدە تاوەکو پێیەکانت ئازاد بکات و پێیانەوە بچیتە بەهەشتەوە"، عەبدولڕەحمان ئەڵێ: چی بەقەرز بدەم ئەی پەیامبەری خوا؟ فەرمووی:« تَتَبَرَّأُ مِمَّا أَمْسَيْتَ فِيهِ»، واتا: خۆت رزگار بکە لەوەی دوێنێ تیایدا بووی و تاوانەکانت لەخۆت پاك بکەرەوە. ئەویش وتی: لەهەمووی ئەی پەیامبەری خوا؟ فەرمووی: بەڵێ. عەبدولڕەحمان بەگرنگیدان بەوە دەرچوو، جیبریل هات بۆلای و فەرمووی: فەرمان بەکوڕی عەوف بدە میوانداریی بکات و خواردن بەهەژاران بدات و لەوانەوە دەستپێبکات کە خەرجییان لەسەر ئەمەو بەخاوەن پێداویستیی ببەخشێ، ئەگەر ئەوەی کرد، ئەوە دەبێتە پاککەرەوە و مایەی سڕینەوەی تاوانەکانی رابردووی[1].

لەوەلأمدا ئەوترێ: ئەمە فەرموودەیەکی بێ بنەمایە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)ئەمەی نەفەرمووە، یەکێك لەگێڕەرەوەکانی خالیدی کوڕی یەزیدی کوڕی ئەبی مالیکە. پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: هیچ نییە. ئیبن موعین ئەڵێ:(واه)یە، نەسائیی ئەڵێ: متمانەدار نییە. دارە قوتنیی ئەڵێ: کەسێکی لاوازە. یەحیای کوڕی موعین ئەڵێ: رازیی نەبووە درۆ بەسەر باوکییەوە بکات تاوەکو درۆ بەدەم هاوەڵانەوە نەکات.

ئەگەر بووترێ: ئەی چی ئەکەن لەو فەرموودەیەی کە پێشەوا ئەحمەد وتوویەتی: هوزەیلی کوڕی مەیمون بۆی باسکردین لەمەتروحی کوڕی یەزیدەوە، ئەویش لەعوبەیدوالڵەی کوڕی زەحرەوە ئەویش لەعەلیی کوڕی یەزیدەوە

---

[1] - زۆر لاوازە، بەیهەقیی لە الشُعب الإیمان(٣٠٦٤٩) و حاکم(٣/ ٣١١) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(١/ ٩٩) ئیخراجیان کردووە، خالیدی کوڕی یەزیدی تێدایە کەسێکی لاوازە.

ئەویش لە ئەلقاسمەوە ئەویش لەئەبی ئومامەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله عليه وسلم)فەرمووی:"دَخَلْتُ الْجَنَّةَ فَسَمِعْتُ فِيهَا خَشْفَةً بَيْنَ يَدَيَّ فَقُلْتُ: مَا هَذَا؟ " قَالَ: بِلَالٌ ". قَالَ: " فَمَضَيْتُ فَإِذَا أَكْثَرُ أَهْلِ الْجَنَّةِ فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ وَذَرَارِيُّ الْمُسْلِمِينَ، وَلَمْ أَرَ فِيهَا أَحَدًا أَقَلَّ مِنَ الْأَغْنِيَاءِ وَالنِّسَاءِ. قِيلَ لِي: أَمَّا الْأَغْنِيَاءُ فَهُمْ هَاهُنَا بِالْبَابِ يُحَاسَبُونَ وَيُمَحَّصُونَ، وَأَمَّا النِّسَاءُ فَأَلْهَاهُنَّ الْأَحْمَرَانِ: الذَّهَبُ وَالْحَرِيرُ ". قَالَ: " ثُمَّ خَرَجْنَا مِنْ أَحَدِ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةِ، فَلَمَّا كُنْتُ عِنْدَ الْبَابِ أُتِيتُ بِكِفَّةٍ فَوُضِعْتُ فِيهَا، وَوُضِعَتْ أُمَّتِي فِي كِفَّةٍ، فَرَجَحْتُ بِهَا ثُمَّ أُتِيَ بِأَبِي بَكْرٍ فَوُضِعَ فِي كِفَّةٍ، وَجِيءَ بِجَمِيعِ أُمَّتِي فَوُضِعَتْ فِي كِفَّةٍ، فَرَجَحَ أَبُو بَكْرٍ. ثُمَّ أُتِيَ بِعُمَرَ فَوُضِعَ فِي كِفَّةٍ، وَجِيءَ بِجَمِيعِ أُمَّتِي فَوُضِعُوا فَرَجَحَ عُمَرُ، وَعُرِضَتْ عَلَيَّ أُمَّتِي رَجُلًا رَجُلًا فَجَعَلُوا يَمُرُّونَ. فَاسْتَبْطَأْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، ثُمَّ جَاءَ بَعْدَ الْإِيَاسِ فَقُلْتُ: " عَبْدُ الرَّحْمَنِ " فَقَالَ: بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللهِ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا خَلَصْتُ إِلَيْكَ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنِّي لَا أَنْظُرُ إِلَيْكَ أَبَدًا إِلَّا بَعْدَ الْمُشِيبَاتِ. قَالَ: وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: مِنْ كَثْرَةِ مَالِي أُحَاسَبُ وَأُمَحَّصُ""[1]،واتا: چوومە بەهەشتەوە گوێم لەجوولەیەك بوو لەبەردەستمدا، وتم: ئەمە چییە؟ وتی: بیلالە. رۆیشتم بینینم زۆربەی خەڵکی بەهەشت هەژارانی موهاجیران و وەچەی موسڵمانانن، هیچ دەوڵەمەندو ئافرەتێکم تیایدا نەبینی. پێم وترا: دەوڵەمەندەکان لەو دەرگایەدان لێپرسینەوە دەکرێن و بژێر ئەکرێن، ژنانیش ئاڵتوون و ئاورێشم(دوو سوورەکە)ئەوانی بەهیلاکدا بردووە. ئەفەرمووێ: پاشان لەیەکێك لەدەرگاکانی هەشتەمی بەهەشتەوە دەرچووین، کە لای دەرگاکە بووم تای تەرازوویەکیان هێنا، من لەتایەکی تەرازووەکەو ئوممەتەکەشم لەتایەکی تریدا بوو، من بارسەنگتر بووم،

[1] - زۆر لاوازە، ئەحمەد(٥/ ٢٥٩)ئیخراجی کردووە ، بڕوانرێتە(الموضوعات)ی ئیبن ئەلجەوزی(٢/ ١٤).

پاشان ئەبو بەکر خرایەسەر تای تەرازووەکە و تەواوی ئوممەتیش خرایە تایەکەی تریەوە، ئەبو بەکر بارسەنگتر بوو، پاشان عومەر خرایە تای تەرازووەکەو تەواوی ئوممەتیش لەتایەکەی تری، عومەر بارسەنگتر بوو، ئوممەتەکەم پیشان درا یەك یەك دەکێشران و تێدەپەڕین. عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف دواخرا، عەبدولڕەحمان وتی:دایك و باوکم بەفیدات بێ، سوێند بەو کەسەی تۆی بەحەق ناردووە وام هەست دەکرد دوای سەختی و سەرسپیبوون دەتبینمەوە و بە تۆ دەگەم. وتم: ئەوە چییە؟ وتی: بەهۆی زۆریی سەروەت و سامانمەوە لێپرسینەوەی زۆر دەکرێم و زۆر رادەگیردرێم.

لەوەڵامدا ئەوترێ: رشتەی گێڕانەوەی فەرموودەکە بەبەڵگە ناکرێ، ئەبو ئەلفەرەج لەکتێبی هەڵبەستراوەکان(الموضوعات)دا هێناویەتییەوەو ئەڵێ: هەرچی عوبەیدواڵلەی کوڕی زەحرە، ئەوە یەحیا وتوویەتی: هیچ نییە، عەلیی کوڕی یەزیدیش پەراوێزخراوە(متروك)، ئیبن حیبان وتوویەتی: عوبەیدواڵلە مەوزوعەکانی گێڕاوەتەوە، کە لەعەلیی کوڕی یەزیدەوە گێڕابێتییەوە، ئەوە کارەساتی هێناوە، کە لەڕشتەی گێڕانەوەدا عوبەیدواڵلەی کوڕی زەحرو عەلیی کوڕی یەزیدو ئەلقاسمی کوڕی عەبدولڕەحمان هاتبێ، ئەوانەی هێناوەتەوە کە دەستیان تیادا هەبووە.

ئەبو ئەلفەرەج ئەڵێ: نەفامە دونیا نەویستەکانن بەنمونەی ئەم فەرموودەیەوە پەیوەست دەبن، وەهای دەبینن سەروەت و سامان رێگری پێشبڕکێی چاکەکارییە، ئەڵێن: کوڕی عەوف کە بەهۆی پارەو سامانییەوە بەخشکە دەچێتە بەهەشتەوە،ئەوە بەسە بۆ خراپی و نابووتیی سەروەت و

سامان. بۆیە ئەم فەرموودەیە راست نییە، حاشا کوڕی عەوفی موژدە پێدراو بە بەهەشت، سەروەتەکەی رێگربێ لەپێشبڕکێکردن و خێراکردنی لەڕۆیشتنە بەهەشتەوە، چونکە سەروەت کۆکردنەوەی رێگە پێدراوە، بەڵکو ئەوەی حەرام و تاوان و نابووت بێ، کۆکردنەوەی سەروەت و سامانە بەڕێگەی ناڕەواو نەدانی زەکات، عەبدولڕەحمانیش لەو دوو کارە بەدوور بووە. تەڵحە سێسەد بارە ئاڵتوون و زوبەیرو کەسانی تریش سەروەتی زۆریان لەدوای خۆیان بەجێهێشت، گەر بیانزانیبایە پارەو سامان تاوان و خراپە، ئەوە هەموویان دەبەخشی و هیچیان نەدەهێشتەوە، ئاخۆ چەندە چیرۆکخوان هەیە دەستی بەنمونەی ئەم باسەوە گرتووە لەهاندان بۆ هەژاری و نابووتکردنی دەوڵەمەندیی، الله ئەو زانایانە چی گەوهەرێکن کە راست و دروست دەناسن و لەبنەماکانیش تێدەگەن. کۆتاییهات.

منیش ئەڵێم: لەوەڵامدانەوەی ئەو باس و فەرموودەیەدا، زیادەڕۆیی کردووەو ئاستی خستنەڕیزی فەرموودە هەڵبەستروەکانی لەم بابەتەدا تێپەڕاندووە، ئەوەش وەك ئەوەی گەورەو قوورس بێ عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف یەکێك لەهاوەڵانی سەرەتاو موژدە پێدراوی بەهەشت بۆ چوونە بەهەشتەوە رابگیردرێ و بەخشکە بچێتە بەهەشتەوە، ئەوەش پێچەوانەی ئەو پێگەیەتی کە خوای گەورە لەبەهەشتدا بۆی داناوە، ئەمەش گومانێکی ئەو زانایە بووە بەڕەحمەت بێ.

وەهای دابنێ رێگەیەکی دۆزیبێتەوە بۆ تانەدان لەو دوو هەواڵە، ئاخۆ ریگەیەکی دۆزیووەتەوە بۆ تانەدان لەو فەرموودەیەی کە ئەبو هورەیرە(خوای لێ رازیی بێ)گێڕاویەتییەوە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە

فەرموویەتی: "يدخل فقراء أمتي الجنة قبل أغنيائهم بنصف يوم وذلك خمسمائة عام"[1]،واتا: هەژارانی ئوممەتەکەم بەنیو رۆژ کە پێنجسەد ساڵی دونیا دەکات پێش دەوڵەمەندانی ئوممەتەکەم دەچنە بەهەشتەوە. ترمیزیی وتوویەتی: فەرموودەیەکی (حسن صحيح)ە.

لەفەرموودەیەکی ئیبن عومەردا کە موسلیم لەصەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی:"إِنَّ فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ يَسْبِقُونَ الْأَغْنِيَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَرْبَعِينَ خَرِيفًا"[2]،واتا: هەژارانی موهاجیرین چل پایز پێش دەوڵەمەندەکان دەچنە بەهەشتەوە.

لەموسنەدی پێشەوا ئەحمەددا لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)هاتووە فەرموویەتی:"هَلْ تَدْرُونَ أَوَّلَ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ؟» ، قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ يُتَّقَى بِهِمُ الْمَكَارِهُ، يَمُوتُ أَحَدُهُمْ وَحَاجَتُهُ فِي صَدْرِهِ لَا يَسْتَطِيعُ لَهَا قَضَاءً"[3]،واتا: ئایە دەزانن یەکەمین کەسێك دەچێتە بەهەشتەوە کێیە؟ وتیان: خواو پەیامبەرەکەی دەزانن. فەرمووی: هەژارانی موهاجیرین کە ناخۆشیی زۆریان بەسەردا هاتووە، لێیان هەیە دەمرێ و حەزو پێداویستییەکەی لەدڵ و سنگیدایە و ناتوانێ بەجێیبهێنێ.

لەجامیعی ترمیزییدا فەرموودەیەکی جابر(خوای لێ رازیی بێ)هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی:«يَدْخُلُ فُقَرَاءُ أُمَّتِي الْجَنَّةَ

---

[1] - صحيح لغيره، ترمیزی(٢٣٥٣) و ئیبن ماجه(٤١٢٢) و ئەحمەد(٢/ ٢٩٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] - موسلیم(٢٩٧٩)ئیخراجی کردووە.

[3] - صەحیحە، ئەحمەد(٢/ ١٦٨) و بەزار(٢٦٦٥) و تەبەرانیی لە المعجم الكبير(١٣/ ١٥١) و ئەبو نەعیم لە الحلية(١/ ٣٤٧) ئیخراجیان کردووە.

قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ بِأَرْبَعِينَ خَرِيفًا»[1]،واتا: هەژارانی ئوممەتەکەم چل پایز پێش دەوڵەمەندەکانیان دەچنە بەهەشتەوە.

ئەم فەرموودانەو هاوشێوەکانی تریان، دروست و راشکاوان بەوەی هەژارانی هاوەڵان پێش دەوڵەمەندەکانیان دەچنە بەهەشتەوە، لەزوو رۆیشتنە بەهەشتدا جیاوازن، هەیانە پێنجسەد ساڵ پێش ئەوانی تر دەچێتە بەهەشتەوە، هەیە بەچل ساڵ پێش ئەوانی تر، ئەمەش شتێك نییە بەرانبەر پێگەو مەقامی ئەوانەی دواتر دەچنە بەهەشتەوە، لەنێویاندا هەیە پێگەو پلەی بەرزترە لەو کەسەی پێش ئەو چووەتە بەهەشتەوە، با بۆ لێپرسینەوەش دواکەوتبن، بۆ نمونە پێشەوای دادپەروەر، کەسانێکی پێش دەکەوێ لەچوونە بەهەشتەوە کە هیچ کاروبارێکی موسڵمانانیان لەدەست نەبووە، لەکاتێکدا پێشەوای دادپەروەر پێگەو پلەی لەهەژار بەرزترو گەورەترەو لەهەموو کەسێکی تر نزیکترە بەخوای گەورە، هەروەك لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە لەعبداللەی کوڕی عەمرەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە ئەفەرمووێت: «الْمُقْسِطُونَ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ عَنْ يَمِينِ الرَّحْمَنِ وَكِلْتَا يَدَيْهِ يَمِينٌ الَّذِينَ يَعْدِلُونَ فِي حكمهم وأهليهم وما وُلّوا»[2]،واتا: دادپەروەران لەرۆژی قیامەتدا لەسەر مینبەری نوورینن لای راستی پەروردگار، ئەوانەی لەحوکم و بڕیاری نێو کەسوکار و دەسەڵاتیاندا دادپەروەرن.

لەترمیزییدا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەبو سەعیدی خودرییدا(خوای لێ رازیی بێ) لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی: «إِنَّ أَحَبَّ النَّاسِ

---

[1] - زۆر لاوازە، ترمیزی(٢٣٥٥)ئیخراجی کردووە.

[2] - موسلیم(١٨٢٧)ئیخراجی کردووە.

إِلَى اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَقْرَبَهُمْ مِنْهُ مَجْلِسًا إِمَامٌ عَادِلٌ، وَإِنَّ أَبْغَضَ النَّاسِ إِلَى اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَشَدَّهُمْ عَذَابًا إِمَامٌ جَائِرٌ»[1]، واتا:خۆشەویسترین کەسێك بەلای خوای گەورەوە لەڕۆژی قیامەتدا و نزیکتر بێ لەخوای گەورەوە، پێشەوایەکی دادپەروەرە، بوغزاوترین کەسێکیش لەڕۆژی قیامەتدا لای خوای گەورەو سەختترین ئەشکەنجەی هەبێ، پێشەوایەکی ستەمکارە.

پێشەوای دادپەروەرو دەوڵەمەند بەهۆی لێپرسینەوەیانەوە دەرنگ دەکەون بۆ چوونە بەهەشت، لەدوای چوونە بەهەشتەوە پلەو مەقامیان لەو هەژارە بەرزترە کە پێشتر چووەتە بەهەشتەوە، ئەوەشی کە عەبدولڕەحمان گیر دەدرێ بۆ لێپرسینەوەکردنی لەسەر سەروەت و سامانەکەی و دواتر بەپەیامبەرو هاوەڵان دەگات، لەبەر تووڕەبوونی خوا نییە لەعەبدولڕەحمان و کەمکردنەوەی پێگەو پلەی نییەو دژ نییە بەوەی شایەتیی چوونە بەهەشتی بۆ دراوە.

بەڵام ئەوەی بەخشکەو کشان دەچێتە بەهەشتەوە، ئەوە بەو جۆرەیە کە پێشەوا ئەحمەد(بەڕەحمەت بێ) باسیکردووەو ئەڵێ: درۆیە(کذب منکر)، هەروەها نەسائیی ئەڵێ: هەڵبەستراوە(مەوزوعە).

پێگەی عەبدولڕەحمان و جیهادو بەخشینە گەورەکانی و خێرەکانی، ئەوە دەخوازن لەگەڵ ئەوانەدا بچێتە بەهەشتەوە کە وەك هەورە برووسکە خێرا دەگەنە بەهەشت نەك بەخشکە رۆیشتن.

## بەش

خوای گەورە هەروەك چۆن مەخلوقاتی دروستکردووە، دروستکەری هۆکاری هەژاربوون و دەوڵەمەندبوونیشیانە، دەوڵەمەندیی و هەژاریی دروستکردووە بۆ

[1] - لاوازە، ترمیزی(١٣٢٩) و ئەحمەد(٣/ ٢٢) و بەیهەقیی لە الشعب(٧٣٦٦)ئیخراجیان کردووە.

تاقیکردنەوەی بەندەکانی تاوەکو دەرکەوێ کامەیان باشترین کارو کردەوەیان هەبووە و کردوویەتییە هۆکاری گوێڕایەڵی و سەرپێچی و پاداشت و سزا، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴾ الأنبياء: ٣٥، واتا:ئێمە تاقیتان دەکەینەوە بە خراپەو ناخۆشی وە بە چاکەو خۆشی تا دەرکەوێ(چاك و خراپ) وە هەر بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە.

ئیبن عەباس(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: سەختی و خۆشی و لەشساغی و نەخۆشی و دەوڵەمەندیی و هەژاری و حەڵاڵ و حەرام هەمووی بۆ تاقیکردنەوەو بەلایە[1] .

ئیبن زەید ئەڵێ: تاقیتان دەکەینەوە بەو شتەی حەزی لێ دەکەن و بەو شتەی حەزی لێناکەن تاوەکو ئارامگری و سوپاسگوزارییتان ببینین.

ئەلکەلبیی ئەڵێ: بەناخۆشی: هەژاری و بەلا، بەخێرو خۆشی: بەماڵ و منداڵ.

خوای گەورە هەواڵی داوە کە دەوڵەمەندیی و هەژاری، بەلاو تاقیکردنەوە دەهێنن و ئەفەرمووێ: ﴿ فَأَمَّا الْإِنسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ ۝ وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ ﴾ الفجر: ١٥ — ١٦، خوای گەورە هەواڵی داوە کە بەندەی خۆی تاقیدەکاتەوە بەڕیزلێنان و نیعمەت پێ بەخشین و ئاسان دەسکەوتنی رزق و رۆزی، هەروەك تاقیدەکاتەوە بەسەختی و گران دەسکەوتنی رزق و رۆزی، هەردوو شتی بەتاقیکردنەوەی بەندە داناوە، پاشان خوای گەورە رەتیدەکاتەوە قسەی ئەو کەسەی نازونیعمەتی خوا بەڕێز لێنانی خۆی دادەنێ و دەسکورتبوونیشی

---

[1] - ئیبن جەریر لە تەفسیرەکەیدا(١٩/١٩)ئیخراجی کردووە، بڕوانرێتە (الدرر المنثور)ی السیوطي(٥/ ٦٢٩).

بەئیهانەی خوا بۆ خۆی دادەنێ، ئەفەرمووێ نەخێر بەو جۆرە نییە کە ئەو مرۆڤە ئەیڵێ، بەڵکو بەنیعمەتی من تاقیکراوەتەوەو بەبەڵاو ناخۆشیشم نیعمەتی پێ دراوە.

ئەگەر لەوشەکانی ئایەتەکە رابمێنی، ئەوە ئەم واتایە روون و راشکاو دەبینی، پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ﴾ الأنعام: ١٦٥، واتا: خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی کردووە بە جێنشینانی زەوی(کۆمەڵ لەدوای کۆمەڵ دێن)چەند پلە هەندێکتانی بەرز کردۆتەوە بەسەر هەندێکی ترتاندا بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە لەوەدا کەپێ ی بەخشیوون.

هەروەها فەرموویەتی:﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۝٧ ﴾ الكهف: ٧، خوای گەورە هەواڵی داوە کە زەویی رازاندووەتەوە بەو سەروەت و سامان و شتانەی لەسەری هەیە هەمووی بۆ تاقکردنەوە، هەروەك مردن و ژیانیشی هەر بۆ ئەوە دروستکردووە، ئاسمانەکان و زەوییشی بۆ ئەو تاقیکردنەوەیە دروستکردووە.

ئەوە سێ شوێنی قورئانە خوای گەورە تیایدا هەواڵ دەدات، کە خۆیەتی ئاسمانی باڵاو نزم و ئەوەی لەنێوانیاندا هەیە دروستکردووە، تەمەنی جیهان و کەسوکارو هۆکاری بژێویان کە کردوویەتییە جوانیی زەوی لەئاڵتوون و زیوو خانوو بەرگ و هۆکاری گواستنەوەو کێڵگەو کشتوکاڵی و درەختی بەردارو ئاژەڵ و ژن و منداڵ، شتانی تریشی هەموو بۆ تاقیکردنەوە دروستکردووە، تاوەکو

مـەخلوقاتی خـۆی تاقیبکاتـەوە کـە کامـەیان گوێڕایـەڵترو رازیـیترو باشـترین کاروکردەوەی هەیە.

ئەوە ئەو حەقەیـە کـە مـەخلوقاتی بەهۆیـەوە دروسـتکردووە، ئاسمانـەکان و زەوی و ئـەوەی لەنێوانیاندایـە هـی ئـەوەو پاداشـت و سـزاش ئامـانجی ئـەوە، لەدەسـتدان و لەکارخسـتنی ئەوەشـی بـەدوور لـەخۆی دانـاوەو هـەموو ئەوانـەی لـەخۆڕا دروسـت نـەکردووە، هـەواڵی داوە کـە لـەوە بـەرزترو بـاڵاترە شـتەکانی لـــەخۆڕا دروســـتکردبێ، پادشانشـــین و موڵکەکـــەی حەقـــەو خوایـــەتی و پـــەروەردگارێتیی هـــەموو شـتێك تـەنیا بـۆ خۆیـەتی، ئـەو گومانـە درۆینـەو ئەژماردەکردنە درۆینە رەتدەکاتـەوە، هـەروەك دەفـەرمووێت: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾ المؤمنـون: ١١٥ – ١١٦، واتـا: ئایـا ئێـوە گومانتان وا بوو کە بێگومان ئێوەمان بەبێ هوودە دروست کـردووە وە بێگومـان ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە. جا بەرزو بڵنـدی بـۆ خـوای پاشـای ڕاسـت و ڕەوا هیچ پەرستراوێك نی یە جگە لەو کە پەروەردگاری عەرشی بەڕێزو بەرزە.

خوای گەورە خۆی پاکڕاگرتووە لـەوەی ژیـانی لـەخۆڕا دروسـتکردبێ و خـۆی پاك و بێگەرد راگرتووە لەهاوبەش دانان و منداڵ و هاوەڵ و تەواوی ئەو عـەیب و ناتەواویانەی تر لەنمونەی وەنەوز و خـەوو ماندوویـەتی و پێویسـتبوون و بـوونی تکاکـاری بەردەسـتی بـەبێ مۆڵـەتی خـۆی، هـەروەك هاوبـەش پەیداکـەرە دوژمنـەکانی وەهـای گومـان دەبـەن و، هەندەکییـەکانی جیهـان و هەنـدێ شـتی جیهان لەزانستی ئەو جیادەکەنەوە.

هەروەك كـەماڵی پـیرۆزو كـەماڵی نـاو و سیفەتەكانیشـی ئـەوە رەتدەكاتـەوە لەخۆڕا شتەكانی دروستكردبێ و فەرمان و نەهییەكی بۆیان بوونی نـەبێ، نـاكرێ پاداشـتێكی نـەبێ بـۆ چـاكەكاران و سـزایەكی نـەبێ بـۆ تاوانكارەكانیـان و پووچـەڵكاران بـزانن درۆزن بوونـەو شـایەتییان پـێ دەدات كـە پەیامبـەران و شوێنكەوتەكانیشیان لەپێشترن بەڕاستگۆیی و پەیوەندیی پێوەی كردنیان.

هەركەسـێ ئـەو پەیامـەی پەیامبـەرانی رەتكردبێتـەوە، ئـەوە خوایـەتیی پەروەردگارێتیی خواو پادشاییە حەقیقییەكەی خوای رەتكردووەتـەوە، ئـەوەش خـودی بێباوەڕییـە بەرانبـەر بـەخوای گـەورە، نمونـەی ئـەو بـاوەڕدارەی بـەو هاوەڵـەی ئـەڵێ كـە گفتوگـۆی زیندوبونـەوەی كـردووەو هاوەڵەكـەی ئـەوەی رەتكردووەتـــــەوە: ﴿ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ ﴾ الكهـــف: ٣٧، واتـــا: هـــاورێ (ئیمانداره)كەی پێی وت لە كاتێكدا كـە گفتوگۆی لەگەڵدا دەكـرد ئایا تـۆ بـێ باوەڕیت بەو زاتەی كە تۆی لـە خـاك دروسـت كـردووە پاشـان لـە دڵۆپـە ئاوێك پاشان كردوێتی بە پیاو.

بەهاوەڵەكـــەی وت، كـــە رەتكردنـــەوەت بـــۆ بابـــەتی زیندووبوونـــەوە بێباوەڕییكردنە بەخودی خوای گـەورە، پـەروەردگاریش دەفـەرمووێت: ﴿ ۞ وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ﴾ الرعد: ٥، واتا: جا ئەگـەر تـۆ سـەرت سـوڕ بمێنـێ ئـەوەی قسەی ئەوانە جێ ی سەر سوڕمانە كە دەڵێن ئایا كاتێ(كە مردین و)بووینەوە بە خاك ئایا ئێمە سەر لەنوێ دروست ئەكرێینەوە ئەوانـە كەسـانێكن كـە بـێ بـاوەڕ بوون بە پەروەردگاریان.

بێگومان رەتکردنەوەی زیندووبوونەوە، رەتکردنەوەی تواناو کارو حیکمەت و دەسەلاتی حەق و پەروردگارو خواییەتی خوای پەروەردگار دەگەیەنێ، هەروەك بەدرۆخستنەوەی پەیامبەرانیشی هەمان شت دەگەیەنێ.

هەرکەس پەیامبەرانی بەدرۆبخاتەوەو قیامەت رەتبکاتەوە، ئەوە پەروەردکاریێتیی خوای گەورەی رەتکردووەتەوەو رەتیکردووەتەوە الله پەروەردگاری جیهانیان بێ.

مەبەست ئەوەیە، خوای گەورە دەوڵەمەندی و هەژاریی دروستکردووە بەمەبەستی تاقیکردنەوە، سەروەت و سامانی تەنیا بۆ چێژوەرگرتن بەمرۆڤ نەداوە، هەروەك لەموسنەددا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی:" إِنَّ اللهَ قَالَ: إِنَّا أَنْزَلْنَا الْمَالَ لِإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَلَوْ كَانَ لِابْنِ آدَمَ وَادٍ من مال، لابتغى أَنْ يَكُونَ له ثَانٍ، وَلَوْ كَانَ لَهُ ثانٍ لابتغى أَنْ يَكُونَ لَه ثَالِثاً، وَلَا يَمْلَأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلَّا التُّرَابُ"[1]،واتا:خوای گەورە دەفەرمووێت: ئێمە سەروەت و سامانمان داوە بۆ راپەراندنی نوێژو زەکات دان، گەر ئەوەی ئادەم شیوێ سەروەت و سامانی هەبووایە ئەوە هەوڵی بۆ پەیداکردنی شێوێکی تر دەدا، گەر دووانی هەبووایە هەوڵی بۆ شیوی سێیەم دەدا، تەنیا خۆڵ سکی ئەوەی ئادەم تێر دەکات.

پەروەردگار هەواڵی داوە بەوەی، سەروەت و سامانی دابەزاندووە تاوەکو مرۆڤ پشتی پێ ببەستێ لەبەجێگەیاندنی مافی خۆی لەنوێژکردن و گەیاندنی مافی بەندەی بەزەکاتدان، تەنیا بۆ چێژ وەرگرتن داینەبەزاندووە وەك ئەوەی

[1] - صەحیحە، ئەحمەد(٥/ ٢١٩) و تەبەرانیی لە المعجم الكبير(٣٣٠٠) و بەیهەقیی لە الشعب(١٠٢٧٧) ئیخراجیان کردووەو پیاوەکانیشی متمانەدارن.

ئاژەلأن چێژی لیّ دەبینن. گەر سەروەت و سامان لەوە زیاتر بوو، یان لەو دوو مەبەستە لایدا کە بەنوێژ کردن مافی خوا بدریّ و بەزەکاتیش مافی بەندەکان،ئەوە خۆلّ بۆی باشتر و لەپێشترە و لەجیاتی ئەو ئیمان و زانستەو حیکمەتەی خوا داوێتی سکی پیّ تێر بکات، خوای گەورە دلّی بۆ دروستکردووە تاوەکو شوێنی ناسینی خوای گەورەی خالیقی بیّ و جێی باوەڕبوونی بیّ بەخواو خۆشویستن و یادی خوای گەورە، سەروەت و سامانیشی بۆ دابەزاندووە تاوەکو هاوکارو پشتیوانی بیّ بۆ ئەو کارە، بەلأم کەسی نەفام بەرانبەر خواو فەرمان و یەکتاناسین و ناو و سیفەتەکانی، دلّ و و ناو سکی خۆی لەکار دەخات لەوەی بۆی دروستکراوەو پڕی دەکات لەسەروەتی لەنێوچوو، ئەو سەروەتەی خاوەنەکەی بەجێدەهێلّیّ یان خاوەنەکەی ئەو بەجێدەهێلّیّ و دەگەڕێتەوە دونیایەکی تر، هەر سەرقالّی کۆکردنەوەو زۆرکردی ئەو سەروەت و سامانەیە، لەگەلّ ئەوەشدا ئەو دلّ و سکەی لەپارە پڕ نابیّ، هەر هەژارترو پێداگرتر ئەبیّ تاوەکو سکی بەو خۆڵە تێرو پڕ دەبیّ کە لێیەوە دروستکراوە، دەگەڕێتەوە ئەو ماددە خۆڵەی کە خۆی و سەروەتەکەی لێیەوە دروستکراون و ماددەی خۆی بەزانست و ئیمان تێر ناکات و ناخی پڕ ناکات لەو دوو شتەی کە کەمالّ و رزگاربوون و بەختەوەریی دونیاو قیامەتی ئەون.

بێگومان سەروەت و سامان گەر سوودیان بەخاوەنەکەی نەگەیاند، ئەوە زیانە بۆی، زانست و دەسەلأت و تواناش هەر بەو جۆرەیە، گەر سوودیان بۆ خاوەنەکەی نەبوو بێگومان زیانی پیّ دەگەیەنن. ئەو کاروبارانە ئامراز گەلێکن لەخێرو خراپەدا پشتیان پیّ دەبەسترێت، گەر بۆ گەیشتنە مەبەست و ئامانجە

پیرۆزەکـان لەکاریخسـت، بێگومـان بـۆ خراپـەکان پشـتی پـێ دەبەسـتێت، زیانمەندترینی نێـو خـەڵکیش کەسێکە بۆ گەیشتنە هەواو ئارەزوو مەبەستە خێراکـانی دونیـا پشـتیان پـێ ببەسـتێ، بێگومـان بـەوە دونیـاو ئـاخیرەتی زیانکردووە.

ئەمەو ئەگەر ئامرازەکانی نەکردبێتـە ئامـانج و مەبەست، بـەڵام گـەر وەهـای کردبێ زیانمەندە، گەر کردیە ئـامرازێ بـۆ گەیشتنە پێچـەوانەی مەبەست، وەك کەسێکە ئامرازەکـانی خۆشـیی بـەکاربهێنێ بـۆ گـەورەترین و سـەختترین ئـازارو ناخۆشی.

بۆیـە بەشـەکان چـوار دانـەن و پێنجـەمیان نییـە، یەکـەم: لەکارخـەری هۆکارەکان، پشت تێکردنی.

دووەم: مانەوە لەسەری بۆ کۆکردنـەوەو بەدەسـتهێنانی. سـێیەم: بەهۆیـەوە گەیشتنە ئەو شتەی لەژیانی دونیاو ئاخیرەتیدا زیانی پـێ دەگەیـەنێ و سـوودی پـێ ناگەیـەنێ، ئـەو سـێ جـۆرە زیانمەنـدن. چـوارەم: پێیـەوە دەگاتـە ئـەوەی لەژیانی دونیاو ئاخیرەتیدا سوودی پـێ دەگەیـەنن، ئەمـە براوەیـە، پـەروەردگار دەفـــــەرموێت:﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيۡهِمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فِيهَا وَهُمۡ فِيهَا لَا يُبۡخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ هـــود: ١٥ – ١٦، واتـــا: هەرکـــەس دەیـــەوێ ژیـــانی دنیـــاو ڕازاوەو جـــوانی ئـــەو ئێمە(بەرهەمی)کردەوەکانیان بە تەواوی پێ دەدەین تیایدا وە ئەوان لەم ژیانەدا کەم و کوڕی یان لەگەڵ ناکرێت. ئەوانە کەسانێکن بۆیان نی یە لـە ڕۆژی دوایـی

دا جگە لە ئاگر وە ئەوەی کردیان تێیدا پـوچ و بـێ بەرهـەم بـووە وە هەرچیان کرد بەردەوام بوو بەهیچ.

تێگەیشتنی ئەم ئایەتە بـۆ زۆرێـك خـەڵکیی ئـاڵۆز بـووە، وەهـا تێگەیشـتوون هەرکەسێ دونیـاو خۆشـییەکانی دونیـای بـووێ بـەر ئـەم هەڕەشـەیە کـەوتووە، پاشان لەبارەی واتاکەیەوە جیاواز بوونە، کۆمەڵێکیان وتوویانە(لەنێویانـدا ئـیبن عـەباس)ە: هەرکەسـێ پەلـەیی و خێرایـی دونیـای بـووێ، ئـەوە بـاوەڕی بەزیندووبوونـەوەو پاداشـت و سـزا نییـە و وتوویانـە: ئـەم ئایەتـە سـەبارەت بەبێباوەڕانە بەتایبەت بەقسەی ئیبن عەباس.

قـەتادە ئـەڵێ: هەرکەسـێ دونیـا خـەمی بـێ و بـۆی پێـداگربێ و جێـی نیـازو ویستی بێ، ئەوە لەدونیادا خـوای گـەورە بەچاکەی خـۆی پاداشـتی دەداتـەوە، بەلام لەئاخیرەتدا هیچ چاکەیەکی نییـە پێـی پاداشـت بدرێتـەوە، بـەلام کەسـی باوەڕدار بەچاکەی خۆی لـەدونیادا پاداشـت دەدرێـت و لـەئاخیرەتیش پاداشـتی لەسەر وەردەگرێ.

وتوویانە: ئەو ئایەتە سەبارەت بەبێباوەڕانە، بەبەڵگەی:﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٦ ﴾ هود: ١٦، واتا: ئەوانە کەسانێکن بۆیان نی یە لە ڕۆژی دوایی دا جگە لە ئاگر وە ئەوەی کردیان تێیدا پوچ و بـێ بەرهـەم بـووە وە هەرچیان کـرد بـەردەوام بـوو بەهیچ.

وتوویانە: باوەڕدار ویستی دونیاو ئاخیرەتی هەیـە، هەرکەسـێ تـەنیا ویسـتی دونیای هەبێ مرۆڤێکی باوەڕدار نییە.

ئیبن عەباس(خوا لەخۆی و باوکی رازیی بێ) لەگێڕانەوەیەکی ئەبی ساڵحەوە لێیەوە وتوویەتی: ئەم ئایەتە لەبارەی ئەهلی قیبلەوە دابەزیووە.

موجاهید وتوویەتی: لەبارەی ریاکارەکانەوە بووە.

زەحاك[1] ئەڵێ: هەر ئیماندارێك کارێکی چاکە ئەنجام بدات و نییەتی خوای نەبێ بەو کارە، ئەوە پاداشتی کارەکەی لەدونیادا بۆی پێشدەخرێت.

فەرائیش ئەم بۆچوونەی هەڵبژاردووەو ئەڵێ: هەر ئەهلی قیبلەیەك بەکارەکەی پاداشتی دونیای بووێ، ئەوە پاداشتەکەی بۆی پێشدەخرێت و کارەکەی بۆ سووك ناکرێت.

ئەمە قسەو بۆچوونی بارسەنگە، واتای ئایەتەکەش بەم شێوەیە ئەکات: هەرکەسێ بەئەنجامدانی کارێکی دونیاو جوانییەکانی دونیای مەبەست بێ ئەوە باوەڕدار نییە، چونکە مرۆڤی تاوانبارو خراپەکار چەندە لەتاوان و خراپەشدا زیادەڕۆبن، ئەوە باوەڕیان هانیان دەدات کارە باشەکانیان بۆ خوای گەورە ئەنجام بدەن، گەرچی کاری خراپەش ئەنجام بدەن، بەلاّم کەسێك خوای مەبەست نەبوو تەنیا دونیاو خۆشییەکانی دونیا نەبێ، ئەوە ناچێتە نێو چوارچێوەی بازنەی ئیمانەوە. موعاویەش هەر بەو جۆرە لەو ئایەتە گەیشتبوو، بەڵگەی بەو فەرموودەیەی ئەبو هورەیرە هێناوەتەوە کە موسلیم لەصەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەبارەی ئەو سێ کەسەی لەرۆژی قیامەتدا لەدۆزەخدا دەسووتێنرێن[2]: ئەو قورئانخوێنەی کە قورئان دەخوێنێتەوە تاوەکو

---

[1] - زەحاك(الضَّحَّاك)ی کوڕی موزاحیمی ئەلهیلالیی ئەلبەلخیی ئەلخۆراسانی، مامۆستایەکی پایەبەرز و راڤەوانێکی بەناوبانگە بووە، ساڵی١٠٥ك مردووە.

[2] - موسلیم(١٩٠٥)ئیخراجی کردووە.

پێی بووترێ فلآنە کەسی قورئانخوێن، ئەو کەسەی پارەو سەروەت دەبەخشێ تاوەکو پێیبووترێ فلآنە کەسی خێرۆمەند، ئەو جەنگاوەرەی لەجیهاددا شەڕ دەکات تاوەکو پێیبووترێ ئازاو چاونەترس.

هەروەك هەڵبژاردەکانی دروستکراوانی خوای گەورە کە پەیامبەران و راستگۆیان و شەهیدان و چاکەکارانن، دەکرێ خەڵکانی خراپیش خۆیان بەوان بشوبهێنن و لەڕیزی ئەوانیشدا نیین، جا هەرکەسێیش رووپامایانە خۆی بەخەڵکانی ڕاستگۆو دڵسۆزیش بشوبهێنێ وەك کەسێکە بەدرۆوە خۆی بەپەیامبەران بشوبهێنێ.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: موحەممەدی کوڕی ئیدریس بۆی باسکردم وتی: عەبدولحەمیدی کوڕی سالح هەواڵی پێدام، قوتنی کوڕی ئەلحەباب بۆی باسکردین لە عەبدولواریثەوە ئەویش لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوای لێ رازیی بێ)وتی: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی: " إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ صَارَتْ أُمَّتِي ثَلَاثَ فِرَقٍ: فِرْقَةٌ يَعْبُدُونَ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ خَالِصًا، وَفِرْقَةٌ يَعْبُدُونَ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ رِيَاءً، وَفِرْقَةٌ يَعْبُدُونَ اللهَ يُصِيبُونَ بِهِ دُنْيَا. قَالَ: فَيَقُولُ لِلَّذِي كَانَ يَعْبُدُ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ لِلدُّنْيَا: بِعِزَّتِي وَجَلَالِي، مَا أَرَدْتَ بِعِبَادَتِي؟ فَيَقُولُ: الدُّنْيَا. فَيَقُولُ: لَا جَرَمَ، لَا يَنْفَعُكَ مَا جَمَعْتَ وَلَا تَرْجِعُ إِلَيْهِ، انْطَلِقُوا بِهِ إِلَى النَّارِ، قَالَ: وَيَقُولُ لِلَّذِي يَعْبُدُ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ رِيَاءً: بِعِزَّتِي وَجَلَالِي، مَا أَرَدْتَ بِعِبَادَتِي؟ قَالَ: الرِّيَاءَ. قَالَ: يَقُولُ: إِنَّمَا كَانَتْ عِبَادَتُكَ الَّتِي كُنْتَ تُرَائِي بِهَا لَا يَصْعَدُ إِلَيَّ مِنْهَا شَيْءٌ، وَلَا يَنْفَعُكَ الْيَوْمَ انْطَلِقُوا بِهِ إِلَى النَّارِ، قَالَ: وَيَقُولُ لِلَّذِي كَانَ يَعْبُدُ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ خَالِصًا: بِعِزَّتِي وَجَلَالِي، مَا أَرَدْتَ بِعِبَادَتِي؟ فَيَقُولُ: بِعِزَّتِكَ وَجَلَالِكَ، لَأَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي كُنْتُ أَعْبُدُكَ

لِوَجْهِكَ وَلِدَارِكَ، قَالَ: صَدَقَ عَبْدِي انْطَلِقُوا بِهِ إِلَى الْجَنَّةِ "[١]،واتا: لەڕۆژی قیامەتدا ئوممەتەکەم دەبێتە سێ کۆمەڵەوە: کۆمەڵێکیان بۆ دونیا خوایان پەرستووە، کۆمەڵێکیان بۆ ریاو ناوبانگیی پەرستنیان کردووە، کۆمەڵێکیان لەبەر خواو بەهەشتەکەی خواپەرستییان کردووە. خوای گەورە بەوانە ئەفەرمووێ کە لەبەر دونیا خواپەرستییان کردووە:بەعیزەت و پایەبەرزیی خۆم لەپەرستنی مندا ئێوە نییەتی چییتان هەبووە؟ ئەڵێن: بەعیزەت و پایەبەرزیی تۆ دونیامان مەبەست بووە، خوای گەورەش ئەفەرمووێ: من هیچ شتێکی لەو جۆرەم قبوڵ نەکردووە، بیانبان بۆ دۆزەخ، بەوانەش ئەفەرمووێ کە بۆ ناوبانگی و ریا خواپەرستییان کردووە:بەعیزەت و پایەبەرزیی خۆم لەپەرستنی مندا ئێوە نییەتی چییتان هەبووە؟ ئەڵێن: بەعیزەت و پایەبەرزیی تۆ ریاو ناوبانگییمان مەبەست بووە، خوای گەورەش ئەفەرمووێ: من هیچ کارێکی لەو جۆرەم قبوڵ نەکردووە، بیانبەن بۆ دۆزەخ. بەوانەش دەفەرمووێ کە لەبەر خواو بەهەشتی خوا خواپەرستییان کردووە:بەعیزەت و پایەبەرزیی خۆم لەپەرستنی مندا ئێوە نییەتی چییتان هەبووە؟ ئەڵێن: بەعیزەت و پایەبەرزیی تۆ تەنیا مەبەستی خۆت و بەهەشتی خۆتمان هەبووە، خوای گەورەش ئەفەرمووێ: راستتان کرد، بیانبەن بۆ بەهەشت.

ئەم فەرموودەیە پێویستی بەڕشتەی گێڕانەوە نییە، چونکە قورئان و فەرموودە بەڕاستی دەخەنەوە، بەڵگەی راستیی ئەوە فەرمایشتی خوای

---

[١] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەدونیا لە ذم الدنیا(٤١٣) و بەیهەقیی لە الشُعب(٦٨٠٨)ئیخراجی کردووە: عەبدولواریثی خزمەتکاری ئەنەسی تێدایە، (منكر الحديث)بووە.

گەورەیە کە دەفەرمووێت:﴿ نُوَفِّ إِلَيۡهِمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فِيهَا ﴾ هود: ١٥، واتا: بەرهەمی کردەوەکانیان بە تەواوی پێ دەدەین تیایدا.

کۆمەڵێك کە کارەکانیان لەبەر خوا ئەنجام نەداوەو تەنیا دونیایان مەبەست بووە، خوای گەورەش بەبێ کەمکردنەوە، پاداشتی کارەکانی داونەتەوە لەدونیادا و بەبێ بوونی کارێك گەڕاونەتەوە قیامەت و کارێکیان نەکردووە بۆ خوای گەورە شیاوبێ لەسەری پاداشت بدرێن، بۆیە ئەمە لەکەسێکدا روو نادات کە باوەڕی بەئاخیرەت هەبێ، جگە لەوانەی کە تاوانی گەورەیان ئەنجام داوەو تەوبەیان نەکردووەو بۆ یەکتاناسیین نەگەڕاونەتەوە.

ئیبن ئەلئەنباریی ئەڵێ: لەم واتایەدا کۆمەڵێکی موسڵمانانیش ئەگرێتەوە، کاری چاکەیان کردووە بۆ رێککردنەوەی کاروباری دونیای خۆیان و بیریان لەئاخیرەت نەبووە، ئەوە پاداشتی چاکەکانیان لەدونیادا دەدرێتەوە، کە ئاخیرەت هات پاداشتی ئەو کارەیان دۆزەخ ئەبێ، گەر لەبەر خواو وەرگرتنی پاداشتی ئاخیرەتیان نەبووبێت.

پاشان کەسانی خاوەن ئەم بۆچوونە، پرسیارێکیان لەخۆیان کردووەو وتوویانە: ئەگەر وترا: ئایەتی دووەم مرۆڤی باوەڕدار بەهۆی کارەکەیەوە لەدۆزەخ نەمر ئەهێڵێتەوە؟.

لەوەڵامدا وتوویانە: ئایەتەکە روون و ئاشکرایە گەر کەسێك بۆ ریا کاری ئەنجام داو نییەتی دەستخستنی پاداشتی ئاخیرەت نەبوو، هەموو بیرکردنەوەیەکی بۆ دونیا بوو، ئەوە لەمردندا خوای گەورە ئیمانەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە، کەسەکە بەئیمان بەرانبەر خوای گەورە وەفاداریی نەکردووە، بەبەڵگەی ئەم ئایەتە:﴿ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ

يَعۡمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ هود: ١٦، واتا: ئەوەی کردیان تێیدا پـوچ و بـێ بەرهـەم بـووە وە هەرچیان کرد بەردەوام بوو بەهیچ.

ئەمە بناغەو لقەکانی ئیمان دەگرێتەوە.

کۆمەڵێکی تر وەڵامیان داوەتەوە: ئەم ئایەتە ئەوە لەخۆ ناگرێ بەهەمیشەیی لەدۆزەخدا بن، بەڵکو باس لەو سزایەیە کە شیاویانە لەدۆزەخدا بیچێژن و کـاری چـاکەیان نـەبووە بەهۆیـەوە ئومێـدی رزگاربوونیـان هـەبێ، هەرکەسـێك یەکتاپەرست بێ بەتەواوکردنی سزاکەی لەدۆزەخ رزگاری دەبێ، ئەمـە بۆچـوونی ئیبن ئەلئەنباری و کەسانی تریشە.

سوپاس بۆ خوای گەورە ئایەتەکە کێشەی تیـادا نییـە، خـوای گـەورە باسـی ئەوەی کـردووە هەرکەسـێ بـەکاروکردەوەکانی، دونیـای مەبەسـت بـووبێ ئـەوە دەچێتە دۆزەخەوەو کارەکەی پـووچ و بـێ بنەمایـە، کـە کارەکـەی پـووچ و بـێ بنەما بوو شـتێکی بـۆ نامێنێتـەوە لـەدۆزەخ رزگـاری بکـات، بـەڵام گـەر ئیمـانی لەتەکدا بوو دونیاو خۆشییەکانی دونیای مەبەست نەبوو، بەڵکو خواو ئـاخیرەتی مەبەسـت بـوو، کارێکیشـی نـەکرد ئـەو کـارە چـاکانەی بـۆ پـووچ و بـێ بایـەخ بکات،ئیمانەکـەی رزگـاری دەکـات و نـاهێڵێ لـەدۆزەخ نـەمر بمێنێتـەوە ئەگـەر بەهۆی تاوانێکیشەوە بخرێتە دۆزەخەوە.

ئیمـان دوو جـۆرە: ئیمانێـك رێگریـی دەکـات لـەوەی باوەڕدارەکـە بخرێتـە دۆزەخەوە، ئەو ئیمانەیە کە هاندان دەکات هەموو کارەکان لەبەر خاتری خـوا و پاداشـتی خـوایی ئـەنجام بـدرێن، ئیمـانێکی تـریش کـە نـاهێڵێ باوەڕدارەکـە لەدۆزەخدا نەمربێ.

هاوشێوەی ئەم ئایەتە لەئایەتەکانی هەڕەشەدا بوونیان هەیە، خوای گەورە سەلامەتمان بکات، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ ﴾ ( الإسراء: ١٨ – ١٩ )

واتا: هەر کەسێك تەنها ژیانی دنیای بوێ لەم(دنیا)دا زوو پێ ی دەدەین ئەوەی بمانەوێ بۆ هەر کەسێك لە پاشان دۆزەخمان بۆ سازداوە دەچێتە ناوی بە لۆمەکراوی و دەرکراوی لەمیهرەبانی خوا. هەر کەسێکیش مەبەستی ڕۆژی دوایی بوبێت وە هەوڵی بۆ بدات بەو جۆرەی شایستەی ئەوەو باوەڕداریش بێت ئایا ئەوانە کردەوەو تێکۆشانەکەیان وەرگیراوە.

ئەمە سێ شوێنی قورئانە لەیەك دەچن و یەکتر بەڕاست دەخەنەوەو لەسەر یەك واتا کۆکن، ئەویش ئەوەیە: هەرکەسێ دونیای مەبەست بێ و ئەوپەڕی هەوڵی بۆ بدات، ئەوە لەئاخیرەتدا هیچ پشکێکی بۆ نابێ، هەرکەسێکیش ئاخیرەتی مەبەست بێ و هەوڵی بۆ بدات و ئەوپەڕی ئامانجیشی بێ، ئەوە ئاخیرەتی بۆ هەیە.

ماوەتەوە بووترێت: حوکمی ئەو کەسە چییە دونیاو ئاخیرەتی پێکەوە بووێ، کەوتبێتە نێو حوکمی دوو ویستەوە، ئاخۆ کامەیان گرنگترو ئەوی تر پاشکۆ ئەبێ؟

لەوەڵامدا وتراوە: لێرەوە کێشەو ناڕوونیی دروست دەبێ، هەندێ لەڕاڤەوانان وەها تێگەیشتوون ئایەتەکە سەبارەت بەمرۆڤی بێباوەڕە کە دونیای دەوێ و

ئاخیرەتی مەبەست نییە، ئەمە یەکلاکەرەوە نییە، چونکە مرۆڤی بێباوەڕیش هەیە ئاخیرەتی مەبەستە، هەندێ موسڵمانیش هەیە هەموو مەبەستێکی تەنیا دونیایە، خوای گەورەش بەختەوەریی و خۆشیی بەئاخیرەتەوە پەیوەست کردووە، بەدبەختییش بەدونیاویستییەوە، کە هەردوو ویست لەمرۆڤ داماڵرا،ئەوکات خۆشبەختی و بەدبەختییش بوونیان نابێ، کە هەردووکیشیان لەمرۆڤدا کۆبوونەوە،ئەوە حوکمی کۆبوونەوەی چاکەو خراپەو گوێڕایەڵی و سەرپێچی و ئیمان و هاوبەش دانانی پەرستشیان هەیە، خوای گەورە لەبارەی باشترین بەندەکانی دوای پەیامبەران فەرموویەتی:﴿ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ ﴾ آل عمران: ١٥٢، واتا: هەندێك لە ئێوە(دەسکەوتی)دنیایی دەویست وە هەندێکتان پاداشتی ڕۆژی دوای دەویست.

ئەمە رووی قسەیە بۆ ئەوانەی لەگەڵ پەیامبەردا بەشداری جیهاد بوون، دووڕوویان تێدا نەبووە، لەمەدا عبداللەی کوڕی مەسعود(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: هەستم نەکرد هاوەڵانی پەیامبەری خوا دونیایان ویستبێ تاوەکو رۆژی ئوحود نەبێ کە ئەم ئایەتە دابەزی[1].

ئەوانەی لەم ئایەتەدا مەبەست بن، ئەوانەن کە شوێنەکانی خۆیانیان چۆڵکرد لەکاتێکدا پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمانی پێدابوون ئەو شوێنانە بپارێزن، چاکەکانی نێو موسڵمانانیش بوون، بەڵام ئەم ویستە بەربەستکارە وەهای لێکردن شوێنەکانیان چۆڵبکەن و بڕۆن بەدەم کۆکردنەوەی

---

[1] - حسن، ئەحمەد(٤٤١٤)ئیخراجی کردووەو ئەلعێراقییش لە: المغني عن حمل الأسفار(٤/ ٢١٩)بەحەسەنی داناوە.

دەسکەوتەکانەوە، ئەمەی ئەوان پێچەوانەی کاری ئەوانەیە کە بەکارەکەیان دونیایان مەبەستە، بۆیە ئەم ویستە رەنگ و جۆرێکەو هی خەڵکە دونیاویستەکانیش جۆرو رەنگێکی ترە.

لێرەدا شتێك هەیە دەبێ بۆی بەئاگابین، ئەویش ئەوەیە ویستی دونیاو خۆشییە خێراکانی لەکارە باشەکاندا بەبێ ویستی ئاخیرەت وەك ئاخیرەت ویستیی دانانرێت کە باوەڕبوون بەخواو پەیامبەرەکەی لەگەڵدایە، باوەڕبوون بەخواو رۆژی ئاخیرەت ویستی بەندە پابەند دەکات تاوەکو بەکارەکانی سۆزو بەزەیی خواو ئاخیرەت بەدەستبهێنێ، بەلاَم کە بەو کارە باشانە ویستی دونیای هەبوو، ئەوە هەرگیز لەگەڵ ئیماندا کۆنابێتەوە با زانستی بەرانبەر خوا هەبێ و دانیشی پێدابنێ، زۆرێك لەوانەی خوای گەورە بەبێباوەڕ ناویبردوون زانست و دانپێدانانیان بۆ خوای گەورە هەبووە، نمونەی فیرعەون و سەمودو ئەو جولەکانەی پەیامبەری خوایان بینی و ناسیانەوە وەك چۆن منداڵەکانی خۆیانیان دەناسییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بێباوەڕترین مرۆڤیش بوون، بۆیە دونیاویستیی بەئەنجامدانی کارە باشەکان رەنگە ئەو مەعریفەو زانستەشی لەگەڵدابێ، بەلاَم ئەو ئیمانەی کە مەرجە هەبێ، ئەوەیە کەسەکە بەوە بگەیەنێ کە ئەنجامدانی کارەکانی بۆ خواو رۆژی ئاخیرەتە، خوای گەورەش پشت و پەنایە.

مەبەست ئەوەیە، خوای گەورە دەوڵەمەندی و هەژاریی کردووەتە تاقیکردنەوەی سوپاسگوزاربوون و ئارامگری و دەرکەوتنی راستگۆیی و درۆزنی و دڵسۆزی و هاوبەش بڕیاردان، خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَآ

ءَاتَىٰكُمْ﴾ الأنعام: ١٦٥، واتا: بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە لەوەدا کە پێی بەخشیوون.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ الٓمٓ ۝١ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓا۟ أَن يَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ۝٢ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ۝٣ ﴾ العنكبوت: ١ — ٣، واتا: بە(ئەلیف، لا، میم دەخوێنرێتەوە بۆ ماناکەشی سەیری سەرەتای سورەتی(البقرة)بکە. ئایا خەڵك وا دەزانن کە وازیان لێ دەهێنرێ ئەگەر بڵێن بڕوامان هێناوە ئیتر ئەوان تاقی ناکرێنەوە. سوێند بەخوا بێگومان کەسانی پێش ئەوانمان تاقی کردەوە(ئەمانیش تاقی دەکەینەوە)ئینجا بێگومان خوا ئەو کەسانەی ڕاستیان کرد دیاری دەکات درۆزنەکانیش دیاری دەکات واتە دەناسرێن.

هەروەها ئەفەرمووێت: ﴿ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ۝١٥ ﴾ التغابن: ١٥، واتا: بێگومان دارایی و منداڵتان هەر هۆی تاقی کردنەوەتانن لە کاتێکدا خوا پاداشتی زۆر و گەورەی لەلایە.

دونیای گێڕاوە بەکاڵایەکی خێراو مایەی لەخۆباییبوون، ئاخیرەتیشی گێڕاوە بەشوێنی پاداشتدانەوە، دونیای ڕازاندوەتەوە بەشەهوەت و جوانییەکانی، هەروەك دەفەرمووێت:

﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ۝١٤ ﴾ ( آل عمران: ١٤ )

خوای گەورە هەواڵی داوە، بەحەوت شت دونیای جوان و رازاندووەتەوەو دونیا ویستەکان بەهۆی ئەو حەوت شتەوە بەسەر ئاخیرەتدا بۆ خۆیانیان پێشخستووە، ئەو حەوت شتەش: ئافرەتان کە گەورەترین جوانی و شەهوەت و گەورەترین تاقیکردنەوەن، کوڕان کە کەماڵ و شانازی و شکۆی پیاوانن، ئاڵتوون و زیوو کە سەرباری جیاوازیی رەگەزو جۆریان دوو مادەی شەهوەتن، ئەسپی زینکراو کە جێی شکۆو شانازیی خاوەنەکانیانن و کەرەستەو ئامرازی بەرگریکردنیانە بەرانبەر دوژمنەکانیان لەڕۆیشتن بەدوای دوژمن و هەڵهاتنیان، ئەو وڵاخانەی بۆ سواری و خواردن و بەرگ و تفاقی نێو ماڵدا سوودیان لێ دەکەن و بۆ شتانی تری پێویست بەکاریاندەهێنن، زەوی کێڵاندنیش کە هێزو تووێشووی مەڕو ماڵات و وڵاخ و سەوزەو میوەو دەواکانیان لێ وەردەگرن.

پاشان خوای گەورە هەواڵی داوە کە هەموو ئەوانە چێژو خۆشییەکانی ژیانی دونیان، پاشان بەندەکانی تامەزرۆ کردووە بۆ ئاخیرەت ویستن و فێریان دەکات، کە ئاخیرەت باشترە لەم خۆشییەی دونیا و مانەوەیەکی هەمیشەیی هەیە، ئەفەرمووێ:

﴿ ۞ قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ ۚ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ ﴿١٥﴾ ﴾ (آل عمران: ١٥)

واتا:بڵێ: خەبەرتان بدەمێ بەباشتر لەمانەتان بۆ ئەوانەی کە پارێزیان کرد لای پەروەردگاریان چەند بەهەشتێك هەیە کە بەژێر درەختەکانیاندا دەڕوات ڕووبارەکان بەئێجگاری تێدا دەمێننەوە، وە(بۆیان هەیە)ژنانی پاکیزە، وە ڕەزامەندی لەخواوە، وە خوا بینایە بە بەندەکان.

پاشـان خـوای گـەورە باسـی ئەوانـە دەکـات کـە شـایەن و شایسـتەی ئـەو خۆشـییەن، کەسـانی پەرستشـکاری خـۆین و لەپێشـترن بـەو خۆشـییەو ئەفـــەرمووێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٦﴾ ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ﴿١٧﴾ ﴾ آل عمران: ١٦ – ١٧، واتا: لە خوا ترسان ئەوانـەی کـە دەڵێن ئـەی پـەروەردگارمان بەڕاسـتی ئێمـە بڕوامـان هێنـا دەی خـۆش ببـە لـە گوناهەکانمان وە بمان پارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ. ئەوانـە بـریتین لـە ئارام گران و ڕاستگۆیان و فەرمانبەران و دارایی بەخت کەران و ئەوانەی کـە داوای لـێ خۆشبوون دەکەن لە پێش بەیانیان دا.

خوای گەورە هەواڵی داوە، ئەوەی کە بـۆ دۆسـتەکانی خـۆی ئامـادە کـردووە باشترە لەخۆشییەکانی دونیا، ئەوەش دوو جۆرە: پاداشتێك چێژی لـێ دەبیـنین و گەورەترێکیش لـەوە ڕازیبوونی خـوایە لێیـان و ئـەفـەرمووێ: ﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ ۖ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا ۖ وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ ۚ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿٢٠﴾ ﴾ الحديـد: ٢٠، خـوای گـەورە لـەبارەی حەقیقـەتی دونیـاوە هـەواڵی داوە، بـەوەی کردوویەتییـە دیمـەنی مرۆڤـە بەرچـاوڕوونەکان، هـەواڵی داوە بـەوەی یـاری و گەپێکە دەروونەکان حەزی پێ دەکەن و جەستەکان یاریی پێ دەکـەن، یـاری و گەپێکـە حەقیقـەتیان نییـە، تـەنیا مایـەی سـەرقاڵکردنی دەروونـەکان و کـات کوشتنن و نەفامەکان تەمەنی خۆیانی پێ تەواو دەکەن و بەزایە دەچن، پاشـان

هـــەواڵی داوە بـــەوەی، جوانییەکـــە بـــۆ چـــاو و دەروونـــەکان و لەبەرچـــاو و دەروونەکاندا خۆشەویست بووە، بەڵام گەر چاو و دەروونەکان بەدڵ بۆی بڕوانن، ئـەوکات حەقیقـەت و داهاتووەکـەی دەبیـنن و حـەزی پـێ ناکـەن و بەسـەر ئاخیرەتی هەمیشەیی و باشتردا پێشیان نەدەخست.

پێشـەوا ئەحمـەد ئـەڵێ: وەکیـع بـۆی باسـکردین، کـە ئەلمەسـعودیی بـۆی باسـکردین، ئـەویش لەعـەمری کـوڕی مـوڕەوە ئـەویش لەعەلقەمـەوە ئـەویش لەعبداللـەوە(خوای لـێ رازیـی بێ)ئـەویش لەپەیامبـەری خواوە(صـلی الله علیـە وسلم) فەرمووی:«ما لي وللدنيا إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ الدُّنْيَا كَرَاكِبٍ ظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا»[1]،واتا: من و دونیا لەکوێ، نمونەی من و دونیا وەك رێبوارێکە لـەژێر سێبەری دارێکدا رۆژێك بەڕێدەخات و دەڕوات و بەجێیدەهێڵێ.

لەجامیعی ترمیزییدا هاتووە لەفـەرموودەی سـەهلی کـوڕی سـەعدەوە ئـەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)فەرمووی:«لَوْ أَنَّ الدُّنْيَا تَزِنُ عِنْدَ اللَّـهِ جَنَـاحَ بعوضة لما سَقَى كَافِرًا مِنْهَـا شَـرْبَةَ مَـاءٍ»[2]،واتـا: ئەگـەر دونیـا لای خـوای گـەورە کێش و سەنگی باڵە مێشوولەیەکی هەبووایە، ئەوە نەیدەهێشت مرۆڤـی بێبـاوەڕ قوومە ئاوێکی لێ بخواتەوە. ترمیزیی وتوویەتی: فەرموودەیەکی صەحیحە.

لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە لەفەرموودەی ئەلموستەوریدی کوڕی شەدادوە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)فەرمووی:«مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ مِثْل مَـا

---

[1] - صەحیحە، ترمیزی(٢٣٧٧) و ئیبن ماجە(٤١٠٩) و ئەحمەد(١/ ٣٩١) ئیخراجیان کردووە، فەرموویـەتی: نمونەی سەرخەوشکانێکی نیوە رۆژەیە(قەیلولە).

[2] - صحیح لغيره، ترمیزی(٢٣٢٠) و ئیبن ماجە(٤١١٠) و ئەحمەد(١/ ٣٩١) ئیخراجیان کردووە.

يَجْعَل أحَدُكُم أصْبُعَهُ فِي اليَمِّ، فَلْيَنْظُرْ بِمَ يَرْجِـع»[1]، واتـا: دونيـا لەچـاو ئاخيرەتـدا، وەك ئەوەيە يەكێك لەئێوە پەنجەی بكاتە ئاوی دەريادا و دواتر بڕوانێ چـەندەی لێ هەڵگرتووە. بەپەنجەی شايەتومانی ئاماژەی كرد.

لەفەرموودەيەكی لای ترميزييدا هاتووە: لەگەڵ ئەو سوارانەدا بووم كە لەگەڵ پەيامبەردا(صـلى الله عليـه وسـلم) لای لاكێكـی مـردارەوە بـوو وەسـتابوون، پەيامبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی: ئايە نابينن ئەمە سووك و بێ نرخ بـووە بۆيە فڕێيان داوە؟ وتيان: بەڵێ لەبەر بێ نرخبوونی فڕێيان داوە ئەی پەيامبەری خوا، ئەويش فەرمووی: ئەمـە چـەندە بـێ نرخـە لای خاوەنەكـەی، دونيـاش لای خوای گەورە ئەوەندە بێ نرخە[2].

هـــەر لەترميزييـــدا لەفـــەرموودەی ئـــەبو هورەيرەدا(خـــوای لـــێ رازيـــی بێ)ئەڵێ:پەيامبەری خوا(صلى الله عليه وسـلم)فەرمووی:"الـدنيا ملعونـةٌ، ملعـونٌ ما فيهـا الا ذكـر الله ومـا والاه وعالمـاً أو متعلمـا"[3]،واتا:دونيـا نـەفرەت لێكـراوە، ئەوەشی تيايدا نەفرەت لێكراوە جگە لەيادی خـواو ئـەوەی خـوای خۆشـبووێ و خوا بيەوێ و زانايەك يان ئەو كەسەی هەوڵی فێربوون دەدا.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: هەيسەمی كوڕی خاريجە بۆی باسـكردين، ئيسـماعيلی كوڕی عەياش بۆی باسـكردين لەعبداللـەی كـوڕی دينـاری ئەلبەهرانييـەوە وتـی: عيسا(سەلامی خوای لەسەربێ)بەحەوارييەكانی وت: بەحەق و راسـتييەوە پێتـان ئـەڵێم خۆشـييەكانی دونيـا تـاڵيی ئـاخيرەتن، تـاڵی دونيـاش خۆشـی و چـێژی

---

[1] - موسليم(٢٨٥٨)ئيخراجی كردووە.

[2] - حسن لغيره، ترميزی(٢٣٢١) و ئيبن ماجه(٤١١١) و ئەحمەد(٤/ ٢٢٩)ئيخراجيان كردووە

[3] صحيح لغيره، ترميزی(٢٣٢٢) و ئيبن ماجه(٤١١٢)ئيخراجيان كردووە.

ئاخیرەتــە، بەنـدەکانی خـوا لـەدونیادا لەنازونیعمەتـدا نـیین، بەحەقــەوە پێتــان ئــەڵێم: خــراپترین کارێکتــان، کــاری زانایەکــە دونیــای خۆشــدەوێ و بەســەر ئاخیرەتدا پێشی دەخـات، گـەر بتـوانێ و پێـی بکـرێ هـەموو خـەڵك وەك خـۆی لێدەکات[1].

ئەحمەد ئەڵێ: یەحیای کوڕی ئیسحاق بۆی باسکردین وتـی: سـەعیدی کـوڕی عەبدولعەزیز هەواڵی پێداین لەمەکحولەوە وتی: عیسای کوڕی مەریەم وتی: ئـەی کۆمەڵی حەوارییـەکان، کـێ لـەئێوە دەتـوانێ لەسـەر شـەپۆلی دەریـا خانوویـەك دروست بکات؟ وتیان: ئەی روحی خوا کێ دەتوانێ و پێی دەکرێ ئـەوە بکـات؟ وتی: ئێوەش ئاممان وریای دونیا بن و مەیکەنە شوێنی گیرسانەوە[2].

لەکتێبی(الزهـد)ی ئەحمـدی کـوڕی حەنبەلـدا هـاتووە کـە عیسـای کـوڕی مەریەم(سـەلامی خـوای لەسـەربێ)ئەیووت: بەحـەق و راسـتییەوە پێتـان ئـەڵێم: خـواردنی نانێـك و خواردنـەوەی ئـاوێکی سـازگارو خـەوتن لەگـەڵ سـەگ لەسـەر زبڵدان، زۆریشە بۆ کەسێك بیەوێ ببێتە خاوەنی فیردەوس[3].

لەموسنەدەوە هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی: "إن الله ضـربَ طعـامَ ابـن آدم مـثلا للـدنيا وان قَزَّحَـهُ ومَلَّحَـهُ فلينظـرْ الى مـاذا يصـير"[4]،واتـا: خـوای گـەورە خـواردنی نـەوەی ئـادەمی بەنمونـە بـۆ دونیـا هێناوەتەوە، تەماشاکە خواردنەکە چەندە خۆش و بەچێژ بێ دواتر دەبێتە چی.

---

[1] - ئەحمەد ئیخراجی کردووە لە الزهد(لا١١٩).

[2] - ئەحمەد ئیخراجی کردووە لە الزهد(لا١١٨).

[3] - ئەحمەد ئیخراجی کردووە لە الزهد(لا٧٦).

[4] - صەحیحە، تەبەرانیی لە المعجم الكبير(٥٣١) و عبداللەی کـوڕی ئەحمـەد لـە زوائـد المسـند(٥/ ١٣٦) و بەیهەقیی لە الشعب(٥٦٥٢)ئیخراجیان کردووە.

پاشان خوای گەورە لەبارەی دونیاوە هەواڵی داوە، کە هەندێکمان بەسەر هەندێکی ترماندا بەدونیا خۆهەڵدەکێشین، داوا لەمرۆڤەکانی بەرانبەرمان دەکەین با لەبابەت دونیادا شان لەشانمان بدەن، بێگومان ئەوە حاڵی هەرکەسێکە لەسەروەت و ناوبانگی و هێزو زانست و شتی ترەوە بەدوای خۆهەڵکێشان و شانازییکردنەوە بێ.

شانازییکردن دوو جۆرە: قێزەون و جوان، قێزەون خۆهەڵکێشان و شانازیکردنی ئەهلی دونیایە بەدونیا، جوانیش: شانازییکردنە بۆ ئاخیرەت، شانازییکردن بۆ ئاخیرەت ئەو شتەیە کە فەرمان کراوە ئەنجامی بدەین، مرۆڤی باوەڕدار بەدونیا و گوێ نەدان بەخۆشی و لەخشتەبەرەکانی دونیا هەوڵی ئاخیرەت ئەدات، بۆ دونیا دەستبەرداری ئاخیرەت نابێ و کێبرکێ بۆ شتی بەنرخ ئەکات، حەقیقەتی کێبرکێیش هەوڵدانە بۆ شتی بەنرخ و گرانبەها.

پاشان خوای گەورە هەواڵ ئەدات، کە دونیا هەوڵدانە بۆ زۆرکردنی سەروەت و منداڵ و، هەموو کەسێك هەوڵ دەدات دەسکەوتی خۆی زۆرتر بکات و خۆشحاڵ بێ کە ببینێ خۆی لەکەسانی تر سەروەت و کوڕی زۆرترەو ئەوەی لەبارەوە بووترێ، هەواڵیشی داوە ئەوە گەورەترین ئارەزوویەکە مرۆڤ لەخواو ئاخیرەت دووردەخاتەوە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ۝١ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ۝٢ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ۝٣ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ۝٤ ﴾ التكاثر: ١ – ٤، واتا: ئێوەی بێ ئاگا کردووە شانازیتان بە زۆریی سەروەت و سامانەوە. تا دەمرن و دەچن بۆ گۆڕستان. وا مەکەن! لەمەولا دەزانن. دووبارە وامەکەن لەمەولا دەزانن.

مرۆڤ هەوڵی زۆر کردن ئەدات لەهەموو شتێکدا، جا بۆیە هەر شتێك سەرقاڵی بکات و لەخواو ئاخیرەت دووری بخاتەوە دەچێتە ژێر حوکمی ئەو ئایەتەوە. خەڵکیی هەیە بەهۆی پارەکۆکردنەوەو هەوڵدان لەکۆکردنەوەی سەروەت و ساماندا لەخوا دوورکەوتووەتەوە، هەیە ناوبانگیی یان زانست دووریخستووەتەوەو شانازیی پێوەی ئەکات،بۆیە خاوەن سەروەت و ناوبانگیی هۆکارەکانی ئاخیرەتی بۆ دونیا بەکارهێناوە.

پاشان خوای گەورە هەواڵی داوە لەبارەی حەقیقەت و پاشەڕۆژی دونیاوە، باسیکردووە بەنمونەی بارانێکە جوتیار بە ڕۆك و بەرهەمەکەی سەرسام بووە، مرۆڤی بێباوەڕی بەجوتیارێك شوبهاندووە کە تۆوەکەی لەخاکدا دەشارێتەوە، تۆو بەرهەمێك زەردو وشك دەبێتەوە، ئەوەش داهاتوو پاشەڕۆژی دونیایە، مرۆڤ گەر لەسەرەتاوە تاوەکو کۆتایی خاوەن دونیا بێ هەر ئەوە کۆتاییەکەی دەبێت. کە دونیا کۆتاییهات و قیامەت هات، یان ژیانی دەگۆڕێ بۆ سزایەکی سەخت یان لێخۆشبوونێك لەلایەن خوای گەورەو باشترین پاداشت.

هەروەك عەلیی کوڕی ئەبو تاڵیب(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ دونیا شوێنی بەڕاستخستنەوەیە بۆ کەسێك بەڕاست بیناسێ، شوێنی سەلامەتییە بۆ کەسێك خۆی لێ سەلامەت بکات و شوێنی رزگاربوونە بۆ کەسێك خۆی سەلامەت راگرتبێ، لەدونیادا مزگەوتی پەیامبەرانی خوا هەیە، شوێنی وەحیی خوایەو شوێنی بازرگانیی دۆستەکانی خۆیەتی، لەوێدا بەزەییان دەستخستووەو سەلامەتییان قازانجکردووە.

ئەی ئەو کەسەی بەدونیا سەرزەنشتکراو و لەخۆبایی بووی، تاوەکو کەی لەو لەخۆباییەت بەردەوامی؟ بەشوێنی گۆڕی باوباپیران و نەهامەتیی دایکانت؟

چەند کەست بینیووە دونیای بۆ هەمیشە بۆ مابێتەوە؟ چەندە دەردو ناخۆشیی دەردارو و داماوت چارە کرد؟ چەندە کەست بەدەستی خۆت نەخۆش خست و حەزی چاکبوونەوەیت بۆ هەبێ و پزیشکت پیشان دابێ و تکای تۆ بۆی سوودی نەبووبێ؟پاشان روودەکاتە گۆڕستان و ئەڵێ: ئەی غەریبان، ئەی خەڵکانی خۆڵ و خاك، وا خەڵکانی تر لەماڵەکانتانـدا نیشتەجێ بوون و سەروەت و سامانەکانتان دابەشکران و ژنەکانیشتان شوویان کردەوە، ئا ئەوە هەواڵی لای ئێمەیە، ئێوەش هەواڵی خۆتانمان پێ بدەن، پاشان لای کردەوە بەلای ئێمەداو وتی: گەر ئەم مردووانە رێگە بدرابانایە، ئەوە بەئێوەیان دەوت تەقوا و لەخواترسان باشترین تووێشوون بۆ ئێوە[1].

لەڕاستیدا دونیا سەرزەنشتکراو نییە، بەڵکو سەرزەنشتییەکە ئاراستەی کرداری بەندەکە دەکرێ کە لەدونیادا ئەنجامی داوە، دونیا تەنیا پردێکە بۆ بەهەشت یان دۆزەخ، بەڵام شەهوەت و بەخت و بێئاگایی و دوورگرتن لەخواو ئاخیرەتی بەسەردا زاڵبووە، زاڵبووە بەسەر دونیاویستەکان و خودی دونیادا، بۆیە ناوە سەرزەنشتکراو و بوغزێنراوەکە بەڕەهایی بەسەر دونیادا زاڵبووە، دونیا هیچ نییە تەنیا تەلارو کێڵگەی ئاخیرەتە، لەدونیادا تووێشووی بەهەشت ئامادە دەکرێت، دەروونەکان ئیمان و خواناسین و خۆشویستنی خواو بەدەستهێنانی رازیبوونی خوای تیادا دەستدەخەن، باشترین ژیانێکیش کە بەهەشتییەکان لەبەهەشتدا دەستیدەخەن، بەرهەمی ئەو کێڵگە کارییەیە کە لەدونیادا ئەنجامیان داوە.

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(١٤٧)ئیخراجی کردووە.

بەسە بۆ ئەوەی فەزڵ و ستایش بێ بۆ بەندە دڵسۆزەکانی خوای گەورە، کە لەخواناسیندا گلێنەی چاو و دڵئارامی و خۆشیی دڵان و چێژی روحەکان و نیعمەتی بێ هاوشێوە دەستدەخەن بەیادو ناسین و خۆشویستن و پەرستنی خوای گەورەو تەنیا پشت بەو دەبەستن و بۆلای دەگەڕێنەوەو لەپاڵیدا دڵئارام دەبن و هەست بەخۆشحاڵیی دەکەن و چێژ لەموناجاتکردنی دەبینن و بەرو لای دەگەڕێنەوەو تەنیا بیریان لای خوای گەورەیەو بەشتی ترەوە سەرقاڵ نابن، هەر لەدونیادا وتەو وەحی و هیدایەتی خوایی بوونی هەیە کە بەفەرمان ناردوویەتی و کێی ویستبێ لەبەندەکانی پێی ئاگاداری کردوونەتەوە.

لەبەر ئەمە ئیبن عەقیل و کەسانی تر، ئەم نیعمەتەیان پێشخستووە بەسەر نیعمەتی بەهەشتداو وتوویانە: ئەمە مافی خوایە بەسەریانەوە، ئەوە بەخت و نیعمەتی ئەوانە، مافی خوا باشترە لەمافی ئەوان، هەروەها وتوویانە: ئیمان و گوێڕایەڵیکردنی خوا باشترە لەپاداشتی خوا.

ئەوەی سەلماوە: دروست نییە لەنێوان هەردوو شتی دونیاو بەهەشتدا فەزڵی ئەم بەسەر ئەوی تردا بدرێ، گەر بکرابایە هەردوو شت لەدونیادا یان لەبەهەشتدا پێکەوە کۆبکرابایانەوە، ئەوە لەدونیادا ئیمان و گوێڕایەڵیی خوا لەهەموو شتێکی تر باشتر دادەنرا، چونکە بەهەشت و بینینی خوای گەورەو بیستنی وتەی و بەدەستهێنانی رازیبوونیشی باشتر لەهەموو شتەکانی تری ئاخیرەت ئەبوو، بۆیە لەدونیا ئیمان و گوێڕایەڵییکردنی خوا باشترەو لەئاخیرەتیش چوونە بەهەشت و بینینی خواو دەستخستنی رازیبوونی. دروست نییە بووترێ: کامەیان باشترینە ئەوەی دونیا یان ئەوەی ئاخیرەت؟ چونکە ئەوەی دونیا باشترینی

هۆکارەکان و ئەوەی ئاخیرەتیش باشترینی ئامانجەکانە، سەرکەوتنیش بەخوای گەورەیە.

کە خوای گەورە حەقیقەتی دونیاو ئامانج و کۆتاییەکەی و هەڵگەڕانەوەی بۆ ئاخیرەت روونکردووەتەوە ئایە بۆ سزایەکی سەختە یان لێخۆشبوون و پاداشتی خوایی، ئەوە فەرمانی بەبەندەکانی کردووە بۆ پێشبڕکێکردن و دەستپێشخەرییکردن بۆ ئەو شتەی باشترین و بەردەوامە، ئەو باشترین و بەردەوامە پێشبخەن بەسەر ئەو شتەی مانەوەی بۆ نییەو ماندوویەتیی بەجێدەهێڵێ.

خوای گەورە هەواڵی داوە، بەوەی ئەوە فەزڵی خۆیەتی و خاوەن فەزڵی گەورەیەو بەکێی بووێ فەزڵی خۆی دەدات و ئەفەرمووێ: ﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ﴿٤٥﴾ ﴾ الكهف: ٤٥، واتا: ئەی(موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)بێنەرەوە بۆ ئەو(بێ باوەڕ)انە نموونەی ژیانی دنیا کە وەك بارانێك وایە لە ئاسمانەوە دەیبارێنین ئەوسا جۆرەها ڕوەوی زەویی(پێ دەڕوێ و)دەڕۆن بەناو یەکدا ئینجا دەبێتە پوش و پەڵاش و با پرش و بڵاوی دەکاتەوە وە خوا هەمیشە بەتواناو دەسەڵات دارە بەسەر هەموو شتێکدا.

پاشان خوای گەورە باسدەکات کە سەروەت و سامان و منداڵ جوانیی دونیان، ئەوەی کە دەمێنێتەوەو باش و چاکن، ئەو قسەو کردارە چاکانەن کە پاداشتیان دەمێنێتەوەو پاداشتی نەبڕاوەیان هەیە، باشترین شتێکن بەندە ئومێدیان ئەکات و چاوەڕێی پاداشتەکەیەتی، پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِٱلْأَمْسِ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ ( يونس: ٢٤ )

واتا: بێگومان وێنەی ژیانی دنیا وەك بارانێك وایـە لـە ئاسمانـەوە باراندومانـە جا بەهۆی ئەو(بارانەوە ڕوەکی زۆر ڕواوەو)تێکەڵ بووە و بەیەکدا چووە سـەوزی و ڕوەکی زەوی لـەوەی کـە خـەڵکی و ئـاژەڵیش دەیخـۆن هـەتا کـاتێ زەوی(بـە سەوزی و ڕوەك) ڕەونەق و جوانی وەردەگرێ و خۆی دەڕازێنێتەوە دانیشتوان و خـەڵکی ئـەو(زەوی یـە)وا دەزانـن کـە بەڕاسـتی ئـەوان بـەتوانان بەسـەر(دروێنە کردن)یدا(لە ناکاوێکدا)فەرمانی ئێمە بێت بۆ ئەو(زەوی و کشتوکاڵە)لەشـەو یـان لـە ڕۆژدا وەك دروێنـە کـراوی لـێ بکـەین وەك لـەوەو پـێش هـەر نـەبووبێت ئـا بـەوجۆرە ڕوونـی دەکەینـەوە ئایـەت و بەڵگـەو نیشـانەکانمان بـۆ گـەلێ کـە بیربکەنەوە.

کە خوای گەورە بەندەکانی لەنەهامەتییەکانی ئەم دونیایە ئاگادار دەکاتەوە، بانگیان دەکات بۆ ژیانی ئاشتی و ئارامیی،ئەو ژیانەی کـە سـەلامەت ماوەتـەوەو گۆڕان و نەمان و پووکانەوەی بەسەردا نایەت، بەدادگەرییەوە بانگەوازی تـەواوی بەندەکانی کردووەو وەك فەزڵ و منەتێکیش بەشـێك لەبەنـدەکانی بەهیدایەتـدان تایبەت کردووە.

پاشان هـەواڵی داوە کـە سـەروەت و منـداڵ مـرۆڤ بـۆلای خـوای گـەورە نزیـك ناخاتەوە، بەڵکو لەخواترسان و مامەڵەی خوا تیایاندا لـەخوایان نزیکدەخاتـەوە،

وریایکردوونەتەوە لەوەی سەروەت و منداڵیان لەیادی خوا دووریان بخاتەوەو ، هەواڵی داوە کە هەرکەسیّ بەو جۆرە بکات، ئەوە زیانمەندی راستەقینەیە نەك ئەو کەسەی ماڵ و منداڵی کەمە.

پەیامبەری خۆی رێگریی کردووە لەوەی چاوبخاتەسەر ئەو خۆشییەی کە خەڵکانی دونیاویست هەیانەو مایەی فیتنەو تاقیکردنەوەیە بۆیان، هەواڵی پیّ داوە کە ئەو رزق و رۆزیەی لەئاخیرەتدا بۆی ئامادەی کردووە باشترەو بەردەوامترە لەوەی بەخەڵکانێك دراوە لەدونیادا. هەواڵی داوە کە (السبع المثاني) و قورئانی مەزنی پیّ داوە، ئەوەش باشترە لەهەموو خۆشییەکانی خەڵکانی دونیاویست. ئەوەی لەئاخیرەتدا پێی بەخشیووە کردوویەتییە رێگریی لەوەی تەماشای خۆشییەکانی خەڵکانی دونیا بکات، بۆیە ئەم بەخششەی لەدونیادا پێی دراوەو ئەو رزق و رۆزییەی لەئاخیرەتدا بۆی پاشەکەوت کراوە، باشترە لەهەموو سەروەت و منداڵ و شتەکانی خەڵکانی دونیاویست، بۆیە چاوتی مەخەرەسەر.

گەر زانرا دەوڵەمەندی و هەژاری و بەڵاو سەلامەتیی فیتنەو تاقیکردنەوەی خوان بۆ بەندەو ئارامگریی و سوپاسگوزاربوونی پیّ تاقیدەکرێتەوە، ئەوکات دەزانریّ کە ئارامگری و سوپاسگوزارییش نمونەی دوو ولاخی بار هەلگرن و ئیمان تەنیا لەسەر هەردووکیان هەڵدەگریّ نەك شتی تر، بۆیە دەبیّ هەموو باوەڕدارێك ئارامگری و سوپاسگوزاریی هەبیّ، هەریەك لەو دوو شتە لەشوێنی خۆیاندا باشترینن، ئارامگرتن لەدۆخ و شوێنی ئارامگرتندا باشترینە، سوپاسگوزارییش لەدۆخ و شوێنی سوپاسگوزارییدا باشترینە، ئەمەو گەر گونجاوبیّ بەیەکتر بەراورد بکرێن، بەڵام گەر ئەوەی ئارامگریی بەشێکی سوپاسگوزاریی بیّ و سوپاسگوزارییش بەشێکی خودی ئارامگریی بیّ و

هەردووکیان حەقیقەتێکی ئاوێتە کراوین وەك پێشتر روونکرایەوە، ئەوە شیاو نییە بەراوردی باشتربوونی یەکێکیان بکرێ تەنیا ئەوکاتە نەبێ کە لەیەکتر دادەبڕێن، ئەوەش گریمانەیەکی زیهنییەو زیهن دەیخەملێنێ و لەدەرەوەدا بوونی نییە.

بەڵام لەڕوویەکەوە دروستە، ئەوەیش ئەوەیە: هەندێجار بەندە ئارامگریی بەسەر سوپاسگوزاربوونیدا زاڵە کە ئەندازەیەکی زیادەی ئارامگرییە لەڕووی قسەو کرداری دیارو نادیارەوە، بواری بۆ جگە لەئارامگریی دەروونی تێدا نابێتەوە، هەموو هێزێکی روودەکاتە گەمارۆدانی دەروون بۆ خوای گەورە، هەندێجاریش بەقسەو کرداری دیار و نادیار بەسەر خودی خۆی و گەمارۆدانی خوای گەورە سوپاسگوزاربوونی بەسەر ئارامگربوونیدا زاڵ دەبێ ، ئەوکات هێزی ویست و کاری بەهێزتر ئەبن لەهێزی رێگریکردن و گەمارۆدانی دەروونی خۆی.

ئەمە بەدوو کەس دابنێ: یەکێکیان دەسەڵاتی بەسەر دەروونی خۆیدا هەیە و ئەتوانێ جڵەوگیری بکات بەرانبەر شەهوەتەکان و کەم گازندەکاربێ بەرانبەر کۆست و ناخۆشییەکان و کردارەکانی گەورەو گران بن، کرداری خێری زۆرەو رێگە بەخۆی دەدات کاری چاك بکات، کەسێکی تریش لەبەرانبەر هێزی خۆڕاگریدا دەروون لاوازە.

بۆیە دەروون دوو هێزی هەیە: هێزی ئارامگری و دەروون جڵەوکردن و هێزی بەخشین و کاری چاکەو پێداگربوون لەسەر کارێك پێی کامڵتربێ، کەماڵی بەندەش بەکۆبوونەوەی ئەو دوو هێزەیە لەودا.

خەڵکیی لەوەدا چوار چین و توێژن: بەرزترینیان ئەوانەن کە دوو هێزەیان تێدا کۆبووەتەوە، نزمترینیان ئەوانەیانن کە ئەو دوو هێزەیان نییە، هەیانە هێزی خۆڕاگربوونی لەهێزی کارو هەوڵدانی کامڵترە، هەشە بەپێچەوانەوەیە.

ئەگەر سوپاسگوزاریی بەسەر ئارامگرییدا فەزڵدارتر بوو، ئەوە یان بەپێی بارسەنگکردنی پێگەیەکە بەسەر پێگەیەکی تردا، یان داماڵین و دوورخستنەوەیانە لەیەکتر و نەڕوانینە ئەو ئیعتیبارە.

ڕوونکردنەوەی جوان و تەواوی ئەم بابەتە، لەبابەتی دەوڵەمەندی سوپاسگوزارو هەژاری خۆڕاگرو بەئارامدایە، ئێمەش تەوەرێکی تایبەتی بۆ تەرخان دەکەین و ڕووی دروستیی ئەو بابەتەی تێدا دەردەکەوێت.

## تەوەری بیست و دوو

## لەجیاوازیی خەڵك لەبارەی دەوڵەمەندی سوپاسگوزارو هەژاری ئارامگردا کامەیان باشترینن؟ بۆچوونی دروست لەو بارەیەوە چۆنە؟

ئەمە بابەتێکە ناکۆکیی زۆری لەبارەوە هەیە لەنێوان دەوڵەمەندو هەژاراندا و هەریەکەو بەڵگە بەسەر ئەوی تردا دەهێنێتەوە، کە بەڵگەی قورئان و سوونەت و شوێنەواری پێشین و ئیعتیبارن، بۆیە بەلای ئەو کەسەوەی لەبابەتەکە رادەمێنێ دەبینێ هەردوولا یەکسان و هاوتان، هەموویان بەڵگەی بەهێزیان پێیە. بەڵگەی حەق و رەوا نادرێن بەگژ یەکدا، بەڵکو دەبێ بەشوێن بەڵگەدا بڕۆین، خەڵکیی هەردوولا لەبابەتەکە زۆریان وتووەو کتێبیان لەبارەوە نووسیوەتەوە، بەهۆی گشتگیریی واتاو حەقیقەتەکانی بۆ تەواوی خەڵك، ئەوە شەرعناسان و هەژاران و دەوڵەمەندان و سۆفی و فەرموودەناسان و راڤەوانانیش قسەیان لەبارەوە کردووە، لەپێشەوا ئەحمەدەوە دوو گێڕانەوەیان باسکردووە کە ئەبو ئەلحوسەین لەکتێبەکەیدا(التمام)هەردوو بۆچوونی هێناوەتەوەو ئەڵێ: لەدروسترینی هەردوو بۆچووندا،بابەتی هەژاری ئارامگر لەدەوڵەمەندی سوپاسگوزار باشترە، لەگێڕانەوەی دووەمدا هاتووە: دەوڵەمەندی سوپاسگوزار باشترینە، کۆمەڵێکیش ئەوەیان وتووەو ئیبن قوتەیبەشیان تێدایە. بۆچوونی یەکەم بارسەنگکراوەو ئەبو ئیسحاقی کوڕی شاقلاو ئەلوالید ئەلسەعیدیش ئەو بۆچوونەی هەڵبژاردووە.

پـەروەردگار فەرموویـەتی: ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ ﴾ الفرقـان: ٧٥، واتا: ئەوانە پاداشت دەدرێنەوە بە پلەو کۆشکی بەرز لـە بەهەشـتدا بـەهۆی ئارام گرتنیان.

موحەممــەدی کــوڕی عــەلیی کــوڕی ئەلحوســەین ئــەڵێ: ﴿ ٱلۡغُرۡفَةَ ﴾ واتــا: بەهەشت﴿بِمَا صَبَرُواْ﴾ بەوەی لەسەر هەژاریی لەدونیادا ئارامیان گرت.

لەئەنەســەوە ئــەویش لەپەیامبــەری خواوە(صــلی الله علیــە وســلم) کــە فەرموویـەتی: "اللَّهُـمَّ أحْيِنـي مِسْـكِيناً، وأَمِتْنِـي مِسْـكِيناً، واحشـرني في زُمْـرَةِ المَسَاكِينِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ"، واتا: خوایە گیان بەهەژاریی بمژێنەو بەهەژاریی بممرێنـەو لـەڕیزی هەژارانـدا لـەڕۆژی قیامەتـدا حەشـرم بکـە. عائیشـە وتـی: بۆچـی ئـەی پەیامبەری خوا؟ فەرمووی: "إنَّهُمْ يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ قَبْلَ أغْنِيَائِهِمْ بِأرْبَعِينَ خَرِيفـاً. يَـا عَائِشَةُ، لاَ تَرُدِّي الْمِسْكِينَ، وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، يَا عَائِشَـةُ، أحِبِّـي المَسَـاكِينَ وَقَـرِّبِيهِمْ، فَإنَّ اللَّهَ يُقَرِّبُكِ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ"[1]، واتـا: ئـەوان بەچـل پـایز لـەپێش دەوڵەمەندانـەوە دەچـنە بەهەشـتەوە. ئـەی عائیشـە گـەر بەلەتـە خورمایـەکیش ئـەبێ هـەژاران بەدەستبەتاڵییەوە مەگێڕەرەوە، ئەی عائیشە هەژارانت خۆشـبووێ و لـەخۆتانی نزیکبخەرەوە، بەوە خوای گەورە لەقیامەتدا لەخۆیت نزیکدەخاتەوە.

منیش ئەڵێم: هیچ بەڵگەیەك لەقسەی هەردووکیان نابینم، هەرچی ئایەتەکەیە باسی ئارامگریی کەسی سوپاسگوزار ئەکات لەسەر گوێڕایەڵیکردنی فەرمانەکانی خوای گەورە، ئارامگرتنی لەدوورگرتن لەسەرپێچیکردنی خواو ئارامگرتنی کەسی مەینـەتبار لەسـەر هـەژاری و کارەساتەکانی تـر، ئەگـەر مەبەسـت بـەوە تـەنیا

[1] - حسن لغيره، ترميزی(٢٣٥٢) و بەیهەقیی لە السنن الكبرى(٧/ ١٢)ئیخراجیان کردووە.

ئـــارمگرتنی مرۆڤـــی هەژاربووبایـــە لەســـەر هەژارییەکـــەی، ئـــەوە لەســـەر سوپاسگوزاریی بارسەنگ نەدەبوو، قورئانی پـیرۆز هـەروەك چۆن بەڵگـە دەدات لەسەر ئارامگران، لـەسەر سوپاسگوزارانیش بـەڵگە دەهێنێتـەوەو ئەفـەرمووێت: ﴿ وَسَنَجْزِى ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ ﴾ آل عمران: ١٤٥،واتا: بەزوویی پاداشتی سوپاس گوزاران دەدەینـەوە، هـەروەها:﴿ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ آل عمـران: ١٤٤، واتا: بەزوویی خوا پاداشتی سوپاس گوزاران دەداتەوە.

خـــوای گـــەورە هـــەواڵی داوە کـــە رازیبـــوونی خـــۆی لەسوپاســـگوزارییدایە، رازیبوونیشی گـەورەترە لەپاداشـتدانەوەی بەبەهەشـت و ئـەوەی تیایدایـە، گـەر خوای گەورە بەئارامگرتنی ئارامگران بەهەشتییان پێ پاداشت بکات، بەڵگە نابێ لەســـەر ئـــەوەی بەبەهەشـــت پاداشـــتی سوپاســـگوزاران ناکـــات لەبـــەر ئـــەوەی سوپاسگوزار بوونە.

هەرچی فەرموودەکەشە لەدوو رووەوە نابێتە بەڵگە:

**یەکەم:** پشت بەڕشتەی گێڕانەوەکەی نابەسترێت، لەگێڕانەوەی موحەممـەدی کـوڕی ثـابتی ئەلکوفییـە ئـەویش لـە ئـەلحاریثـی کـوڕی ئەلنوعمانـە، خـاوەنی کتێبەکانی صیحاح ئەلحاریث بەبەڵگە ناکەن، بوخاریی لەبارەیـەوە ئەفـەرمووی: (منکر الحدیث)ە، ترمیزییش ئەم فەرموودەیەی بەڕاست دانەناوە و بێدەنگییشی لەسەر نەکردووە، بەڵکو غەریب(نامۆ)ی داناوە.

**وەڵامـی دووەم:** ئـەم فەرموودەیـە گـەر دروسـتیش بووایـە، ئـەوە بەڵگـەی مەبەستی ئەوان نەدەبوو، چونکە ئەو ئارامییەی کە خـوای گـەورە حـەز دەکـات لەبەندەکەیدا هەبێ، ئارامبوونی بەنـدە نییـە لەسـەر دەسـکورتی و هـەژاربوونی، بەڵکو ئارامیی دڵە، کـە شـکان و ملکەچـبوون و کزۆڵـی و خاکەرابوونـە بەرانبـەر

خـوای گـەورە، ئـەم ئارامبوونـە دژ بەدەوڵەمەنـدیی نییـەو مـەرج نییـە هـەژاریی لەگەڵ بێ، چونکە شکانی دڵ بۆ خوای گەورەو ئارامبوون بەمەزنی و گەورەیی و ناوو سیفەتەکانی، گەورەتر و باڵاترە لـەئارامبوون لەسـەر نـەبوونیی سـەروەت و سامان، هەروەك ئارامگرتنی کەسی دەوڵەمەند لـەدوورگرتن لەسەرپێچـی کردنـی فەرمانـەکانی خـوای گـەورە بـەترس و سەربەسـتبوونەوەو ترسـانی لـەخواو خۆشویستنی بۆی باڵاترە لەئارامگرتنی هەژاری بێ توانا.

خوای گەورە دەوڵەمەندی و پادشایەتیی بەکۆمـەڵێ لەپەیامبـەرانی خـۆی دا، ئەو بەخشینە لەدڵئارامبوون بەرانبەر خوای گەورە دوورینەخستنەوە.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: یەزیدی کوڕی هارون بۆی باسـکردین کـە ئەلجـەریریی هـەواڵی پێـدایـن لەئـەبی ئەلسـەلیلەوە وتـی: پەیامبـەر داوود(سـەلامی خـوای لەسەربێ)دەچووە مزگەوتەوەوە دەیڕوانیە ئەڵقەیەکی دانیشتنی بەنی ئیسـرائیل و ئەویش لایان دادەنیشت و پاشان دەیووت: هەژارێك لـەنێو هەژارانـدا[1]...ئەمـەو گەرچـی لـەپاڵ پەیامبەرایەتییشـدا خـوای گـەورە پادشـایەتی و دەوڵەمەنـدیی و هێزیشی پێ دابوو.

ئەبو ئەلحوسەین ئەڵێ: ئەبو بەرزە ئەلئەسلەمیی ئەڵێ:پەیامبەری خوا(صـلی الله علیه وسلم)فەرمووی:«إِنَّ فُقَرَاءَ الْمُسْلِمِينَ لَيَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ بِمِقْدَارِ أَرْبَعِينَ عَامًا، حَتَّى يَتَمَنَّى أَغْنِيَاءُ الْمسلمين أَنَّهُمْ كَـانُوا فِـي الـدُّنْيَا فُقَـرَاءَ»[2]،واتـا: هەژارانی موسـڵمانان بەئەنـدازەی چـل پـایز لـەپێش دەوڵەمەنـدەکانیان دەچـنە

[1] - ئەحمەد لە الزهد(٩٢٧)ئیخراجی کردووە.

[2] - زۆر لاوازە، ئەلدەیلەمیی لە مسند الفردوس(٨٨٣)ئیخراجی کردووە، نوفەیعی کوڕی ئەلحاریثـی تێدایـە کەسێکی پەراوێزخراوە(متروك)ە.

بەهەشـتەوە، تائـەوەی دەوڵەمەنـدانی موسـڵمانان لـەرۆژی قیامەتـدا خۆزگـە دەخوازن لەدونیادا هەژاربوونایە.

منیش ئەڵێم: ئەم فەرموودەیە سەلماوە لەپەیامبـەری خواوە(صـلی الله علیـه وسـلم)لەگێرانەوەی کۆمـەڵێك هاوەڵـەوە، لەنێویانـدا ئـەبو هـورەیرەو عبداللـەی کوڕی عەمرو جـابری کـوڕی عبداللـه و گێڕدراوەتـەوە لەئـەبی سـەعیدو ئەنەسـی کوڕی مالیکیشەوە، گەر پێش دەوڵەمەندانیش بچنە بەهەشتەوە ئـەوە بەڵگـەی پایەبـەرزبوونیان نییـە، بـەڵکو لەبـەر ئەوەیـە شـتی زۆریـان نییـە لەسـەری لێپرسـینەوە بکـرێن، بێگومـان دەسـەلأتداری دادپـەروەرو دەوڵەمەنـدی سوپاسگوزار کە درەنگتر دەچنە بەهەشتەوە، بەڵگـەی نزمیـی پایـەو مـەقامیان نییە لەبەرانبەر هەژارداو پێشتر باسمان کرد.

خۆزگە خواستنی دەوڵەمەندان بەوەی خۆزگە لـەدونیادا هـەژار بوونایـە، گـەر ئەم بێژەیە دروست بێ، ئەوە بەڵگەی نزمیی پلە و پایەی ئـەوان نییـە، هـەروەك دادوەری دادپـەروەر لەهەنـدێ شـوێنی رۆژی قیامەتـدا خۆزگـە دەخـوازێ لەبـەر دەنکە خورمایەکیش بوایـە لـەنێوان دوو کەسـدا لـەدونیادا دادوەریـی نـەدەکرد، ئەوەش لەبەر سەختیی کارەکەیە.

ئەبو ئەلحوسەین ئەڵێ: ئیبن عومەر گێڕاویەتییەوە کە پەیامبـەری خوا(صـلی الله علیـه وسـلم)فەرموویەتی: چـی جـۆرە خـەڵکێك باشـترینە؟ هەنـدێك وتیـان: دەوڵەمەنـدێك مـافی خـۆی و سـەروەتەکەی بـدات، پەیامبـەر فـەرمووی: ئـەوە

باشترین کەسێکە، بەلاّم باشترینی خەڵکیی باوەڕدارێکی هەزارە لەسەر ماندوویەتی و شەکەتیی ئەبەخشێ[1].

منیش ئەڵێم: بۆ ئەم فەرموودەیە رشتەیەك باس نەکراوە تەماشا بکرێت، فەرموودەیەك حاڵی نەزانرێ ناکرێتە بەڵگە، گەر دروستیش بێ ئەوە بەڵگەیەکی تێدا نییە، چونکە هەزارێك بەباش دەزانێ لەسەر ماندووبوون دەبەخشێ، هەزاریی ئارامگران و سوپاسگوزاریی سوپاسگوزارانی تێدایە، بێگومان ئەمە باشترینی سێ جۆرەکەیە، درهەمێکی ئەم جۆرە مرۆڤە پێش هەزار درهەمی کەسیی تر ئەکەوێ، هەروەك پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی:"سەد درهەمی خێر پێش هەزار درهەم ئەکەوێ، وتیان: ئەی پەیامبەری خوا چۆن سەد درهەم پێش هەزار درهەم ئەکەوێ؟ فەرمووی: پیاوێك دوو درهەمی هەیەو دانەیەکیان ئەکاتە خێر، یەکێکی تر سەروەتێکی زۆری هەیە و لەکۆی ئەو هەموو سەروەت و سامانەی سەد هەزار دەر ئەکات و ئەیکاتە خێر[2]. نەسائیی گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەی صەفوانی کوڕی عیساوە کە ئیبن عەجلان بۆی باسکردین لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ئەویش لەئەبی ساڵحەوە ئەویش لەئەبو هوریەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ).

بەیهەقیی[3] لەفەرموودەیەکی سەورییەوە دەگێڕێتەوە لەئەبی ئیسحاقەوە ئەویش لەئەلحاریثەوە ئەویش لەعەلییەوە(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: سێ کەس

---

[1] - مەوزوعە، فەرموودەکە لە الجامع الصغير(٣/ ٤١٨- فيض القدير)دا هەیە.

[2] - حسن، ئیبن خوزەیمە(٢٤٤٣) و نەسائی(٥/ ٩٥) و ئیبن حیبان(٣٤٤٧) و حاکم(١/ ٤١٦)ئیخراجیان کردووە.

[3] - ئەحمەدی کوڕی ئەلحوسەینی کوڕی عەلی، ئەبو بەکر(ساڵی٣٨٤ك لەدایکبووەو ساڵی٤٥٨ك مردووە)، یەکێك بووە لە پێشەوا بەناوبانگەکانی فەرموودە.

هاتنه لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، یەكێكیان وتی: من سەد ئۆقییەم هەبووەو دە ئۆقییەم لێ كردووەتە خێر، یەكێكی تریان وتی: من سەد دینارم هەبووەو دە دینارم لێ كردووەتە خێر، سێیەمیان وتی: من دە دینارم هەبووەو دیارێكم لێ كردووەتە خێر، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی: "كُلُّكُمْ فِي الْأَجْرِ سَوَاءٌ كُلُّكُمْ قَدْ تَصَدَّقَ بِعُشْرِ مَالِهِ"[1]، واتا: هەمووتان لەخێردا وەك یەك یەكسانن، هەر یەكەتان دە یەكی ماڵەكەی بەخێر كردووە.

ئەبو سەعیدی كوڕی ئەلئەعرابیی ئەڵێ: ئیبن ئەبی ئەلعەوام بۆی باسكردین كە یەزیدی كوڕی هارون بۆی باسكردین، ئەبو ئەلئەشهەب بۆی باسكردین لەئەلحەسەنەوە وتی: پیاوێك بەعوسمانی كوڕی عەفانی وت(خوای لێ رازیی بێ): ئەی خاوەن پارەو سەروەتەكان هەموو خێرەكانتان بۆ خۆتان برد، خێر ئەكەن، كۆیلە سەربەست ئەكەن، حەج دەكەن و ئەبەخشنەوە، عوسمانیش وتی: ئێوە ئیرەیی بەئێمە دەبەن و ئێمەش ئیرەیی بەئێوە دەبەین، سوێند بەخوا درهەمێكی ئێوە كە بەناڕەحەتی و ماندوویەتیی پەیدای دەكەن و دەیبەخشن لە دە هەزار درهەمی ئێمە خێری زۆرترە لەكاتێكدا بەراورد بەوەی ئێمە دەیبەخشین زۆر كەمە[2].

لەسوننەنی ئەبو داووددا لەفەرموودەی لەیثەوە هاتووە ئەویش لەئەبی ئەلزوبەیرەوە ئەویش لەیەحیای كوڕی جەعدەوە ئەویش لەئەبو هورەیرەوە كە

---

[1] - زۆر لاوازە، بەیهەقیی لە السنن(٤/ ١٨٢) و ئەحمەد(١/ ٩٦) و بەزار(٨٤١)ئیخراجیان كردووە، ئەلحاریثی ئەلئەعوەری تێدایە كەسێكی لاوازە.

[2] - لاوازە، بەیهەقیی لە شعب الإیمان(٣١٨٢)ئیخراجی كردووە.

وتوویەتی: ئەی پەیامبەری خوا چی سەدەقەیەك باشترینە؟ فەرمووی:" جهد المقل وابدأ بمن تعول"[1]،واتا: بەخشینی ئەوپەڕی پارەیەكی كەم كە بەناڕەحەتیی پەیدا بكرێ بەسەر ئەوانەدا بیبەخشیتەوە كە ئەركی بەخێوكردنیان لەسەرتە.

لەموسنەدو صەحیحی ئیبن حیباندا هاتووە لەفەرموودەیەكی ئەبو زەڕەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ:وتم: ئەی پەیامبەری خوا چی خێرو سەدەقەیەك باشترینە؟ فەرمووی: بەخشینی ئەوپەڕی پارەو سەرمایەیەك كە بەناڕەحەتیی پەیدا بكرێ[2].

لەسوننەنی نەسائییدا هاتووە لەفەرموودەیەكی عەلیی ئەلئەزدییەوە ئەویش لەعوبەیدی كوڕی عومەیرەوە ئەویش لەعبداللەی كوڕی حوبشییەوە كە پرسیار لەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) كرا: چی كارو كردەوەیەك باشترینە؟ فەرمووی:"ایمان لا شك فیه وجهاد لا غلول فیه وحجة مبرورة"،واتا: ئیمانێك هیچ گومانێكی تیادا نەبێ و جیهادێك هیچ ناپاكی و ستەمێكی تیادا نەبێ و حەجێكی قبوڵكراویش.

وترا: ئەی چی نوێژێك باشترینە؟ فەرمووی: نوێژێك وەستانی زۆربێ. وترا: چی خێرو سەدەقەیەك باشترینە؟ فەرمووی: ئەوپەڕی شتێكت لەدەست بێ و بیبەخشی. وترا: چی هیجرەتێك باشترینە؟ فەرمووی:"من هجر ما حرم الله علیه"،واتا: دووركەوتنەوە لەشتێك كە خوای گەورە لەسەرتی حەرامكردووە.

---

[1] - صەحیحە، ئەبو داوود(١٦٧٧) و ئەحمەد(٢/ ٣٥٨) و ئیبن خوزەیمە(٢٤٤٤)ئیخراجیان كردووە.

[2] - زۆر لاوازە، بەشێكی فەرموودەیەكی دوورودرێژە ئەحمەد(٥/ ١٧٨) و بەیهەقیی لە الشعب(٣٢٩٨) ئیخراجیان كردووەو ئەبو عەمری ئەلدیمەشقیی تێدایە كەسێكی پەراوێزخراوە(متروك).

وتــرا: چــی جیهادێــك باشــترینە؟ فــەرمووی:" مــن أهريــق دمــه وعقــر جواده"[1]،واتا: جیهادی ئـەو کەسـەی خۆی و ئەسپەکەی لـەپێناو خـوادا بـەخت ئەکات.

هەموو ئەم فەرموودانە بەڵگە دەدەن لەسەر ئەوەی، بەخشینی مـاڵێکی کـەم کە بەنارەحەتیی پەیدا بکرێ و لەدەست بـێ باشـترە لـەخێری سـەروەتێکی زۆر کـە هەنـدێکی ببەخشـی، لەبەخشـینی هەنـدێ لـەو سـەروەتەی شـوێنەواری بەخشـراوی تیـادا دیـار نـەبێ و وانـەزانی شـتێکی لـێ کەمبووەتـەوە، چـونکە باشتردانانی کاروکردەوەکان لای خـوای گـەورە پەیوەسـتە بـەوەی لەدڵەکاندایـە نـەوەك زۆری و وێنـە، گرنگییەکـەی بـەهێزی پاڵنـەرو راسـتگۆیی بەخشـەرو دڵسۆزبوونی و پێشخستنی مافی خوایە بەسەر دەروونی خۆیدا، ئاخۆ خێری ئـەو کەسەی کولێرەکەی لەخۆی گرتووەتەوەو لەبـەر خـوا دەیبەخشـێ چـۆن لەگـەڵ خێری کەسێکدا بەراورد دەکرێ کە لەسەروەت و سـامانێکی زۆریـدا سـەد هـەزار درهـەمی بـەخێر کردووە؟بێگومـان کولێرەکـەی ئـەم کابرایـە لەتـەرازووی خـوا سەنگینترو قوورسترە لەسەد هەزار درهەمی کابراکەی تر، خوای گەورەش پشـت و پەنایە.

بەڵگەیان بـەوە هێناوەتـەوە کـە ئـیبن عـەدیی گێڕاویەتییـەوە لەفـەرموودەی سولەیمانی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە، کـە خالیـدی کـوڕی یەزیـد بـۆی باسـکردین ئەویش لەباوکییەوە ئەویش لەعەتائەوە کە گوێی لەئەبو سەعیدی خودریی بووە ئەیووت: گوێم لەپەیامبەری خوا بوو(صـلی الله علیـە وسـلم) ئەیفـەرموو: " اللهُمَّ

[1] - حسن، ئەبو داوود(١٤٤٩) و نەسائی(٥/ ٥٨) و ئەحمەد(٣/ ٤١١) ئیخراجیان کردووە.

تَوَفَّنِي فَقِيرًا، وَلَـا تَـوَفَّنِي غَنِيًّـا"،واتـا: خوایـه گیـان بەهـەژاریی بممرێنـه نـەوەك بەدەوڵەمەندی[1].

ئـەم فەرموودەیـە دروسـت نییـە، چـونکە خالیـدی کـوڕی یەزیـدی کـوڕی عەبدولڕەحمانی کـوڕی مـالیکی ئەلدیمەشـقیی تێدایـە یەکدەنگیی هەیـە لەسـەر لاوازبـوونی و گێڕانـەوەکانی بەبەڵگـە نـاکرێن. ئەحمـەد ئـەڵێ: هـیچ نییـە. ئـیبن مـوعین ئـەڵێ: (واه)یـە، یـەحیا خسـتوویەتییە پـاڵ درۆزنـان و پێشـتر باسمـان لەبارەوە کردووە.

لەم بارەیەوە پرسیار لەشێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە کراوە وتوویـەتی: زۆرێـك لـەزانایانی دوایـین نـاکۆکن لـەبارەی دەوڵەمەنـدی سوپاسـگوزارو هـەژاری ئارامگرەوە، ئاخۆ کامەیان باشترینن؟ کۆمەڵێك لەزاناو خواناسـان، دەوڵەمەنـدی سوپاسگوزاریان باشتر داناوەو کۆمەڵێکی تری زانـاو خواناسـانی تـریش هـەژاری ئارامگریان باشتر داناوە، لەو بارەیەشەوە لەپێشـەوا ئەحمـەدەوە دوو گێڕانـەوە گێڕدراوەتەوە، بەڵام لـەهاوەڵان و تابیعینـەوە(خوای گـەورە لەهـەموویان رازیـی بێ)شتێك نەگێڕدراوەتەوە کە کام لەو دوو کۆمەڵە لەوی تریان باشترینە.

کۆمەڵێکی سێیەمیش هەیە وتوویانە: تەنیا بەتەقوا فەزڵیان بەسەر یەکترەوە هەیـە، کامـەیان ئیمـانی مـەزنترو تـەقوای زیـاتری هـەبێ ئـەوە باشـترینە، گـەر لەئیمان و تەقوادا وەك یەك بن، ئەوە لەفەزڵیشدا وەك یەکن.

ئەڵێ: ئەمە دروستترینی بۆچوونەکانە، چونکە دەقەکانی قورئان و فەرموودە بەئیمان و تەقوا فەزڵەکان دیاریی ئەکەن، پـەروەردگاریش ئەفـەرمووێت:﴿ إِن

---

[1] - زۆر لاوازە، ئـیبن عـەدی لـە الکامـل(٣/ ٨٨٤) و تەبـەرانیی لـە کتـاب الـدعاء(١٣٢٦) و بەیهـەقیی لـە الشعب(١٠٥٠٦)ئیخراجیان کردووە.

يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ﴾ النســاء: ١٣٥، واتــا: ئەگەر(شــايەتى لەسەر دراوەكە)دەوڵەمەند بێت يا هەژار(شايەتيەكە هەر بدەن).

لەنێو پەيامبەران و باوەڕدارانى سەرەتادا كە دەوڵەمەند بوونە، لەزۆربەى هەژاران فەزڵدارتربوونە، هەژاريان تێدا هەبووە لەزۆربەى دەوڵەمەندانيان فەزڵدارتر بووە، كامڵترينيان،ئەوانەن كە هەردوو مەقامەكەيان هەبووە، سوپاسگوزار بوونەو هەم ئارامگريش، سوپاسگوزارى و ئارامگرييەكى تەواو،وەك حاڵى پەيامبەرمان(صلى الله عليه وسلم) و ئەبو بەكرو عومەر(خوايان لىٚ رازيى بىٚ).

بەلاٚم هەنديٚجار هەژاران بۆ خەڵكانێك بەسوودترن و دەوڵەمەندانيش بۆ خەڵكانێكى تر بەسوودترن، هەروەك لەشساغيى بۆ هەندێكيان بەسوودترو نەخۆشييش بۆ هەندێكى تريان بەسوودترە، هەروەك لەو فەرموودەيەدا هاتووە كە بەغەوى و كەسانى تر لەپەيامبەرى خواوە(صلى الله عليه وسلم)لەخواى پەروەردگارەوە گێڕاويانەتەوە: "ان من عبادي من لا يصلحه الا الغني ولو أفقرته لأفسده ذلك، وان من عبادي من لا يصلحه الا الفقر ولو أغنيته لأفسده ذلك وان من عبادي من لا يصلحه الا الصحة ولو أسقمته لأفسده ذلك، وان من عبادي من لا يصلحه الا السقم ولو أصححته لأفسده ذلك، إني أدبر عبادي، إني بهم خبير بصير"[1]،واتا: لەنێو بەندەكانمدا كەسانێك هەن تەنيا دەوڵەمەندبوونيان بۆ شياوە، گەر هەژار بكەوىٚ خراپ و نالەبار ئەبىٚ، هەيانە تەنيا هەژاريى بۆ شياوە، گەر دەوڵەمەندبىٚ دەوڵەمەندييەكەى ليٚى تێكدەدات، هەيانە تەنيا

[1] - لاوازە، ئيبن ئەبى ئەلدونيا لە الأولياء(١) و ئەبو نەعيم لە الحلية(٨/ ٣١٨)ئيخراجيان كردووە، هيشامى ئەلكينانيى تێدايە نەناسراوە.

لەشساغیی بۆی شیاوە، گەر نەخۆش بکەوێ لێی تێکدەدات،هەیە تەنیا نەخۆشیی بۆی شیاوە، گەر لەشساغ بێ لەشساغییەکەی لێی تێکدەدات، خۆم کاری بەندەکانم بەڕێوە دەبەم و خۆم پێیان شارەزاو بینام.

بەدروست لەپەیامبەری خواوە هاتووە(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی:"إِنَّ فُقَرَاءَ الْمُسْلِمِينَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ قَبْلَ الأَغْنِيَاءِ"[1]،واتا: هەژارانی موسڵمانان پێش دەوڵەمەندەکانیان دەچنە بەهەشتەوە.

لەفەرموودەیەکی تردا: کە هەژاران فێری یادو زیکری دوای نوێژ بوون و دەوڵەمەندەکان گوێیان لەوە بوو، ئەوانیش وەکو هەژاران ویردی دوای نوێژەکانیان دەخوێند، هەژارەکان ئەوەیان بۆ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)باسکرد، پەیامبەریش فەرمووی:﴿ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ﴾ الحديد: ٢١،[2]واتا:ئەو(پاداشتە)بەخششێکی خوایی یە دەیدات بە هەرکەس کە خۆی بیەوێت.

بۆیە هەژارەکان لەبەر سووکیی لێپرسینەوەیان پێشتر دەچنە بەهەشتەوە، دەوڵەمەندەکانیش بەهۆی لێپرسینەوەی زۆریانەوە لەچوونە بەهەشتەوە درەنگ دەکەون، پاشان گەر لێپرسینەوەی یەکێکیان کراو چاکەکانی لەچاکەکانی هەژارێك زۆرتر بوو، ئەوە پێگەی بەهەشتی لەپێگەی هەژارەکە بەرزترە با درەنگتریش بچێتە بەهەشتەوە، هەروەك ئەو حەفتا هەزارەی بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە عوکاشەی کوڕی میحصەنیشیان تێدایە، بۆیە دەکرێ

---

[1] - پێشتر تەخریج کراوە.

[2] - بوخاری(٨٤٣) ئیخراجی کردووە بەبێ(کە دەوڵەمەندەکان گوێیان لەوە بوویەوە...) و موسلیم(٥٩٥) لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەوە(خوای لێ ڕازیی بێ).

کەسێك بچێتە بەهەشتەوە پێش کەسێکی تر کە لەپێگەو پایەدا لەو بەرزترە، هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دوورن لەسەرئێشەی لێپرسینەوەکردنیان، ئەوە ئەو هەژارییەیە کە لەقورئان و فەرموودەدا باسکراوە، دژە بەو دەوڵەمەندییەی کە زەکات وەرگرتنی حەڵاڵ داناوە یان زەکات دان بەواجیب نازانێ.

پاشان لەزاراوەی زۆربەی خەڵکیدا هەژاریی بووەتە دەربڕینی زوهدو خواپەرستی و رەوشت، هەرکەسێ هەڵگری ئەو سێ سیفەتە بێ پێیدەوترێت هەژار با خاوەن سەروەت و پارەش بێ، هەرکەسێکیش هەڵگری ئەو سیفەتانە نەبێ پێی ناوترێ هەژار با بێ پارەو سامانیش بێ، ئەم واتایە تەصەوفانە ناونراوە، خەڵکانێکیش هەن جیاوازیی دەکەن لەنێوان کەسی هەژارو صۆفییدا، پاشان هەندێکیان کەسی هەژار باشتر دادەنێن و هەندێکی تریش کەسی صۆفیی باشتر دادەنێن.

ئەوەی سەلماوەو دروست بێ لەم تەوەرەدا: ئەوەیە ناڕوانرێتە وشە نوێیەکان، بەڵکو دەڕوانرێتە ئەو ناو و واتایانەی لەقورئان و فەرموودەدا هاتوون، خوای گەورە ئیمان و لەخواترسانی کردووەتە وەسفی دۆستەکانی خۆی، هەرکەسێ پشکی ئیمان و لەخواترسانی زۆربێ باشترینە،خوای گەورەش زاناترە.

***

# تەوەری بیست و سێ

## بەڵگەی هەژاران لەقورئان و فەرموودەو ئەسەرو ئیعتیباردا

**هەژاران وتوویانە: خوای گەورە بەیەکێك لەم لایەن و روانە لەقورئاندا باسی دەوڵەمەندی و سەروەت و سامانی کردووە:**

**یەکەم: لەڕووی نابووتییەوە، وەك دەفەرموویت:** ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ۝٦ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ۝٧ ﴾ **العلق: ٦ – ٧، واتا: بەڕاستی مرۆڤ یاخی دەبێ. کە خۆی ببینێ وادەوڵەمەند بووە. هەروەها دەفەرموویت:** ﴿ ۞ وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ **الشوری: ٢٧، واتا:خۆ ئەگەر خوا ڕزق و ڕۆزی فراوان بکردایە بۆ بەندەکانی لە زەوی دا ستەمیان دەکرد. هەروەها دەفەرموویت:**

﴿ وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ۝٣٣ وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ۝٣٤ وَزُخْرُفًا ۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَٱلْءَاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ۝٣٥ ﴾ **( الزخرف: ٣٣ – ٣٥ )**

**واتا: خۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە خەڵکی ببن بە ئوممەتی بێ باوەڕ وامان دەکرد هەر کەس بێ باوەڕ بوایە بە خوای میهرەبان سەقفی خانوەکانیان لەزیو بوایە هەروەها پلەکان کە پێ ی دا سەردەکەون بۆمان دەکردن بە زیو. وە دەرگای زۆرمان بۆ خانووەکانیان دادەنا وە کورسی و قەنەفەی زۆر تا لەسەری دانیشن و پاڵ بدەنەوە. وە زەخرەفەی زۆر(لە ئاڵتون و زیو)جا هەموو ئەوانە**

بەهرەو خۆشی ژیانی دونیایە بەڵام(پاداشتی)ڕۆژی دوایی لای پەروەردگارت بۆ پارێزکارانە.

هەروەها دەفەرمووێت:﴿ فَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُمۡۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾ التوبة: ٥٥، واتا: جا با سەرنجت ڕانەکێشێت(سەرسامت نەکات)(زۆری) ماڵ و دارایی و منداڵیان بێگومان خوا دەیەوێت سزایان بدات بەهۆی ئەو(ماڵ و منداڵەوە)لەم ژیانی دنیایەدا وە بەسەختی گیانیان دەربچێت لە کاتێکدا کە ئەوان بێ باوەڕن.

هەروەها فەرموویەتی:﴿ ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ﴾ الكهف: ٤٦، واتا: ماڵ و کوڕو کاڵ جوانی و زینەتی ژیانی دنیان.

هەروەها دەفەرمووێت:﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ ﴾ آل عمران: ١٤، واتا:جوان کراوە بۆ خەڵکی(دنیا پەرست)خۆشی و ئارەزوواتی نەفسی لە ئافرەتان و کوڕان و دارایی زۆری کەڵەکە کراو لە ئاڵتون و زێڕو زیو.

بۆیە هاوشێوەی ئەم ئایەتانە زۆرن.

**ڕووی دووەم:** لەڕووی تاقیکردنەوەو بەلاوە باسی دەکات، هەروەك دەفەرمووێت:﴿ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ ﴾ التغابن: ١٥، واتا: بێگومان دارایی و منداڵتان هەر هۆی تاقی کردنەوەتانن لە کاتێکدا خوا پاداشتی زۆر و گەورەی لەلایە.

پەروەردگار ئەفەرمووێت:﴿ أَيَحۡسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٖ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمۡ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ بَل لَّا يَشۡعُرُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾ المؤمنون: ٥٥ – ٥٦، واتا: ئایا ئەوانە وا

دەزانـــن ئـــەوەی پـــێ یـــان دەبەخشـــین لەســـامان و منـــدالآن. بەهۆی(شیاویانەوە)چەسپانیمان کردووە بۆیان لەخێرو خۆشیەکاندا(نەخێر وانـی یە) بەڵکو ئەوانە هەست ناکەن(کە بۆ تاقی کردنەوە)یانە.

خوای گەورە باس لەتاقیکردنەوەی خۆی دەکات بۆ مرۆڤ بەدەوڵەمەنـدکردنی و ئەفـــەرموویت:﴿ فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ ﴾ الفجر: ١٥، واتا: جا کاتێك کـە خـوا ئـادەمی تـاقی کـردەوەو ڕێـزی گرت و ناز نیعمەتی بەسەردا ڕشت ئەوە دەڵێ پەروەردگارم ڕێزی گرتوم.

هـــەروەهـــا دەفـــەرموویت:﴿ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً ۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الأنبياء: ٣٥، واتا: ئێمە تاقیتان دەکەینەوە بـە خراپـەو ناخۆشـی وە بـە چاکەو خۆشی تا دەرکەویَ(چاك و خراپ) وە هەر بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە.

**ڕووی سێیەم:** خوای گەورە هەواڵی داوە، بەوەی ماڵ و منداڵ بەهیچ شتێك مرۆڤ لەخوای گەورە نزیك ناخەنەوە، بەڵکو بەئیمان و کاری چاکەوە لەخوای گەرە نزیکدەبێتەوە:﴿ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ ( سبأ: ٣٧ )

واتا: سـامان و منـداڵتان شـتێك نـین لای ئێمـە پلـەو پایـەتان نزیـك بکەنـەوە مەگەر ئەوەی باوەڕی هێنابیَ و کردەوەی چاکی کردبیَ بۆ ئەوانـە پاداشـتی دوو بەرامبـەر هەیـە بـەهۆی ئـەو چـاکانەی کـە کردوویانـە ئـەوان لـە کۆشـکە بەرزەکانی(بەهەشتدا)لە ئاسایش دان.

**ڕووی چوارەم:** خـوای گـەورە هـەوڵی داوە، بـەوەی دونیـاو دەوڵەمەنـدیی و سەروەت و سامانی کردووەتە چێژو خۆشیی بۆ کەسێك کە لەئاخیرەتـدا هـیچ پشـکێکی نـەبێ، ئـاخیرەتیش بـۆ لەخواترسـاوان دانـاوەو ئەفـەرموێت:﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ ﴾ طه: ١٣١، واتا: تۆ چاوەکانت مەبڕە ئـەو نـازو نیعمەتانـەی داومانە بە تاقم و دەستەیە لەوان(بێ باوەڕان)(چونکە ئەوە)زینەت و جوانی ئـەم ژیـانی دنیایـە بـۆ ئەوەیـە تاقیتـان بکەینـەوە تیایـدا دڵنیابـە ڕزق و ڕۆزی پەروەردگارت(لە دوا ڕۆژدا)چاکترو بەردەوامترە.

هــەروەها دەفــەرموێت:﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَٰتِكُمْ فِى حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنْيَا وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا﴾ الأحقـاف: ٢٠، واتا:(بیریـان بخەرەوە)ئـەو ڕۆژەی ئەوانـەی کـە بـێ بـاوەڕن بەرانبـەر دۆزەخ ڕادەگیرێن(پێیـان دەووترێت)هەرچـی خۆشیتان بوو بەسەرتان برد لە ژیانی دونیاتان دا و بەهرەو لەزەتتان لێ برد.

هەر بۆ ئەم واتاو مەبەستە، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئاماژەی بۆ عومــەر کــردووەو فەرموویــەتی:"أمــا ترضــى أن تكــون لهــم الــدنيا ولنــا الآخرة"[1]،واتا:ئایە ڕازیی نابی دونیا بۆ ئەوان بێ و ئـاخیرەتیش بـۆ ئێمـە. دواتـر ئەم فەرموودەیە باس دەکەین.

**ڕووی پێنجـەم:** خـوای گـەورە تـەنیا لەشـێوەی سەرزەنشـتکردندا باسـی خۆشگوزەران و خاوەن سەروەتەکانی کـردووە، وەك دەفـەرموێت:﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾ الواقعة: ٤٥، واتا: بەڕاسـتی ئەمانـە لەمـەوپیش خـۆش گوزەران بوون.

---

[1] - بوخاری(٢٤٦٨) و موسلیم(١٤٧٩)(٣٤)ئیخراجیان کردووە.

هەروەها دەفـەرموویت: ﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا ﴾ الإسراء: ١٦، واتا: کاتێ بمانەوێ(دانیشتوانی)شار و ولآتانێ لەناو ببەین فـەرمان دەدەین(بـەگوێ رایـەڵی و کـردەوەی چـاك) بـە دەوڵەمەنـدە خراپـەکار و زۆردارەکانی کەچی ئەوان یاخی دەبن و لەفەرمان دەردەچن.

هـەروەها دەفـەرموویت: ﴿ لَا تَرۡكُضُواْ وَٱرۡجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتۡرِفۡتُمۡ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡـَٔلُونَ ١٣ ﴾ الأنبياء: ١٣، واتا:فریشتـەکان بەگاڵتـەوە پێیـان دەڵێن رامەکـەن و بگەڕێنـەوە بـۆ لای ئـەو نـازو نیعمەتانـەی کـە رۆچـوون تێیـدا وە(بگەڕێنەوە)بۆ سـەر خـانوو ماڵـەکانتان بـەڵکو پرسیارتان لـێ بکرێ لـەوەی بەسەرتان هاتووە.

**ڕووی شەشەم:** خوای گەورە سەرزەنشـتی ئەوانـەی کـردووە کـە سـەروەت و سـامانیان خۆشـدەوێ و بـەوە عەیبـداری کـردوون و ئەفـەرموویت: ﴿ وَتَأۡكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكۡلٗا لَّمّٗا ١٩ وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا ٢٠ ﴾ الفجـر: ١٩ — ٢٠، واتـا: بەڵکو سەرەڕای ئەمەش بەشە کەلەپور(ی بەشداران)هەمووی(بە هەڵپـە)دەخۆن. وە ماڵ و سامانتان خۆش دەوێت بە خۆش ویستنێکی زۆر.

**ڕووی حەوتـەم:** سەرزەنشـتی ئەوانـەی کـردووە کـە خۆزگـەی دونیـاو دەوڵەمەنـدی و خۆشـگوزەرانییان هەیـە، پیاهەڵـدانی ئەوانەشـی کـردووە کـە ئەوەیان رەتکردووەتەوەو پێچەوانەی پێڕی دونیاویستانیان کردووە، لـەبارەی دەوڵەمەنـدترین کەسـانی سـەردەمەوە فەرموویـەتی: ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ فِي زِينَتِهِۦۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا يَٰلَيۡتَ لَنَا مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ٧٩ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ

ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًاۚ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾ القصص: ٧٩ – ٨٠،

واتا: ئینجا(قاروون)بەخۆ ڕازاندنەوە هاتەدەر بۆ ناو گەلەکەی ئەوانەی ژیانی دنیایان دەویست وتیان ئای خۆزگە ئەوەندەی بە قاروون دراوە ئێمەش بمان بوایە بەڕاستی ئەو(قاروون)خاوەنی بەش و بەختێکی گەورەیە. بەڵام ئەو کەسانەی کە زانسیان پێ درابوو وتیان هاوار بۆ ئێوە پاداشتی خوا(لە ڕۆژی دواییدا)لەوە چاکترە بۆ ئەو کەسانەی بڕوایان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردووە وە کەس ئەو(ووتەی زانایانە)وەرناگرێ جگە لە خۆڕاگران.

**ڕووی هەشتەم:** خوای گەورە گومانی ئەوانەی بەرپەرچداوەتەوە، کە وەهایان گومان بردووە فەزڵداربوونی مرۆڤەکان بەهۆی ماڵ و سامانەوەیە کە بۆ ڕاپەڕاندنی دەسەڵات و پادشایەتیی پێویستییان پێی هەیە، پەروەردگار ئەفەرمووێت:

﴿ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًاۚ قَالُوٓاْ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِۚ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى ٱلْعِلْمِ وَٱلْجِسْمِۖ ﴾ ( البقرة: ٢٤٧ )

واتا: پێغەمبەرەکەیان پێ ی وتن بێگومان خوا طالووتی بۆ ناردن بە پادشا وتیان ئەو چۆن ئەبێ بە پادشا بەسەر ئێمەوە کە ئێمە لەو شایستە ترین بەپادشاییی وە دارایی زۆری نەدراوەتێ فەرمووی: بەڕاستی خوا ئەوی هەڵبژاردووە بەسەر ئێوەدا وە بەشی زیاتری داوەتێ لە فراوانی لەزانین و

توانایی جەستە، وە خوا پاشایی خۆی دەدات بەهەر کەس خۆی بیەوێ وە خوا(بەهرە)فراوان و زانایە.

خوای گەورە بەرپەرچی ئەو قسەو بۆچوونەی ئەوانی داوەتەوەو هەواڵی داوە کە رێزو فەزڵ بەهۆی سەروەت و سامانەوە نییە وەك گومانی دەکەن، بەڵکو فەزڵ بەهۆی زانستەوەیە نەوەك پارەو سامان و ئەفەرمووێت:﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ یونس: ٥٨، واتا:ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)بڵێ هەر بەهۆی چاکەو میهرەبانی خواوەیە جا کەواتە با بەوە دڵخۆش بن ئەوە چاکترە(بۆیان)لەوەی کۆی دەکەنەوە لەشتی ئەم دنیایە.

زانست و ئیمان و قورئان فەزڵ و بەزەیی و سۆزی خوای گەورەن، بەلاّم ئەوەی ئەوان کۆیدەکەنەوە سەروەت و سامان و هۆکارەکانێتی، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ الزخرف: ٣٢، واتا: ئایا ئەوان ڕەحمەتی پەروەرگارت دابەش دەکەن لە کاتێکدا ئێمە لە نێوانیاندا دابەشمان کردووە هۆی گوزەرانیان لە ژیانی ئەم دونیایەدا وە هەندێکیانمان چەند پلە بەرز کردۆتەوە بەسەر هەندێکی تریاندا تا هەندێکیان ئیش بە هەندێکی تریان بکەن وە بەزەیی پەروەردگارت(بۆ تۆ)لەوە چاکترە ئەوان کۆی دەکەنەوە.

**ڕووی دوەم:** خوای گەورە هەواڵی داوە کە هەڵپەو تەقەلا کردن لەکۆکردنەوەی سەروەت و سامان و شتانی تردا، خەڵکیی سەرقاڵکردووەو

ئاخیرەتی لەبیربردوونەتەوەو بۆ ئاخیرەت خۆیان ئامادەساز نەکردووە، لەسەر ئەوەش هەڕەشەیان لێ دەکات و ئەفەرمووێ: ﴿ أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ۝١ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ۝٢ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ۝٣ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ۝٤ ﴾ التكاثر: ١ – ٤، خوای گەورە هەواڵی داوە کە دونیاویستان بەهۆی هەڵپەکردنیان بۆ زۆرکردنی سەروەت و سامان بێ ئاگا بوونە، بێ ئاگابوونە لەخوای گەورەو ڕۆژی ئاخیرەت تائەو کاتەی مەرگیان دێ و دەبردرێن بۆ سەردانیکردنی گۆڕستان، هەتا ئەوکاتە لەخەوی بێ ئاگایی و زۆرکردنی سامانی دونیا بەئاگا نایەنەوە.

خوای گەورە کە ناویبردووە سەردانیکردنی گۆڕستان، ئاگادارکردنەوەیانە بەوەی گۆڕ جێگەی گیرسانەوەو هەمیشەییان نییە، بەڵکو گۆڕ بۆ ئەوان وەك شوێنی مانەوەی گەشتیارو سەردانیکارانە، بۆ ماوەیەك تیایدا دەمێننەوەو دواتر بەجێیدەهێڵن وەك بەجێهێشتنی دونیا کە تیایدا نەگیرسانەوە، بەڵکو گۆڕیش بەجێدەهێڵن بۆ شوێنی گیرسانەوە ئایە بەهەشتە یان دۆزەخ.

خوای گەورە سەرزەنشتی خودی سەروەت و سامانی نەکردووە، بەڵکو سەرزەنشتی زۆرکراو و کۆکردنەوەی کردووە، وەك دەوترێ: یارییەکە سەرقاڵی کردین، باس ناکرێ چی یارییەك، بەڵام ویستی ڕەها بریتییە لەهەر شتێك بەندە هەوڵی زۆر کۆکردنەوەی بدات لەسەروەت و سامان و ناوبانگی و بەندەو جاریەو خانوو باخ یان زانستێك لەبەر خوا نەبێ، یان زۆر ئەنجامدانی کارێك پێیەوە لەخوا نزیك نەبێتەوە، بۆیە هەموو ئەوانە لەو هەوڵ و زۆر تەقەلایە دادەنرێن کە مرۆڤ لەخوای گەورەو ئاخیرەت بێ ئاگا ئەکەن.

لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە[1] لەفەرموودەی عبداللەی کوڕی ئەلشیخیرەوە کە وتوویەتی: گەیشتمە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە:﴿ أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ﴾، فەرمووی: ئەوەی ئادەم ئەڵێ: سەروەت و سامانەکەم سەروەت و سامانەکەم، ئاخۆ تۆ چی ماڵ و سامانێکت هەیە جگە لەوەی بەخشیوتەو ڕۆیشت، یان خواردووتەو نەما یان لەبەرت کردووە کۆن و لەنێودەچێ؟!

پاشان خوای گەورە هەڕەشە و بەڵێنی دووپاتکراوی بەو کەسە داوە، کە زۆرکردنی هۆکارەکانی دونیا بێ ئاگای کردووە، ئەویش کاتێك پێشانی دەدات کە هەوڵە زۆرەکانی و شتە کۆکراوەکانی دەبنە تەپوتۆزو بەبادا دەچن و ئەزانێ ئەو دونیایەی ئەو هەوڵی زۆری بۆ دەدا تەنیا فێڵ و لەخشتەبردن بووەو هیچی تر، سەرەنجامی هەوڵەکانیشی سزاو ئەشکەنجەی بۆ هەیەو وەك ئەوانی تر دونیای زیانکردو لای خوای گەورەش سەرەنجامی وەهای بۆ دەردەکەوێ، کە بەخەیاڵیدا نەهاتووەو ئەو زۆرکراوەی دونیای دەبێتە گەورەترین هۆی ئەشکەنجەو ئازاری، لەدونیادا بەهەوڵە زۆرەکانی ئەشکەنجەو ئازار ئەبینێ، لەبەرزەخدا سزای لەسەر دەبینێ، لەڕۆژی قیامەتیشدا سزای لەسەر دەبینێ، بەو زۆرکردنەی شتانی دونیای بەدبەختتر ئەبێ و بەرزی و دەوڵەمەندیی نامێنێ، ئای ئەوە چی بەدبەختی و چی هەڵپەیەکی کەمە؟! ئەوە چی دەوڵەمەندییەکە کە هەژاری و نەهامەتیی دەهێنێ؟! چی خۆشییەکە بەهەموو خراپەو ناخۆشییەك دەگات؟! ئەوەیە کەسەکە کاتێك پەردەی لەسەر لادەدرێت ئەڵێ:

---

[1] - موسلیم(٢٩٥٨)ئیخراجی کردووە.

﴿ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ﴾ الفجـر: ٢٤، واتا:ئینجـا بەداخـەوە دەڵـێ خۆزگە لە دنیادا کاری چاکەم پێش بخستایە بۆ ئەم ژیانەم.

خۆزگە ئەخوازێ ئەو شتەی ئەو کۆی دەکردەوە پـێش مردنـی بیخستبایەتە خزمـەت فـەرمانی خـوای گـەورەوە: ﴿ رَبِّ ٱرۡجِعُونِ ۝ لَعَلِّيٓ أَعۡمَلُ صَٰلِحٗا فِيمَا تَرَكۡتُۚ كَلَّآۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ﴾ المؤمنـون: ٩٩ – ١٠٠، واتـا: ئـەی پەروەردگارم بمگێڕەرەوە بۆ دنیا. بەڵکو کردەوەی چاك بکەم(لـە بـری ئـەوەی نەمکردووە) لەو تەمەنەی لەدەستم چوو نـەخێر بێگومـان ئەمـە(ی دەیڵێ)تـەنها قسەیەکە ئەو دەیڵێ.

ئـەوەی ئـەیڵێ تـەنیا قسـەیەکەو بـۆ خـۆی ئـەیکات و گـوێی لـێ نـاگیردرێ و وەڵامی نادرێتەوە.

سەرەتا بیر لەقسەکەی بکـەرەوە: (رب)واتـا: پـەروەردگارا، هـاوار ئەباتەبـەر پەروەردگار، پاشان ڕوودەکاتە ئەو فریشتانەی فەرمانکراوە بیگەڕێننەوە بۆ لای خوای گەورەو ئەڵێ: بمگەڕێننەوە دونیا، پاشان هۆکاری ئـەوە ئـەڵێ کـە بۆچـی بیگەڕێننـەوە دونیـا، ئـەویش بـۆ ئـەوەی ئـەو کـارە چـاکانە ئـەنجام بـدات کـە نـەیکردووە لەسـەرووەت و ناوبـانگی و دەسـەڵات و هێـزو هۆکارەکـانی و ئەوانـە لەکاری چاکەدا بەکاریبهێنێ، بەڵام پێیدەوترێ: نەخێر، جارێکی تر ڕێگـەو بـواری گەڕانەوە دونیات نییە، ئەوەندە تەمەنت کرد بتوانیبایە ئەوانە ئەنجام بدەی.

لەبەرئەوەی خوای گەورە بەبەزەییەو هەمیشە ئـەوەی لـێ چاوەڕێی دەکـرێ بەدەم ئەو کەسـەوە بـڕوات، کـە هـاواری بـۆ دەبـات و بـواری پـێ بـدات تائـەوە بیربهێنێتەوە کە لەدەستی داوە، خـوای گـەورە لـەبارەی داواکـاریی ئـەو کەسـە لەدەستچووەوە ئەفـەرمووێ، ئـەوەی ئـەیڵێ تـەنیا قسـەیەکەو هیچـی تـر، هـیچ

حەقیقەتێکی نییە، ئەوە سرووشتی ئەو مرۆڤە بەو جۆرە حەزی بەکاری چاکە نەبێ، گەر داواکارییەکەشی قبولّ بکرێ لەسرووشتی رابردووی پاشگەزنابێتەوە، ئەوە یەکێکە لەدرۆزنان، بۆیە بڕیاری خوای گەورە باشترین بڕیارو عیزەت و زانست و ستایشی ئەو رەتیدەکاتەوە بەدەم داوای لەو شێوەیەوە بڕوات، چونکە هیچ سوودێکی تێدا نییە، گەر جارێکی تریش بگەڕێنرێتەوە دونیا هەر حاڵەتی یەکەم ئەنجام دەدات، هەروەك پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُوا۟ يَٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾ بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا۟ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَلَوْ رُدُّوا۟ لَعَادُوا۟ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ الأنعام: ٢٧ – ٢٨، واتا: ئەگەر بیان بیتیت کاتێك کە لەسەر قەراغی دۆزەخ وەستێنراوون کە دەڵێن خۆزگە دەگەڕێنراینەوە بۆ دنیا و بەڵگەکانی پەروەردگارمان بە درۆ نەدزانی وە لە بڕواداران ئەبووین. نەخێر بەڕاستیان نی یە بەڵکو ئەوەی کە لەوەو پێش دەیان شاردەوە بۆیان دەرکەوتووە وە ئەگەر بگەڕێنرێنەوە(بۆ دنیا)بێگومان دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کارانەی کە لێیان قەدغە کرابوو وە بەڕاستی ئەوانە درۆزنن.

زۆربەی راڤەوانان بەلای واتای دروستی ئەم ئایەتەدا نەڕۆیشتوون، بیریان لە(بل– بەڵکو) هەروەها لەو کارەی بۆ ئەوان دەرکەوتووە نەکردووەتەوە کە پێشتر لەناخی خۆیاندا شاردبوویانەوە، وەهایان گومان کردووە ئەوەی بۆیان دەرکەوتووە سزاو ئەشکەنجەیە، کە ئەوەیان بەگونجاو نەزانیووە لەگەڵ ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا:﴿ مَّا كَانُوا۟ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ ﴾ بەخستنەسەرێکی سڕدراوە(مضاف محذوف)خەملاندنیان بۆ کردووە، ئەویش باشترین کارێك کە

پێشتر دەیانشاردەوە، بۆیە چوونەتە ناو کارێکی ترەوە کە وەڵامیان لەبارەوە نییە، ئەویش ئەوەیە، ئەو قەوم و کەسانە هاوبەش بڕیاردان و بێباوەڕیی خۆیانیان نەشاردبووەوە، بەڵکو ئاشکرا دەریانخستووەو بانگەوازیان بۆ کردووەو لەپێناویدا شەڕیان کردووە.

کە زانیوویانە نەیانپێکاوەو لەوەدا قسەیان دێتەسەر، هاتوون وتوویانە: ئەوانە لەبابەت قیامەتدا هاوبەش بڕیاردانی خۆیانیان شاردووەتەوەو قیامەتیان رەتکردووەتەوەو وتوویانە: ﴿ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنعام: ٢٣، کە لەسەر دۆزەخ راگیراون، ئەو پاداشت و سزایەیان لێ دەرکەوتووە کە لەدونیادا شاردبوویانەوە، ئەلواحیدیی ئەڵێ: لەمەدا راڤەوانان شتێکیان نەوتووە گونجاو بێ.

کۆمەڵێکیان وتوویانە، لەنێویشیاندا ئەلزەجاج: بەڵکو بۆ کەسانی شوێنکەوتەو ژێر دەستە شتانێك دەردەکەوێ و ئاشکرا دەبێ کە گەورەکان لەبابەت قیامەت لەوانیان شاردبووەوە.

ئەم راڤەیە پێویستی بەڕاڤەو لێکدانەوەی تر هەیە، زۆر لەخۆکردنێکی تێدایە کە بێ مەترسی و شاراوەیی نییە، پووختتر لەمە ئەوەیە کە موبەڕید لەم ئایەتە تێگەیشتووەو ئەڵێ: وەك ئەوەی بێباوەڕییەکەیان لێیان روون و دەرکەوتە نەبووبێ و زیانەکەی لایان شاراوە بووبێ، کە بۆیان دەرکەوت چی سزاو ئەشکەنجەیەکی هەیە، ئەوجار حەقیقەت و خراپەی بێباوەڕی و هاوبەش پەیداکردنەکەیان زانیووە. ئەڵێ: وەك ئەوەی پێشتر بۆ یەکێك قسەیەکت کردبێ لەبارەی شتێکەوەو ئینجا جارێکی تر پێی بڵێیتەوە: وا ئەوەت بۆ دەرکەوت کە پێشتر بۆتم باسکردبوو، ئەمە بەکەسێك ناوترێ کە ستەمی دەرخستبێ و

خراپەی کردبێ و مرۆڤەکانی کوشتبێ و هەوڵی بڵاوکردنەوەی خراپەکاریی دابێ لەزەویدا، بەمە ناوتریێ نەزان و نەفام بووە بەسەرەنجامی کاروکردەوەکانی.

خوای گەورە زاناترە، واتای ئەم ئایەتە ئەوەیە، کاتێک ئەو هاوبەش پەیداکەرانە لەبەردەم دۆزەخدا رادەگیردرێن و دۆزەخ دەبینن و دڵنیان ئەخرێنە نێویەوە، ئەوکات خۆزگە دەخوازن بگەڕابایانەوە دونیاو باوەڕیان بەخواو بەڵگەکانی بهێنابایەو پەیامبەرانی خوایان بەدرۆزن نەزانیبایە، بەڵام خوای گەورە هەواڵ دەدات کە کارەکە بەوشێوەیە نییە، ئەوان هەر لەسرووشتیاندا باوەڕ بوونی نییە، بێباوەڕی و هاوبەش پەیداکردن و بەدرۆخستنەوە سروشت و نەریتی ئەوانەیە، گەر جارێکی تریش بگێڕدرێنەوە دونیا هەر کاری پێشتر دووبارە دەکەنەوە، ئەوەشی داوا دەکەن بگەڕێنەوە باوەڕدار ئەبن و پەیامبەران بەڕاست دەخەنەوە قسەیەکەو درۆ دەکەن.

گەر مەبەست و واتای ئایەتەکە هاتبێتەدی، ئەوە واتای(بل) و ئەوە دەرکەوتووە کە لەوان دەرکەوتووەو پێشتر شاردبوویانەوە، بەڵگە بۆ ئەوە، خۆزگەی ئەوانە بگەڕابانەوە دونیاو پەیامبەرانیان بەدرۆنەخستبایەتەوە، ئەوان زانیوویانە لەدونیادا لەسەر بیروباوەڕی پووچ و بێ بنەما بوونە، پەیامبەرانیش راستگۆ بوونە لەوەی لەلایەن پەروەردگارەوە بۆیانیان هێنابوو، دڵنیابوونە، بەڵام ئەوەیان لەناخدا شاردبووەوەو لەنێو خەڵکدا ئەوەیان دەرنەخستووەو ئامۆژگاریی یەکتریان کردووە ئەو راستییە بشارنەوە، ئەوە نییە خۆزگەی گەڕانەوە دونیایان هەبووبێ تاوەکو باوەڕ بهێنن و راستگۆیی پەیامبەران بزانن کە پێشتر نەیانزانیووە، بەڵکو راستیی پەیامی پەیامبەرانیان زانیووەو شاردوویانەتەوە، بۆیە لەڕۆژی قیامەتدا ئەوەیان بۆ دەردەکەوێ کە

شاردبوویانەوەو دەشیانزانی خۆیان لەسەر ناڕەوان و پەیانبەرانیش لەسەر حەقن، دوای شاردنەوەی ئەوە حەقیقەتە کە ئەنجامەکەی بەچاو دەبینن، گەر بشگەڕێنرێنەوە دونیا، ئەوە دەروونیان رێگە بەباوەڕبوون نادات، هەر دەگەڕانەوە سەر بێباوەڕی و بەدرۆخستنەوەی پەیامبەران.

ئەوان خۆزگەی باوەڕ ناخوازن کە خۆزگە باوەڕداربوونایە لەبەر ئەوەی پەیامی خوا پەیامێکی حەق بووە و هاوبەش بڕیاردانیش ناڕەوابووە، بەڵکو ئەوان کە سزای دۆزەخیان بینیووەو زانیوویانە توانای ئەو سزایەیان نییە،ئینجا خۆزگەی گەڕانەوە دونیایان هەبووە.

ئەمە وەك نمونەی کەسێکە یەکێکی خۆشبووێ و تێکەڵیی بکات و بشزانێ خۆشەویستیی بۆ ئەو کەسە خۆشەویستییەکی ناڕەوایە و دوورکەوتنەوەشی لێی عاقڵییە، پێیدەوترێ: گەر بەخێوکەرت(خاوەنەکەت) پێت بزانێ سزات دەدات، ئەزانێ راستە گەر پێی بزانرێ سزا دەدرێ بەلام هەر سەرسەختیی ئەکات و لووتبەرزیی دەنوێنێ و ئەڵێ: نەخێر خۆشویستن و تێکەڵیکردنی ئەو کەسە شتێکی رێك و چاکە، بەلام کە بەخێوکەری لەوەدا گرتی و ویستی سزای بدات و دڵنیابێتەوە لەوەی سزا دەدرێ، خۆزگەی ئەوە دەخوازێ لەسزادان ببەخشرێت و بەڵێن دەدات جارێکی تر لەگەڵ ئەو کەسەدا کۆنابێتەوە، لەدڵیشیدا خۆشەویستیی ئەو کەسە هەر ماوەو هەیە، بەلام کە چاری ناچار ئەبێ و دەستبەسەر دەکرێ و لەکاتی سزاو ئەشکەنجەدا ئەوە دەردەخات، کە دەیزانی سەرەنجامی ئەوەی رێگریی لێ دەکرا سزایەو دروست ئەوە بوو کە رێگریی لێ

دەکرا،بەلاّم گەر بشگێڕدرابایەتەوە هەر ئەوەی دەکردەوە کە ڕێگریی لێ کرابوو.

بڕوانە گونجانی(بل"بەڵکو"ی الإضراب) بەو واتایە، ڕەتی ئەو قسەیەیان دەکاتەوە کە ئەڵێن: گەر بگەڕێندرێینەوە دونیا باوەڕدار ئەبووین و پەیامبەرانمان بەڕاست دەخستەوە، بەوپێیەی ئەوەی ئێستا بۆیان دەرکەوتووە، ئەوەیە ئەوەی پەیامبەران وتوویانە راست و حەق بووە، واتا: ئەوەی ئێوە ئەیلێن وا نییە، بەڵکو ئێوە ئەم راستییەی ئێستاتان دەزانی و شارەزای بوون و دەتانشاردەوە، بۆیە ئێستا شتێکتان بۆ دەرنەکەوتووە پێشتر نەتانزانیبێ و ئێستا بۆ ئێوە ببێتە پاساو و بیانوو، بەڵکو ئەوەتان بۆ دەرکەوت کە پێشتر دەتانزانی و ئامۆژگاریی یەکترتان دەکرد بەشاردنەوەی، خوای گەورەش زاناترە. ئیتر لەم بابەتەدا درێژەی پێ نادەین.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ كَلَّا لَوۡ تَعۡلَمُونَ عِلۡمَ ٱلۡيَقِينِ ۝٥ ﴾ التكاثر: ٥، واتا:وانی یە(وەکو خۆتان دەیزانن) ئەگەر(ئەنجامی خۆتان)بزانیایە بەدڵنیایی یەوە وا بێ ئاگا نە ئەبوون.

وەلاّمەکەی سڕاوەتەوە، ئەوەی بەڵگەی لەسەر داوە ئایەتەکەی پێشترە، واتا: هەوڵ و تەقەلای زۆرکردنی هۆکارەکانی دونیا ئێوەی بێ ئاگاو لەخشتەبرد، کە زانینی یەقینتان لەدەست دا ئەوکات ئەو هەڵپەو تەقەلاکردنەی دونیاتان بەلاوە لەپێشترو کاریگەرتربوو،ئەو زانینەی کە مرۆڤ دەگەیەنێتە ئاستی ئەو پێویستییانەی کە گومان لەدروستییەکەیدا نییە، بەلاّم گەر حەقیقەتی ئەو زانینە بەدڵ گەیشت و تێکەڵی بوو، ئەوکات ناهێڵێ بەشتی تری جگە

خواپەرستییەوە ئالودەبیّ، دەبیّ ئەوەش بزانین کە تەنیا زانین بەقێزەونیی شتێك و دەرەنجامی خراپی بەس نییە بۆ ئەوەی وازی لیّ بهێنرێت، بەلاّم گەر زانینی دلّنیایی(علم الیقین)ی بۆ دروستبوو، ئەوکات پێداگرتر ئەبیّ بۆ دوورکەوتنەوە لەو شتە خراپە، کە گۆڕدرا بۆ خودی دلّنیایی(عین الیقین- بینراوەیی)، ئەوکات دەگمەن ئەبیّ لەو شتە خراپەیە دوورنەکەوێتەوە، هەر لەم واتایەدا حەسسانی کوڕی ثابت وتوویەتی:

سِرْنا وساروا إلى بدر لِحَتْفِهِم          لو يعلمون عين العلم ما ساروا

واتا: ئێمە بەڕێکەوتین و ئەوانیش بەڕێکەوتن بۆ بەدر تاوەکو لەنێوبچن، گەر بەچاو ئەوەیان ببینایە بەڕیّ نەدەکەوتن.

خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ۝ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ۝ ﴾ التكاثر: ٣ - ٤، وتراوە: ئەمە دووپاتی دەکاتەوە کە زانینیان هەبووە وەك بەلگەی: ﴿ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ۝ ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ۝ ﴾ النبأ: ٤ - ٥، وتراوە: دووپاتکردنەوە(تأكيد)نییە، بەلّکو زانینی یەکەم و سەرەتایە لەکاتی مردندا، زانینی دووەم لەگۆڕدایە، ئەمە قسەی ئەلحەسەن و موقاتیلەو عەتائیش لەئیبن عەباسەوە گێڕاویەتییەوە.

بەلّگەی دروستیی ئەم بۆچوونە لەچەند روویەکەوەیە:

**یەکەم:** سوودی نویّ و دامەزراو بناغەیەو واتاو روونی و دروستی هەیەو بەهێزی کردووە.

**دووەم:**(ثم-پاشان) کەوتووەتە نێوان هەردوو زانینەوە، واتای ماوەیەك دەدات لەنێوان هەردووکیاندا.

**سێیەم:** ئەم بۆچوونە گونجاوە بەواقیع، ئەوەی بگاتە سەرەمەرگ حەقیقەتی ئەوە دەزانێ کە لەسەری ژیاوە، پاشان لەنێو گۆڕو دواتریشدا زانینێك دەزانێ لەسەرووی ئاستی زانینی یەکەمەوەیە.

**چوارەم:** عەلیی کوڕی ئەبو تالیب(خوای لێ رازیی بێ) و کەسانی تری پێشینیش لەو ئایەتە سزای گۆڕ تێگەیشتوون، ترمیزیی ئەڵێ: ئەبو کورەیب بۆی باسکردین، حەکامی کوڕی ئەسلەمی ئەلرازیی بۆی باسکردین لەعەمری کوڕی ئەبی قەیسەوە، ئەویش لەحەجاجی کوڕی مینهالی کوڕی عەمرەوە، ئەویش لەزرەوە ئەویش عەلییەوە(خوای لێ رازیی بێ) وتی: گومانمان لەسزای گۆڕ دەکرد تاوەکو ئەم ئایەتە دابەزی:﴿ أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ۝١ ﴾ التكاثر[1]: ١، ئەلواحیدیی ئەڵێ: واتای ئەم ئایەتە:﴿ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ۝٣ ﴾ التكاثر: ٣، واتا: لەگۆڕدا سەرەنجامی ئەوە دەزانن.

پێنجەم: ئەمە گونجاوە بەئایەتەکانی دواتر:﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلۡجَحِيمَ ۝٦ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيۡنَ ٱلۡيَقِينِ ۝٧ ﴾ التكاثر: ٦ – ٧، ئەمە بینینی دووەمە، ئەوەش لەدوو رووەوە: یەکەم رەهایانەیە و بەهیچەوە پەیوەست نەکراوە، بەلآم بینینی دووەم بەبینینی سزا کۆت و پەیوەست کراوە، یەکەم پێشخراوەو دوای ماوەیەك ئینجا بینیی دووەم هاتووە،پاشان سورەتەکەی کۆتاییپێهێناوە بە(واوی سوێند(قسم) و لامی تەئکیدو نونی تەوکیدی قورس(نون التوكيد الثقيلة) لەبارەی ئەو نازونیعمەتانەوە، بێگومان هەموو کەسێك لەبارەی ئەو نازونیعمەتەوە لێپرسینەوە دەکرێ کە لەدونیادا تیایدا بووە: ئاخۆ بەحەلآڵ پەیدای کردبوو یان

---

[1] - لاوازە، ترمیزی(٣٣٥٥)ئیخراجی کردووە.

حەرام؟ کە لەم پرسیارە رزگاری بوو پرسیارێکی تری لێدەکرێت: ئاخۆ سوپاسی خوای لەسەر کردووەو لەگوێڕایەڵیی خوادا بەکاریهێناوە یان لەسەرپێچیی خوای گەورەدا؟ پرسیاری یەکەم لەهۆکاری پەیداکردنی نیعمەتەکەیەو لەپرسیاری دووەمیشدا چۆن خەرجی کردووە، هەروەك لەجامیعی ترمیزییدا هاتووە لەفەرموودەی عەتائی کوڕی ئەبی رەباحەوە ئەویش لەئیبن عومەرەوە ئەویش لەئیبن مەسعودەوە ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی:«لا تزول قدما ابن آدم يوم القيامة من عند ربه حتى يسأل عن أربع: عن عمره فيم أفناه، وعن شبابه فيما أبلاه، وعن ماله من أين اكتسبه وفيم أنفقه، وماذا عمل فيما علم»[1]،واتا: هیچ ئەوەی ئادەمێك لەڕۆژی قیامەتدا لای خوای گەورە پێ هەڵناگرێ تاوەکو لەچوار پرسیار لێیدەپرسرێتەوە:تەمەنی لەچیدا تەواوی کرد، گەنجێتییەکەی لەچیدا بەسەربرد، سەروەتەکەی لەکوێوە پەیدا کرد و لەچییدا خەرجی کرد، لەوەی فێری بوو چی کارێکی کرد.

هەر لەئەبی بەرزەوە: وتی: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی:" لَا تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ، وَعَنْ عِلْمِهِ فِيمَا عَمِلَ بِهِ، وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَ فِيمَا أَبْلَاهُ "[2]،واتا: بەندە لەڕۆژی قیامەتدا پێ هەڵناگرێ تاوەکو پرسیاری ئەوەی لێ دەکرێت تەمەنی لەچیدا تەواوکرد، زانستەکەی چی کارێکی پێ کرد، لەبارەی سەروەت وماڵیشییەوە لەکوێدا پەیدای کرد و لەچیشدا خەرجی کرد. ئەڵێ: ئەمە فەرموودەیەکی صەحیحە.

---

[1] - زۆر لاوازە، ترمیزی(٢٤١٦) و بەزار(٤/ ٢٦٦/ ١٤٣٥) و ئەبو یەعلا(٥٢٧١)ئیخراجیان کردووە.

[2] – حسن لغيره، ترمیزی(٢٤١٧) و دارمی(٥٣٧) و ئەبو یەعلا(٣٤٣٤) و ئەبو نەعیم لە الحلية(١٠/ ٢٣٢) ئیخراجیان کردووە.

هـەروەها لەفەرموودەیـەكی ئـەبو هورەیرەدا(خـوای لـێ رازیـی بـێ) هـاتووە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:«إِنَّ أَوَّلَ مَا يُسْأَلُ عَنْهُ الْعَبْدُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ مِـنْ النَّعِـيمِ أَنْ يُقَـالَ لَـهُ: أَلَـمْ نصِـحَّ جِسْـمَك؟ ونَرْوِيـك مِـنْ الْمَـاءِ الْبَارِدِ؟»[1]،واتا: یەكەمین پرسیارێك لەبارەی نازونیعمەتەكانەوە لەبەندە دەكرێت لەرۆژی قیامەتدا، ئەوەیە پێیدەوترێ: ئاخۆ جەستەی تۆمان تەندروست نەكردو لەئاوی سارد گەرووی تۆمان پاراو نەكرد؟.

هەروەها هاتووە لەفەرموودەیەكی زوبەیری كوڕی عەوامەوە(خوای لـێ رازیـی بێ) كە ئـەم ئایەتـە دابـەزی:﴿ ثُمَّ لَتُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ۝٨ ﴾ التكـاثر: ٨، واتـا: لـە پاشـان سـوێند بـەخوا لـەو رۆژەدا پرسـیاری هـەموو بەهرەیـەكتان لـێ دەكرێ.

زوبـەیر وتی:ئـەی پەیامبـەری خـوا، ئێمـە لـەبارەی چـی نازونیعمەتێكـەوە لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەكرێت؟ ئێمە تەنیا دوو رەشەكەمان هەیە خورماو ئاو، پەیامبەریش فەرمووی:"أما أنه سيكون"[2]،واتا: هەر لەو بارەیـەوە ئـەبێ. ئـەڵێ: ئەمە فەرموودەیەكی حەسەنە.

هەر لەئـەبو هـورەیرەوە نزیك بەمـە هـاتووە ئـەڵێ: هـەر ئـەو دوو رەشـەمان هــەبوو دوژمــن دەورەمــانی دابــوو، شمشــێرەكانیش لەسەرشــانماندا بــوون. ئەفــەرمووێ:"أمـا أنـه سـيكون"[3]،واتـا: هـەر لـەو بارەیـەوە ئـەبێ. هەرچـی

[1] - صەحیحە، ترمیزی(٣٣٥٨) و عبداللەی كوڕی ئەحمەد لە الزهد(٣١) و ئیبن حیبـان(٧٣٦٤) و حـاكم(٤/ ١٣٨) ئیخراجیان كردووە.

[2] – حسن، ترمیزی(٣٣٥٦) و ئیبن ماجە(٤١٥٨) ئیخراجیان كردووە.

[3] – حسن لغيره، ترمیزی(٣٣٥٧) ئیخراجی كردووە.

فەرموودەی: "أما أنه سيكون"ە، یان مەبەست پێی ئەو نیعمەتەیە کە بۆ ئێوە روودەدات، یان لەو بارەیەوە پرسیارتان لێ دەکرێت. ئەگەر خورماو ئاویش بێ هەر نیعمەتە، بەڵگە بۆ ئەمە، فەرموودەی صەحیحی پەیامبەرە(صلى الله عليه وسلم) کە لەگەڵیدا خورماو گۆشتیان خواردووە و ئاوی ساردیان خواردووەتەوە فەرموویەتی: "هذا من النعيم الذي تسألون عنه يوم القيامة"[1]،واتا: ئەمە یەکێکە لەو نیعمەتانەی کە لەرۆژی قیامەتدا پرسیارتان لەبارەوە لێ دەکرێت. پرسیارو لێپرسینەوە کردن لەسەر ئەوەی سوپاسی خوای لەسەر کراوەو مافی دراوە.

لەترمیزییدا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوای لێ رازیی بێ)، ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "يجاء بالعبد يوم القيامة كأنه بذج، فيوقف بين يدي الله تعالى فيقول الله: أعطيتك وخولتك وأنعمت عليك، فماذا صنعت؟ فيقول: يا رب جمعته وثمرته فتركته أوفر ما كان فارجعني آتيك به، فاذا أعيد لم يقدم خيراً، فيُمضَى به الى النار"[2]،واتا: لەرۆژی قیامەتدا بەندە دەهێندرێت و وەك کاوڕ لەبەردەم خوای گەورەدا رادەگیردرێت، پەروەردگار ئەفەرمووێت: من سەروەت و ماڵم پێت بەخشی و سەرپشکم کردی، تۆ چیت کرد؟ بەندە ئەڵێ: پەروەردگارا کۆمکردەوەو بەرهەمهێنانم پێ کردو زیاترم کردو بەزۆرەوە لەدوای خۆم بەجێمهێشت، بمگەڕێنەوە دونیا بیهێنم، گەر بەندەکە خێرو چاکەی پێشنەخستبێ، ئەوە بۆ دۆزەخ بەرێدەخرێت.

---

[1] - موسلیم(٢٠٣٨)ئیخراجی کردووە.

[2] - لاوازە، ترمیزی(٢٤٢٨) ئیخراجی کردووە.

لەفەرموودەیەکی ئەبی سەعیدو ئەبی هورەیرەدا(خوای گەورە لەهەردووکیان رازیی بێ)هاتووە کە وتوویانە: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:"يُؤْتَى بِالْعَبْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فيَقُلُ لَهُ: أَلَمْ أَجْعَلْ لَكَ سَمْعًا وَبَصَرًا، وَمَالًا، وَوَلَدًا، وَسَخَّرْتُ لَكَ الْأَنْعَامَ وَالْحَرْثَ، وَتَرَكْتُكَ تَرْأَسُ وَتَرْبَعُ؟ فَكُنْتَ تَظُنُّ أَنَّكَ مُلَاقِيَّ فِي يَوْمِكَ هَذَا؟ قَالَ: فَيَقُولُ: لَا، فَيَقُولُ لَهُ: الْيَوْمَ أَنْسَاكَ كَمَا نَسِيتَنِي"[1]،واتا:لەرۆژی قیامەتدا بەندە دەهێندرێت و خوای گەورە پێی ئەفەرموێت:ئاخۆ گوێ و چاو و سەروەت و منداڵم پێت نەبەخشی و مەڕو ماڵات و کشتوکاڵییم بۆت رامنەکرد و نەمهێشت دەسەڵاتداری قەوم و کۆمەڵی خۆت بی و بەشی زۆری دەسکەوتەکانت هەبێ، ئایە گومانت هەبوو لەرۆژێکی ئاوەهادا بەمن دەگەیتەوە؟ ئەڵێ: نە، خوای گەورە پێیدەفەرموێت: کەوابوو ئەمرۆش ئێمە تۆ لەبیر دەکەین وەك چۆن تۆ لەدونیادا منت لەبیرکرد. ئەڵێ: ئەمە فەرموودەیەکی صەحیحە.

کۆمەڵێکی راڤەوانان وەهایان داناوە، ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە تایبەت بەبێباوەڕانە، ئەوانن لەبارەی نازونیعمەتەکانەوە لێپرسراون، ئەوەش لەئەلحەسەن و موقاتیلەوە باسکراوەو ئەلواحیدییش ئەوەی هەڵبژاردووەو بەڵگەیان بەقسەی ئەبو بەکر هێناوەتەوە کە کاتێ ئەو ئایەتە دابەزیووە: بەپەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)ی وتووە: ئاخۆ ئەو خواردنەی لەنانی جۆ و گۆشت و بەرسیلەو ئاوی سازگار بوو کە لەماڵی هەیسەمی کوڕی تەیهاندا

---

[1] - صەحیحە، ترمیزی(٢٤٢٨)ئیخراجی کردووە.

لەگەڵ تۆدا خواردمان، ئەترسی ئەوە بەشێك لەو نیعمەتە بێ کە لەڕۆژی قیامەتدا لەبارەیەوە لێمان دەپرسنەوە؟

پەیامبەری خواش فەرمووی: "إنما ذلكَ للكُفّارِ"، واتا: ئەوە تەنیا بۆ بێباوەڕانە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَهَلْ نُجَٰزِيٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ ﴿١٧﴾ ﴾ سبأ: ١٧[١]، واتا: ئایا جگە لەوانەی زۆر سپلەن تۆڵە لەکەس ئەسەنین.

ئەلواحیدیی ئەڵێ: لەڕواڵەتدا بەڵگەی ئەم قسەیە دەبینین، چونکە تەواوی سورەتەکە رووی دەمی لەهاوبەش پەیداکەرانەو هەڕەشەیە لەدژیان، واتاش بەڵگەی ئەوە دەدات، ئەوەیە کە بێباوەڕان مافی نیعمەتی خوایان نەداوە کە خوای گەورە ئەو نیعمەتەی پێداون و لەبەرانبەردا هاوبەشیان بۆ بڕیار داوەو جگە لەخوای گەورەیان پەرستووە، بۆیە شیاوە وەك تەمبێکردنێك بۆیان لێپرسینەوە بکرێن، ئاخۆ ئەرکی سوپاسگوزارییان تیادا داوە یان مافی نیعمەتەکەیان فەوتاندووە، پاشان لەسەر سوپاس نەکردن و یەکتادانانی خوای نیعمەت بەخش سزا دەدرێن. ئەڵێ: ئەمە واتای قسەی موقاتیل و قسەی ئەلحەسەنیشە کە وتوویانە: تەنیا دۆزەخییەکان لەبەرانبەر نیعمەتەکاندا لێپرسینەوە دەکرێن.

منیش ئەڵێم: نە لەئایەتەکەو نەلەفەرموودەی صەحیح و نە لەبەڵگەی عەقڵیشدا شتێك نییە بیسەلمێنێ، کە فەرمایشتەکانی خوای گەورە لەو بارەیەوە تایبەت بەبێباوەڕان بێ، بەڵکو رووی دیاری ئایەتەکەو راشکاویی فەرموودەو

---

[١] - سیوتیی باسیکردووە لە الدرر المنثور(٨/ ٦١٨).

ئیعتیبـاری عـەقڵ خیتابەکـە گشـتگیر دەکـەن بـۆ تـەواوی ئەوانـەی وەسـفی هەڵپەکردن و زۆر هەوڵدانی دونیا دەیانگرێتەوە، تەنیا تایبـەت نییـە بەکەسانێك ئـەو وەسـفەیان تیـادا هـەبێ، بەڵگـەش بـۆ ئـەوە، فەرمایشـتی پەیامبـەری خوایە(صـلی الله علـی وسـلم)کە لـەکاتی خوێندنـەوەی ئـەم سـورەتەدا فەرموویەتی:«يَقُولُ ابْنُ آدَمَ: مَالِي مَالِي. وَهَلْ لَكَ مِنْ مَالِكَ إِلَّا مَا أَكَلْتَ فَأَفْنَيْتَ، وَمَا لَبِسْتَ فَأَبْلَيْتَ؟.....»[1]،واتـا: ئـەوەی ئـادەم لـەڕۆژی قیامەتـدا ئـەڵێ: مـاڵ و سەروەتەکەم، ماڵ و سەروەتەکەم، ئاخۆ تۆ ئەو ماڵ و سەروەتەی هـەتبوو هـەر ئەوەیە کە خواردووتە یان لەبەرت کردووەو نـەماون. رەنگـە ئـەو کەسـەی ئەمـە ئەڵێ موسڵمانێك بێ، رەنگە بێباوەڕیش بێ، بەڵگە بۆ ئەمـە، ئـەو فەرموودانەیـە کە پێشتر باسکران.

پرسـیارکردنی هـاوەڵان لەپەیامبـەری خوا(صـلی الله علیـه وسـلم) و تێگەیشتنیشـیان بـۆ ئەوەیـە گشـتێتیی ئەگەیـەنێ، تـا ئـەوەی پێیانووت:ئێمـە لـەبارە چـی نیعمەتێکـەوە پرسـیارمان لـێ دەکرێـت؟ ئـەوەی هەمانـە بیخـۆین خورماو ئاوە، جا ئەگەر ئایەتەکە تایبەت بـەبێباوەڕان بوایە،ئـەوە بۆیـانی روون دەکردەوەو دەیفەرموو: لەبارەی ئێوەوە نییە، بەڵکو تایبەتە بەبێباوەڕان.

بۆیـە هـاوەڵان ئـەوە تێگەیشـتوون کـە موسـڵمان و بێبـاوەڕیش دەگرێتـەوە، فەرموودەکانیش روون و راشکاوانەن لەو بوارەداو ئەوەشـی لەقورئانـدا دابـەزی، لەبارەی گشتێتییەوە زیاتر دڵنیای کردنەوە.

هەرچی فەرموودەکەی ئەبو بـەکرە کـە هـەڵگرانی ئـەو بۆچـوونە بەبەڵگـەیان کردووە، ئەوە فەرموودەیەکی صـەحیح نییـە، بـەڵکو فـەرموودەی صـەحیح لـەو

---

[1] - موسلیم(٢٩٥٨)ئیخراجی کردووە، صەحیحە.

باس و چیرۆکەدا نارەوایی ئەوە دەردەخات و ئێمەش ئەو فەرموودەیە باس دەکەین، لەصەحیحی موسلیمدا[1] لەئەبو هورەیرەوە هاتووە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)ڕۆژێ یان شەوێ دەرچوو، بەئەبو بەکرو عومەر گەیشت و فەرمووی:چی شتێك لەم کاتەدا ئێوەی لەماڵ دەرکردووە؟ وتیان: برسێتیی ئەی پەیامبەری خوا. فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، منیش هەمان ئەو شتە لەماڵ دەریکردووم کە ئێوەی لەماڵی خۆتان دەرکردووە، هەڵسن. ئەوانیش لەگەڵیدا هەڵسان و هاتنە لای پیاوێکی ئەنصاری، پیاوەکە لەماڵ نەبوو، کە ژنی پیاوەکە پەیامبەری خوای بینی وتی: بەخێر هاتن(مرحباً وأهلاً)، پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)پێی فەرموو: ئەی فلانە کەس کوانێ؟ وتی: ڕۆیشتووە ئاوی ساردمان بۆ بهێنێ، ئا لەمەدا پیاوە ئەنصارییەکە هاتەوەو تەماشای پەیامبەری خواو دوو هاوەڵەکەی کردو وتی: سوپاس بۆ خوای گەورە، هیچ کەسێ وەك من ئەمڕۆ بەڕێزترین میوانێکی نییە.

ئەڵێ: کابرا ڕۆیشت و سەبەتەیەکی هێنا بەرسیلەو خورمای تێدا بوو وتی: ئا لەمە بخۆن، چەقۆی هەڵگرت و پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)پێیفەرموو: وریا بە شیردەرەکە سەر نەبڕی، کابرا شەك مەڕێکی بۆ سەربڕین و لەو شەك مەڕەو بەرسیلەو خورمای ناو سەبەتەکەیان خواردو ئاویان خواردەوە، کە تێریان خوارد و ئاویان خواردەوە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) بەئەبوبەکرو عومەری فەرموو:" والذی نفسي بیده لَتُسْئلنَّ عن هذا النعیم یوم القیامة، أخرجکم من بیوتکم الجوع، ثم لم ترجعوا حتی أصابکم هذا النعیم"،واتا: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە،لەڕۆژی قیامەتدا لەبارەی ئەم

---

[1] - موسلیم(٢٠٣٨)ئیخراجی کردووە.

نیعمەتەوە پرسیارتان لێ دەکرێت، پرسێتیی لەماڵ دەریکردن و پاشان نەگەڕانەوە تاوەکو ئەم نیعمەتەی هێنایە ڕێگەتان. بۆیە ئەم فەرموودەیە ڕاست و ڕەوان رایدەگەیەنێ کە موسڵمان و بێباوەڕیش دەگرێتەوەو لێپرسینەوە کردن لەسەر نازونیعمەتی دونیا تەنیا بەبێباوەڕانەوە تایبەت نییە.

واقیع دەیسەلمێنێ کە ئەمە تایبەت نییە، هەڵپەکردن و تەقەلاکردن بۆ زۆرکردنی سەروەت و هۆکارەکانی دونیایی لای موسڵمانان زۆرە، زۆربەیان بەوەوە سەرقاڵن، خیتابی قورئانیش خیتابێکی گشتییە بۆ هەموو ئەوانەی پێیان دەگات، یەکەمین کەسێکی هاوسەردەمی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) تا کۆتاهەمینی موسڵمانان و غەیرە موسڵمانانیش دەگرێتەوە.

بەحوکم و پێویستییەکانی ئایین شتێکی روون و ئاشکرایە، با کەسانی دواتریش کە قسەیان بەبەڵگە ناکرێ لەوەدا ناکۆك بن، بۆیە دەبێ بزانین، کە ئێمەو ئەوانەی پێش ئێمەو دوای ئێمەش بەشدارین لەحوکمی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەو هاوشێوەکانی فەرمایشتەکانی تردا کە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ﴾ البقرة: ١٨٣، واتا: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر نووسراوە.

بۆیە: ﴿ أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ١ ﴾ التكاثر: ١، خیتابی خوایە بۆ هەموو ئەوانەی ئەو وەسفە دەیانگرێتەوەو دونیا سەرقاڵی کردوون، لەزۆرکردنی سەروەتی دونیاشدا پلە گەلێك هەیە تەنیا خوای گەورە ژمارەیان دەزانێ.

ئەگەر بووترێ: باوەڕداران هۆکارەکانی دونیا سەرقاڵ و بێئاگایان ناکات، بۆیە ناچنە ژێر حوکمی هەڕەشەکردن لەوانەی دونیا بێ ئاگای کردوون.

لەوەڵامدا ئەوترێت:ئەمە هەمان ئەو شتەیە ئەوانەی بەوە گەیاندووە ئایەتەکە بەبێباوەڕان تایبەت بکەن و نەیانتوانیووە بەگشتیی ببینن، بێباوەڕانیـان شـیاو بەهەڕەشە داناوەو بەو هۆیەوە تەنیا بێباوەڕانیان بەوە تایبەت کردووە.

وەڵام بۆ ئەمە: ئەم خیتاب و دوواندنـە بـۆ مرۆڤـە بەوپێیـەی مرۆڤـەو لەسـەر شێوازی قورئانە لەسەرزەنشتکردنی بۆ مرۆڤ، وەك دەفـەرمووێ: ﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ عَجُولًا ۝١١ ﴾ الإسراء: ١١، واتا: ئادەمی هەمیشە پەلە کەرە.

هـــەروەها دەفـــەرمووێ: ﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا ۝١٠٠ ﴾ الإســـراء: ١٠٠، واتا:ئادەمی هەمیشە ڕژدەو چروکە.

هەروەها: ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ ۝٦ ﴾ العاديات: ٦، واتا: بەڕاستی ئینسان بـــۆ پەروەردگـــاری نـــا سوپاســـە. هەروەهـــا دەفـــەرموێت: ﴿ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ۝٧٢ ﴾ الأحـزاب: ٧٢، واتا:بەڕاسـتی ئـەو(ئادەمی)زۆر سـتەمکارو نەزانـە. هەروەها دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٌ ۝٦٦ ﴾ الحـج: ٦٦، واتـا: بێگومـان خەڵکی زۆر ناسوپاس و سپڵەن.

هاوشێوەکانی تری ئەم وەسفانە بۆ مرۆڤ لەقورئاندا زۆرن.

مـرۆڤ لـەو ڕووەوەی لەهــەموو خێرێـك داڕنـراوە لەزانسـتی بەسـوودو کـاری چاك،ئەوە خوای گەورەیە لەو ڕووەوە کامڵی کردەوەو ئەوانەی پـێ بەخشـیووە، خودی مرۆڤ نییە زانستی بەسـوودو کـاری چـاکی دەستخسـتبێ، بـەڵکو ئـەوەی لەخۆیدا بوونی هەبووبێ نـەزانیی دژ بەزانسـت و سـتەمی دژ بەدادگـەریی بـووە، بۆیـە هــەر زانسـت و دادگـەری و چـاکەیەکی تێـدا هــەبێ لەخواوەیـەو لـەخودی مرۆڤەوە سەرچاوەی نەگرتووە.

هەڵپەکردن و تەقەلاکردن بۆ زۆرکردنی هۆکارەکانی دونیا سرووشتی ئەوە، تەنیا بەپاکڕاگرتنی خوایی بۆی و کردنی بەئاخیرەت ویست لەو سرووشتە رزگاری دەبێ، بەوە رزگاری دەبێ کە خوای گەورە وەهای لێبکات ئاخیرەت بەسەر دونیادا پێشبخات، ئەگەرنا لەدونیادا دەستبەرداری هەڵپەکاریی نابێ.

بەڵگەی ئەوەی هەڕەشەکە تایبەتە بەبێباوەڕان، ئەوە دەوترێ: ئەو هەڕەشەیەی باسکراوە بۆ باوەڕدارو بێباوەڕیشە، زانینێکە لەبینینی ئاخیرەتدا دەبینرێ، وەك پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ۝ ﴾ التكاثر: ٣، واتا: وامەکەن! لەمەولا دەزانن.

ئەمە ئەوە دەسەلمێنێ و بڕیار دەدات کە ئەو جۆرە مرۆڤانە دەچنە دۆزەخەوە، سەرباری نەمر بوون تیایدا. بینینی دۆزەخ ئەوە پێویست ناکات هەرکەسێ ببینێ بخرێتە ناویەوە، بەڵکو هەموو مرۆڤەکان ئەوکاتە دەیبینن، خوای گەورەش سوێندی خواردووە کە دەبێ هەموو بوونەوەران دۆزەخ بەچاو ببینن: بەباوەڕدارو بێباوەڕو چاك و خراپیانەوە، بۆیە لەکۆی ئایەتەکە شتێك نابینن گشتێتیی رەتبکاتەوە، ئەوەشی لە ئەلحەسەنەوە باسیکردووە: تەنیا دۆزەخییەکان لەنازونیعمەتی دونیا لێپرسینەوە دەکرێن، بۆچوونێکی تەواو بێ بنەمایە، فەرمووده راست و راشکاوەکان ئەوە رەتدەکەنەوە، سەرکەوتنیش بەخوای گەورەیە.

شتێکی شاراوە نییە، ئەم سورەتە بە مەزنییەکەی و توندیی هەڕەشەو ترسناکییەکەی و ئەو وریاییدانەی تیایدایە لەبارەی هەڵپەکاریی دونیاو چەسپانی واتاکەشی بەسەر زۆربەی مرۆڤەکاندا، ئەوە رەتدەکاتەوە تەنیا تایبەت بەبێباوەڕان بێ، ئەوەش بەسە بڕوانیتە فەرموودە صەحیحەکانی ئەو بوارە، خواش زاناترە.

بڕوانە ئەو سەرزەنشتکردنە بەئازارو ترسناکەی بۆ ئەو کەسەی تاوەکو مردن سەرقاڵە بەکۆکردنەوەی دونیاو بێ ئاگایە لەئاخیرەت، کە تا کاتی سەرەمەرگ لەخەوی بێ ئاگایی بەئاگا نەهاتووە و هەڵپەکاریی دڵی خەواندووە، کاتێ لەمە بەئاگادێت کە لەڕیزی مردوواندایە، جا بڕوانەو بەراورد بکە لەنێوان ئەمەو حاڵی زۆربەی مرۆڤەکان، ئەوجار بۆت ڕووندەبێتەوە کە گشتێتیی مرۆڤەکان لەم سورەتەدا مەبەستە.

بڕوانە ئەو سەرزەنشتکردن و هەڕەشەکردنەی خوای گەورە، کە پەیوەستی کردووە بەهەڵپەکردن و کۆکردنەوەی هۆکارەکانی دونیا، تەنیا ڕەگەزو جۆرێکی سەرزەنشت نەکردووە، چونکە زۆر هەڵپەکاریی زۆر لەخۆکردنە، هەموو هەڵپەکارێك هەوڵ دەدات کێبرکێ بکات و لەوی تر زۆرتری هەبێ، وەها گومان دەکات شکۆمەندیی بۆ ئەو کەسەیە کە زۆرتری هەیە، هەروەك وتراوە:

ولستُ بالأكثرِ منهم حَصى وإنَّـما العـزَّة للكـاثِـرِ

واتا: من بەردو چەوم لەوان زۆرتر نییە، بەڵکو سەربەزی و شکۆمەندیی بۆ ئەو کەسەیە زۆرتری هەبێ لەهۆکارەکانی دونیادا.

ئەگەر کەسێك زۆر لەخۆی نەکات بۆ دەوڵەمەندی و هۆکارەکانی دونیاو هەر دەوڵەمەندو زۆری هەبێ، ئەوە زیانێکی پێ ناگەیەنێ، زۆرێك لەهاوەڵانیش دەوڵەمەند و خاوەن پێگە بوون و ئەو دەوڵەمەندی و پێگەدارییەش زیانی پێ نەدان، چونکە هەڵپە و تەقەلایان بۆ نەکرد.

هەر مرۆڤێك بۆ دونیا یان ناوبانگیی خۆی هەوڵی زۆری دا، ئەو هەوڵە زۆرەی لەهەوڵی زۆری بۆ ئاخیرەت دووری دەخاتەوە.

دەروونە بەڕێزو بەرزو خاوەن هیممەتەکان، تەقەلایان بۆ شتێکە سوودی بەردەوامی هەبێ، کامڵ و پوخت و سەرفرازیی بهێنێ، بۆیە حەز ناکەن بۆ جگە لەوە تەقەلاو کێبرکێیان هەبێ، ئەوەش ئەو تەقەلاو هەوڵە زۆرەیە کە ئامانجی بەختەوەریی بەندەیە، دژو پێچەوانەکەشی تەقەلای دونیا ویستانە لەکۆکردنەوەو زۆرکردنی هۆکارە دونیاییەکانیاندا.

هەوڵ و زۆرکردنی دونیاویستان، لادان و سەرقاڵکەری مرۆڤە لەبەرانبەر خواو ئاخیرەت، گەیشتنە بەئامانجێکی زۆر کەم، سەرەنجامی قیامەتیشی هەژاری و بێ بەشییە، بەلام هەوڵدانی زۆر لەکۆکردنەوەو زۆرکردنی هۆکارەکانی بەختەوەریی ئاخیرەت، بەیادو لیقای خوای گەورە زۆرتر ئەبێ، سەرەنجامەکەشی زۆرییەکی هەمیشەییە کە نەمانی بەسەردا نایەت.

ئەو کەسە خوا ویستەی کە هۆکارەکانی ئاخیرەت بۆ خۆی زۆرتر ئەکات، بەلایەوە کەم نییە کەسێك ببینێ قسەو کردارو ڕاستی لەخۆی باشتربێ، گەر کەسێکی وەهای بینی لەتایبەتمەندییەکی چاکەدا لەم بەتواناترەو ناتوانێ لەوەدا بەو بگات، هەوڵدەدات لەتایبەتمەندی و ڕەوشتێکی تردا پێی بگات کە بەتوانایە بەو ڕەوشتەو بەزۆرکردنی ئەو ڕەوشتە هەوڵ دەدات، ئەم پێشبڕکێ و هەوڵە سەرزەنشتکراو و ناتەواوییەك نییە لەدڵسۆزیی بەندەدا، بەڵکو ئەوە حەقیقەتی کێبڕکێ و پێشبڕکێکردنە لەکارە چاکەکاندا.

ئەمە حاڵی ئەوس بوو لەگەڵ خەزرەجدا(خوایان لێ ڕازیی بێ) لەبەردەستی پەیامبەری خوادا(صلی الله علیە وسلم) پێشبڕکێیان ئەکرد بۆ ڕازیکردن و سەرخستنی، ئەمە حاڵی عومەریش بوو لەگەڵ ئەبو بەکردا(خوا لەهەردووکیان

رازیی بێ)، کە بۆ عومەر روونبوویەوە ئەبو بەکر هەمیشە لەپێش ئەوەوەیە وتی: سوێند بەخوا ئیتر بۆ هیچ شتێك پێشبڕکێی تۆ ناکەم[1].

## بەش

هەرکەسێ بڕوانێتە جوانیی شوێنی(کلا – نەخێر) کە بەرپێگرتن و دوورخستنەوەیەتی لەکۆکردنەوەی زۆری دونیا و ئەو بۆچوونەی هەڵدەوەشێنێتەوە، کە باوەڕی وەهایە زۆر پەیداکردنی هۆکارەکانی دونیا سوودی بۆی هەیەو شکۆمەندی ئەکات و پێیەوە کامڵ ئەبێ، بۆی دەردەکەوێ کە(کَلا) هەم نەهی و هەم نەرێکردنیشی لەخۆگرتووە.

خوای گەورە هەواڵی پێداون کە دەبێ زانین بەدوای زانین سەرەنجامی ئەو کۆکردنەوە زۆرەیان ببینن، دەبێ بینین لەدوای بینین شوێنی ئەوانە ببینن کە بەکۆکردنەوەی دونیاوە سەرقاڵبوون و ئاخیرەتیان لەبیربردەوە، دەبێ خوای گەورە لەهۆی ئەو کۆکردنەوە زۆرەیان بپرسێتەوە: لەکوێوە پەیداتان کرد؟ لەچیشدا خەرجتان کرد؟

الله خوایە گیان ئەمە چی سورەتێکی مەزن و چی سوودێکی گەورەو نرخداری هەیە، چی ئامۆژگاری و وریاییدانێکی تێدایە، چی ئارەزوویەکی توندی تێدایە بۆ هەوڵدان بۆ ئاخیرەت و نەویستنی دونیا، ئەمە بەوپەڕی کورتکراوەیی و پوختی و کەمترین وشەو جوانی رێکخستندا دەربڕدراوە، گەورەیی و مەزنیی بۆ ئەو خوایەی بەحەق قسەی لەبارەوە کردووەو پەیامبەریش بەوەحی لێیەوە گەیاندوویەتی.

---

[1] - ئەبو داوود(١٦٧٨) و ئەحمەد(١/ ٢٥)ئیخراجیان کردووە.

## بەش

بڕوانەو بیربکەرەوە، چۆن خوای گەورە لەگەیاندنیان بەهەر ژیانێك وەك ڕێبوارێکی لێکردوون و سەقامگیرییان نییە، بۆ ماوەیەك لەگۆڕدا دادەنرێن و جارێك شوێنی گیرسانەوەی هەمیشەییشیان لەبەردەمدا ماوە، وەك ڕێبوارێك بەڕێگاوەن تاوەکو شوێنی سەقامگیری، بۆیە لێرەدا سێ شت هەیە: تێپەڕبوون بەڕێگەی ئەم دونیایەدا بەئامانجی سەردانیکردنی گۆڕ، لەوێشەوە بۆ شوێنی گیرسانەوە.

## بەش

با بڕوانینە تەواوی مونازەرکە، وتوویانە: خوای گەورە دۆستەکانی خۆی لەبەرانبەر دونیا پاراستووەو لەبەرچاوی خستوون، وەك ڕێز و پاکڕاگرتنیان لەپیسییەکانی دونیاو بەرزبوون لەئاستیدا. دونیای لەبەرچاویان سووککردووەو هەواڵی پێداون کە دونیای بەلاوە سووکە، خۆشییەکانیشی فیتنەو تاقکردنەوەن و هۆکاری ستەمکاری و خراپەی سەر ڕووی زەوییە، کۆکردنەوەی زۆرو هەڵپەکردن و بێ ئاگابوون لەقیامەت چێژو خۆشیی کەسی لەخۆباییە، ئەوانەی بۆ سەرزەنشتکردوون کە دونیایان خۆش دەوێ و پێی کاریگەرن، هەروەها ئاگاداری کردوونەتەوە کە هەرکەسێك دونیاو جوانییەکانی دونیای بووێ لەئاخیرەتدا هیچ پشکێکی بۆ نییە، دەسکەوتنی خۆشییەکانیشی فیتنەو تاقیکردنەوەیە نەك ڕێزو خۆشەویستی و خەڵکەکەشی لەخێرو چاکەدا پێشبڕکێیان نییەو ئەو خۆشییەیان لەخوا نزیکیان ناخاتەوە.

گەر ئەو خەڵكە لەبێباوەڕیی خۆیاندا بەردەوام بن، ئەوە لەسەرووی خۆزگەی خۆیانەوە پێیان دەدات، تائەوەی بنمیچی خانوو دەرگاو تەختی خەویشیان بۆ دەكاتە زیوو، هەواڵیشی داوە كە ئەوەی رازاندووەتەوە بۆ دوژمنانی خۆی و ئەو كەم عەقڵانەی كە لەئاخیرەتدا هیچ پشكێكیان بۆ نییە، رێگریی لەپەیامبەرەكەشی كردووە كە بەچاو سەیری ئەوانەیان نەكات و سەرزەنشتی ئەوانەی كردووە كە چێژیان لەوە بینیووەو بەپەیامبەرەكەی ئەفەرمووێ:

﴿ ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا۟ وَيَتَمَتَّعُوا۟ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ۝ ﴾ الحجـر: ٣،

واتا: لێیان گەڕێ بابخۆن و ڕابوێرن و ئومێد بێ ئاگایان بكات جا بێگومان لەمەودوا دەزانن(چۆن سزایان)دەدەین.

ئەمە دڵدانەوەی خوای گەورەیە بۆ دۆستەكانی خۆی بەوەی لەچێژبینینی دونیا رێگریی كردوون، تەمبێی تێدایە بۆ ئەوانەی دەوڵەمەند و خۆشگوزەرانن، كە ستەمكارو زیادەڕەو نەبن و بەشەهوەتەكانی دونیا ئالوودە نەبن.

خوای گەورە سەرزەنشتی ئەوانەی كردووە كە دونیایان خۆشدەوێ و شانازیی پێوەی ئەكەن و هەوڵی كۆكردنەوەی زۆری تیادا ئەدەن، ئەوانەی گومانیان وەهایە فەزڵ و گەورەیی لەوەدایە سەروەت و ناوبانگییت زۆرتر هەبێ، بۆیە خوای گەورە لەوەدا بەدرۆیخستوونەتەوەو هەواڵی داوە، كە ئەوە نییە ئەوان ئەیلێن و گومان و خەیاڵیان كردووە، بەزۆرێك نمونە خستوویەتییە پێش چاوی بەندەكانی، كە وەها لەهەموو مرۆڤێكی ژیر دەكات دونیانەویست بن و دەستی پێوە نەگرن و مەیلی دڵیشی پێ نەدەن.

وێنەو حەقیقەتی دونیای لەدڵیاندا بەم نمونەیە ئامادە كردووە: بەنمونەی بارانێك لەئاسمانەوە دایباراندووەو تێكەڵ بەتۆوی رۆكی زەویی بووەو زەویی

پێـوەی جـوان و رازاوە بـووەو جۆرەهـا رۆك رازاندوویەتییـەوە، بـەلاَم ئـەو جوانییەی پووكاندووەتەوە و كردوویەتییە پووشێكی وشك و رەشەبا بلاَوەی پێ كردبێ وەك ئەوەی هەر بوونیان نەبووبێ.

خوای گەورە هەواڵی داوە لەبارەی لەنێوچوونی دونیـاو خێـرا نـەمانی، بەنـدە كە ئاخیرەتی بینیـی وەك ئـەوە وایـە كاتـژمێرێكی رۆژ یـان رۆژو چـەند رۆژێكـی لەدونیادا بەسەر بردبێ، رێگریی كـردووە لـەوەی بەنـدەكانی بـەدونیا لـەخۆبایی بن، هەواڵی پێداون كە دونیا حەزو یاری و جوانی و خۆهەڵكێشان و كۆكردنـەوەو چێژێكی لەخۆباییانەیە، رێگەو پـردی پەڕینەوەیـە بـۆ ئـاخیرەت، قەرەبوویـەكی خێرایەو مانەوەی بۆ نییە، هەرگیز دونیاویستانی بەباشە باس نـەكردووە، بـەڵكو بەسەرزەنشتكردن باسیكردوون و هەواڵی داوە كە مرۆڤی دونیاویست پێچەوانەی ویستی خوا دەجوڵێتەوە، خوای گـەورە شـتێكی دەوێ و مرۆڤـی دونیاویسـتیش شـتێكی تـری دەوێ، ئـەوەش بەسـە ببێتـە دووركەوتنـەوەی لـەخوای گـەورە. هـەواڵی داوە، كـە دۆزەخییـەكان تـەنیا بـەهۆی لەخشـتەبردنی دونیـاو حـەزو خۆزگەی دونیایان دەخرێنە دۆزەخەوە.

وتوویانە: هەموو ئەوە، بۆ ئەوەیە خوای گەورە بێ ویسـتیان بكـات لـەدونیاو تابتوانن ئارەزووی كەمیان بۆ دونیا هەبێ.

وتوویانــە: خــوای گــەورە كلیلــی گەنجینــەكانی دونیــای خســتەبەردەم خۆشەویسـترین و بـەڕێزترین مـەخلوقی خـۆی كـە موحەممـەدی پەیامبـەری بوو(صلى الله عليه وسلم)، پەیامبـەریش نـە رەتیكـردەوەو نـە هەڵبـژارد، گـەر بەكاریگەری دابنابایەو بیویستبایە، ئەوە پەیامبـەر هـەر سوپاسـگوزارترینی نێـو مرۆڤـەكان ئـەبوو بـەوەی لـەخواوە پێـی درابـوو، هـەر لەڕێگـەو پێنـاو خـوای

گەورەشدا خەرجی دەکرد، بەڵام کەمترینی پشکی دونیای ویست و لەسەر ژیان سەختیی ئارامیگرت.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: ئیسماعیلی کوڕی موحەممەد بۆی باسکردین، عباد بۆی باسکردین-واتا ئیبن عباد- موجالیدی کوڕی سەعید بۆی باسکردین ئەویش لەئەلشەعبییەوە ئەویش لەمەسروقەوە ئەویش لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) وتی: ژنێکی ئەنصاریی هاتەلام و بینی جێ خەوی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)عەبایەکی دوو پارچەییە، گەڕایەوە ماڵی خۆی و جێ خەوێکی بۆ ناردم ناوەوەی خووریی بوو، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)هاتە دیووەکەم و فەرمووی:((ما هذا؟))،واتا: ئەمە چییە؟ وتم: فلانە ئافرەتی ئەنصاریی هاتە ژوورەوە بۆلام جێ خەوەکەی تۆی بینی، بۆیە ئەمەی بۆ ناردم، فەرمووی: بۆی بگەڕێنەوە. منیش نەمگێڕایەوە حەزمکرد لەماڵەکەمدا هەبێ، سێ جار پێیووتم بیگێڕمەوە، فەرمووی:،ئەی عائیشە بیگێڕەرەوە، سوێند بەخوا گەر بمەوێ خوای گەورە چیای ئاڵتوون و زیووم لەگەڵ دەخات)) منیش گەڕاندمەوە[1].

کلیلی گەنجینەکانی دونیای خرایەبەردەم، وەری نەگرت و فەرمووی:" أَشْبَعُ يَوْمًا وَأَجُوعُ يَوْمًا، فَإِذَا جُعْتُ تَضَرَّعْتُ إِلَيْكَ وَذَكَرْتُكَ، وَإِذَا شَبِعْتُ حَمِدْتُكَ وَشَكَرْتُكَ"[2]،واتا: بەڵکو دەمەوێ رۆژێ برسیی بم و رۆژێ تێربم، گەر برسیی بم هانات بۆ دەهێنم و ئەکڕوزێمەوەو یادت دەکەمەوە، کە تێرش بم سوپاس و ستایشت دەکەم.

---

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

[2] - پێشتر تەخریج کرا.

داوای لەپـــەروەردگاری کـــرد رزق و رۆزیـــی خێزانـــەکانی توویٚشـــوو(ژەمە خـــواردن)بیٚ، هـــەروەك لەصـــەحیحەیندا هـــاتووە لەفەرموودەیـــەکی ئـــەبو هورەیرەوە(خـــوای لـــیٚ رازیـــی بیٚ)ئـــەڵیٚ: پەیامبـــەری خوا(صـــلی الله علیـــە وسلم)فەرمووی:«اللَّهُمَّ اجعل رِزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ قُوتاً»[1]،واتا: خوایە گیان رزق و رۆزیی بنەماڵەی موحەممەد توویٚشوویی بیٚ. هەر لەئەبو هورەیرەوە وتوویەتی:"سوێند بەو کەسەی گیانی ئەبو هورەیرەی بەدەستە، پەیامبەری خواو کەسوکارەکەی سـێ رۆژ بـەدوای یەکـدا لـەنانی گـەنم تێریـان نـەخواردووە تائەوکاتـەی دونیـای بەجێهێشت"[2].

لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوای لیٚ رازیی بیٚ) ئەڵیٚ: وەها نازانم و نابینم پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) تاوەکو بـەخوای گەورە گەیشتەوە کولێرەیەکی نەرم و شەك مەڕێکی برژاوی بینیبیٚ[3].

هـەر لەصـەحیحی بوخاریـدا هـاتووە ئـەڵیٚ: پەیامبـەری خوا(صـلی الله علیـە وسلم) لەدونیا دەرچوو لەنانی جۆ تێری نەخوارد[4].

لەصەحیحەیندا هاتووە لەعائیشـەوە(خوای لـیٚ رازیـی بـیٚ) ئـەڵیٚ: بنەماڵـەی موحەممەد لەوەتەی هاتوونەتە مەدینەوە تاوەکو کۆچـی دوایـی پەیامبـەر، سـێ شەوی بەدوای یەك لەنان تێریان نەخوارد[5].

---

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

[2] - بوخاری(٥٤١٤) و موسلیم(٢٩٧٦) ئیخراجیان کردووە.

[3] - بوخاری(٥٤٢١) ئیخراجی کردووە.

[4] – بوخاری(٥٤١٤) ئیخراجی کردووە.

[5] - بوخاری(٥٤١٦) و موسلیم(٢٩٧٠) ئیخراجیان کردووە.

لەصەحیحی موسلیمدا لەعومەری کوڕی خەتابەوە(خوای لێ رازیی بێ): بینینم پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)رۆژێك بەبرسێتیی مایەوە دەنکە خورمایەکی خراپ نەبوو سکی پێ تێر بکات[1].

لەموسنەدو تەرمیزیدا هاتووە لەئیبن عەباسەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ): پەیامبەری خواو خێزانەکانی بۆ چەند شەوێك بەبرسێتیی مانەوەو هیچیان نەبوو ئێوارە بیخۆن، زۆرجار نانەکانیان جۆ بوو[2]. ترمیزیی ئەڵێ: ئەم فەرموودەیە (حسن صحیح)ە.

لەترمیزیدا فەرموودەیەکی ئەبی ئومامە هاتووە: کە ئالوبەیتی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نانی جۆیان لێ زیاد نەبووە[3].

لەموسنەددا لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) هاتووە:سوێند بەو کەسەی موحەممەدی بەحەق ناردووە، لەو کاتەوەی خوای گەورە موحەممەدی بەپەیامبەر نارد تاوەکو رۆژی کۆچی دواییکردنی، ئاردێکی لەبێژەنگ دراوی نەبینی[4].

عوروە ئەڵێ: وتم: ئەی چۆن جۆکەتان دەخوارد؟ عائیشەش وتی: فوومان پێدادەکردو چی لێ بمایەتەوە ئەوەمان بەهەویر ئەکرد.

---

[1] - موسلیم(٢٩٧٨)ئیخراجی کردووە.

[2] - حسن، ترمیزی(٢٣٦٠) و ئیبن ماجە(٣٣٤٧) و ئەحمەد(١/ ٢٢٥) ئیخراجیان کردووە.

[3] - صەحیحە، ترمیزی(٢٣٥٩)ئیخراجی کردووە.

[4] - لاوازە، ئەحمەد(٦/ ٧١) ئیخراجی کردووە، سولەیمانی کوڕی رومانی تێدایە کەسێکی نەناسراوە.

لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە لەئەنەسەوە(خوای لێ رازیی بێ)ئەڵێ: پەیامبەری خوا زرێیەکەی کردە رەهنی جۆ، گوێم لێبوو ئەیفەرموو:"بنەماڵەی موحەممەد بۆ حەوت شەو شتێکیان نەبووە بیخۆن".

لەموسنەدی حاریثی کوڕی ئەبی ئوسامەدا هاتووە لەئەنەسەوە ئەڵێ: فاتیمە(خوای لێ رازیی بێ) هەندێ وردە نانی بۆ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)هێنا، پەیامبەر فەرمووی: ئەم وردە نانە چییە ئەی فاتیمە؟ وتی: ئەم نانەم کرد، دڵ ئاسوودە نەبووم تا ئەم پارچانەم بۆ تۆ هێنا، پەیامبەریش فەرمووی: ئەمە یەکەمین خواردنێکە دوای سێ رۆژ بچێتە دەمی باوکتەوە[1].

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: وەکیع بۆی باسکردین، عەبدلواحیدی کوڕی ئەیمەن بۆی باسکردین ئەویش لەباوکییەوە ئەویش لەجابرەوە(خوای لێ رازیی بێ)وتی: کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)خەندەقی هەڵکەند تووشی ماندووبوون و برسێتییەکی سەخت بوون، تائەوەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)لەبرسێتییدا بەردی بەسەر سکییەوە بەست[2].

ئەبو حاتەمی کوڕی حیبان[3] لەرەتدانەوەی ئەم فەرموودەیە زۆر زیادەرۆیی کردووەو ئەڵێ: موحەممەدی پەیامبەر لای خوای پەروەردگاری بەرێزترە لەوەی بەسەردابێ. بەڵام ئەمە گومان و خەیاڵی ئەبو حاتەمە، ئەو حاڵەی پەیامبەری

---

[1] - لاوازە، بەیهەقیی لە شعب الإیمان(١٠٤٣٠) ئیخراجی کردووە و ئەلعێراقییش لە المغني عن حمل الأسفار(٣/ ٨٢): حاریثی کوڕی ئەبی ئوسامە گێراویەتییەوە بەڕشتەیەکی لاواز.

[2] - صەحیحە، ئەحمەد(٣/ ٣٠١) و بەیهەقیی لە دلائل النبوة(٣/ ٤٢٢).

[3] - موحەممەدی کوڕی حیبانی کوڕی ئەحمەدی ئەلتەمیمی، ئەبو حاتەمی ئەلبستی، ساڵی٣٥٤ك مردووە: مێژوونووس و عەللامەو فەرموودەناس بووە.

خوا(صلى الله عليه وسلم)لای خوای گەورە پلەو پایەی کەمناکاتەوە، بەڵکو پێی بەرزدەبێتەوەو ڕێزی زۆرتر ئەبێ،پەندو وانەیەکیشە بۆ ئەوانەی دوای خۆی لەخەلیفەو پادشایان و ئەوانی تر.

ئەمە وەك ئەوەیە ئەبا حاتەم لەتەواوی ئەو فەرموودانە ڕانەمابێ و بیری نەکردبێتەوە، کە باس لەجۆری بژێویی پەیامبەری خوا دەکەن(صلى الله عليه وسلم)، ئاخۆ ئەوانە گەورەترین دیمەن و بەڵگەکانی ڕاستگۆیی پەیامبەری خوا نین؟ ئەگەر ئەوە بێ کە دوژمنەکانی خۆی و پەروەردگاری ئەیڵێن بەوەی پادشایەك بووە دەسەڵات و دونیای ویستبێ، ئەوە دەبوو بژێوی و سەربووردەی وەك بژێوی و سەربووردەی ئەوان ببووایە.

کۆچی دوایی کردو زرێیەکەی لەڕەهنی کابرایەکی جولەکەدا بوو، کە لەبری خواردنێك بۆ خێزانەکانی هێنابووی زۆرێپۆشەکەی لا دانابوو.

خوای گەورە وڵاتی عەرەبی بۆ فەتحکرد و سەروەتەکانی لای کۆکردەوە، کەچی کە کۆچی دوایی کرد یەك درهەم و یەك دینارو یەك شەك مەڕو وشترو کۆیلەو جاریەیەکی لەدوای خۆی بەجێنەهێشت.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: حوسەین بۆی باسکردین، موحەممەدی کوڕی موتەڕیف بۆی باسکردین لەئەبی حازمەوە ئەویش لەعوروەوە: کە گوێی لێبوو عائیشە ئەیووت: مانگ و مانگ بەسەرماندا تێدەپەڕی و لەهیچ ماڵێکی پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم)ئاگر نەدەکرایەوە، وتم: ئەی پووری(خوشکی دایکی بوو) ئەی بەچی دەژیان؟ وتی: بەدوو ڕەشەکە: خورماو ئاو[1].

[1] - صەحیحە، ئەحمەد(٦/ ٧١)ئیخراجی کردووە.

لەپێشتریشدا فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەمان هێنایەوە لەچیرۆکی ئەبی هەیسەمی ئەلتەیهان کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)لەماڵی خۆی دەرچوو، ئەبو بەکرو عومەری بینی(خوایان لێ رازیی بێ)، فەرمووی: چی شتێ ئێوەی لەماڵ دەرکرد؟ وتیان: برسێتی، ئەویش فەرمووی:"سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هەمان ئەو شتە منی لەماڵ دەرکرد کە ئێوەی لەماڵ دەرکردووە"[1].

ئەحمەد لەفەرموودەکەی مەسروقەوە دەگێڕێتەوە، ئەڵێ: چوومە لای عائیشە، داوای کرد خواردنم بۆ بهێنن و وتی: تێرم لەخواردن نەخواردووە و گریاوم، وتم: بۆچی؟ وتی: ئەو حاڵەم بیردەکەوێتەوە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) لەسەری دونیای بەجێهێشت، سوێند بەخوا تاوەکو ئەو رۆژەی کۆچیکرد لەرۆژێکدا دووجار تێر نانی گەنمی نەخوارد[2].

هەر لەعائیشەوە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) دوو رۆژی یەك بەدوای یەك تێر نانی جۆی نەخوارد[3]. هەردوو فەرموودەکەش دروستن.

هەر لەعائیشەوە: بنەماڵەی موحەممەد تاوەکو کۆچی دوایی موحەممەد، بۆ سێ رۆژی بەدوای یەك تێر نانیان نەخوارد[4].

لەصەحیحەیندا لەئەبو هورەیرەوە هاتووە: پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم) و خێزانەکانی سێ رۆژی بەدوای یەك تێر نانی گەنمیان نەخوارد تاوەکو دونیای بەجێهێشت[1].

---

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

[2] - لاوازە، ترمیزی (٢٣٥٦) ئیخراجی کردووە.

[3] - موسلیم (٢٩٧٠) (٢٢) ئیخراجی کردووە.

[4] - بوخاری (٦٦٨٧) ئیخراجی کردووە.

لەترمیزیدا لەئیبن عەباسەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ): پەیامبەری خواو خێزانەکانی بۆ چەند شەوێك بەبرسێتیی مانەوەو هیچیان نەبوو ئێوارە بیخۆن، زۆرجار نانەکانیان جۆ بوو[2].

هەر لەو بارەیەوە لەئەنەسەوە، ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم): " لَقَدْ أُخِفْتُ فِي اللهِ وَمَا يَخَافُ أَحَدٌ، وَلَقَدْ أُوذِيتُ فِي اللهِ وَمَا يُؤْذَى أَحَدٌ، وَلَقَدْ أَتَتْ عَلَيَّ ثَلَاثُونَ مِنْ بَيْنِ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، وَمَا لِي وَلَا لِبِلَالٍ طَعَامٌ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ إِلَّا شَيْءٌ يُوَارِيهِ إِبِطُ بِلَالٍ"[3] ،واتا:(لەبەر خوای گەورە هەڕەشەو ئەشکەنجەیەك دراوم هیچ کەسێك هەڕەشەو ئازاری وەهای بەسەردا نەهاتووە، سی شەو و رۆژمان بەسەردا تێپەڕبووە من و بیلال خواردنێکمان نەبووە بیخۆین تەنیا بەئەندازەی بن باڵی بیلال خواردنمان هەبوو. هەردوو فەرموودەکە صەحیحە.

هەر لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەویش لەئەبی تەڵحەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: گازندەی برسێتییمان بردە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، بەرد لەسەر بەرد لەسەر سکمان بەستبوو، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) دوو بەردی لەسەر سکی بەستبوو[4].

هەر لەو بارەیەوە هاتووە لەعەلقەمەوە ئەویش لەعبداللەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەسەر حەسیرێك خەوتبوو، هەستاو شوێنەواری لەسەر کەلەکەی کەوتبوو، ئێمەش وتمان: ئەی پەیامبەری خوا چی دەبێ شتێکت بۆ دروست بکەین لەسەری بخەوی. ئەویش فەرمووی:،

[1] - بوخاری(٥٤١٤) و موسلیم(٢٩٧٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] - حسن، ترمیزی(٢٣٦٠) و ئیبن ماجە(٣٣٤٧) و ئەحمەد(١/ ٢٢٥) ئیخراجیان کردووە.

[3] - پێشتر تەخریج کرا.

[4] - لاوازە، ترمیزی(٢٣٧١) و بەیهەقیی لە الشعب(١٠٤٢٨) ئیخراجیان کردووە.

واتـا: مـن و دونیـا لـەکویێ، مـن لـەدونیادا نمونـەی ڕێبـوارێکم و لـەژێر سـێبەری دارێکدا پشوویەك دەدەم و دواتر ئەڕۆم و بەجێیدەهێڵم. ئەم فەرموودەیە(حسـن صحیح)ە.

هەر لەو بارەیەوە لەعەلییەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) ئـەڵێ: لـەڕۆژێکی سـەرماو سـۆڵەدا لـەماڵی پەیامبـەری خوا(صـلی الله علیـە وسلم)دەرچـووم و پێسـتێکی خۆشەکراوم هەڵگرت و لەناوەڕاستەوە کردمە دوو کەرتەوە(کۆڵەپشت)و خسـتمە سـەر شـانم و ناوقـەدم پێـی توونـد کـرد و بەپـەلکی دارخورمایـەك بەسـتم و لەناوقەدمەوە پێچامەوە، زۆر برسیمبوو، گەر لەماڵی پەیامبەری خوادا(صـلی الله علیە وسلم)خواردنێك هەبوو دەمخوارد، بۆیـە دەرچـووم خواردنێـك دەسـتبخەم، بەلای جولەکەیدا تێپـەڕبووم لـەنێو بێسـتانی خۆیـدا بـوو بەجەنجـەڕەو دۆڵەکـە، ئاوی دارو کشتوکاڵەکەی ئەدا، منیش لەدرزی دیوارەکەوە تەماشـام کـرد، وتـی: ئەی ئەعرابی ئەوە چیتە، ئایە دێیت و ئاوم بۆ هەڵبکێشی، بەرانبەر هەر دۆڵەکـە ئاوێك خورمایەکت پێ دەدەم؟ وتم: بەڵێ، تـۆ دەرگاکـە بکـەرەوە تـاوەکو بێمـە ژوورەوە، دەرگاکەی کردەوەو منیش چوومە ژوورەوە، دۆڵەکەکەی پێ دام، هەر دۆڵەکە ئاوێکم رادەکێشـایە سـەرەوە خورمایـەکی پـێ دەدام تـاوەکو چـنگم پـڕ کـردو وتم: ئەمـەم بەسـە، خورماکـانم خـواردو دۆڵەکـە ئـاوێکم هەڵکێشـاو لـێم خواردەوە، پاشان هاتمە مزگەوتەوە بینیم پەیامبەری خوای لێیە(صلی الله علیـە وسلم)[1].

سەعدی کوڕی وەقاص(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەڵێ: وەك ئـەوەی بمـانبینی کـە لەگــەڵ پەیامبــەری خوادا(صــلی الله علیــە وســلم)لەغەزادا بــووین و هــیچ

[1] - لاوازە، ترمیزی (٢٤٧٣) ئیخراجی کردووە.

خواردنێکمان نەبوو جگە لەم (الحُبلة) کە درەختێکی دڕکاوی و خڕنوکی بیابانە[1]. فەرموودەیەکی صەحیحە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)هەندێجار شەوان نوێژی دەکرد و عەبایەکی خورینی لەسەر بوو، هەندێکی بەسەر خۆیەوەو هەندێکی تری بەسەر عائیشەوە بوو[2]. ئەلحەسەن ئەڵێ: نرخەکەی شەش درهەم یاخود حەوت درهەم بووە.

ئەحمەد ئەڵێ: ئەبو ئوسامە بۆی باسکردین، زائیدە هەواڵی پێداین، عەتاء بۆی باسکردین ئەویش لەباوکییەوە ئەویش لەعەلییەوە وتی: پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) فاتیمەی بەبوکێنیی ئامادەکرد بەپۆشاك(عەبایەك)ی قەیفەیی و جەوندەیەك و سەرینێك ناوەوەی ریشاڵ بوو[3].

ئەڵێ: بەهزی کوڕی ئەسەد بۆی باسکردین، سولەیمانی کوڕی موغیرە بۆی باسکردین ئەویش لەحومەیدەوە وتی: ئەبو بوردە وتی: چوومە لای عائیشە، ئەویش رووپۆشێکی زبر کە لەیەمەن دروستدەکرێ لەگەڵ عەبایەکدا دەرکرد لەوەی پێی دەڵێن پێکەوە نووسێنراو(المُلبَّدة)، وتی: پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) لەنێوان ئەم دوو پارچەیەدا کۆچی دواییکرد[4].

وتوویانە: گەر دەوڵەمەندیی بەسوپاسگوزارییەوە لەهەژاریی بەئارامگرییەوە باشتر بووایە، ئەوە پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)دەوڵەمەندیی

---

[1] - بوخاری(٦٤٥٣) و موسلیم(٢٩٦٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] - حسن، تەبەرانیی لە المعجم الأوسط(٥٦٩٥)ئیخراجی کردووە.

[3] - صەحیحە، نەسائی(٦/ ١٣٥) و ئیبن ماجە(٤١٥٢) و ئەحمەد(١/ ٨٤) ئیخراجیان کردووە.

[4] - بوخاری(٥٨١٨) و موسلیم(٢٠٨٠) و ئەحمەد(٦/ ٣٢)ئیخراجیان کردووە.

بەسوپاسگوزارییەوە هەڵدەبژارد کاتێك دونیای خرایە بەردەست و پەروەردگاریش فەرمانی پێ دەکرد داوای دەوڵەمەندیی لێ بکات، هەروەك چۆن فەرمانی پێکرد داوای زانستی زیاتری لێ بکات.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) تەنیا ئەوەی هەڵدەبژارد کە خوای گەورە بۆی هەڵبژاردبوو، خوای گەورەش باشترینی بۆ هەڵدەبژارد، چونکە بەرێزترین و کامڵترین مەخلوقی خۆی بوو.

وتوویانە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەواڵی داوە کە باشترین رزق و رۆزییەك، ئەوەیە کە بەئەندازەی پێویستیی بەندە بێ، ئەوەندەی لێ کەم نەبێ زیانی لێ بدات و ئەوەندەی لێ زیاتر نەبێ لەرێ دەریبکات و تووشی ئارەزووبازیی بکات.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: ئیبن مەهدیی بۆی باسکردین، هیشام بۆی باسکردین لەقەتادەوە، ئەویش لەخولەید ئەلعەصرییەوە ئەویش لەئەبی دەردائەوە وتی: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:"ما طلعت شمس قط الا بعث بجنبيها ملكان يناديان يسمعان أهل الأرض الا الثقلين يا أيها الناس هلموا الى ربكم فإن ما قلَّ وكفى خير مما كثر وألهى ولا آبت شمس قط الا بعث بجنبيها ملكان يناديان يسمعان أهل الأرض الا الثقلين اللهم أعط منفقا خلفا واعط ممسكا تلفا"[1]،واتا:هەرگیز نەبووە رۆژێك خۆر هەڵبێ و دوو فریشتە لەمدیو ئەودیووی نەبن و بانگ بکەنە ئەهلی سەرزەوی کە هەموو مەخلوقاتی سەر زەویی جگە

[1] - صەحیحە، ئەحمەد(٥/ ١٩٧) و حاکم(٢/ ٤٤٤) و ئیبن حیبان(٤٧٦/ موارد) و تەیالسی(٩٧٩) و بەیهەقیی لە الشعب(١٠٣٧٣) ئیخراجیان کردووە.

لەمرۆڤ و جنۆکە هـەموویان گوێیـان لـەدەنگی ئـەو دوو فریشـتە دەبیٚ و ئـەڵێن: ئەی خەڵکینە وەرنەوە بۆلای پەروەردگارتان، ئەوەتان کە کەمی هەبێ و بەسـی بێ باشترە لەوەی زۆری هـەبێ و ئـارەزوو بـازبێ، هـەرگیز نـەبووە جارێك خـۆر ئاوابێ و دوو فریشتە لەمدیوو ئەودیووی بانگەشە بکەن و جگە لـەمرۆڤ و جنۆکـە هەموو مەخلوقاتی سەر زەویی گوێیان لێیەتی و ئەڵێن: خوایە گیان ببەخشە بەو کەسەی بەسەر ماڵ و منداڵ و نزیکان و هەژاراندا بەخشیوێتی و ئەوەشی چـنگی نوقاندووەو نەیبەخشیووە ماڵەکەی لەنێوببە.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: وەکیع بـۆی باسـکردین، ئوسـامەی کـوڕی زەیـد بـۆی باسکردین ئـەویش لەموحەممـەدی کـوڕی عەبـدولڕەحمانی کـوڕی ئـەبی لەبیبـە، ئـەویش لەسـەعدی کـوڕی مالیکـەوە(خوای لـێ رازیـی بـێ) ئەڵێ:پەیامبـەری خوا(صـلى الله عليـه وسـلم)فەرمووی:«خَـيرِ الـرِّزْقِ مَـا يَكفـي، وخَـيرُ الـذِّكرِ الخَفيُّ»[1]،واتـا: باشـترین رزق و رۆزییـەك ئەوەنـدە بـێ بـەش بکـات و بـەس بـێ، باشترین زیکرو یادێکیش ئەوەیە کە بەشاراوەیی بێ.

بڕوانـــەو رابمێنـــە لەکۆکردنـــەوەی نێـــوان رزقـــی دڵ و جەســـتە لـــەم فەرموودەیەیدا:رزق و رۆزیـی دونیـاو ئـاخیرەت، هەواڵیشـی داوە کـە باشـترینی هـەردوو رزق و رۆزییەکـە ئەوەیـە سـنوور نەبـەزێنێ، یـادکردنی خـوای گـەورە ئەوەنـدەی بەسـە بـەنهێنی و شـاراوەیی بـێ، کـە لـەوە دەرچـوو ترسـی ریـاو خۆبەزلزانینی هەیە بەسەر بێئاگایانەوە، هەروەها رزق و رۆزیـی جەسـتەش گـەر لەسـنووری ئەنـدازەو بـەس بـوون دەرچـوو، ئـەوە ترسـی سـتەمکاری و لـەڕێ دەرچوون و کۆکردنەوەی زۆری دونیا بۆ کەسەکە هەیە.

---

[1] - لاوازە، ئەحمەد(١/ ١٧٢ و ١٧٨) و ئیبن حیبان(٨٠٩) ئیخراجیان کردووە: لاواز و پچڕانی تێدا هەیە.

وتوویانە: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەوەندە خۆزگەی بەکەسێك هەبووە بەکەمی دونیا رازیی بێ، خۆزگەی نەبردووە بەدەوڵەمەند.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: وەکیع بۆی باسکردین، عەلیی کوڕی ساڵح بۆی باسکردین، ئەویش لەئەبی ئەلموهلبەوە ئەویش لەعوبەیدوالڵەی کوڕی زحرەوە ئەویش لەعەلیی کوڕی یەزیدەوە، ئەویش لەئەلقاسمەوە ئەویش لەئەبی ئومامەوە(خوای لێ رازیی بێ) وتی: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"ان أغبط أوليائي عندي: مؤمن خفيف الحاذ، ذو حظ من صلاة، أحسن عبادة ربه، وكان غامضا في الناس، لا يشار إليه بالاصابع فعجلت منيته، وقل تراثه، وقلت بواكيه""،واتا:شانسدارترین و بەختەوەرترین دۆستێك بەلای منەوە:باوەڕدارێکی هەژاری خزم و کەس کەمە و لەنوێژدا پشکی هەیەو شانسدارە، بەچاکی و جوانیی پەروەردگاری دەپەرستێ و لەنێو خەڵکدا ناناسرێتەوە، بەپەنجەکانی دەست ئاماژەی بۆ ناکرێت، مردنی خێرای پێ دەکرێ و میرات و بەجێماوی کەم و ئەو کەسانەشی کەمن کە بۆی دەگرین[1].

وتوویانە: پارێزگاریی خوای گەورە بۆ بەندەی باوەڕداری لەدوورگرتنی لەدونیا، تەنیا خۆشویستن و رێزی خوایە بۆ بەندەکەی. پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: ئەبو سەعید بۆی باسکردین، سولەیمانی کوڕی بیلال بۆی باسکردین، ئەویش لەعەمری کوڕی ئەبی عەمرەوە، ئەویش لەعاصمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادەوە، ئەویش لەمەحمودی کوڕی لەبیدەوە(خوای لێ رازیی بێ): کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی: «إِن الله يحمي عَبده الْمُؤمن من

[1] - زۆر لاوازە، ترمیزی(٢٣٤٧) و ئەحمەد(٥/ ٥٢٥) و تەبەرانیی لە المعجم الأوسط(٧٨٢٩) و حاکم(٤/ ١٢٣)ئیخراجیان کردووە.

الدُّنْيَا وَهُوَ يُحِبهُ كَمَا تحمون مريضكم الطَّعَام وَالشرَاب تخافون عَلَيْه»[1]،واتا: خوای گەورە بەندەی باوەڕداری خۆی لەدونیا دووردەگرێ و دەیپارێزێ لەبەر ئەوەی بەندەکەی خۆی خۆشدەوێ، هەروەك چۆن ئێوە نەخۆشەکەتان لەخواردن و خواردنەوە دەپارێزن دەترسێن شتێکیان بەسەردابێ. وتوویانە: بەزۆریی سەروەت و دەوڵەمەندیی بەخشین بەخەڵك، مۆڵەت و بیانووی خوا بووە بۆ بەندە نەوەك ڕێزو خۆشەویستیی بۆی.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: یەحیای کوڕی غەیلان بۆی باسکردین، ریشدینی کوڕی سەعد بۆی باسکردین، لەحرملەی کوڕی عیمرانی ئەلتتوجەیبییەوە ئەویش لەعوقبەی کوڕی موسلیمەوە ئەویش لەعوقبەی کوڕی عامرەوە(خوای لێ رازیی بێ)، ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) ئەفەرمووێت:«إِذَا رَأَيْتَ اللَّهَ يُعْطِي الْعَبْدَ مِنَ الدُّنْيَا عَلَى مَعَاصِيهِ مَا يُحِبُّ فَإِنَّمَا هُوَ اسْتِدْرَاجٌ»،واتا: ئەگەر بینیتان خوای گەورە لەدونیای بەبەندەیەك دەبەخشی و بەندەکە لەسەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خوادا بوو، بزانن ئەوە خۆشەویستیی خوای گەورە نییە بۆی، بەڵکو ئەوە بیانوو خستنەسەرە. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:﴿ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ﴾(الأنعام: ٤٤[2]). وتوویانە: لەبەر سووکی و بێ نرخیی دونیایە، خوای گەورە زۆربەی دۆست و خۆشەویستانی خۆی لێ بەدوورگرتووە.

---

[1] - صەحیحە، ترمیزی(٢٠٣٦) و ئەحمەد لە الزهد(١٧) و حاکم(٤/ ٢٠٧) و ئیبن حیبان(٦٦٩) ئیخراجیان کردووە.

[2] - صەحیحە، ئەحمەد(٤/ ١٤٥) و تەبەرانیی لە المعجم الکبیر(١٧/ ٢٨٣) و بەیهەقیی لە الشعب(٤٢٢٠) ئیخراجیان کردووە.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: موعاویە بۆی باسکردین، ئەعمەش بۆی باسکردین لەسالمەوە ئەویش لەئەبی ئەلجەعدەوە وتی: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: « إِنَّ مِنْ أُمَّتِي مَنْ لَوْ أَتَى بَابَ أَحَدِكُمْ يَسْأَلُهُ دِينَارًا أَوْ دِرْهَمًا أَوْ فَلْسًا لَمْ يُعْطِهُ، وَلَوْ سَأَلَ اللَّهَ الْجَنَّةَ لَأَعْطَاهُ إِيَّاهَا، وَلَوْ سَأَلَهُ الدُّنْيَا لَمْ يُعْطِهِ إِيَّاهَا، وَلَمْ يَمْنَعْهَا إِيَّاهُ لِهَوَانِهِ عَلَيْهِ، ذُو طِمْرَيْنِ لَا يُؤْبَهُ لَهُ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ »[١]، واتا: لەنێو ئوممەتەکەمدا کەسی وا هەیە ئەگەر بێتە بەر دەرگای یەکێ لەئێوە تاوەکو شتێکی پێ بدات لەدینارێك یان درهەمێك یان فلسێك ئێوە هیچی پێ نادەن، کەچی ئەگەر داوای بەهەشت لەخوا بکات خوای گەورە دەیداتێ، داوای دونیا بکات نایداتێ، چونکە دونیا بۆی هیچە، بەرگ دڕاوێك کە هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێ،گەر سوێند لەسەر خوا بخوات ئەوە خوای گەورە بۆی بەجێدەگەیەنێ.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە خوای گەورە ڕێگریی دەوڵەمەندبوونی بەندە دەکات، لەبەر سووکی و کەم نرخیی دونیایە بەلای خوای گەورەوە نەك کەم نرخیی بەندە، بۆیە خوای گەورە باشترو نرخدارتری پێ دەدات، دونیا دەداتە ئەو کەسەی خۆشیبووێ و ئەوەشی خۆشی ناوێ، بەڵام ئاخیرەت تەنیا بەخۆشەویستانی خۆی دەدات.

وتوویانە: بێگومان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هەواڵی پێداوین، ئەوانەی لەمەجلیسی ئەوەوە نزیکبن، ئەوانەن کە بەکەمی دونیا رازیبن و هەوڵی زۆرتری بۆ نادەن، پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: یەزیدی کوڕی هارون بۆی باسکردین، موحەممەدی کوڕی عەمر هەواڵی پێداین وتی:گوێم لێ بوو عیراکی کوڕی مالیك ئەیووت:ئەبو زەڕ وتی: لەڕۆژی قیامەتدا من لەئێوە نزیکتر لەپەیامبەری

---

[١] - لاوازە، ئەحمەد لە الزهد(لا١٨) و پچڕانی تێدا هەیە، هەناد لە الزهد(٥٨٧) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە التواضع(١) ئیخراجیان کردووە.

خواوه(صلی الله علیه وسلم)دانیشتووم، من گوێم لێبوو ئەیفەرموو:«ان أقربكم منی مجلسا یوم القیامة مَنْ خَرَجَ مِنَ الدُّنْیَا كَهَیْئَةِ مَا تَرَكْتُهُ فِیهَا»[1]،واتا: نزیكترین كەستان لەمنەوە لەرۆژی قیامەتدا، ئەوەتانە كە وەك من لەدونیا دەرچووبێ،سوێند بەخوا هەر یەك لەئێوە چمكێكی دونیای گرتووە جگە لە من نەبێ.

وتوویانە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) خۆزگەی خواستووە بەو كەسەی ژیانێكی سادەی كردووەو هەواڵی رزگاربوونی پێ دراوە. پێشەوا ئەحمەد ئەفەرمووێ: عبداللەی كوڕی یەزید بۆی باسكردین، حەیوە بۆی باسكردین وتی: ئەبو هانیئ هەواڵی پێدام، كە ئەبا عەلیی ئەلجنبی هەواڵی پێداوە، كە گوێی لەفوزالەی كوڕی عوبەید بووە ئەیووت: گوێی لەپەیامبەری خوا بووە ئەیفەرموو:" طوبى لمن هُدي الى الاسلام، وكان عيشه كفافاً وقَنَع"[2]،واتا: بەختەوەرو سەرفراز بووە ئەو كەسەی بۆ ئیسلام هیدایەت دراوەو ژیانێكی زۆر سادەی كردووەو بەقەناعەت بووە.

هەروەها لەفەرموودەیەكی عبداللەی كوڕی عەمرەوە هاتووە: كە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"قد أفلح من أسلم ورُزِق كفافاً، وقَنَّعه الله بما آتاه"[3]،واتا: سەرفراز بووە ئەو كەسەی موسڵمانبووەو رزق و رۆزییەكی سادەو كەمی پێ دراوەو بەقەناعەت بووە بەوەی خوا پێیداوە.

---

[1] - لاوازە، ئەحمەد(٥/ ١٦٥) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(١/ ١٦١) و بەیهەقیی لە الشعب(١٠٤٠٥) ئیخراجیان كردووە.

[2] - صەحیح، ترمیزی(٢٣٤٩) و ئەحمەد(٦/ ١٩) و ئیبن حیبان(٧٠٥) و حاكم(١/ ٣٤) ئیخراجیان كردووە.

[3] - موسلیم(١٠٥٤) و ئەحمەد(٢/ ١٦٨) ئیخراجیان كردووە.

وتوویانـە: تەنانـەت سـووك ی و خێـرا لێپرسـینەوە کـردن لەکەسـێ دونیـای بەکـەمگرت بـێ و هـەوڵی تێـدا نـەدابێ، بەسـە بـۆ ئـەوەی فـەزڵی بەسـەر دەوڵەمەندییەوە هەبێ.

عبداللەی کوڕی پێشەوا ئەحمەد[1] ئەڵێ: بیانی کوڕی حەکەم بۆی باسکردین، موحەممەدی کوڕی حاتەم بۆی باسکردین و وتی: بیشری کوڕی ئـەلحاریـث بـۆی باسکردین، عیسای کوڕی یونس بۆی باسکردین، ئەویش لەهیشامەوە ئەویش لـە ئەلحەسەنەوە، وتـی: پەیامبـەری خوا(صـلی الله علیـه وسـلم)فەرمووی:"ثلاثـة لا يحاسَبُ بهن العبد: ظلٌّ خُصٍّ يُستظلُّ به، وكسرةٌ يشدُّ بها صُلْبَهُ وثـوبٌ يـواري بـه عورتَهُ"[2]،واتـا: سـێ شـت خـوای گەورەیـە بەنـدەی لەسـەر لێپرسـینەوە ناکـات: سێبەرێك لەژێریدا بحەسێتەوە، پارچە نانێك سکی پێ تێربکات، بـەرگێك داوێنـی پێ داپۆشێ.

پێشەوا ئەحمـەد ئـەڵێ: سـەییار بـۆی باسـکردین، جەعفـەر بـۆی باسـکردین، لـەیـث بـۆی باسـکردین لەئـەبی عوسمانـەوە وتـی: کـە موسـڵمانەکان جوجـەیان فەتحکرد، ڕۆیشتنە ناویـەوەو ئەگـەڕان، کیسـەو جـوێنیی پـڕ خـواردن وەك چیا بـەرزکرابووەوە، پیاوێـك بەتەنیشـت سـەلماندا ڕێـی دەکـردو وتـی: ئـەی ئـەبا

[1] - عبداللـەی کـوڕی ئەحمـەدی کـوڕی موحەممـەدی کـوڕی حەنبـەلی ئەلشـەیبانیی ئەلبەغـدادی، ئـەبو عەبدولڕەحمان(ساڵی٢١٣ك لەدایکبووەو ساڵی٢٩٠ك مردووە: حـافیظی فـەرمووده و خـەڵکی بەغـدا بـووە، (الزوائد)ی هەیە لەسەر کتێبی(الزهد)ی پێشەوا ئەحمەدی باوکی و (زوائد المسند)ی زیـاتر کـردووە لەسـەر موسنەدی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل.

[2] - لاوازە، بەیهەقیی لە الشعب(١٠٣٦٨) و عبداللەی کوڕی حەنبەل لە زوائد الزهد(١٨) ئیخراجیان کردووە، بەیهەقیی ئەڵێ: بەم شێوەیە بەمورسەلیی هاتووە.

عبدالله، ئایە دەبینی خوای گەورە چی شتێکی بۆمان فەتحکرد؟ ئەبینی خوای گەورە چی پێمان بەخشی؟ سەلمان وتی: ئایە سەرسامی بەوەی دەیبنی؟ لەسەر هەر دەنکە دانەوێڵەیەك لێپرسینەوە هەیە[1]!.

وتوویانە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) شایەتیی ئەوەی بۆ هاوەڵانی داوە: کە رۆژی هەژاری و دەسکورتی و برسێتییان باشترە لەرۆژی دەوڵەمەندبوون و کرانەوەی دونیا بەڕوویاندا. پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: عەبدولصەمەد بۆی باسکردین، ئەبو ئەلئەشهەب بۆی باسکردین، ئەویش لە ئەلحەسەنەوە وتی: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: "یا أهل الصفة کیف أنتم؟قالوا نحن بخیر قال أنتم الیوم خیر أم یوم تغدو علی أحدکم جفنة وتروح أخری، ویغدو في حلة ویروح في أخری وتسترون في بیوتکم مثل أستار الکعبة"،واتا:ئەی ئەهلی صوفە(أهل الصُّفة) ئێوە چۆنن؟ وتیان: ئێمە باشین. فەرمووی: ئایە ئێوە ئەمڕۆ لەخێردان یان ئەوەی بەیانی و ئێوارە دەفری جیاوازی خواردنتان بۆ بهێنن و هەر جارەو بەرگێ لەبەر بکەن و وەك کەعبە ماڵەکانتان داپۆشن؟ وتیان: ئەی پەیامبەری خوا ئەو رۆژە باشین کە خوای گەورە نیعمەتمان پێ ببەخشێ و ئێمەش سوپاس و ستایشی بکەین، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:"بل أنتم الیوم خیر"[2]،واتا: بەڵکو ئێوە ئەمڕۆ لەخێردان. بێگومان ئەمە راشکاونەیە، بەوەی لەکاتی ئارامگرتن لەسەر هەژاریان باشترن لەکاتی دەوڵەمەندییان هەرچەندە سوپاسگوزاریش بن.

---

[1] - لاوازە، بەیهەقیی لە الشعب(١٠٦٥٤) ئیخراجی کردووە.

[2] - لاوازە، ئەحمەد لە الزهد(٤٨٧) ئیخراجی کردووە، بەهۆی مورسەل بوونییەوە لاوازە.

عبداللەی کوڕی ئەحمەد ئەڵێ: ئەبا زەڕ بۆی باسکردین، حەفصی کوڕی غەیاس بۆی باسکردین، ئەویش لەداوودی کوڕی ئەبی هیندەوە، ئەویش لەئەبی حەربی کوڕی ئەبی ئەلئەسوەدەوە، ئەویش لەتەڵحەی ئەلبەصرییەوە وتی: هاتمە مەدینە و هیچ ناسراوێکم لەو شارەدا نەبوو، چنگە خورمایەك بەسەر دوو کەسدا دابەش دەکرا، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نوێژێکی پێ کردین، لەپشتییەوە کابرایەك هاواری کرد وتی: ئەی پەیامبەری خوا خورما سکی سووتاندین و سەرئاو ناکەین، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم)وتارێکی پێشکەشکردو سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو فەرمووی:«وَاللَّهِ لَوْ أَجِدُ لَكُمُ اللَّحْمَ وَالْخُبْزَ لَأَطْعَمْتُكُمُوهُ، وَلَيَأْتِيَنَّ عَلَيْكُمْ زَمَانٌ تُغْدو عَلَى أَحَدِكُمْ الْجِفَانُ وَتُرَاحُ، وَلَتَلْبَسُنَّ مِثْلَ أَسْتَارِ الْكَعْبَةِ» ،واتا:سوێند بەخوای گەورە گەر گۆشت و نانم دەسکەوتبایەو شك بردبایە بەئێوەم دەدا، بەڵام بزانن سەردەمانێکتان بەسەردا دێت بەیانیان و ئێواران دەفرو مەجەڵی پڕتان بۆ دەهێندرێت و دەخرێتە بەردەم وماڵەکانتان وەکو کەعبە دادەپۆشن. وتیان: ئەی پەیامبەری خوا ئەمڕۆمان بۆ باشە یان ئەو ڕۆژەی بەو جۆرە دەکەوینە خۆشگوزەرانییەوە؟ فەرمووی:«أَنْتُمُ الْيَوْمَ خَيْرٌ مِنْكُمْ يَوْمَئِذٍ، أَنْتُمُ الْيَوْمَ خَيْرٌ مِنْكُمْ يَوْمَئِذٍ" يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[1] ،واتا: بەڵکو ئەمڕۆتان بۆ باشترە، لەو ڕۆژەی دەکەونە خۆشگوزەرانییەوە دەکەونە گیانی یەکتر و لەگەردنی یەکتر دەدەن.

---

[1] - صەحیحە، ئەحمەد لە المسند(٣/ ٤٨٧) و عبداللە لە زوائد الزهد(٣٣) و ئیبن حیبان(٦٦٨٤) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(١/ ٣٧٤) و ئەلبەزار(٣٦٧٣) ئیخراجیان کردووە.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: عەبدولوەهاب بۆی باسکردین، ئەویش لەسەعیدەوە ئەویش لەقەتادەوە وتی: بۆمان باسکراوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هاتووەتەلای ئەهلی صوفەو ئەوانەی فەرمووە[1].

وتوویانە: لەدەوڵەمەندیی و سەروەت و ساماندا تەنیا فیتنە هەیە، کەم کەس هەیە بەبوونی سەروەت و سامان سەلامەت مابێتەوەو کاریگەریی نەکردبێتە سەر ئایینەکەی، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی:﴿أَنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ﴾ الأنفال: ٢٨، واتا: بزانن بەڕاستی ماڵ و منداڵتان هۆی تاقی کردنەوەی(ئێوەن).

ئەڵێ: گوێم لەپەیامبەری خوابوو(صلى الله عليه وسلم) ئەیفەرموو:« إنَّ لِكُلِّ أُمَّةٍ فِتْنَةً، وَفِتْنَةُ أُمَّتِي:المالُ »[2]،واتا: هەموو ئوممەتێك فیتنەیەکی هەیە، فیتنەی ئوممەتەکەی منیش لەسەروەت و ساماندایە. ئەڵێ: ئەمە فەرموودەیەکی(حسن صحيح)ە.

وتوویانە: سەروەت و سامان مرۆڤ بۆ دۆزەخ بانگدەکات، هەژارییش بۆ بەهەشت، پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ:یەزید بۆی باسکردین، ئەبو ئەلئەشهەب بۆی باسکردین، سەعیدی کوڕی ئەیمەن خزمەتکاری کەعبی کوڕی سور بۆی باسکردین وتی: جارێکیان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بۆ هاوەڵانی قسەی دەکرد، پیاوێکی هەژار هات و لەتەنیشت پیاوێکی دەوڵەمەندا دانیشت،

---

[1] - ئەحمەد لە الزهد(٤٨/لا).

[2] - صەحیحە، ئەحمەد لە الزهد(٤٨/لا) ئیخراجی کردووە.

پیاوە دەوڵەمەندەکە بەرگ و پۆشاکەی پێچایەوە، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"أخشيتَ يا فلان أن يغدو غناك عليه أو يغدو فقره عليك"،واتا: ئەی فلانە کەس ترسای دەوڵەمەندییەکەی تۆ بۆ ئەو بڕوات یان هەژارییەکەی ئەو بۆ تۆ بێ؟ وتی: ئەی پەیامبەری خوا بۆ دەوڵەمەندیی خراپە؟ پەیامبەریش فەرمووی:"نعم ان غناك يدعوك الى النار وان فقره يدعوه الى الجنة " واتا: بەڵێ دەوڵەمەندییەکەت بۆ دۆزەخ بانگت دەکات و هەژارییەکەی ئەویش بۆ بەهەشت بانگی دەکات. وتی: ئەی بەچی شتێك خۆم لەدۆزەخ بپارێزم؟ فەرمووی: دڵدانەوەی براکەت بکە. هەژارەکە وتی: پێویستییم پێی نییە، پەیامبەریش فەرمووی: لەبراکەت خۆش بەو بۆی بپارێرەوە[1].

وتوویانە: مافی دەوڵەمەندیی لەوە گەورەترە بەندە تەنیا سوپاس و ستایشی خوای گەورە بکات، ترمیزی لەجامیعەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەیەکی عوسمانی کوڕی عەفاندا(خوای لێ رازیی بێ): کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"ليس لابن آدم حق في سوى هذه الخصال: بيت يسكنه، وثوب يواري به عورته، وجلف الخبز والماء"[2]،واتا:نەوەی ئادەم تەنیا چەند مافێکی هەیە: خانوویەك تیایدا بژێ، بەرگێك خۆی پێ داپۆشێ، نانە رەقێك و ئاوی هەبێ. ئەڵێ: ئەم فەرموودەیە(حسن صحيح)ە.

لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە لەئەبی ئومامەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:" يَا ابْنَ آدَمَ إِنَّكَ أَنْ تَبْذُلَ الْفَضْلَ

---

[1] - لاوازە، ئەحمەد لە الزهد(لا٤٩).

[2] - لاوازو(منکر)ە، ترمیزی(٢٣٤١) و ئەحمەد(١/ ٦٢) و تەیالیسی(٨٣) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(١/ ٦١) و حاکم(٤/ ٣١٢) ئیخراجیان کردووە.

خَيْرٌ لَكَ وَأَنْ تُمْسِكَهُ شَرٌّ لَكَ وَلَا تُلَامُ عَلَى كَفَافٍ وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى"[1]،واتـا: ئـەی نـەوەی ئـادەم، گـەر ئـەوەی لەپێویستت زیادە ببیەخشی ئەوە چاکترە بۆت، ئەگەر نەتبەخشی خراپە، لەسەر سادەیی ژیان سەرزەنشت ناکرێی، لەوانەوە دەستپێبکە کە ئەرکی بژێویان لەسەر تۆیە ئینجا هـەژاران و بـێ نـەوایان، دەسـتی باڵاَ(بەخشـەر) لەدەسـتی نزم(پـێ بەخشراو)باشترە.

هـەر لەصـەحیحی موسـلیمدا هـاتووە لەئـەبی نـەضرەوە، ئـەویش لەئـەبی سـەعیدەوە(خوای لـێ رازیـی بێ)ئـەڵێ: جارێکیـان لەگەشـتێکدا بـووین لەگـەڵ پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم)، پیاوێك بەسەر ولاَخ(یـان وشـتر)ەکەیەوە بـوو، بەڕاسـت و چـەپدا چـاوی دەگێـڕا، پەیامبـەری خواش(صـلى الله عليـه وسلم)فەرمووی:"من كان معه فضل من ظهر فليعد به على من لا ظهر له ومن كان عنده فضل من زاد فليعد بـه علـى مـن لا زاد لـه"،واتـا: هەرکەسـێ خـواردنێکی لەخۆی زیاتری پێیە با بیداتە ئەو کەسەی خواردنی پێ نییە، هەرکەسێ بەرگ و پۆشـاکێکی لـەخۆی پـێ زیـاترە بـا بیداتـە کەسـێك پۆشـاکی پـێ نییـە. ئـەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليـە وسـلم) لـەجۆرەها سـەروەت و سـامانی باسـکرد، تائەوەی گومانمان کرد کە هیچ مافێکمان بەسەر سەروەت و سـامانی خۆمانـەوە نییە[2].

---

[1] - موسلیم(١٠٣٦) ئیخراجی کردووە.

[2] - موسلیم(١٧٢٨) ئیخراجی کردووە.

وتوویانه:ئەمە جێی تێڕوانینە لەباشتردانانی ئەو دەوڵەمەندە سوپاسگوزارەی تەواوی شتە زیادەکانی لەخۆی دەبەخشێ، بەڵام دەوڵەمەندێك کە جۆر گەلێکی فەزڵ و سەروەتی جۆر بەجۆری هەیەو سوپاسگوزاریی لەسەر شتە واجیب و هەندێ سووننەت ئەکات، ئاخۆ ئەمە چۆن فەزڵدارتر ئەبێ بەسەر هەژارێکی خۆڕاگر کە لەسەر هەژارییەکەی بەرانبەر بەخوای گەورە رازییە؟!

وتوویانە: پەیامبەری خوا بۆ هاوەڵانی خۆی سوێندی خواردووە کە پێشەوای سوپاسگوزاران بوونە، بەوەی لەهەژارییان لێیان ناترسێ، بەڵکو لەدەوڵەمەندییان دەترسێ، سوێندی خواردووە کە ترسی خراپەی دەوڵەمەندیی هەیە بەسەریانەوە، لەصەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەی عەمری کوڕی عەوفەوە(بەشدار بووی بەدر بووە)، بەوەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)ئەبا عوبەیدەی نارد بۆ بەحرەین تاوەکو جیزیەی ئەوێ بهێنێت، چونکە پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) لەگەڵ خەڵکی بەحرەیندا رێککەوتنی کردبوو، عەلائی کوڕی حەزرەمیی کردبووە سەرپەرشتیاریان، ئەبو عوبەیدە بەسەروەتێکەوە لەبەحرەینەوە هاتەوە، ئەنصارەکان گوێبیستی هاتنەوەی ئەبو عوبەیدە بوون، نوێژی بەیانیان لەگەڵ پەیامبەری خوادا کرد، کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) لەنوێژ بوویەوە هەڵساو رۆیشت، ئەوان هاتنە بەردەمی، پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) کە ئەوانی بینی بزەی کردو فەرمووی:"أظنكم سمعتم أن أبا عبيدة قدم بشئ من البحرين"،واتا: وا گومان دەبەم گوێتان لێبووە ئەبا عوبەیدە لەبەحرەینەوە گەڕاوەتەوە؟" وتیان: بەڵێ ئەی پەیامبەری خوا. پەیامبەریش فەرمووی:" أبشروا وأملوا ما يسركم فوالله ما الفقر أخشى عليكم ولكني أخشى أن تبسط عليكم الدنيا كما بسطت

على من كان قبلكم فتتنافسوا فيها كما تنافسوها فتهلككم كما أهلكتهم"[1]،واتـا: مژده بدەن بەوەی جێی دڵخۆشییتان بی، سوێند بەخوا من لەوە ناترسم هەژاریی خراپەی بۆ ئێوە هەبێ، بەڵکو لەوە دەترسم دونیاتان بەڕوودا ئاوەڵا بێ وەك ئەوەی بۆ خەڵكانی پێش ئێوە كرایەوەو خۆشگوزەران بوون و وەك ئەوان كێبڕكێی تێدا بكەن و وەك چۆن ئەوانی بەهیلاكدا برد ئێوەش بەهیلاكدا ببات.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: روح بۆی باسكردین، هیشام بۆی باسكردین، ئەویش لە ئەلحەسەنەوە وتی: بە ئەبا سەعلەبەی ئەلخوشەنیی وترا: ئەو دونیایەی ئێوە كوانێ كە ئێوە خۆتانتانی بۆ ئامادە دەكرد ئەی هاوەڵانی موحەممەد؟ ئەویش وتی: سوێند بە الله كە هیچ خوایەكی دیكەی بەحەق بوونی نییە جگە لەخۆی، دونیا وا خەریكە لەئیمانتان دەخوات و دەسووتێنێ هەروەك چۆن ئاگر پووش و پەلاش دەسووتێنێ.

ئەحمەد ئەڵێ: یەزید بۆی باسكردین، هیشامی كوڕی حەسسان بۆی باسكردین وتی: گوێم لە ئەلحەسەن بوو ئەیووت: سوێند بەخوا گەر هەركەسێ خۆشگوزەرانیی بەڕوودا بكرێتەوەو ترسی لێ نەبێ، ئەوە زانستی كەمەو توانای بۆچوون و بیركردنەوەی نییە،هەر بەندەیەكیش خوای گەورە خۆشگوزەرانیی لێ گرتەوەو بەخێرو چاكەی نەزانی، ئەوە زانستی كەمەو توانای بۆچوون و بیركردنەوەی نییە[2].

---

[1] - بوخاری(٦٤٢٥) و موسلیم(٢٩٦) ئیخراجیان كردووە.

[2] - ئەحمەد لە الزهد(٤٨لا)ئیخراجی كردووە.

وتوویانە: بەلای پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم) هەژار و دەوڵەمەندێك تێپەڕیوون، فەرمووی:"هذا خیر من ملء الأرض مثل هذا"[1]، واتا: ئەم هەژارە بەلای خوای گەورەوە پڕ بەزەویی لەو دەوڵەمەند و کەسە بەناوبانگە باشترە.

بوخاریی لەصەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەسەهلی کوڕی سەعدەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پیاوێك بەلای پەیامبەری خوادا تێپەڕی، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"چی دەڵێن لەبارەی ئەم پیاوەوە؟ وتیان: شیاوی ئەوەیە داوای ژنی کرد ژنی پێ بدرێ، تکای کرد تکاکەی قبوڵ بکرێ، قسەی کرد گوێی لێ بگیردرێ. پاشان پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بێدەنگ بوو، ئینجا پیاوێکی موسڵمانی هەژار تێپەڕیوو، فەرمووی: ئەی لەبارەی ئەمەوە چی دەڵێن؟ وتیان: حەقی ئەوەیە کە داوای ژنی کرد ژنی پێ نەدرێ و تکای کرد تکای قبوڵ نەکرێ و قسەی کرد گوێ بۆ قسەی نەگیردرێ، بۆیە پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"هذا خیر من ملء الأرض مثل هذا"[2]، واتا: ئەم هەژارە بەلای خوای گەورەوە پڕ بەزەویی لەو دەوڵەمەند و کەسە بەناوبانگە باشترە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) موژدەیەکی بەهەژارانی ئارامگر داوە کە بەدەوڵەمەندانی نەداوە، هەر لەترمیزیدا فەرموودەیەك لەفوزالەی کوڕی عوبەیدەوە هاتووە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نوێژیی بەخەڵك دەکرد، هەژارەکانی ئەهلی صوفە لەبرسێتییدا لەنوێژەکانیان دەکەوتن، ئەعرابەکان دەیانووت: ئەوانە شێتن، کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)لەنوێژ بوویەوە رۆیشتە لایان و فەرمووی:"لَوْ تَعْلَمُونَ مَا لَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ

---

[1] - بڕوانرێتە تەخریجی فەرموودەکەی دواتر.

[2] -بوخاری(٥٠٩١) تەخریجی کردووە.

لَأَحْبَبْتُمْ أَنْ تَزْدَادُوا فَاقَةً وَحَاجَةً"[1]،واتا: گەر دەتانزانی چی پاداشتێکتان لای خوای گەورە بۆ هەیە، ئەوکات داواتان دەکرد زیاتر هەژارترو خاوەن پێداویستیی تر بن. فوزاله ئەڵێ: من ئەو ڕۆژە لەگەڵ پەیامبەری خوادا بووم، موژدەی پێدان کە پێش دەوڵەمەندەکان دەچنە بەهەشتەوە.

گێڕانەوەکان جیاوازن لەبارەی ماوەی ئەو پێشکەوتنە، لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە لەعبداللەی کوڕی عەمرەوە: کە سێ کەس هاتوونەتە لای و وتوویانە: ئەی ئەبا موحەممەد هیچ شتێکمان نییە، نە خەرجییەك، نە ولاخێك، نە کەلوپەلێك. ئەویش پێیان ئەڵێ: گەر بتانەوێ وەك خۆمانتان لێ دەکەین و چیتان بووێ پێتانی دەدەین، ئەگەر ئەشتانەوێ حاڵەکەتان بەسوڵتان دەگەیەنم، ئەگەر بشتانەوێ دەتوانن ئارامبگرن، چونکە لەپەیامبەری خوام گوێ لێبوو فەرمووی:"إِنَّ فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ يَسْبِقُونَ الْأَغْنِيَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَرْبَعِينَ خَرِيفًا"،واتا: هەژارانی موهاجیرین چل پایز پێش دەوڵەمەندەکان دەچنە بەهەشتەوە. ئەوانیش وتیان: ئارام دەگرین و هیچ شتێك داوا ناکەین[2].

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: عەفان بۆی باسکردین، حەمادی کوڕی سەلمە بۆی باسکردین، ئەویش لەموحەممەدی کوڕی عەمرەوە، ئەویش لەئەبی سەلەمەوە، ئەویش لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ ڕازیی بێ): کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی:"يدخل فقراء أمتي الجنة قبل أغنيائهم بنصف يوم وذلك خمسمائة عام"[3]،واتا: هەژارانی ئوممەتەکەم بەنیو ڕۆژ کە پێنجسەد ساڵی دونیا

---

[1] - صەحیحە، ترمیزی(٢٣٦٨) و ئەحمەد(٦/ ١٨) و ئیبن حیبان(٧٢٤) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٢/ ١٧) ئیخراجیان کردووە.

[2] - موسلیم(٢٩٧٩)ئیخراجی کردووە.

[3] - صحیح لغیره، ترمیزی(٢٣٥٣) و ئیبن ماجە(٤١٢٢) و ئەحمەد(٢/ ٢٩٦) ئیخراجیان کردووە.

دەكات پێش دەوڵەمەندانی ئوممەتەكەم دەچنە بەهەشتەوە. ترمیزیی ئەڵێ: فەرموودەیەكی(حسن صحیح)ە.

هەر لەترمیزیدا هاتووە لەفەرموودەیەكی ئەبی سەعیدەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:" فقراء المهاجرین یدخلون الجنة قبل أغنیائهم بخمسمئة سنة"[1]، واتا: هەژارانی موهاجیرین بەپێنجسەد ساڵ پێش دەوڵەمەندەكانیان دەچنە بەهەشتەوە.

هەر لەترمیزیدا هاتووە لەفەرموودەیەكی جابری كوڕی عبداللەوە(خوای لێ رازیی بێ)، ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) كە فەرموویەتی:«یَدْخُلُ فُقَرَاءُ أُمَّتِي الْجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ بِأَرْبَعِينَ خَرِيفًا»[2]،واتا: هەژارانی ئوممەتەكەم چل پایز پێش دەوڵەمەندەكانیان دەچنە بەهەشتەوە. فەرموودەیەكی(حسن)ە، گونجاوە بەفەرموودەكەی عبداللەی كوڕی عەمر و فەرموودەكەی ئەنەس كە لەترمیزییدا هاتووە:"إن المساكین یدخلون قبل الاغنیاء بأربعین خریفاً"[3]،واتا: هەژاران چل پایز پێش دەوڵەمەندەكان دەچنە بەهەشتەوە.

ئەو سێ كەسە: جابر و ئەنەس و عبداللەی كوڕی عەمر، هەموویان لەسەر چل یەكدەنگن، ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیدیش لەسەر پێنجسەد ساڵ یەكدەنگن، دەبێ بزانین دژیەكییەك لەنێوان ئەو فەرموودانەدا بوونی نییە، چونكە درەنگ و زوو چوونە بەهەشتەوە پەیوەستە بەپلەی هەژاری و دەوڵەمەندییەوە، هەیانە

[1] - حسن، ترمیزی(٢٣٥١) و ئەبو داوود(٣٦٦٦) و ئەحمەد(٣٢/ ٦٣) ئیخراجیان كردووە.

[2] - زۆر لاوازە، ترمیزی(٢٣٥٥)ئیخراجی كردووە.

[3] - لاوازە، ترمیزیی(٢٣٥٢)ئیخراجی كردووە.

بەچل ساڵ پێشتر دەچێتە بەهەشت و هەشیانە بەپێنجسەد ساڵ، زوو چوونە بەهەشتەوە بەو بڕە دیاریکراوانەوە پەیوەست نییە، بەڵکو زیاد و کەمیش ئەکات.

ئەبو داوود لەسوونەنەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەوە، ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"أن أول الأمة دخولاً إلى الجنة أبو بكر الصديق رضي الله عنه"[1]،واتا:یەکەمین کەسێکی ئوممەت بچێتە بەهەشتەوە ئەبو بەکری صدیقە(خوای لێ رازیی بێ).

روونە ماوەی چوونی بۆ بەهەشت لەگەڵ ماوەی برا مەهاجیرە هەژارەکانیدا درێژە ناکێشێ، بەڵکو درێژترین ماوە، ماوەی چوونی ئەوە بۆ بەهەشت لەگەڵ کۆتا کەسێك کە دەچێتە بەهەشتەوە.

پێشەوا ئەحمەد لەموسنەدەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەیەکی عبداللەی کوڕی عەمرەوە(خوای لێ رازیی بێ)، ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی:"هَلْ تَدْرُونَ أَوَّلَ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ؟» ، قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ يُتَّقَى بِهِمُ الْمَكَارِهُ، يَمُوتُ أَحَدُهُمْ وَحَاجَتُهُ فِي صَدْرِهِ لَا يَسْتَطِيعُ لَهَا قَضَاءً. تَقُولُ الْمَلَائِكَةُ: رَبَّنَا، نَحْنُ مَلَائِكَتُكَ وَخَزَنَتُكَ وَسُكَّانُ سَمَوَاتِكَ، لاَ تُدْخِلْهُمُ الجَنَّةَ قَبْلَنَا. فَيَقُولُ: عِبَادِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا، تُتَّقَى بِهِمُ الْمَكَارِهُ، يَمُوتُ أَحَدُهُمْ وَحَاجَتُهُ فِي صَدْرِهِ لَمْ يَسْتَطِعْ لَهَا قَضَاءً. فَعِنْدَ ذَلِكَ تَدْخُلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ مِنْ كُلِّ بَابٍ: {سَلَامٌ عَلَيْكُمْ بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ *} "[2]،واتا:

---

[1] - لاوازە، ئەبو داوود(٤٦٥٢) ئیخراجی کردووە.

[2] - صەحیحە، ئەحمەد(٢/ ١٦٨) و بەزار(٢٦٦٥) و تەبەرانیی لە المعجم الكبير(١٣/ ١٥١) و ئەبو نەعیم لە الحلية(١/ ٣٤٧) ئیخراجیان کردووە.

ئایــه دەزانــن یەکــەمین کەســێك دەچــێتە بەهەشــتەوە کێیــە؟ وتیــان: خــواو پەیامبەرەکەی دەزانن. فـەرمووی: هــەژارانی موهـاجیرین کـه ناخۆشـیی زۆریـان بەسەردا هاتووە، لێیـان هەیـە دەمـرێ و پێداویسـتییەکەی لـەدڵ و سـنگیدایە و ناتوانێ بەجێیبهێنێ. فریشتەکان ئەڵێن: ئـەی پـەروەردگارمان، ئێمـه فریشـتەی تۆ و سەرپەرشتیارانی بەهەشـت و دۆزەخ و دانیشـتوانی ئاسمـانی تـۆین، ئـەوان پـێش ئێمـه مەخـەرە بەهەشـتەوە. پـەروەردگاریش ئەفـەرمووێ: ئەوانـه بەنـدە گەلێکی منن کە هیچ شتێکیان بۆ من نەکردووە بەهاوبەش، ناخۆشی و سەختیی تاقەت و توانای لێیان بڕی و پێداویسـتی و حـەزەکانیان لەدڵـدا بـوو نـەیانتوانی بەجێیبهێنن. ئەوکات فریشتەکان لەهەموو دەرگاکانی بەهەشتەوە دەچـنە لایـان و سەلامیان لێ دەکەن و ئەڵێن: سەلامتان لێ بەهۆی ئەوەی ئارامتان گرت، ئـای چەند چاك و باشە سەرەنجامی ئەو ئارامگرتنەی دونیاتان.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: حوسەینی کوڕی موحەممـەد بـۆی باسـکردین، دوەیـد بۆی باسـکردین، ئـەویش لەسـەلەمی کـوڕی بەشـیرەوە، ئـەویش لەعیکرەمـەوە، ئـەویش لـەئیبن عەباســەوە(خوای گــەورە لــەخۆی و بــاوکی رازیــی بــێ) ئــەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:"الْتَقَى مُؤْمِنَـانِ عَلَـى بَـابِ الْجَنَّـةِ، مُؤْمِنٌ غَنِيٌّ، وَمُؤْمِنٌ فَقِيرٌ، كَانَا فِي الدُّنْيَا، فَأُدْخِلَ الْفَقِـيرُ الْجَنَّـةَ، وَحُـبِسَ الْغَنِـيُّ مَـا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يُحْبَسَ، ثُمَّ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ، فَلَقِيَهُ الْفَقِيرُ، فَيَقُولُ: أَيْ أَخِي، مَاذَا حَبَسَكَ؟ وَاللَّهِ لَقَدِ احْتُبِسْتَ حَتَّى خِفْتُ عَلَيْكَ. فَيَقُولُ: أَيْ أَخِي، إِنِّي حُبِسْتُ بَعْدَكَ مَحْبِسًـا فَظِيعًا كَرِيهًا، وَمَا وَصَلْتُ إِلَيْكَ حَتَّى سَالَ مِنِّي مِـنَ الْعَـرَقِ مَـا لَـوْ وَرَدَهُ أَلْـفُ بَعِـيرٍ، كُلُّهَـا آكِلَـةُ حَمْـضٍ، لَصَـدَرَتْ عَنْـهُ رِوَاءً "[1]،واتـا: لەبـەر دەرگـای بەهەشـت دوو بـاوەڕدار بەیـەك دەگـەن، لـەدونیادا یـەکێکیان دەوڵەمـەندو ئـەوی تریـان هـەژار

---

[1] - لاوازە، ئەحمەد لە المسند(١/ ٣٠٤) ئیخراجی کردووە.

بووه، هەژارەكە دەخرێتە بەهەشتەوە، ئەوی تر تاوەكو خوای گەورە بیەوێ گل دەدرێتەوەو رادەگیردرێت، پاشان دەخرێتە بەهەشتەوە، هەژارەكە پێی دەگات و ئەڵێ: ئەی برا گیان چی تۆی راگرت و گلی دایتەوە؟ سوێند بەخوا لەپاشەرۆژت ترسام!؟ ئەویش ئەڵێ: ئای برا گیان لەدوای تۆ خراپ و ترسناك گلدرامەوە، كاتێ بەتۆ گەیشتم كە ئەوەندە عەرەقم لێ چۆڕا، گەر هەزار وشتری لەسەر كۆبكرابایەتەوە تێر ئاو دەبوون.

تەبەرانیی[1] لەموعجەمەكەیدا ئەڵێ: موحەممەدی كوڕی عبداللەی حەزرەمی و عەلیی كوڕی سەعیدی ئەلرازیی وتوویانە: عەلیی كوڕی بەهرام ئەلعەتار بۆی باسكردین، عەبدولمەلیكی كوڕی ئەبی كەریمە بۆی باسكردین، ئەویش لەسەورییەوە، ئەویش لەموحەممەدی كوڕی زەیدەوە، ئەویش لەئەبی حازمەوە، ئەویش لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ) وتی: گوێم لێبوو پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:" إن فقراء المؤمنين يدخلون الجنة قبل أغنيائهم بنصف يوم وذلك خمسمائة سنة"،واتا:هەژارانی باوەڕداران بەنیو رۆژ پێش دەوڵەمەندەكانیان دەچنە بەهەشتەوە، كە پێنجسەد ساڵی دونیا ئەكات. پیاوێك وتی:ئەی پەیامبەری خوا منیش لەهەژارانم؟ فەرمووی:"گەر بەیانیی شتێكت خوارد، ئێوارە گەڕایتەوە خواردنێكی تر هەیە، كە ئێوارە شتێكت خوارد خواردنێكت بۆ دەمێنێتەوە بۆ بەیانی؟"،وتی: بەڵێ، پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"لەوان نییت"، پیاوێكی تر هەڵساو وتی: ئەی من لەڕیزی ئەواندام ئەی پەیامبەری خوا؟ فەرمووی:"گوێت لێ بوو چیمان بەو وت؟ وتی:

---

[1] - الطبراني: سولەیمانی كوڕی ئەحمەدی ئەللەخمیی ئەلشامی، ساڵی(٢٦٠ك لەدایكبووەو ٣٦٠ك مردووە): فەرموودەناس و دانەرێكی بەناوبانگە.

بەڵێ، بەلاّم من بەو جۆرەی ئەو نیـیم. فەرمووی:"جگە لەو پۆشاکەی لەبەرتدایە، ئایە پۆشاکێکی ترت هەیە؟" وتی: بەڵێ، پەیامبەریش فەرمووی: لەوان نییت.

پیاوێکی تر هەڵساو وتی: ئەی من لەوانم ئەی پەیامبەری خوا؟ فەرمووی:"گوێت لێبوو چیم وت بەو دوو کەسەی پێشت تۆ؟" وتی: بەڵێ. فەرمووی:"هیچ قەرزێك شك دەبەی کە هەرکاتێ ویستت قەرزی بکەی؟" وتی: بەڵێ. فەرمووی:"تۆش لەوان نییت". پیاوێکی تر هەڵساو وتی: ئەی من لەوانم ئەی پەیامبەری خوا؟ فەرمووی:"گوێت لێبوو چیم بەوان وت؟" وتی: بەڵێ، فەرمووی:"توانای کارکردنت هەیە؟" وتی: بەڵێ. فەرمووی:"تۆش لەوان نییت". پێنجەمین کەس هەڵساو وتی: ئەی من لەوانم ئەی پەیامبەری خوا؟ فەرمووی:"گوێت لێبوو چیم بەوان وت؟" وتی: بەڵێ. فەرمووی:"ئایە ئێوارەو بەیانیی دەکەیتەوە لەپەروەردگارت رازییت؟" وتی: بەڵێ. فەرمووی:"کەوابوو تۆ لەوانی.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:«سَادَات الْمُؤمنِينَ فِي الْجنَّة من إِذا تغدى لم يجد عشَاء، وَإِذا اسْتقْرض لم يجد قرضا، وَلَيْسَ لَهُ فضل كسْوَة إِلَّا مَا يواريه، وَلم يقدر عَلَى أَن يكْتَسب مَا يُغْنِيه، يُمْسِي عَلَى ذَلِك وَيُصْبِح رَاضِيا عَن ربه {فَأُولَئِك مَعَ الَّذين أنعم الله عَلَيْهِم من النَّبِيين وَالصديقين وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا}»[1]،واتا:گەورەکانی باوەڕدارانی بەهەشت ئەوانەن، کە لەدونیادا ئێوارە دێت خواردنێك شك نابەن، کە خواردنێکیش بخۆن

[1] - لاوازە، ئەبو نەعیم لە الحلية(٧/ ٩٩و ١٠٠) ئیخراجی کردووە.

بۆ بەیانیی خواردنێکیان نییە، کە قەرزیش بکات قەرزی دەستناکەوێ، جگە ئەو بەرگەی لەبەریدایە بەرگێکی تری نییە، توانای کارێکی نییە بژێویی خۆی پێ دەستبخات، ئێوارە دەکاتەوە لەخوای گەورە رازییەو بەیانییش دەکاتەوە بەڕازیبوون لەخوای گەورە بەیانیی دەکاتەوە: ﴿ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَـٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ﴾ النساء: ٦٩، واتا: هەر کەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بکات جا ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن کە خوا بەهرەی ڕشتوە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان وە ئەوانە چ هاوڕێ و هاوەڵێکی چاکن.

تەبەرانیی ئەڵێ: ئەمە فەرموودەیەکی غەریبە لەفەرموودەی سوفیانی سەوریە ئەویش لەموحەممەدی کوڕی زەیدەوە، ئەوتریێ ئەلعەبدییەو تەنیا عەبدولمەلیك هێناوێتییەوە(تفرد به).

منیش ئەڵێم: ئەم موحەممەدە کە ئەلعەبدییە، کۆمەڵێك متمانەداریان داناوەو کۆمەڵێکیش بەلاواز، دارەقوتنیی وتوویەتی: بەهێز نییە. ئەبو حاتەم ئەڵێ: فەرموودەکانی باش و شیاون. ئیبن حیبان لەڕیزی متمانەداران باسیکردووە. ترمیزی و ئیبن ماجە لێیەوە گێڕاویانەتەوە. لەو چینەدا موحەممەدی کوڕی زەیدی ئەلشامیی هەیە کە لەئەبی سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە دەگێڕێتەوەو کەسێکی پەراوێزخراوە(متروك)، ئەترسین ئەمە ئەوە بێ کە سەوریی ڕەچەڵەکی باس نەکردووەو تەنیا وتراوە ئەلعەبدییە، خواش زاناترە.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم بۆی باسکردین، هیشامی ئەلدەستوائیی بۆی باسکردین، ئەویش لەیەحیای کوڕی ئەبی کەثیرەوە، ئەویش

لەعامری ئەلعەقیلییەوە ئەویش لەباوکییەوە، ئەویش لەئەبو هورەیرەوە(خـوای لێ رازیی بێ)وتوویەتی: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:

« عُرِضَ عَلَيَّ أَوَّلُ ثَلَاثَةٍ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَأَوَّلُ ثَلَاثَةٍ يَدْخُلُونَ النَّارَ فَأَمَّا أَوَّلُ ثَلَاثَةٍ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ فَالشَّهِيدُ، وَعَبْدٌ مملوك يشغله رق الدنيا عن طاعة ربه، وَفَقِيرٌ مُتَعَفِّفٌ ذُو عِيَالٍ، وَأَمَّا أَوَّلُ ثَلَاثَةٍ يَدْخُلُونَ النَّارَ فَسُلْطَانٌ مُسَلَّطٌ، وَذُو ثَرْوَةٍ مِنَ الْمَالِ لَمْ يُعْطِ حَقَّ مَالِهِ، وَفَقِيرٌ فَخُورٌ »[1]، واتـا: سـێ کەسم لەوانـە پیشـان درا پـێش هەمووان دەچنە بەهەشتەوە، سێ کەسی ئەوانەشم پیشان درا کە پـێش ئـەوانی تر دەچنە دۆزەخەوە، ئەو سێ کەسەی سـەرەتا دەچـنە بەهەشـتەوە ئەمانـەن: شەهیدو بەندەیەك كۆیلایەتیی دونیا لەبەرانبـەر گوێڕایـەڵیکردنی پەروەردگاریـدا سەرقاڵی کردبێ، هەژارێکی دەستپاکی خۆپـارێزی خـاوەن خێـزان و کەسـوکار. هەرچی ئەو سێ کەسەشە کە پێش ئەوانی تر دەچنە دۆزەخەوە:دەسەلاتدارێکی زۆرداری خۆسـەپێن و خـاوەن سـەروەتێك کـە مـافی سـەروەتەکەی نـەدات و هەژارێکی لووتبەرزە. ترمیزیی تەنیا ئـەو سێ کەسـەی بـاس کـردووە کـە پـێش ئەوانی تر دەچنە بەهەشتەوە.

وتوویانە: لەفەزڵی هـەژاردا بەسـە کـە تـەواوی بەهەشـتییەکان هـەژارەکانن و تـەواوی دۆزەخییـەکانیش دەوڵەمەنـدەکانن. پێشـەوا ئەحمـەد ئـەڵێ: عبداللـەی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبی شەیبە بۆی باسکردین، شەریك بـۆی باسـکردین، ئـەویش لەئـەبی ئیسـحاقەوە، ئـەویش لەسـائیبی کـوڕی مالیکـەوە، ئـەویش

[1] - لاوازە، ئەحمـەد (٢/ ٤٢٥ و ٤٧٩) و تەیالیسـی(٢٥٦٧) و حـاکم(١/ ٣٨٧) و ئـیبن خوزەیمـە(٢٢٤٩) ئیخراجیان کردووە.

لەعبداللـەی کـوڕی عـەمرەوە(خوای گـەورە لەهـەردووکیان رازیـی بـێ) ئـەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"اطَّلَعْتُ فِي الْجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الْفُقَرَاءَ، وَاطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ"[1]،واتا: بەهەشتم پیشان درا و بینـیم زۆربـەی بەهەشـتییەکان هـەژارەکانن، دۆزەخیشـم بینـی زۆربـەی خەڵکەکەی ئافرەتان بوون.

لەصەحیحی بوخاریدا هـاتووە لەئـەبی ئەلڕەجائـەوە ئـەڵێ: عیمرانـی کـوڕی ئەلحەصـین لای خێزانەکەیـەوە فەرموودەیـەکی پەیامبـەری خوا(صـلی الله علیـه وسـلم)ی هێنـا،وتی: وتی:گـوێم لێبـوو پەیامبـەری خوا(صـلی الله علیـه وسـلم) فەرمووی: «نَظَرْتُ فِي الْجَنَّةِ، فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الْفُقَرَاءَ، ثُمَّ نَظَرْتُ فِي النَّارِ، فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ»،واتا: روانیمە بەهەشـت و بینـیم زۆربـەی خـەڵکانی بەهەشـت هەژارەکانن، روانیمە دۆزەخ و بینیم زۆربەی خەڵکەکەی ئافرەتانن[2].

لەصەحیحەیندا فەرموودەیەکی ئوسامەی کوڕی زەید هاتووە: کە پەیامبـەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:" قُمْتُ عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ، فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا الْمَسَاكِينُ، وَقُمْتُ عَلَى بَابِ النَّارِ، فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ يَدْخُلُهَا النِّسَاءُ "[3]،واتـا: لەبـەر دەرگـای بەهەشـت وەسـتام و بینـیم، تـەواوی ئەوانـەی دەچـنە ناویـەوە هەژارەکانن، لەبەر دەرگای دۆزەخیش وەستام، بینـیم تـەواوی ئەوانـەی دەچـنە ناویەوە ئافرەتانن.

---

[1] - لاوازە، ئەحمەد(٢/ ١٧٣) ئیخراجی کردووە.

[2] - بوخاری(٣٢٤١) ئیخراجی کردووە.

[3] - بوخاری(٥١٩٦) و موسلیم(٢٧٣٦) ئیخراجیان کردووە.

لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە لەئیبن عباسەوە: کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیـه وسـلم) تەماشـای دۆزەخـی کـردووەو بینیـوێتی زۆربـەی خەڵکەکـەی ئافرەتـانن، تەماشـای بەهەشتیشـی کـردووەو بینیـوێتی زۆربـەی خەڵکەکـەی هەژارانن.

وتوویانە: ئەوە بەسە بۆ هەژاریی ببێتە فەزڵ و گەورەیی کە لەڕۆژی قیامەتدا هەموو دەوڵەمەندەکان خۆزگە دەخوازن لەدونیادا هەژاربوونایە.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: عبداللەی کوڕی نومەیر بـۆی باسـکردین، ئیسـماعیل- واتا ئیبن ئەبی خالید- بۆی باسکردین، ئەویش لەنوفەیعەوە، ئەویش لەئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە(خوای لـێ رازیـی بـێ) وتی:پەیامبـەری خوا(صـلی الله علیـه وسلم)فەرمووی:"مَا مِنْ أحَدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ غَنِيٍّ وَلَا فَقِيرٍ، إِلَّا وَدَّ أَنَّمَا كَانَ أُوتِـيَ مِـنَ الدُّنْيَا قُوتاً"[1]،واتا:لەڕۆژی قیامەتدا هەموو دەوڵەمەندو هەژارێك خۆزگە دەخوازێ لـەدونیادا پـارووە نانێك(تووێشـوویەك)ی نەبووایـە. بوخـاریی ئـەڵێ: لـەبارەی نوفەیعەوە قسە ئەکەن و شیاوە ئەوەی لەبارەیەوە وتراوە.

وتوویانـە: پەیامبـەری خوا(صـلی الله علیـه وسـلم) لـەزیاتر لەفەرموودەیـەك راشـکاوانە باسـی فەزڵـدانی هـەژارانی کـردووە، لەوانـە پێشـتر باسمـانکرد لەفەرموودەکەی سەهلی کوڕی سەعد. پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: ئەبو موعاویە بۆی باسکردین، ئەعمەش بۆی باسکردین، ئەویش لەزەیدی کوڕی وەهبـەوە، ئـەویش لەئـەبو زەڕەوە(خـوای لـێ رازیـی بـێ) ئـەڵێ: پەیامبـەری خوا(صـلی الله علیـه وسلم)فەرمووی: "یا أبا ذر، ارفع بصرك فانظر أرفع رجل تراه فی المسـجد، قـال

[1] - مەوزوعە، ئیبن ماجە(٤١٤٠) و ئەحمەد(٣/ ١١٧و ١٦٧)، نوفـەیعی کـوڕی ئـەلحاریثـی تێدایـە بـەدرۆزن تۆمەتبارە.

فنظرت فإذا رجل جالس عليه حلة له، قال: فقلت: هذا، قال: فقال: يا أبا ذر ارفع بصرك فانظر أوضع رجل تراه في المسجد" قال: فنظرت فاذا رجل ضعيف عليه أخلاق. قال: فقلت: هذا، قال: فقال: رسول الله والذى نفسى بيده لهذا أفضل عند الله يوم القيامة من قرابِ الارض من هذا"[1]،واتا: ئەی ئەبا زەڕ بەچاو بڕوانەو بڕوانە مزگەوت پیاوێك دەبینی، منیش روانیم وا لەنێو مزگەوتدا پیاوێك دانیشتووە بەرگێكی گرانبەهای لەبەرە، وتم: بەڵێ ئەوە ئەو پیاوەیە، فەرموو: پیاوێكی هەژارو داماو(ئاست نزم) ئەبینی لەنێو مزگەوتەكەدا. ئەڵێ: روانیم پیاوێكی لاوازی بەرگ دڕاوی لێیە، وتم: ئا ئەوە ئەو پیاوەیە. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە، بەلای خوای گەورەوە ئەو هەژارە بەئەندازەی زەویی لەو دەوڵەمەندە باشترە.

ئەڵێ: وەكیع بۆی باسكردین زائیدەش لەگەڵیدا یەكدەنگ بوو، ئەعمەش بۆی باسكردین، ئەویش لەسولەیمانی كوڕی موسهیرەوە، ئەویش لەخەرشەی كوڕی ئەلحوڕەوە، ئەویش لەئەبو زەڕەوە، باسیكردووەو وتی:"بەلای خوای گەورەوە، ئەو هەژارە پڕ بەدونیا لەو دەوڵەمەندە باشترە".

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: ئەبو موعاویە بۆی باسكردین و یەعلاش یەكدەنگی بووە، ئەڵێ: ئەعمەش بۆی باسكردین، ئەویش لەزەیدی كوڕی وەهبەوە، ئەویش لەئەبو زەڕەوە كە باسیكردووە[2].

---

[1] - ئەحمەد لە الزهد(لا٢٧- ٢٨) ئیخراجی كردووە.

[2] - ئەحمەد لە الزهد(لا٣٦) و ئیبن حیبان (٦٨١) و ئەلبەزار(٢٦٢٩) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٨/ ١١٥) ئیخراجیان كردووە.

وتوویانــە: ئــەوەی لــەم بابەتــەدا نێوانمــان یەکلادەکاتــەوەو وەڵامــی دڵئارامکەرمان پـێ دەدات:ئەوەیە هەزاریی پاداشت و پلەی هەزار لای خوای گەورە بەرزو فراوان دەکاتەوە، دەوڵەمەندیش گەر سوپاسگوزاریش بوو، هەر دەوڵەمەندییەك لەدونیادا هەیبووبێ،ئەوە لەسەر پاداشتدانەوەشی لێپرسینەوە دەکرێت لەڕۆژی قیامەتدا با بەباشترین شێوەش مافی خۆی پێ دابێ، چونکە کەمترین فەزڵێکی دونیا زۆرترین فەزڵی ئاخیرەت کەم دەکاتەوە.

لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە لەفەرموودەیەکی عبداللەی کوڕی عەمرەوە: کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی:"ما من غازیة تغزو في سبیل الله، فیصیبون الغنیمة، إلا تعجلوا ثلثي أجرهم من الآخرة ویبقی لهم الثلث. وان لم یصیبوا غنیمة تم لهم أجرهم"[1]،واتا: هەر یەکێك لەپێناو خوای گەورەدا جیهاد بکات و دەسکەوتی تالآنیی هەبێ، ئەوە دوو لەسەر سێی پاداشتی جیهادەکەی لەدونیادا وەردەگرێ و یەك لەسەر سێی بۆ ئاخیرەتی دەمێنێتەوە، هەرکەسێك دەسکەوتی نەبێ، ئەوە تەواوی پاداشتەکەی بۆ ئاخیرەت دەمێنێتەوە.

لەصەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەی خەبابی کوڕی ئەرەتەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم) لەبەر خوای گەورە کۆچمان کرد و پاداشتمان کەوتەلای خوای گەورە، تیاماندا هەبوو مردو لەهیچ شتێکی ئەو پاداشتەی نەخوارد، لەوانە موسعەبی کوڕی عومەیر بوو(خوای لێ رازیی بێ) کە لەڕۆژی ئوحوددا کوژراو عەبایەکی لەدوای خۆی بەجێهێشت، کە سەرمان پێ دادەپۆشی هەردوو قاچی بەدەردەکەوت، کە هەردوو قاچیمان پێ دادەپۆشی سەری بەدەردەکەوت، بۆیە پەیامبەری

[1] - موسلیم(١٩٠٦) ئیخراجی کردووە.

خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمانی پێ داین سەری دابپۆشین، ناچاربووین هەردوو قاچی بەگژوگیا دابپۆشین. هەندێکیشمان لێ مایەوە بەرووبوومی دونیای پێگەیشت و خۆشگوزەرانیی دونیای بەڕوودا کرایەوە[1].

لەصەحیحەیندا هاتووە: لەقەیسی کوڕی ئەبی حازمەوە وتی: چووینە سەردانی خەباب نەخۆش بوو، حەوت داخ کرابوو، وتی: ئەو هاوەڵانەمان کە پێش ئێمە ڕۆیشتن دونیا هیچ لەپاداشتیانی کەم نەکرد......فەرموودەکەی باسکردووە[2].

سەعیدی کوڕی مەنسور ئەڵێ: موعاویە بۆی باسکردین، ئەویش لەئەعمەشەوە، ئەویش لەموجاهیدەوە، ئەویش لەئیبن عومەرەوە(خوا لەخۆی و باوکیشی ڕازیی بێ) وتی:"هەر بەندەیەك لەدونیادا شتێکی پێ بدرێ، ئەوە لەپلەو پایەی لای خوای کەمدەبێتەوە، ئەگەرچی بەلای خوای گەورەشەوە بەڕێزبێ"[3].

لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە لەئیبراهیمی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە، وتی:"خواردنێك بۆ عەبدولڕەحمان هێنرا کە بەڕۆژووبوو، وتی: موسعەبی کوڕی عومەیر کوژرا کە لەمن باشتر بوو، لەنێو عەبایەکدا(بوردە) کفنکرا: کە سەری دادەپۆشرا هەردوو قاچی بەدەرەوە ئەمایەوە، کە هەردوو قاچی دادەپۆشرا سەری بەدەرەوە ئەمایەوە. حەمزە(خوای لێ ڕازیی بێ)کوژرا کە لە من باشتر بوو، تەنیا عەبایەك هەبوو تیایدا کفنکرا، پاشان دونیامان

[1] - بوخاری(١٢٧٦) و موسلیم(٩٤٠) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٥٦٧٢) و موسلیم(٢٦٨١) ئیخراجیان کردووە.

[3] - ئەبو نەعیم لە الحلیة(١/ ٣٠٦) ئیخراجی کردووە.

بەڕوودا کرایەوە و پێمان درا وەك ئەوەی دەیبینین پێمان دراوە، ئەترسم چاکەکانمان لەژیانی دونیادا پێمان بدرێتەوە، پاشان گریاو دەستی لەخواردنەکە هەلگرت[1].

ئەبو سەعیدی کوڕی ئەلئەعرابیی ئەگێڕێتەوە: تەنیا عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و خەباب ئەوەیان نەوتووە، بەڵکو گەورە هاوەڵانی تری پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)ئەوەیان وتووە، حەزیان نەکردووە بەو خۆشگوزەرانییەی بۆیان هاتووەتە پێش و لێی ترساون، زانیوویانە ئەوەی خوای گەورە بۆ پەیامبەرەکەی هەڵیبژاردبوو باشتر بووەو ئەوەی ئەوان بۆی داخراون لەپاداشتی قیامەتیان کەم دەکاتەوە، لەوانە: ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان و عەلی و ئەبو عوبەیدەو عەماری کوڕی یاسر و سەلمان و عبداللەی کوڕی مەسعودو عائیشەی دایکی ئیمانداران و ئەبو هاشمی کوڕی عوتبەو کۆمەڵێکی تر کە ناومان نەهێناون، چونکە ژمارەیان زۆرەوە(خوای گەورە لەهەموویان رازیی بێ).

هەرچی ئەبو بەکری سدیقە(خوای لێ رازیی بێ)، ئەوە ئیبن ئەبی ئەلدونیایە بۆمان دەگێڕێتەوە ئەڵێ، عەبدولڕەحمانی کوڕی رەبیانی تائیی بۆی گێڕاینەوە، عەبدولصەمەدی کوڕی عەبدولواریث بۆی گێڕاینەوە، عەبدولواحیدی کوڕی زەید بۆی گێڕاینەوە، ئەسلەم بۆی گێڕاینەوە، ئەویش لەمورەوە، ئەویش لەکوڕی ئەرقەمەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: لەگەڵ ئەبو بەکری سدیقدا بووین(خوای لێ رازیی بێ)داوای خواردنەوەیەکی کرد، ئاو و هەنگوینی بۆ هێنرا، کە لەدەمی نزیکخستەوە گریاو گریا تاوەکو هاوەڵەکانیشی گریان، ئینجا کە وازی لەگریان

---

[1] - بوخاری(٤٠٤٥) ئیخراجی کردووە.

هێنا ئەوانیش بێدەنگبوون، پاشان دەستی کردەوە بەگریان و تاوەهایان گومان کرد نەتوانن هۆی ئەو گریانەی لێ بپرسن، ئەڵێ: پاشان هەردوو چاوی سڕی و وتیان:ئەی جێنشینی پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) چی شتێك تۆی خستە گریان؟ وتی: لەگەڵ پەیامبەری خوادا بووم(صلی الله علیە وسلم) بینیم شتێك لەخۆی دوور دەخاتەوە کەسیشی لەگەڵدا نەبوو، وتم: ئەی پەیامبەری خوا ئەوە چی شتێك لەخۆت دووردەخەیتەوە؟ پەیامبەریش فەرمووی:«هَذِهِ الدُّنْيَا مُثِّلَتْ لِي، فَقُلْتُ لَهَا إِلَيْكِ عَنِّي، ثُمَّ رَجَعَتْ فَقَالَتْ: إِنْ أَفْلَتَّ مِنِّي، فَلَنْ يَنْفَلِتَ مِنِّي مَنْ بَعْدَكَ»[1]،واتا:دونیا لەشێوەی مرۆڤێکدا خۆی بۆم نواند، منیش پێموت: لێم دوورکەوە، پاشان گەڕایەوەو وتی: ئەگەر تۆ لەدەستم دەرچووی، ئەوە ئەوانەی دوای خۆت لەدەستم دەرناچن.

لەیثی کوڕی سەعد باسدەکات لەساڵحی کوڕی کیسانەوە، ئەویش لەحەمیدی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە، ئەویش لەباوکییەوە: کە ئەبو بەکری سدیق(خوای لێ رازیی بێ) لەو نەخۆشییەی پێیەوە مردووە وتوویەتی: من کاروباری ئێوەم گرتەدەست و لەئێوە باشتر نەبووم و کەستان نەتانویست و فیزتان دەنواند بەڕێوەی ببەن، کە دونیام بینی هاتەپێش و هاتەپێش و قبوڵ نەکرا تاوەکو تەخت و پەردەی ئاورێشمیی بەکاربهێنن، تائەوەی لەپاڵدانەوەتان لەسەر جێگەی خوریین ئازارتان دەبینی هەروەك چۆن لەپاڵدانەوە لەسەر دڕك

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(١١)و، بەیهەقیی لە شعب الإیمان(١٥٠١٨) و حاکم(٤/ ٣٠٩) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(١/ ٣٠) ئیخراجیان کردووە.

ئازار ببینن، پاشان ئێوه یەکەم کەس ئەبن لەوێڵکردنی خەڵکدا، بەڕاست و چەپدا بڵاوەیان دەکەن. سوێند بەخوا گەر یەکێك لەئێوه لەگەردنی بدرێ کە لێدانی حەددی شەرعیی نەبێ، بۆی باشترە لەوەی رۆبچێتە خۆشییەکانی دونیاوه[1].

موحەممەدی کوڕی عەتائی کوڕی خەباب ئەڵێ: لەگەڵ ئەبو بەکردا دانیشتبووم، باڵندەیەکی بینی و وتی: خۆشبەختیی بۆ خۆت ئەی باڵندە، لەم درەختە دەخۆیت و پاشان ریقنە دەکەی و پاشان نابیتە هیچ و هیچ لێپرسینەوەیەکیشت لەسەر نییە، خۆزگە من لەجێگەی تۆ دەبووم[2]. منیش پێموت: ئەوە تۆ ئەوە ئەڵێی لەکاتێکدا هاوڕێی پەیامبەری خوای(صلى الله عليه وسلم)؟!.

هەرچی عومەری کوڕی خەتابە(خوای لێ رازیی بێ)، کە گەنجینەکانی کیسرای بۆ هێنرا گریا، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف پێیووت: چی شتێك تۆی خستە گریان ئەی ئەمیری ئیمانداران؟ سوێند بەخوا ئەمڕۆ رۆژی سوپاسگوزاری و خۆشییە؟! عومەر وتی: ئەمە بە هەر قەومێك درابێ، خوای گەورە دوژمنایەتی و رق و کینەی خستووەتە نێوانیانەوە[3].

---

[1] - لاوازە، تەبەرانیی لە المعجم الكبير(١/ ٦٢/ ٤٣) و ئەبو نەعیم لە الحلية(١/ ٣٤) ئیخراجیان کردووە، عەلوانی کوڕی داوودی ئەلبەجەلیی تێدایە کەسێکی لاوازە.

[2] - بەیهەقیی لە شعب الإيمان(٣/ ٧٦- ٧٧) و ئیبن ئەلموبارەك لە الزهد(٢٤٠) ئیخراجیان کردووە.

[3] - عبداللەی کوڕی ئەحمەد لە زوائد الزهد(لا١٤٣) ئیخراجی کردووە.

ئەبو سینانی ئەلدوئەلیی دێتە ژوورەوە بۆلای کە هەندێ لەموهاجیرینی لا بووە، عومەر دەنێرێ بەدوای سەبەتەیەکدا[1] کە لەقەلآیەکی عێراقەوە هێنرابوو، ئەلقەیەکی تێدا بووە، یەکێك لەمندالەکانی هەلیدەگرێ و ئەیخاتە دەمی، عومەر لێی دەستێنێ و پاشان گریا، ئەوانەی لای بوون پێیانووت: بۆ دەگریی وا خوای گەورە ئەو ولآتەی بۆ فەتحکردی و سەریخستی و دلئارامی کردی؟ ئەویش وتی: گوێم لەپەیامبەری خوابوو(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"لَا تُفْتَحُ الدُّنْيَا عَلَى أَحَدٍ إِلَّا أَلْقَى اللَّهُ بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ"،واتا: خوای گەورە دونیای بەڕووی هەر قەومێکدا کردبێتەوە، ئەوە تاوەکو ڕۆژی قیامەت دوژمنایەتی و ڕق و کینەی خستووەتە نێوانیانەوە" منیش لەوە دەترسێم و دلتەنگم[2].

ئەبو سەعید ئەلێ: لەکتێبێکدا دۆزیوومەتەوە کە بەخەتی خۆم نووسیوومە لەئەبی داوودەوە وتوویەتی:موحەممەدی کوڕی عوبەید بۆی باسکردین، حەماد بۆی باسکردین، یونس بۆی باسکردین، ئەویش لەئەلحەسەنەوە: کە عومەری کوڕی خەتاب(خوای لێ ڕازیی بێ) لەشەڕی کیسرادا کلاوێکی هێنرایە بەردەم، لەنێو ئەو خەلکەی لەوێدابوون سوراقەی کوڕی مالیك هەبوو، بازنەکانی کیسرای خستەبەردەم سوراقەو خستیە دەست سوراقەو نزیکی شانی سوراقە بووەوە، کە لەهەردوو دەستی سوراقەدا بازنەکانی بینی وتی: سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە وا بازنەکانی کیسرای کوڕی هورمز لەدەستی سوراقەی کوڕی

[1] - سفط: سەبەتە یان شتێکە عەترو گولاو کەرەستەی جوانکاری و خشلی ئافرەتانی تێدایە.

[2] - لاوازە، ئەحمەد(١/ ١٦) ئیخراجی کردووە، ئیبن لەهیعەی تێدایە کەسێکی لاوازە، هەروەها موحەممەدی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی لەبیبەش لاوازە.

مالیکی کوڕی جەعشەمی ئەعرابییەکی نەوەی مودلەج دایە. پاشان وتی: خوایە گیان خۆت پەیامبەری خۆتت فێر کرد کە هەر سەروەتێکی دەسکەوێ لەڕێی خۆت و بەندەکانتدا خەرجی بکات، بەهاوکاریی خۆت و سەرپشکییانە وەهات لێکرد چاو لەسەر دونیا لابدات، خوایە گیان پەنات پێ دەگرم ئەمە تاقیکردنەوەو بیانووی خۆت بێ بۆ عومەر، پاشان وتی: ﴿ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾ المؤمنون: ٥٥ — ٥٦،[1] واتا: ئایا ئەوانە وا دەزانن ئەوەی پێ یان دەبەخشین لەسامان و منداڵان. بەهۆی(شیاویانەوە)چەسپانیمان کردووە بۆیان لەخێرو خۆشیەکاندا(نەخێر وانی یە) بەڵکو ئەوانە هەست ناکەن(کە بۆ تاقی کردنەوە)یانە.

مەبەست ئەوەیە: خۆشگوزەرانی و کرانەوەی دونیا بەڕووی مرۆڤدا، خێراکردنە لەپێدانی پاداشتی ئاخیرەت و کەمبوونەوەو بەرتەسکبوونەوەی خۆشییەکانێتی. عەبدولڕەزاق ئەڵێ: موعەمەر هەواڵی پێداین، ئەویش لەزوهەرییەوە، ئەویش لەئیبن ئەبی صوعەیرەوە، ئەویش لەجابری کوڕی عبداللهوە(خوا لەخۆی و باوکی رازیی بێ) وتی: کە لەڕۆژی ئوحوددا پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەسەر ئەو شەهیدانەدا سووڕایەوە کە ئەو رۆژە کوژرابوون، فەرمووی: "إني شهيدٌ على هؤلاء فَزَمِّلوهم بدمائهم"[2]،واتا: من شایەتی ئەوانەم، بۆیە بەخوێنەکانیانەوە دایانپۆشن. موعەمەر ئەڵێ: لەبیستن و گوێی ئەلحەسەنەوە هەواڵی پێ دراوە وتوویەتی: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه

---

[1] - بەیهەقیی لە دلائل النبوة(٦/ ٣٢٥)ئیخراجی کردووە.

[2] - صەحیحە، عەبدولڕەزاق(١٦٣٣) و ئەحمەد(٥/ ٤٣١) و بەیهەقیی لە السنن الكبرى(٤/ ١١) ئیخراجیان کردووە.

وسلم) فەرموویەتی:"هؤلاء قد مضوا، وقد شهدت عليهم، لم يأكلوا من أجورهم شيئاً، وإنكم قد أكلتم من أجوركم، وإني لا أدري ما تحدثون بعدي"[1]،واتا: ئەوانە ڕۆیشتن و منیش شایەتم بۆیان، هیچ شتێکی پاداشتی کارەکانیان وەرنەگرت، بەڵام ئێوە پاداشتی کاری خۆتانتان خوارد، ناشزانم دوای من چی دەکەن.

ئیبن ئەلموبارەك ئەڵێ: جورەیری کوڕی حازم هەواڵی پێداین، وتی: گوێم لە ئەلحەسەن بوو ئەیووت: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ هاوەڵانی دەرچوو بۆلای بەقیعی غەرقەد و فەرمووی:" السلام عليكم يا أهل القبور، لو تعلمون ما نجاكم الله منه مما هو كائن بعدكم"،واتا: سەلامی خواتان لێ بێ ئەی خەڵکانی گۆڕستان، گەر دەزانن خوای گەورە لەچی شتێك رزگاری کردن کە بۆ خەڵکانی دوای ئێوە هاتووەتەپێش. پاشان لای کردەوە بەلای هاوەڵانیداو فەرمووی:"هؤلاء خير منكم"، واتا: ئەوانە لەئێوە باشترن. هاوەڵانیش وتیان: ئەی پەیامبەری خوا، ئەوانە برای ئێمەن، وەك ئەوان موسڵمانبووین و وەك ئەوان کۆچمان کردو وەك ئەوان جیهادمان کرد، کاتی مردنیان هات و مردن و ئێمە جارێك کاتی مردنمان نەهاتووە، ئەوە چی شتێکە وەهای کردووە لەئێمە باشترین؟ فەرمووی:"إن هؤلاء خرجوا من الدنيا، ولم يأكلوا من أجورهم شيئاً، وخرجوا وأنا شهيد عليهم، وأنتم قد أكلتم من أجوركم، ولا أدري ما تحدثون بعدي"،واتا: ئەوان لەدونیا دەرچوون و لەپاداشتی کارەکانیان هیچیان نەخوارد، بەو جۆرە لەدونیا دەرچوون و منیش بۆ ئەوە شایەتم، بەڵام ئێوە لەپاداشتی کاری خۆتانان خواردووە و ناشزانم دوای من چی دەکەن. ئەڵێ: کە ئەوەیان لەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)گوێ لێبوو تێگەیشتن و سوودیان لێ

[1] - لاوازە، عەبدولڕەزاق(٦٦٣٤) ئیخراجی کردووە، لەڕشتەی گێڕانەوەدا پچڕان هەیە.

بینی و وتیان: سوێند بەخوا ئێمە لێپرسینەوە دەکرێین لەسەر ئەوەی دوای ئەوان لەدونیادا دەستمان کەوت و لەپاداشتەکانمانی کەمکردووەتەوە، بۆیە حەلاَڵیان خواردو بۆ خوا بەخشییان و چاکەیان پێشخست[1].

عبداللەی کوڕی موبارەك ئەڵێ: ئەم فەرموودەیەم بۆ باوکم خوێندەوە کە هاتووە: ئەسوەدی کوڕی عامر بۆی باسکردین، ئیسرائیل بۆی باسکردین، ئەویش لەثوەیرەوە، ئەویش لەموجاهیدەوە، ئەویش لەئیبن عومەرەوە وتی:"هەر بەندەیەك لەدونیادا شتێکی پێ بدرێ، ئەوە لەپلەو پایەی لای خوا کەمدەبێتەوە"[2].

وتوویانە: گەورە دەوڵەمەندەکان راشکاوانە وتوویانە:بەناخۆشیی تاقیکراونەتەوە ئارامیان گرتووە، بەلاَم کە بەخۆشیی تاقیکراونەتەوە ئارامیان نەگرتووە، ئەمە عەبدولڕەحمان و کەسانی تریش وتوویانە، بەڕاستخستنەوەی ئەوەیە کە موسعەبی کوڕی سەعد ئەویش لەباوکییەوە گێڕاویەتییەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"لأَنَا مِنْ فِتْنَةِ السَّرَّاءِ أَخْوَفُ عَلَيْكُمْ مِنْ فِتْنَةِ الضَّرَّاءِ إِنَّكُمُ ابْتُلِيتُمْ بِفِتْنَةِ الضَّرَّاءِ فَصَبَرْتُمْ، وَإِنَّ الدُّنْيَا حُلْوَةٌ خَضْرَاءُ"[3]،واتا:زیاتر لەفیتنەی هەژاری و ناخۆشیی،لەفیتنەی دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانیی لەئێوە دەترسێم، بەناخۆشیی تاقیکرانەوە ئارامتان گرت، بێگومان دونیا چێژو بەرو میوەیەکی خۆش و راکێشەرە.

---

[1] - لاوازە، ئیبن ئەلموبارەك لە الزهد(٤٩٨) ئیخراجی کردووە، مورسەلە.

[2] - پێشتر تەخریج کراوە.

[3] - لاوازە، ئەبو نەعیم لە الحلية(١/ ٩٣) و ئەبو یەعلا(٧٨٠) و بەیهەقیی لە الشعب(١٠٣٠٨) ئیخراجیان کردووەو کەسی نەناسراوی تێدایە.

وتوویانــه: لێــرەدا دوو باســی راســت هەیــە و بــەو دووانــە فــەزڵ و باشــتر ڕووندەبێتەوە، یەکێکیان: ئەوانەی لـەدونیادا زۆریـان هـەبێ لەقیامەتـدا کـەمیان هەیە،پێشتریش ئەوەندە بەڵگەمان هێنایەوە کە بەس بن. هەرچـی دووەمیشـە: لەصەحیحەیندا فەرموودەیەکی ئـەبو زەڕ(خـوای لـێ رازیـی بـێ) هـاتووە ئـەڵێ: لەیەکێك لەشەوەکاندا دەرچـووم، بینـیم پەیامبـەری خوا(صـلی الله علیـه وسـلم) بەتـەنیا دەگـەڕێ و هـیچ مرۆڤێکـی لەگەڵـدا نییـە، لـەژێر رۆشـنایی مانگـدا رێـم دەکــرد، پەیامبـــەری خوا(صـــلی الله علیـــه وســـلم)لایکردەوە منـــی بینـــی و فەرمووی:"ئـەوە کێیـە؟"، وتم: ئـەبو زەڕم خـوای گـەورە بەفیـدای تـۆم بکـات، فەرموی:"ئـــەی ئـــەبا زەڕ وەرە"بـــۆ کاتـــژمێرێك لەگەڵێـــدا ســـووڕامەوە و فەرمووی:«إِنَّ الْمُكْثِرِينَ هُمُ الْمُقِلُّونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِلَّا مَنْ أَعْطَاهُ الله خيرا فنفخ فيـه عن يمينه وشماله وبـين يديـه ووراءه وَعَمِـلَ فِيـهِ خَيْـرًا»،واتا:ئەوانـەی لـەدونیادا سەروەتی زۆر کۆدەکەنەوە، لەقیامەتدا کەمیان هەیە تەنیا ئەو کەسـە نـەبێ کـە خــوای گــەورە چــاکەی پــێ داوە، بەڕاســت و چــەپ و پــێش و پاشــدا فــووی پێداکردووەو بەچاکە کاری تێدا کردووە....فەرموودەکەی باسکرد[1].

وتوویانە: گەر دەوڵەمەندیی فەزڵی بەسەر هەژارییـەوە هەبووایە،ئـەوە خـوای گەورە پەیامبـەری خـۆی هـان نـەدەدا بـێ نیـاز بـێ بەرانبـەر دونیـاو پشـتی لـێ هەڵبکات و سەرزەنشتی ئەوانەی نەدەکرد کە بـۆ دەستخسـتنی دونیـا پێـداگریی ئەکـەن و حـەزیان لێـی هەیـە، بـەڵکو هـانی دا بـۆ دەستخسـتنی ئـەو فـەزڵ و چاکەکارییانەی کە بەندە لەڕووی زانست و کردارەوە پێی کامڵ ئەبێ.

---

[1] - بوخاری(٦٤٤٣) و موسلیم(٩٤)(٣٣) ئیخراجیان کردووە.

که خوای گەورە هاندانی دونیا نەویستیی کردووە، ئەوە دەسەلمێنێ کە دونیانەویستان و ئەوانەی بەبەشی کەم رازیین باشترینی نێو مرۆڤەکانن. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەواڵی داوەو فەرموویەتی:«لَوْ أَنَّ الدُّنْيَا تَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بعوضة لما سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ»[1]،واتا: ئەگەر دونیا لای خوای گەورە کێش و سەنگی باڵە مێشوولەیەکی هەبووایە، ئەوە نەیدەهێشت مرۆڤی بێباوەڕ قوومە ئاوێکی لێ بخواتەوە. هەواڵیشی داوە کە دونیا بەلای خوای گەورەوە لەلاکی مردارەوە بوو سووك و بێ نرخترە[2]، هەروەها نمونەی دونیا بەرانبەر بەئاخیرەت، بەئەندازەی پەنجەیەکە بخرێتە دەریاوە کە چی هەڵدەگرێتەوە[3]، دونیاو هەموو ئەوەی تیایدا نەفرەت لێکراوە جگە لەیادی خواو ئەوەی پەیوەندیی بەوەوە هەبێ و زاناو فێرخوازێك[4]، دونیا بەندیخانەی باوەڕداران و بەهەشتی بێباوەڕانە[5].

فەرمانی بە بەندە داوە لەدونیادا وەك کەسێکی غەریب یان رێبوارێك بێ و خۆی بەخەڵکی گۆڕستان دابنێ و خۆی بۆ ئەو شوێنە ئامادە بکات، کە بەیانیی کردەوە چاوەڕێی ئێوارە نەبێ، کە ئێوارەی کردەوە چاوەڕێی بەیانیی نەبێ[6]. نەهی لێکردووە شتێك لەخۆبگرێ کە حەزی پێ دەکات و نەفرەتی کردووە

[1] - صحيح لغيره، ترميزى(٢٣٢٠) و ئيبن ماجه(٤١١٠) و ئەحمەد(١/ ٣٩١) ئیخراجیان کردووە.

[2] - پێشتر تەخریج کرا.

[3] - پێشتر تەخریج کرا.

[4] - پێشتر تەخریج کرا.

[5] - پێشتر تەخریج کرا.

[6] - پێشتر تەخریج کرا.

لەبەنـدەی دینـارو درهـەم و ئـەو بەندەیـەی بـە بەدبـەخت و تێکشـکاو لـەدژی پاراوەتەوە و لێنەبووردن لەهەڵەو ساتمەبردن[1].

هەواڵی داوە کە دونیـا سرنجڕاکێشـە، فـەرمانی داوە خۆمـانی لـێ بپـارێزین و لێی بەئاگابین هەروەك چۆن لەئافرەت خۆت دەپارێزی و لێیان وریایی دەکریَ[2].

هـەواڵی داوە، کـە پێـداگرییکردن لەسـەر دونیـاو سـەرۆکایەتی و پۆسـت و پایەداریی، ئایینـداریی مـرۆڤ دەشـێوێنن و خـراپ دەکـەن بەنمونـەی وێرانکـاریی گـورگ گـەلێکی زیانـدەر کـە کەوتبنـە نێـو رانـە مـەڕەوە، یـان خـراپتر لـەوە ئایینداریی کاول دەکەن[3].

هەروەك هەواڵیشی داوە بـەوەی، لـەدونیادا وەك ڕێبوارێکـەو لـەژێر سـێبەری درەختێکـدا لەڕۆژێکـدا هـەتاودا پشـوو دەدات و پاشـان دەڕواو درەختەکـە بەجێدەهێڵێ[4].

ئا ئەمـە حەقیقـەتی حـاڵی تـەواوی دانیشـتوانی دونیایـە، بـەڵام ئـەوە هەیـە، پـەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئـەو حاڵەتـەی بینیـووەو ڕۆڵـەکانی دونیـا لەئاستیدا کوێر بوونە، بەلایاندا تێپەڕبووە خەریکی چاککردنی کەپرێکی رووخـاو بوونـە فەرموویـەتی:«مَـا أُرَى الْـأَمْرَ إِلَّـا أَعْجَـلَ مِـنْ ذَلِـكَ»[5]،واتـا: ئـەوەی مـن دەیبینم،مردن لەوە خێراترە.

---

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

[2] - موسلیم(٢٧٤٢) ئیخراجی کردووە.

[3] - صەحیحە، ترمیزی(٢٣٧٦) و ئەحمەد(٣/ ٤٥٦) ئیخراجیان کردووە.

[4] - پێشتر تەخریج کرا.

[5] - صـەحیحە، ئـەبو داوود(٥٢٣٥و ٥٢٣٦) و ترمیـزی(٢٣٣٥) و ئـیبن ماجـە(٤١٦٠) و ئەحمـەد(٢/ ١٦١) ئیخراجیان کردووە.

پەردەیـــەك لەســـەر دەرگاكـــەی بـــووە، فـــەرمانی داوە لابـــبردریّ و فەرموویەتی: "إنه يذكرني الدنيا"[1]، واتا: دونیام بیردەهێنێتەوە.

خەڵكیشی فێر كرد كە مافی هەریەكێكیان تەنیا لەبوونی خانوویەكدایە تێیدا بـژیّ و بـەرگێك خـۆی پـیّ داپۆشـیّ و توویشـوویەك(پاروویەك)خۆی پـیّ بـەهێز بكات[2].

هەواڵیشی داوە كە مردوو، كەسوكارو سـەروەت و كارەكـانی دوای دەكـەون، كەسوكارو سەروەتەكەی دەگەڕێنـەوەو كاروكردەوەكـانی لەگەڵدا دەمێننـەوە[3]. هەروەك هەواڵیشـی داوە، ئـەو كەسـەی كـە رۆچـووە لـەرێی نـاڕەوادا سـەروەتی خوای گەورە بۆ خۆی كۆبكاتەوە، ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا دۆزەخی بۆ ئەبیّ[4].

سـوێندیخواردووە كـە ترسـی نییـە لـەوەی هـاوەڵانی هـەژار بكـەون، بـەڵكو دەترسیّ دونیایان بەڕوودا بكرێتەوەو كێبركێی دونیا بكەن و سەروەت و هۆكاری دونیایی زیاتر كۆبكەنەوەو بیّ ئاگابن پێـی[5]. هەواڵیشـی داوە كـە نـەوەی ئـادەم هیچ ماڵ و سـەروەتێكی نییـە، جگـە لـەوەی خواردوویـەتی و رۆیشـت و ئـەوەی لەبـــەریكردووەو دڕاوەو بەسەرچـــووەو خێرێـــك كـــە بـــۆ قیامـــەتی خـــۆی پێشیخستووە[6].

[1] - موسلیم(٢١٠٧) (٨٨) و ترمیزی(٢٤٦٨) ئیخراجیان كردووە.

[2] - پێشتر تەخریج كرا.

[3] - بوخاری(٦٥١٤) و موسلیم(٢٩٦٠) ئیخراجیان كردووە.

[4] - بوخاری(٣١١٨) ئیخراجی كردووە.

[5] - پێشتر تەخریج كرا.

[6] - پێشتر تەخریج كرا.

هەواڵی داوە کە پشکی ئەوەی ئادەم لەدونیادا، چەند پارووپەکە تاوەکو برسیی نەبێ و بکەوێ، ئەگەر لەوە زیاتر بوو، ئەوە یەك لەسەر سێی بۆ خواردن و یەك لەسەر سێی گەدەی بۆ خواردنەوەو یەك لەسەر سێی تری بۆ هەناسەدانی بێ[1]. بۆیە لەم فەرموودەیەدا ئەمە دەبینین: ڕێنماییدان و ئامۆژگاریکردن بۆ تەندروستیی دڵ و جەستەو ئایین و دونیا. هەواڵی داوە کە دەوڵەمەندیی مرۆڤ لەدونیادا، دەوڵەمەندیی دەروونە نەك زۆریی سەروەت و خۆنواندن[2].

داوای لەخوای گەورە کردووە تووێشووی بۆ بکاتە رزق و رۆزیی دونیاو دەوڵەمەندی نەکات[3]، خۆزگەی بردووە بەو کەسەی دوای وەرگرتنی هیدایەتی موسڵمانبوون، ئەوەندەی رزق و رۆزیی پێ دراوە بەسی بێ و لێی زیاتر نەبێ[4]. هەواڵیشی داوە، هەرکەسێ دونیا خەم و پەژارەی بێ، ئەوە خوای گەورە چاوبرسیی ئەکات و هەرچی کۆکردووەتەوە بۆی پەرش و بلاو ئەبێ و تەنیا ئەوەندەی لێ سوود ئەکات کە بۆی نووسراوە سوودی لێ بکات[5]. خوای گەورە پێشنیاری بۆ کردووە بەتحائی مەککەی بۆ بکاتە ئاڵتوون، بەلام فەرموویەتی: :" أَشْبَعُ يَوْمًا وَأَجُوعُ يَوْمًا، فَإِذَا جُعْتُ تَضَرَّعْتُ إِلَيْكَ وَذَكَرْتُكَ، وَإِذَا شَبِعْتُ حَمِدْتُكَ وَشَكَرْتُكَ"[6]،واتا: بەڵکو دەمەوێ ڕۆژێ برسیی بم و ڕۆژێ تێربم، گەر برسیی بم هانات بۆ دەهێنم و ئەکڕوزێمەوەو یادت دەکەمەوە، کە تێرش بم سوپاس و ستایشت دەکەم. فێریشی کردوون کە:"هەرکەسێ لەماڵی خۆیدا بەئارامی و بێ

---

[1] - ترمیزی(٢٣٨١) ئیخراجی کردووە.
[2] - بوخاری(٦٤٤٦) و موسلیم(١٠٥١) ئیخراجیان کردووە.
[3] - پێشتر تەخریج کرا.
[4] - پێشتر تەخریج کرا.
[5] - صەحیحە، ئیبم ماجە(٤١٠٥) و ئەحمەد(٥/ ١٨٣) ئیخراجیان کردووە.
[6] - پێشتر تەخریج کرا.

ترس لەژیانی خۆی بەیانیی کردەوە و جەستەی ساغ و سەلامەت و خواردنی ئەو ڕۆژەی هەبوو، وەك ئەوەیە دونیای پێ درابێ[1].

هەواڵی داوە، بەندە گەر لەپێویستییەکەی ببەخشێ بۆی خێرو چاکە، گەر گرتییەوەو نەیبەخشی بۆی خراپەو لەسەر ئەوە سەرزەنشت ناکرێ بە بەپێویستیی خۆی ماڵ و سەروەتی هەبێ[2]. ڕێگریی ئوممەتەکەی کردووە کە بڕواننە سەرووی خۆیان لەشتە دونیاییەکان و فەرمانی پێکردوون بڕواننە خوارووی خۆیان[3]، هەواڵیشی داوە کە لەدونیادا ئەوەی مابێتەوە تەنیا بەڵاو فیتنەو زیانە، نمونەی ئەوەیە کە مرۆڤ لەسەر ئاودەستکردنەوەدا دایدەنێ. دونیا نمونەی ئەو خواردنەیە کە لەسەرەتادا چێژو خۆشیی هەیەو لەسەرئاوکردنەوەشدا بەپیسایی فڕێ دەدرێ[4].

هەواڵی داوە کە بەندەکانی خوا لەدونیادا نیعمەتیان پێ نەبەخشراوە،بەڵکو ئەو بەهەشتەی کە لەڕێگەیانە ئەوەیە شوێنی نیعمەت و خۆشییەکان، بۆیە با لەبری بەهەشت بەخۆشییەکانی دونیا ڕازیی نەبن[5].

هەواڵی داوە، کە ڕزگاربوونی یەکەمین کەسی ئەم ئوممەتە بەهۆی دونیانەویستی و یەقینەوەیە، بەهیلاکدا چوونی کۆتا کەسیشی بەهۆی چرووکی و هیواو ئومێد درێژییەوەیە[6]، ئەیفەرموو:" لَبَّيْكَ لَا عَيْشَ إِلَّا عَيْشُ الْآخِرَةْ"[1]،واتا:

---

[1] - حسن لغیره، ترمیزی(٢٣٤٧) ئیخراجی کردووە.

[2] - پێشتر تەخریج کرا.

[3] - پێشتر تەخریج کرا.

[4] - پێشتر تەخریج کرا.

[5] - ئەحمەد لە الزهد(لا١١٩) ئیخراجی کردووە.

[6] - حسن، تەبەرانیی لە المعجم الأوسط(٧٦٥٠) ئیخراجی کردووە، ئەلئەصبەهانییش لە الترغیب والترهیب(١٦٤) ئیخراجی کردووە.

هەموو مەزنی و گەورەییەك بۆ تۆ ئەی پەروەردگارا، هیچ ژیانێك نییە خۆشیی و حەسانەوەی تێدا هەبێ جگە لەژیانی ئاخیرەت. هەواڵیشی داوە، خوای گەورە گەر بەندەیەکی خۆشبووێ ئەوە بەرانبەر دونیا دەیپارێزێ، هەروەك چۆن مرۆڤ کەسە نەخۆشەکەی لەخواردن و خواردنەوە دەپارێزێ[2].

هاتەلای عوسمانی کوڕی مەزعون کە لەنەخۆشیی سەرەمەرگدا بوو، لەسەر سەری دانیشت و ماچی کردو ئەیفەرموو:«رَحِمَكَ اللَّهُ يَا عُثْمَانُ، مَا أَصَبْتَ مِنَ الدُّنْيَا وَلَا أَصَابَتْ مِنْكَ»[3]،واتا: رەحمەتی خوات لێ بێ ئەی عوسمان، نە تۆ لەدونیا سوودت کردو نە دونیاش لە تۆ سوودی کرد. بەوە خۆزگەی پێ برد. ئەیفەرموو:"الزُّهْدُ فِي الدُّنْيَا يَرِيحَ الْقَلْبَ وَالْبَدَنَ ، وَالرَّغْبَةُ فِي الدُّنْيَا تُكْثِرُ الْهَمَّ وَالْحَزَنَ"[4]،واتا: دونیانەویستیی دڵ و جەستە ئەحەسێنێتەوە، دونیاویستییش خەم و خەفەت و پەژارە زۆر ئەکات.

ئەیفەرموو:"من جعل الهموم كلها هما واحدا، كفاه الله سائر همومه، ومن تشعبت به الهموم في أحوال الدنيا، لم يبال الله في أي أوديتها هلك"[5]،واتا:هەرکەسێ خەم و پەژارەکانی بکاتە یەك پەژارە، ئەوە خوای گەورە پەژارەی بۆ ناهێڵێ، هەرکەسێکیش پەژارەکانی لەکاروبارەکانی دونیادا زۆر و لق

---

[1] - صەحیحە، ئیبن خوزەیمە(٤/ ٢٦٠) و حاکم(١/ ٤٦٥) و بەیهەقیی لە السنن(٥/ ٤٥) ئیخراجیان کردووە.

[2] - پێشتر تەخریج کرا.

[3] - لاوازە، ئەحمەد لە الزهد(لا٧٧) ئیخراجی کردووە، رشتەی گێڕانەوە لاوازو(معضل)ە.

[4] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(١٣١) ئیخراجی کردووە،موحەممەدی کوڕی موسلیمی ئەلتائیی تێدایە کەسێکی لاوازە

[5] - حسن، ئیبن ماجە ( ٢٥٧، ٤١٠٦ ) ئیخراجی کردووە لە فەرموودەیەکی ئیبن مەسعودەوە( خوای لێ راز یی بێ ).

و پۆداری بکات، ئەوە خوای گەورە حەقی بەسەرییەوە نییە لەچی دۆڵێکی دونیادا تیابچێ. هەروەها هەواڵی داوە:" أنه يؤتى يوم القيامة بأنعم الناس كان في الدنيا، فيقول الله عز وجل: أصبغوه في النار صبغة، ثم يؤتى به، فيقول: يا ابن آدم هل أصبت نعيماً قط؟ هل رأيت قرة عين قط؟ هل أصبت سروراً قط؟ فيقول: لا وعزتك. ثم يقول: ردوه إلى النار، ثم يؤتى بأشد الناس كان بلاء في الدنيا، وأجهده جهداً، فيقول تبارك وتعالى: أصبغوه فى الجنة، صبغة فيصبغ فيها، ثم يؤتى به، فيقول: يا ابن آدم، هل رأيت ما تكره قط؟ فيقول: لا وعزتك ما رأيت شيئاً قط أكرهه"[1]،واتا: لەرۆژی قیامەتدا دەوڵەمەندترین مرۆڤی دونیا دەهێنرێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: یەك جار بەدۆزەخدا بیگێڕن، پاشان دەیهێنن و ئەفەرمووێ: ئەی نەوەی ئادەم، لەدونیادا هیچ خۆشیی و نیعمەت و حەسانەوەیەکت بینیووە؟ ئەڵێ: نە سوێند بەعیزەتی تۆ هیچ خۆشی و حەسانەوەیەکم نەبینیووە. پەروەردگار ئەفەرمووێت: بیگێڕنەوە بۆ دۆزەخ. پاشان یەکێکی تر دەهێنرێت کە سەختترین بەڵاو ناخۆشیی ژیانی بینیووەو لەهەموو مرۆڤەکانی تر ماندووتر بووە، پەروەردگاری بەرزو باڵا دەفەرمووێت:یەکجار بەبەهەشتدا بیگێڕن، بەبەهەشتدا دەگێڕدرێت و پاشان دەهێنرێت، پەروەردگار ئەفەرمووێت: ئەی نەوەی ئادەم، تۆ لەدونیادا هیچ ناخۆشییەکت بینیووە؟ ئەڵێ: نە سوێند بەعیزەتی تۆ هەرگیز ناخۆشییەکم نەبینیووە.

لەو فەرموودەیەی موناجاتی موسادا کە پێشەوا ئەحمەد لەکتێبەکەیدا(الزهد) گێڕاویەتییەوە: ئیسماعیلی کوڕی عەبدولکەریمی کوڕی مەعقیل بۆی گێڕاینەوە،

---

[1] - موسلیم(٢٨٠٧) ئیخراجی کردووە لەفەرموودەیەکی ئەنەسەوە(خوای لێ رازیی بێ).

عەبدولصـەمەدی کـوڕی مـەعقیل بـۆی گێڕاینـەوە وتـی: گـوێم لـەوەهبی کـوڕی مونبیـە بـوو باسـیکردو ئەمـەی تیـادا بـوو: هـەردووکتان سەرسـام مـەبن بـەو جوانییەی دونیا هەیەتی و چێژی لـیٚ دەبینـدریٚ و چـاوتانی مەخەنەسـەر، ئـەوە جوانیی ژیانی دونیاو خۆشیی ئارەزووبازانە، گەر بمەویٚ دونیاتان بەجوانییەك بۆ دەرازێنمـەوە فیرعـەون بـەبینینی بزانـیٚ توانـای ئـەو لەئاسـت ئـەوەدا نییـە کـە بەئێوەم داوە، گەر بمویستبایە ئەوەم بۆتان دەکرد، بـەلاّم مـن نیعمـەتێکی تـرم بۆ ئێوە دەویٚ نەك ئـەوەی دونیـا، مـن بـۆ دۆسـتەکانم هـەر ئـەوە دەکـەم، هـەر لەکۆنەوە دۆستەکانی خۆمی لیٚ بەدووردەگرم، هەروەك چۆن شوانی بـە بـەزەیی مەڕو مالاّتی لە لەوەڕگای مەترسیدار بەدوور دەگریٚ، بزانە بەنـدە بـەهیچ شـتێك خـۆی بـۆ مـن جـوان ناکـات بەئەنـدازەی خـۆ جـوانکردن و خۆڕازاندنـەوەی بـیٚ بەدونیانەویسـتی، بەڕاسـتیی ئـەوە خۆڕازاندنـەوەی لەخواترسـاوانە، لێیـەوە بـەرگێکیان لەبەردایـە بـەهۆی دڵئـارامی و لەخواترسـاوییانەوە دەناسـرێنەوە، شوێنەواری کڕنۆش بردن بەنێوچاوانییانەوە دیارە، ئەوانە بەڕاستیی دۆستەکانی مـنن، کـە پێیـان گەیشـتی سـادەبیت بۆیـان بنوێنـە، دڵ و زمانـت بۆیـان کـزۆڵ بکە....فەرموودەکەی باسکردووە[1].

ئەحمـەد ئـەڵیٚ: عـەوفی کـوڕی جـابر بـۆی باسـکردین، وتـی: بیسـتم لەموحەممەدی کوڕی داوودەوە، ئەویش لەباوکییەوە، ئەویش لەوەهبـەوە وتـی: حەوارییەکان وتیان: ئەی عیسا، ئەو دۆستانەی خـوای گـەورە کـێن کـە تـرس و خەم و خەفەتیان لەسەر نییە؟

[1] - ئەحمەد لە الزهد(لا٧٤- ٧٩)ئیخراجی کردووە.

وتی:ئەوانەن کە دەڕواننە ناوەوەی زەوی، لەوکاتـەی خـەڵکیی سـەیری رووی زەویـی ئەکـەن، ئەوانـەن کـە دەڕواننـە سـەرەنجامی دونیـا لەکاتێکـدا خـەڵکیی تەماشای شتە بەپەلەو خێراکانی ئەکەن، ئـەوە دەمـرێنن کـە دەترسـێن ئـەوان بمرێنیّ، واز لەوە دەهێنن کە دەزانن و دڵنیان وازیان لـیّ دەهێنـیّ، لـەزۆرکردنی دونیا دووردەگرن، باسکردنی دونیا بەتیاچوون و لەدەستچوون دەزانن، دڵخۆشن کـە لـەدونیادا تووشـی خـەم و خەفـەت بـبن، هـەر خۆشـییەکی دونیایـان بێتـە بەردەست رەتیدەکەنەوە، بەناڕەوا بەرزی و پایەدارییەکی دونیایـان پـیّ بـدرێت فرێـی دەدەن، دونیایـان بـۆ دروسـتبکریّ بەدوایـدا ناچـن و کـاولیش بـیّ چـاکی ناکەنـەوە، دونیـا لـەدڵی ئەوانـدا مـردووەو زینـدووی ناکەنـەوە، دونیـای خۆیـان دەڕوخێنن و ئاخیرەتیان پیّ بوونیات ئەنێنەوە، دونیایـان دەفرۆشـن و قیامـەتی پیّ دەکڕن، دونیایان رەتکردووەتەوە وەك ئەوەی تیایـدا خۆشـحاڵبن، دەڕواننـە دونیاویستان وەك ئـەوەی سـزای شـەرمەزارانەو ئابڕووبەرانـەیان بەسـەرداهاتبیّ، یادی مردنیان زیندوو کردووەتەوەو باسی دونیایـان مرانـدووە، خـوای گـەورەیان خۆشـدەویّ و یـادکردنی خوایـان خۆشـدەویّ و بـەنوورو رووناکیی خـوا دونیـای خۆیان رووناك دەکەنەوە، هەواڵی سەیریان بۆ هەیەو هـەواڵی سـەیریان لا هەیـە، بەوان پەرتووك راگیراوەو ئـەوانیش بەپـەرتووکی خـوا خۆیـان راگرتـووە، بـەوان هاتووەتـە گـۆو ئـەوانیش بـەو پەرتووکـە هاتوونەتـە گـۆ، بـەوان ناسـراو بـووەو ئەوانیش بەوە کاریان کردووە، هیچ شتێکی تر بەدەسکەوت نازانن جگـە لـەوەی دەستیانخستووەو هیچ سەلامەتییەکیان نییە جگە لەوەی ئومێدی دەکەن و هیچ ترسێکیان نییە جگە لەوەی کە ورياییان لێکردووە[1].

---

[1] - ئەحمد لە الزهد(لا٧٨) ئیخراجی کردووە.

روح بۆی باسکردین، سولەیمانی کوڕی موغیرە بۆی باسکردین، ئەویش لەثابتەوە وتی: بەعیسای کوڕی مەریەم وترا: ئەی پەیامبەری خوا، خۆزگە گوێدرێژێکت ئەبوو بۆ پێویستییەکانت سواری دەبووی؟ وتی: من لەوە بەڕێزترم لای خوای گەورە، کە شتێکم پیێ بدات بەو شتەوە سەرقاڵم بکات[1].

وتی: گەنجینەکانتان لەئاسمان دابنێن، چونکە دڵی مرۆڤ پەیوەستە بەگەنجینەکەیەوە[2]. وتی: لەشتە زیادەکانی دونیا خۆبەدووربگرن، چونکە ئەو شتە زیادانە لای خوای گەورە پیس و بێزراون[3]. وتی: ئەی بەنی ئیسرائیل، ماڵەکانتان وەك ماڵی میوانداریی لیێ بکەن، چونکە ئێوە لەم جیهانەدا ماڵتان نییەو تەنیا رێبوارێکن. وتی: ئەی گرۆی حەوارییەکان، کیێ لەئێوە دەتوانیێ لەسەر شەپۆلی دەریا خانوویەك درستبکات؟ وتیان: ئەی روح الله، کیێ دەتوانیێ ئەوە بکات؟ وتی: دە ئاممان وریای دونیابن و مەیکەنە شوێنی گیرسانەوە[4].

وتوویەتی:خواردنی نانە گەنمێك و خواردنەوەی ئاوێکی سازگارو خەوتن لەگەڵ سەگەکان لەسەر زبڵدانەکان، زۆرە بۆ کەسێك فیردەوسی بوویێ[5].

ئەحمەد ئەڵیێ:بەهز بۆی گێڕاینەوە، ئەویش لەئەعمەشەوە، ئەویش لەخەیسەمەوە وتی: مەسیح وتوویەتی: زۆر بەسەختیی مرۆڤی دەوڵەمەند

---

[1] - ئەحمد لە الزهد(لا٧٣) ئیخراجی کردووە.

[2] - ئەحمد لە الزهد(لا٧٤) ئیخراجی کردووە.

[3] - ئیبن موبارەك لە الزهد(٨٤٨) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(٢١٥) ئیخراجیان کردووە.

[4] - پێشتر تەخریج کرا.

[5] - پێشتر تەخریج کرا.

دەچێتە بەهەشتەوە[1]. مەسیح ئەڵێ: خۆشی و چێژی دونیا تاڵیی ئاخیرەتە، تاڵیی دونیاش چێژی ئاخیرەتە[2].

وتوویەتی: ئەی بەنی ئیسرائیل، دونیا بەکەم بگرن لاتان کەم و سووک ئەبێ، دونیا سووک بگرن ئاخیرەتتان لا نرخدار ئەبێ، دونیاتان بەلاوە نرخدار و بەرێز نەبێ، چونکە ئەوکات ئاخیرەتتان لا بێ نرخ ئەبێ، دونیا بەرێز نییە، هەموو رۆژێك بانگەواز دەکات بۆ فیتنەو زیان.

ئیسحاقی کوڕی هانیئ لە(مسائل)ەکەیدا ئەڵێ: ئەبو عبداللە-کە لەماڵی دەردەچووم- وتی: ئەلحەسەن وتی: دونیا بەسووك بگرن، سوێند بەخوا سووکترین شتێکە کاتێك بەهۆیەوە سووك و ریسوا ئەبێ[3]. ئەلحەسەن وتی: سوێند بەخوا خەمم نییە بەرۆژئاوادا ئەرۆم یان بەرۆژهەلاَتدا. ئەڵێ: ئەبو عبداللە پێیووتم: ئەی ئەبا ئیسحاق دونیا چەند سووکە بەلای خوای گەورەوە. وتی: لەسەر پشکە کەمەکانی دونیا مرۆڤ پاداشت وەردەگرێ و لەسەر زۆرەکانی پاداشت وەرناگرێ.

وتوویانە: لەپێشینەوە بەدەماودەم(متواتر)هاتووە کە خۆشویستنی دونیا سەرو بنچینەی هەموو تاوان و خراپەیکە،ئەمە لەفەرموودەیەکی مەرفوعی نەسەلمێندراودا هاتووە، بەلاّم لەعیساشەوە گێڕدراوەتەوە[4].

---

[1] - ئەبو نەعیم لە الحلیة(٤/ ١١٩) ئیخراجی کردووە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(١٣٨) ئیخراجی کردووە.

[3] - مسائل ابن هانئ(٢/ ١٨٠).

[4] - موضوع، السلسلة الضعیفة(١٢٢٦).

عبداللەی کوڕی ئەحمەد ئەڵێ: عوبەیدواللەی کوڕی عومەری ئەلقەواریریی بۆی باسکردین، موعازی کوڕی هیشام بۆی باسکردین، باوکم بۆی باسکردین، ئەویش لەبودەیلی کوڕی مەیسەرەوە وتی: جەعفەری کوڕی جرفاس وتی: عیسای کوڕی مەریەم(سەلامی خوای لەسەربێ)وتی: خۆشویستنی دونیا سەری هەموو تاوانێکە، ژنانیش پەت و گوریسی شەیتانن، عەرەقیش کۆکەرەوەی هەموو خراپەیەکە[1].

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: عومەری کوڕی سەعد ئەبو داوودی ئەلحەفەریی بۆی باسکردین، ئەویش لەسوفیانەوە وتی: عیسای کوڕی مەریەم ئەیووت: خۆشویستنی دونیا سەری هەموو تاوان و خراپەیەکە، سەروەت و سامانیش دەردێکی زۆری تێدایە. وتیان: دەردی دونیا چییە؟ وتی: کەسەکە لەشانازی و خۆهەڵکێشان سەلامەت دەرناکات. وتیان: ئەی ئەگەر سەلامەت بوو؟ وتی: بەرانبەر یادی خوای گەورە هەر سەرقاڵی ئەکات.

وتوویانە: روون و ئاشکرایە بەپێی ئەزموون و بینین، خۆشویستنی دونیا مرۆڤ بانگدەکات بۆ تاوانی ئاشکراو نهێنی، بەتایبەت تاوانێك بەوەوە پەیوەست بووبێ، کەسی عاشقی دونیا سەرخۆش ئەکات و خراپەو ناشیرینییەکانی لای جوان ئەکات و ئەیخاتە گومانەوە، پاشان شتە مەکروە و پاشان حەرامکراوەکان گیرۆدەی ئەکەن. مرۆڤ دەخاتە بێباوەڕییەوە، تەواوی نەتەوەکانیش بەهۆی خۆشویستنی دونیاوە پەیامبەرانی خۆیانیان بەدرۆ دەزانی و دەستیاندایە بێباوەڕییکردن. پەیامبەران کە ڕێگریی ئەوانیان کرد لەهاوبەش پەیداکردن و ئەو

---

[1] - عبدالله له زوائد الزهد(لا١١٧).

تاوانانەی دونیایان پێ دەستدەخست، هەر خۆشویستنی دونیا بوو ئەوانی بەوە گەیاند دژ بەپەیامبەرانی خۆیان بجولێنەوەو بەدرۆزنیان بزانن.

خۆشویستنی دونیا بناغەی هەموو تاوانێکە لەجیهاندا، تۆش هەڵەی دایك و باوکی مرۆڤایەتیی لەکۆندا لەبیر مەکە، هۆکاری ئەو تاوانەی ئەوان، حەزکردنیان بوو بەنەمریی لەدونیادا، تاوانی ئیبلیسیش لەبیر مەکە، کە هۆکارەکەی حەزکردن بوو لەو سەرۆکایەتییەی کە خراپییەکەی لەخۆشویستنی دونیا زۆرترە، هەر بەهۆی دونیاوە بوو فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان بێباوەڕییان هەڵبژارد، هەر دونیاو خۆشویستنی دونیاش بوو ئەبو جەهل و قەومەکەی و جولەکەش بێباوەڕییان هەڵبژارد.

بێگومان خۆشویستنی دونیاو سەرۆکایەتییکردنە دۆزەخی بەخەڵك پڕ کردووەتەوە، دونیانەویستی و سەرۆکایەتی نەویستنیشە بەهەشتی بەخەڵکانی خۆی پڕ کردووەتەوە، بەڕاستیی سەرخۆشبوون بەخۆشویستنی دونیا زۆر گەورەترە لەسەرخۆشبوون بەعەرەق، سەرخۆشبوونێکە کە تاریکایی گۆڕ مرۆڤەکە بەئاگا دەهێنێتەوە، گەر لەدونیادا بەئاگابهاتبایەتەوە، ئەوکات دەیزانی چی سەرخۆشییەکی تێدا هەیە، بۆیە سەختترە لەسەرخۆشبوون بەعەرەق.

دونیا سیحرێکی بێ وێنە لەعەقڵەکان ئەکات، پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ:سەییار بۆی باسکردین، جەعفەر بۆی باسکردین وتی: گوێم لێبوو مالیکی کوڕی دینار ئەیووت: لەساحیرەکان خۆتان بەدووربگرن، چونکە لەدڵی زانایانیش سیحر ئەکەن[1].

[1] - ئەحمەد لە الزهد(٣٨٧٧).

یەحیای کوڕی موعازی ئەلڕازیی ئەڵێ: دونیا عەرەق و کەرەستەی هۆشبەری شەیتانە، هەرکەسێ پێی سەرخۆشبێ بەئاگا نایەتەوە، ئەوکاتە نەبێ کە بەپەشیمانی و زیانمەندییەوە کەوتووەتە نێو مردووانەوە. کەمترین خۆشەویستیی دونیا، مرۆڤ لەخۆشویستن و یادی خوا دووردەخاتەوە، هەرکەسێکیش سەروەت و ماڵی لەیادی خوا بێ ئاگای کرد، ئەوە لەزیانمەندانە، هەرکاتێکیش دڵ لەیادی خوای گەورە بێ ئاگابوو، ئەوکات شەیتان تیایدا دادەنیشێ و چۆنی بووێ ئاوەها بەڕێیدەخات.

یەکێك لەتێکەیشتن و فێڵەکانی شەیتان، ئەوەیە بەهەندێ کاری چاکە رازیی ئەکات تاوەکو پیشانی بدات لەسەروەت و ماڵەکەی چاکە ئەکات لەکاتێکدا دڵی بۆ خستووەتە پەرستنەوە، ئاخۆ ئەو چاکەیەی کە دەیکات چۆن لەگەڵ ئەوەدا رێکدێ و دەگونجێ کە دڵی بۆ خستووەتە پەرستنەوە؟ بێگومان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەفرەتی لێکردووەو لەدژی پاڕاوەتەوەو فەرموویەتی: "لُعِنَ عبدُ الدینار والدرهم"[1]، واتا:نەفرەت لێکراوە بەندەی دینارو درهەم، هەروەها فەرموویەتی:« تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ، وَعَبْدُ الدِّرْهَمِ:إِنْ أُعْطِيَ رَضِيَ، وَإِنْ مُنِعَ سَخِطَ »[2]،واتا:بەدبەخت و زیانمەند بوو بەندەی دینارو درهەم، کە پێی ببەخشرێ رازییەو کە لێی بگێردرێتەوە تووڕە ئەبێ. ئەمە راڤەی پەیامبەری

[1] - لاوازە، ترمیزی(٢٣٧٥) ئیخراجی کردووە لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ).

[2] - بوخاری(٢٨٨٦و ٦٤٣٥) ئیخراجی کردووە لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ).

خوا(صلى الله عليه وسلم) و روونكردنـەوەی بەندایـەتیكردنی دینـارو درهـەم و سەروەتە.

دونیا بەتەواوی گەورەو وردییەوە خۆی پیشانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)دا، پەیامبەر بەهەردوو دەستی پاڵی بەسنگییەوە ناو لەخۆی دوورخستەوەو گەڕاندییەوە، پاشان خۆی پیشانی هاوەڵانی دا و ڕێی پێگرتن، هەندێكیان ڕێی پەیامبەریان گرت و پاڵیان پێوەناو كەسانێكی كەم بوون، ئەوان تر بەڕوویدا وەستان و وتیان: چیت پێیە؟ وتی: لەحەڵاڵ و گومان و مەكروه و حەرام، ئەوانیش وتیان: حەڵاڵەكانتمان پێ بدەو پێویستمان بەوانی تر نییە، حەڵاڵەكانیان وەرگرت، دوای ئەوان ڕێگەی بەوانی تر گرت و داوای حەڵاڵەكانیان كردو حەڵاڵیان بۆ نەدۆزرایەوە، داوای مەكروه و شتە گومانەكانیان كرد، وتی: ئەوانەی پێش ئێوە بردیان، وتیان: كەوابوو كوا حەرامەكانتمان پێ بدە، وەریانگرت، خەڵكانی تر هاتن و وتیان: ئەی بەشی ئێمە؟ وتی: لەدەستی ستەمكارەكانتانەو بۆ خۆیانیان بردو بەشی ئێوەشیان داگیركرد، هەوڵبدەن بەقسەی خۆش و ترساندن لێیانی دەستبخەن، بۆیە هەر خراپەكارێك دەستی بۆ حەرامێ درێژ كردبێ، دەستێكی خراپترو بەهێزتری لەبەردەم بووە. ئا ئەوان هەموو میوانن و ئەوەی لەدەستیانە سپاردەیە، هەروەك ئیبن مەسعود وتوویەتی: هەموو ئەوەی لەدونیادایە میوانەو ئەوەی لەدەستی دایە سپاردەیە، میوان دەڕوات و سپاردەش دەگێڕدرێتەوە[١].

وتوویانە: بێگومان دونیا سەری هەموو تاوانێك و خراپكەری ئایینیشە لەچەند ڕوویەكەوە:

---

[١] - بەیهەقیی لە شعب الإيمان(١٠٦٤٤) ئیخراجی كردووە.

**یەکەم:** خۆشویستنی دونیا پێویست ئەکات و وا ئەخوازێ گەورەی رابگری، لەکاتێکدا لای خوای گەورە سووك و بێ نرخە، گەورەترین تاوانێکیش گەورە راگرتنی شتێکە لای خوای گەورە سووك و بێ نرخ بێ.

**دووەم:** خوای گەورە نەفرەتی لێکردووەو حەزی پێ نەکردووەو رقی لێبووەتەوە، تەنیا ئەو شتانەی نەبێ کە خوای گەورە خۆشیانی دەوێ و بۆ خوای گەورەن، بۆیە هەرکەسێك ئەو شتەی خۆشبووێ کە خوای گەورە نەفرەتی لێکردوون و رقی لێ دەبێتەوەو حەزی پێ ناکات، ئەوە خۆی خستووەتە بەردەم فیتنەو رق و تووڕەیی خوای گەورە.

**سێیەم:** کە دونیای خۆشویست، ئەوە دونیای بۆ دەبێتە ئامانج و بەو کارو کردەوانەی کە دەبێ لەخواو ئاخیرەت نزیکبێتەوە بەکاریان دەهێنێ بۆ نزیکوونەوە لەدونیا، کارەکە پێچەوانە ئەکاتەوەو حیکمەتەکە هەڵوگێڕ ئەکاتەوەو دڵی بۆ دواوە بەڕێدەخات، ئا لێرەدا دوو شت روودەدات: یەکەم: ئامراز ئەکاتە ئامانج. دووەم: کارەکانی ئاخیرەت بۆ مەبەستەکانی دونیا بەکاردەهێنێ، ئەمە لەهەموو روویەکەوە خراپەیەکی پێچەوانەکراو و دڵێکی تەواو هەڵگێڕدراوەیە بۆ دۆخی پێچەوانە، ئەمە ئەوەیە کە شوێن دڵی دەکەوێ، ئارەزووی بەکوێدا چوو ئەمیش بەدواوەیەتی و موو بەموو لێی لانادات، پەروەردگاریش ئەفەرمووێت: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَـٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا۟ فِيهَا وَبَـٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ هود: ١٥ – ١٦، واتا: هەرکەس دەیەوێ ژیانی دنیاو رازاوەو جوانی ئەو

ئێمە(بەرهەمی)کردەوەکانیان بە تەواوی پێ دەدەین تیایدا وە ئەوان لەم ژیانەدا کەم و کوڕی یان لەگەڵ ناکرێت. ئەوانە کەسانێکن بۆیان نی یە لە ڕۆژی دوایی دا جگە لە ئاگر وە ئەوەی کردیان تێیدا پوچ و بێ بەرهەم بووە وە هەرچیان کرد بەردەوام بوو بەهیچ.

هەروەها ئەفەرموویْت:﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ ﴾ الإسراء: ١٨، واتا: هەر کەسێك تەنها ژیانی دنیای بوێ لەم(دنیا)دا زوو پێ ی دەدەین ئەوەی بمانەوێ بۆ هەر کەسێك لە پاشان دۆزەخمان بۆ سازداوە دەچێتە ناوی بە لۆمەکراوی و دەرکراوی لەمیهرەبانی خوا.

هەروەها ئەفەرموویْت:﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْـَٔاخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ ۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴿٢٠﴾ ﴾ الشوری: ٢٠، واتا: هەرکەس بەرهەمی دوا ڕۆژی بوێ ئێمە بەرهەمەکەی بۆ زیاد دەکەین وە هەرکەسێك بەرهەمی دونیای بوێ هەندێ لە دنیای پێ دەدەین بەڵام لە ڕۆژی دوایی دا هیچ بەشێکی نی یە.

ئەمە سێ ئایەتی لێکچووی یەکن، هەموویان بەڵگە لەسەر یەك واتا دەدەن، ئەویش ئەوەیە، هەر کەسێ بەکاروکردەوەی خۆی نیازو مەبەستی دونیاو جوانییەکانی دونیا بێ لەجیاتی خوای گەورەو ئاخیرەت، ئەوە پشکی ئەوەی هەیە کە ویستوویەتی و لەئاخیرەتدا هیچ پشکێکی بۆ نییە.

فەرمودەکانی پەیامبەری خواش(صلی الله علیە وسلم) هاوجۆرو گونجاوی ئەوەن و ڕوونکەرەوەی ئەو بەڵگانەی قورئانن، نمونەی فەرموودەکەی لای ئەبو

هورەیرە(خوای لێ رازیی بێ) لەبارەی ئەو سێ کەسەی ئاگری دۆزەخیان پێ گڕ دەدرێ: کەسێکی جەنگاوەر، خێرومەندکارێك، قورئانخوێنێك کە بەو کارەی خۆیان دونیاو پشکی دونیایان مەبەست بووە، ئەوەش لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە[1].

لەسووننەنی نەسائییدا هاتووە لەئەبی ئومامەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پیاوێك هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و وتی:ئەی پەیامبەری خوا، کەسێك جیهادی کردبێ بۆ پاداشت و باسیش بکرێ، ئەو کەسە چی پاداشتێکی بۆ هەیە؟ فەرمووی:"هیچ شتێکی بۆ نییە"، سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوەو پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) هەر دەیفەرموو:"هیچی بۆ نییە". پاشان فەرمووی:"إن الله تعالى لا يقبل إلا ما كان خالصاً وابتُغِي به وجهه"[2]،واتا" خوای گەورە تەنیا ئەو کارانەی قبوڵە کە دڵسۆزانە بۆ خۆی ئەنجام دراون و رەزامەندیی خوایی لەسەر ویستراوە.

ئەوە پاداشتەکەی پووچ کردووەتەوەو کارەکەی بەخۆڕا چووە. ئەگەرچی پاداشتی خواییشی مەبەست بووە، بەلأم لەپاڵ ئەوەدا نیازی ئەوەی هەبووە لەنێو خەڵکدا باس بکرێ، تەواوی کارەکەی بۆ خوای گەورە یەکلانەکردووەتەوە، بۆیە تەواوی هەوڵەکەی بەفیڕۆچووە.

لەموسنەدی پێشەوا ئەحمەددا هاتووە لەئەبو هورەیرەوە: کە پیاوێك وتی: ئەی پەیامبەری خوا، کەسێك لەپێناو خوای گەورە جیهادی کردبێ و دەسکەوتی

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

[2] - حسن، نەسائی(٦/ ٢٥)ئیخراجی کردووە.

دونیایی ویستبێ چۆنە؟ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) پێیفەرموو:"لا أجر له"،واتا: پاداشتی بۆ نییە. ئەوە بەلای خەڵکەکەوە گران بوو، بەپیاوەکەیان وت: بۆ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دووبارەی بکەرەوە رەنگە لەقسەکەت تێنەگەیشتبێ، بۆیە وتی: ئەی پەیامبەری خوا:کەسێك ئەیەوێ جیهاد لەپێناوی خوای گەورە ئەنجام بدات و نیازی دونیاییشی هەبێ پاداشتی بۆ هەیە؟ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی"لا أجر له"،واتا: پاداشتی بۆ نییە. بۆ سێیەم جار دووبارەی کردەوەو پەیامبەریش فەرمووی:"لا أجر له"[1]،واتا: پاداشتی بۆ نییە.

هەر لەموسنەد و سوننەنی نەسائیشدا هاتووە لەعوبادەی کوڕی سامتەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:"من غزا وَهُوَ لَا يَنْوِي فِي غزاته إِلَّا عقَالًا فَلَهُ مَا نوى"[2]، واتا: هەر کەسێك شەڕ بکات و لەشەڕەکەیدا نیازی گوریسێکی وشتر راگرتنی هەبێ، ئەوە بەپێی نییەتەکەی پاداشت دەدرێتەوە.

لەموسنەدو لەسووننەنیشدا هاتووە لەیەعلای کوڕی مونیەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەهەندێ سریەدا دەیناردم، جارێکیان لەسریەیەکدا ناردمی، پیاوێکیش سواری ئێسترێك بووبوو، پێموت: بڕۆ، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)لەسریەیەکدا ناردوومی، وتی: تاوەکو سێ دینارم پێ نەدەی سوارت ناکەم، منیش سێ دینارەکەم پێ دا، کە گەڕامەوە

---

[1] - حسن لغيره، ئەبو داوود(٢٥١٦) و ئەحمەد(٢/ ٢٩٠) و ئیبن حیبان(٤٦٣٧) و حاکم(٢/ ٨٥) و ئەحمەد(٤/ ٢٢٣) ئیخراجیان کردووە.

[2] - حسن لغيره، ئەحمەد(٥/ ٣١٥) و نەسائی(٦/ ٢٤) و ئیبن حیبان(٤٦٣٨)ئیخراجیان کردووە.

لەغەزاکە ئەوەم بۆ پەیامبەری خوا باسکرد،ئەویش فەرمووی:"لَيْسَ لَهُ مِنْ غَزَاتِهِ هَذِهِ، وَمِنْ دُنْيَاهُ، وَمِنْ آخِرَتِهِ، إِلَّا ثَلَاثَةُ الدَّنَانِيرِ"[1]،واتا: لەو غەزایەی کە بۆی دەرچوو بۆ دونیاو ئاخیرەتی تەنیا سێ دیناری دەسکەوت بووە.

لەسووننەنی ئەبو داووددا هاتووە: کە عبداللەی کوڕی عەمر(خوای لێ رازیی بێ)وتوویەتی:ئەی پەیامبەری خوا لەبارەی جیهادو غەزاوە هەواڵم پێ بدە، پەیامبەریش فەرمووی:"يا عبد الله بن عمر،إن قاتلت صابراً محتسباً بعثك الله صابراً محتسباً، وإن قاتلت مرائياً مكاثراً بعثك الله مرائياً مكاثراً. يا عبد الله بن عمر، على أي حال قاتلت أو قُتِلْتَ بعثك الله على تلك الحال"[2]،واتا:ئەی عبداللەی کوڕی عەمر، ئەگەر ئارامگرانەو بەنییەتی پاداشتی خوایی جەنگای، ئەوە خوای گەورە ئارامگرانەو چاو لەپاداشتی خوایی زیندووت دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر بۆ ریاو پەیداکردنی سەروەتی دونیا دەرچووی، ئەوە خوای گەورە لەسەر ریاو پەیداکردنی سەروەتی دونیایی زیندووت دەکاتەوە، ئەی عبداللەی کوڕی عەمر لەسەر هەر حاڵێ کەست کوشت یان کوژرای، ئەوە لەسەر ئەو حاڵە خوای گەورە زیندووت دەکاتەوە.

بڕوانە چۆن ئەو موجاهیدکارەی لەپاداشت بێ بەشکردووەو، کارەکەی بۆ پووچ کردووەتەوەو کردوویەتییە یەکەمین ئەو کەسانەی دەخرێنە دۆزەخەوە.

چوارەم: خۆشویستنی دونیا ئەبێتە بەربەستی نێوان بەندەو ئەو کارە چاکەی کە سوودی بۆ ئاخیرەت هەیە و لەوە سەرقاڵی ئەکات. بۆیە خەڵکیی لەمەدا چەند پلەو جۆرێکن: هەیانە دونیا لەبەرانبەر ئیمان و شەریعەت بەدووری

---

[1] - صەحیحە، ئەحمەد(٤/ ٢٢٣) و حاکم(٢/ ١٠٩) و بەیهەقیی لە السنن(٩/ ٢٩) ئیخراجیان کردووە.

[2] - لاوازە، ئەبو داوود(٢٥١٩) ئیخراجی کردووە.

دەگرێ، هەیانە لەو واجیبانە بەدووریان دەگرێ کە دەبێ بۆ خوای گەورە ئەنجامیان بدات و بەڕواڵەت و ناخ هیچ واجیبێك ئەنجام نادات، هەیانە خۆشویستنی دونیا لەبەردەم زۆربەی واجیبەکان سەرقاڵی کردووە، هەیانە بەدووریان دەگرێ لەو واجیبەی کە پێویستە لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدرێ، هەیانە خۆشویستنی دونیا لەپەرستشی دڵی بەدووری دەگرێ و ناهێڵێ لەکاتی کارەکەدا دڵی تەنیا بۆ خوا خاڵیی بکاتەوە، بەڕواڵەت بۆ خوای ئەنجام دەدات و ناخی لەگەڵدا نییە. ئەمە لەکوێی عاشق و خۆشویستانی دونیادایە؟ ئەمە دەگمەنترینیانە. کەمترین پلەی دونیاخۆشویستن، ئەوەیە سەرقاڵی بکات لەبەردەم بەختەوەریی بەندەدا، کە خاڵیکردنەوەی دڵە تەنیا بۆ خۆشویستنی خوای گەورەو یەکلاکردنەوەی زمانە بۆ یادی خواو، دڵ و زمانی بۆ خۆشویستی خوای گەورە کۆبێتەوە.

بێگومان خۆشویستنی دونیا زیان بەئاخیرەت دەدات و گومانێك لەوەدا نییە، هەروەك خۆشویستنی ئاخیرەتیش زیان بەدونیا دەدات، لەم فەرموودەیەشدا بەمەرفوعیی هاتووە: "من أحب دنياه أضرَّ بآخرته، ومن أحبَّ آخرته أضرَّ بدنياه، فآثروا ما يبقى على ما يفنى"[1]، واتا: هەرکەسێ دونیای خۆشویست ئەوە زیان بەئاخیرەتی دەگەیەنێ، هەرکەسێ ئاخیرەتی خۆشویست ئەوە زیان بەدونیای دەگەیەنێ، بۆیە ئەوەی ئەمێنێتەوەو مانەوەی بۆ هەیە پێشبخەن بەسەر ئەوەی مانەوەی بۆ نییە.

**پێنجەم:** خۆشویستنی دونیا ئەبێتە گەورەترین پەژارەی بەندە، ترمیزیی لەفەرموودەیەکی ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەگێڕێتەوە

---

[1] - لاوازە، ئەحمەد(٤/ ٤١٢) و ئیبن حیبان(٧٠٩) و حاکم(٤/ ٣٠٨) و بەیهەقیی لە الشعب(١٠٣٣٧) ئیخراجیان کردووە.

ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: "من كانت الآخرة أكبر همه، جعل الله غناه في قلبه، وجمع له شمله، وأتته الدنيا وهي راغمة. ومن كانت الدنيا أكبر همه، جعل الله فقره بين عينيه، وفرَّق عليه شمله، ولم يأته من الدنيا إلا ما قُدِّرَ له"[1]، واتا: هەر كەسێ ئاخیرەت گەورەترین خەم و پەژارەی بێ، ئەوە خوای گەورە دڵی دەوڵەمەند ئەكات و بەهێزی ئەكات و دونیای پێ دەدات زیاتر لەوەی بۆی دانراوە، بەڵام گەر كەسێك دونیا بووبێتە گەورەترین خەم و پەژارەی، ئەوە خوای گەورە هەژاریی ئەخاتە نێوان هەردوو چاوی و توانای پێ نادات و لەدونیا ئەوەندەی پێ دەدات كە بۆی ئەندازە كراوە.

**شەشەم:** خۆشەویستانی دونیا لەدونیادا سزای سەختی پێ دەبینن، لەسێ قۆناغدا مرۆڤی دونیاخۆشویست سزا دەدرێ: لەدونیادا سزا دەدرێ بە بەدەستخستنی شتە دونیاییەكانی و هەوڵدان و ركەبەرێتییكردنی دونیاویستانی دیكە، لەبەرزەخیشدا كە سەروەتەكەی لەدەست داوەو حەسرەتی لەسەر دەكێشێ و ئیتر جارێكی تر بەدەستی ناخاتەوەو بۆی ناگەڕێتەوە، لەوێشدا شتێكی شیرینتری دەستناكەوێ قەرەبووی ئەو لەدەستچوونەی بۆ بكاتەوە، ئەوەش سەختترین سزاو ئەشكەنجەیە كە بۆی لەنێو گۆڕەكەیدا، هەروەك چۆن كرم و مێرووی زەویی چی بەجەستەی ئەكەن، خەم و پەژارەو حەسرەت و ئازاریش ئەوەندە روحی ئازارو مەینەتبار ئەكەن. هەروەك پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: ئیسماعیلی كوڕی عەبدولكەریم بۆی باسكردین، عەبدولصەمەدی كوڕی مەعقیل بۆی باسكردین، ئەویش لەوەهبی كوڕی مونبیهەوە وتی: حزقیل لەنێو

---

[1] - پێشتر تەخریج كرا.

دیلەکانی لای بەختەنەسردا بوو، لەبارەیەوە باسێکی دوورودرێژی گێڕاوەتەوە لەکۆتاییەکەیدا ئەڵێ:جارێکیان لەڕۆخی فورات خەوتبووم فریشتەیەك هات بۆلام، سەریگرتم و هەڵیگرتم تاوەکو لەشوێنێ داینام شەڕی تێدا روویدابوو، وتی: دە هەزار کوژراوی تێدا بوو، ئەو شوێنە باڵندەو ئاژەڵی دڕ خەریکی خواردنی گۆشتەکانیان بوون و پارچە پارچەیانیان کردبوو، فریشتەکە پێیووتم: قەومێك هەیە وەها گومان دەبەن کە ئەوەی لێیان مرد یان کوژرا لەدەستی من رزگاری بووە و توانام بەسەریاندا نامێنێ و وازیان لێ دەهێنم.

حزقیل ئەڵێ: بانگم لێکردن هەموو ئێسکەکان بۆ لای یەکتر گەڕانەوە کە لەیەکتر کرابوونەوە، باشتر دەیانزانی کامە ئێسك هی یەکترە باشتر لەوەی مرۆڤ هاوڕێی خۆی بناسێتەوە، کە ئێسکی جەستەکان یەکیانگرت، گۆشتەکانیشیان بەسەردا رووا، پاشان دەمارەکان و پاشان پێستیان بەسەردا کرا، منیش هەروا دەڕوانم. پاشان وتی: بانگی روحەکانیان بکە، منیش بانگم کردن. وا هەر روحەو رووی لەو جەستەیە دەکرد کە لێی دەرچووبوو. کە روحیان بەبەرداچوو دانیشتن، لێم پرسین: حاڵتان چۆن بوو؟ وتیان: ئێمە کە مردین و لەژیان دەرچووین، فریشتەیەکمان پێگەیشت و وتی: کوانێ کاروکردەوەکانتان تاوەکو پاداشتەکانی لەسەر وەربگرن و رێبازی ئێوەو ئەوانەی پێش خۆتان و ئەوانەی دوای خۆتانیش. روانیە کاروکردەوەمان بینی بتمان پەرستووە، بۆیە کرمی بەسەر جەستەکانماندا زاڵکردو روحەکان کەوتنە ئازارەوە، پەژارە بەسەر روحماندا زاڵبوو جەستە کەوتە ئازارەوە، ئا بەو جۆرە لەسزاو ئازاردابووین

تاوەکو تۆ بانگت لەئێمە کرد، عاشقانی دونیا حەسانەوەو پشوودانیان بۆ نییە لەگۆڕدا[1].

ئەوەی وتیان:"بتمان دەپەرست"، ئەوە بزانە پارە پەرستی و بتپەرستیی وەك یەكن: بەدبەخت بوو دینار پەرست، بەدبەخت بوو درهەم پەرست.

مەبەست ئەوەیە، ئەو کەسەی دونیای خۆشبووێ، ئەوە لەگۆڕو ڕۆژی بەخوا گەیشتنەوەدا سزا دەدرێ، پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿ فَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُمۡۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾ التوبة: ٥٥، واتا:جا با سەرنجت ڕانەکێشێت(سەرسامت نەکات)(زۆری) ماڵ و دارایی و منداڵیان بێگومان خوا دەیەوێت سزایان بدات بەهۆی ئەو(ماڵ و منداڵەوە) لەم ژیانی دونیایەدا وە بەسەختی گیانیان دەربچێت لەکاتێکدا کە ئەوان بێ باوەڕن.

هەندێ پێشین وتوویانە: خوای گەورە بەکۆکردنەوەی ئەو سەروەت و سامانە سزاو ئازاریان دەدات، بەخۆشویستنییەوە گیانیاندەکێشێ و هەناسەیان لێ دەبڕێت، بەهۆی نەدانی مافی خوای گەورەشەوە لەو سەروەت و سامانەدا بێباوەڕ دادەنرێن.

حەوتەم: ئەو کەسەی عاشقی دونیایەو خۆشیدەوێ و بەسەر ئاخیرەتدا پێشیدەخات، گەمژەترین مرۆڤ و کەمترین عەقڵی هەیە، چونکە خەیاڵی بەسەر حەقیقەتدا پێشخستووە، خەوتن بەسەر بەئاگایی و سێبەری هەڵوەریوو بەسەر نیعمەتی هەمیشەیی و دونیای نەماو بەسەر بەهەشتی هەمیشەییدا پێشخستووە،

---

[1] - ئەحمەد لە الزهد(لا١٠٤) ئیخراجی کردووە.

ژیانێکی هەمیشەیی بەسووکترین بژێویی ژیانێك فرۆشتووە کە تەنیا نمونەی خەون و سێبەرێکی بەسەرچووە.

بەڕاستیی مرۆڤی ژیر بەنمونەی دونیا ناخەڵەتیٚ، هەروەك کابرای ئەعرابیی دابەزییە لای قەومێك و خواردنێکیان پێشکەشکردو خواردی، پاشان چووە سێبەر دەوارێك و خەوت، دەوارەکەیان هەڵگرت و کابرا کەوتە بەر هەتاو و بەئاگاهاتەوەو وتی:

وإن امرؤ دنياه أكبرُ هَمَه ... لمستمسكٌ منها بحبلِ غرورِ

واتا: ئەو مرۆڤەی دونیا گەورەترین خەم و پەژارەی بیٚ، ئەوە دەستی بەپەتی خەیاڵ و لەخۆباییبوونەوە گرتووە.

هەندیٚ پێشین بەم دێڕە شیعرە نمونەی دونیایان هێناوەتەوە:

يا أهلَ لذَّات دنيا لا بقاءَ لها ... إنَّ اغْتِراراً بظلٍّ زائلٍ حمقٌ

واتا:ئەی ئەوانەی بوونەتە ئەهلی خۆشییەکانی دونیایەك کە مانەوەی بۆ نییە، بزانن لەخۆباییبوون بەسێبەرێکی هەڵوەریوو، گەمژەییە.

یونسی کوڕی عەبدولئەعلا ئەڵیٚ[1]: دونیام بەنمونەی پیاوێك شوبهاندووە کە خەوی لێکەوتووە و لەخەویدا شتانێکی بینیووە کە حەزی پیٚ کردووەو لەوانەش کە حەزی پیٚ نەکردوون، لەوەدا بووە تاوەکو بەئاگاهاتووەتەوە[2].

---

[1] - یونسی کوڕی عەبدولئەعلای کوڕی موسای کوڕی مەیسەرە، ئەبو موسای ئەلصەدەفی(ساڵی١٧٠ك لەدایکبووە–٢٦٤ك مردووە): لەگەورە شەرعناسان بووە، سەرۆکایەتیی زانستی بۆ بووە لەمیسردا، زانا بووە بەهەواڵ و فەرموودەو عەقڵ دەوڵەمەند و هاوەڵی شافیعیی بووەو زانستی لێوە وەرگرتووە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(٢٤٩) ئیخراجی کردووە.

ئـیبن ئـەبی ئەلـدونیا ئـەڵێ: ئـەبو عـەلیی ئـەلتائیی بـۆی باسـکردم، عەبدولڕەحمانی ئەلمەحاریبیی بۆی باسکردین، ئەویش لە لەیثەوە وتی: عیسای کـوڕی مەریـەم دونیـای لەشـێوەی پیرەژنێکـدا بینیـی کـە هـەموو جوانییـەکی بەخۆوە کردبوو، پێیووت: چەند مێردت کردووە؟ وتـی: بـۆم نـاژمێردرێن. وتـی: هـەموویان مـردن یـان تـەڵاقیان دای؟ وتـی: هـەموویانم کوشـت. عیسـا وتـی: بەدبەختیی بۆ ئەو مێردانەت وا لەدونیا ماون و بـەمێردەکانی رابـردووت پەنـدیان وەرنەگرتووە؟! یەك بەیەك لەنێویان ئەبەی و وریاییت لێ ناکەن[1]!.

أرى اشقياء الناس لا يسأمونها ... على أنـهم فيهـا عـراة وجوع
اراهـــا وان كـــانت تحب فإنهـا ... سحابة صيف عن قليل تقشع

واتا:ئەبینم خەڵکە بەدبەختەکە لەدونیا بێـزار نـابن، بـەوەی رووت و قـووت و برسیین تیایدا، دونیا ئەگەرچی خۆشوویسـتراوە، بـەڵام ئـەبینم هـەوری هاوینـەو زوو دەڕەوێتەوە.

دونیـا زۆرتـر بەسـێبەر ئەچـێ، بەحەقیقـەتێکی جێگـر ئـەیبینی، کەچـی لەکەمبوونەوەو نەماندایە، چەندە دوای بکەوی پێی ناگـەی، لێکچووترین شـتێك بەدونیا دیمەنی تراویلکەیە:﴿ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٣٩﴾ ﴾ النـور: ٣٩، واتـا: (کەسێك) زۆر تینوو بە ئاوی دەزانێ (لە دوورەوە) (بەپەلـە دەڕوات بـۆی) کـاتێ دەگاتە لای هیچ بەدی ناکات (لە قیامەت کافر) دەبینـێ خـوا ئامادەیـە لـە لایـدا

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(٢٧) ئیخراجی کردووە، لەیثی کوڕی سولەیمی تێدایە کەسێکی لاوازە.

ئینجا خوا بە چاکی پاداشتی(کردەوەکانی)دەداتێ وە خوا بەپەلەو چەسپانە لە لێپرسینەوەدا.

لێکچووترین شتێك بەدونیا دیمەنی خەوە، بەندە لەخەودا شتانێك دەبینێ حەزی پێ دەکات و شتانێکیش دەبینێ حەزی پێ ناکات، بەڵام کە بەئاگاهاتەوە ئەوجار دەزانێ حەقیقەتی نەبووە. هەروەها لێکچووترین شتێك بەدونیا پیرەژنێکی شێوە شێواوی دیمەن ناشیرین و قێزەونە، بەرانبەر مێردەکانی غەدرکار بووە، بۆ خوازبێنیکاران بەهەموو جوانییەك خۆی رازاندووەتەوەو ناشیرینییەکانی شاردووەتەوە، ئەو کەسەی بەس روانیوێتییە رواڵەتی پێی لەخشتەبراوەو داوای خوازبێنیی لێکردووە، ئەویش وتوویەتی: هیچ مارەییەکم ناوێ جگە لەڕەتکردنەوەی ئاخیرەت، ئەو بۆ من وەك هەوێیەو ناکرێ پێکەوە کۆببینەوە، بۆیە خوازبێنیکاریش دونیای هەڵبژاردووە. وتوویانە: هەرکەسێ دڵی خۆشەویستەکەی بەجێهێنابێ تاوانی لەسەر نییە، بەڵام کە پەردەو رووپۆشی سەر رومەتی لاچووە و بەلاو دەردەکانی بەدەرکەوتووە، هەندێ لەوانە تەڵاقی داوون و لەدەستی حەساونەتەوە، بەڵام هەندێکی تری مرۆڤەکان هەر پێی رازیبوونەو شەوی گواستنەوەیان بەهات و هاوار تەواو کردووە.

سوێند بەخوا جاڕدەری دونیا بەسەر هەموو مەخلوقاتەوە جاڕی داوە بۆ سەرفراز نەبوون، کەسانێك بۆی هەڵساون و بەدەمییەوە رۆیشتوون، سەلامەت دەرنەچوونەو کەوتوونەتە داوەکەیەوە، هەموویان باڵ و لاق شکاو بوونەو رادەستی قەسابی کردوون.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: موحەممەدی کوڕی عەلیی کوڕی شەفیق بۆی باسکردین، ئیبراهیمی کوڕی ئەشعەس بۆی باسکردین وتی: لەفوزەیلی کوڕی

عەیازم گوێ لێبوو وتی: ئیبن عەباس(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ) وتی:لەڕۆژی قیامەتدا دونیا لەشێوەی پرەژنێکدا دەهێنرێت، پیرەژنێکی قژ ماشوبرنجیی و شین و کەڵپە دەرچوو، شێوە شێواو، پیشانی مەخلوقات دەدرێت و ئەوترێ: ئەزانن ئەمە کێیە؟ ئەڵێن: پەنا بەخوا دەگرین لەناسینەوەی ئەو پیرەژنە، ئەوترێ: ئەمە ئەو دونیایەیە کە شەڕ و شۆڕتان لەسەر ئەکردو پەیوەندیی خزمایەتیتان لەسەر دەپچڕاند و ئیرەییتان بەیەکتر ئەبردو رق و کینەو خۆبەزلزانیتان ئەکرد، پاشان فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە، ئەویش هاوار ئەکات: ئەی پەروەردگارا شوێنکەوتەو داروەدەستەکانم لەکوێن؟ خوای گەورەش ئەفەرمووێ: شوێنکەوتەو داروەدەستەکانی بەدوایدا بنێرن[1].

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: ئیسحاقی کوڕی ئیسماعیل بۆی باسکردین، رەوحی کوڕی عوبادە بۆی باسکردین، عەوف بۆی باسکردین، ئەویش لەئەوفەوە ئەویش لەئەبی ئەلعەلائەوە وتی: لەخەودا پیرەژنێکی زۆر بەتەمەنم بینی هەموو خشڵ و جوانییەکی پێوە بوو، خەڵك دەورەیان لێ دابوو سەرسامانە تەماشایان ئەکرد، منیش هاتم و روانیم سەیرم هات بەتەماشاکردنیان بۆی و پێشوازیکردن و بەدەمەوەچوونیان بۆی، پێموت: لەنێوبچی تۆ کێی؟ وتی: بۆ نامناسی؟ وتم:نە. وتی: من دونیام. وتم: پەنا بەخوا دەگرم لەخراپەی تۆ. وتی: ئەگەر حەزدەکەی لەخراپەم پارێزراوبی، ئەوە رقت لەدرهەم بێتەوە[2].

---

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(٢٧) ئیخراجی کردووە، پچڕانی تێدا هەیە.

[2] - ئەحمەد لە الزهد(٣١٢٧) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٢/ ٢٤٣) ئیخراجیان کردووە.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: ئیبراهیمی کوڕی سەعیدی ئەلجەوهەریی بۆی باسکردم، سوفیانی کوڕی عویەینە بۆی باسکردم وتی: ئەبو بەکری کوڕی عەییاش پێیووتم: لەخەودا دونیام بینی پیرەژنێکی شێوە شێویندراوی قژ ماشوبرنجیی بوو، چەپڵەی لێ دەداو خەڵکیش بەدوایەوە بوون و چەپڵەیان لێ دەداو سەمایان دەکرد، بەرەو رووم هات و وتی: ئەگەر بەسەر تۆدا زاڵببووایەم، هەمان شتم بە تۆ دەکرد کە بەوانم کرد. پاشان ئەبو بەکر گریا[1].

ئەڵێ: موحەممەدی کوڕی عەلیی بۆی باسکردین، ئیبراهیمی کوڕی ئەشعەس بۆی باسکردین وتی: گوێم لەفوزەیل بوو وتی: پێمگەیشت کە پیاوێك روحی بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان، وتی: ئەبینم ئافرەتێك لەقەراغ رێگەدایە و لەهەموو خشڵ و بەرگێکی لەسەرە، هەرکەسێك بەلایدا تێپەڕێ برینداری ئەکات، لەپشتەوە جوانترین شتێك بوو خەڵکیی بینیبێتی، کە رووی لێت دەکرد ناشیرینترین شتێك بوو، پیرەژنێکی قژ ماشوبرنجیی دێز، وتم: پەنا بەخوا. وتی: نە سوێند بەخوا خوا ناتپارێزێ تاوەکو رقت لەدرهەم نەبێتەوە. وتم: تۆ کێی؟ وتی: من دونیام[2].

عەلیی(خوای لێ رازیی بێ) وەسفی دونیای کردووەو ئەڵێ: ماڵێکە هەر کەسێ تیایدا ساغ بێ پیرو نەخۆش ئەکەوێ، هەرکەسێ تیایدا نەخۆشکەوتبێ پەشیمانیی ئەکێشێ، هەرکەسێ بۆی هەژار بێ خەمبار ئەبێ، هەرکەسێ تیایدا دەوڵەمەندبووبێ بەفیتنەدا چووە،بۆ حەلاڵەکانی لێپرسینەوە هەیەو بۆ حەرامەکانیشی دۆزەخ[3].

---

[1] - ئەحمەد لە ذم الدنیا(٢٩- ٣٠) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(٨/ ٣٠٤) ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئەحمەد لە ذم الدنیا(١٢٤) ئیخراجی کردووە.

[3] - ئەحمەد لە ذم الدنیا(١٨) ئیخراجی کردووە.

ئیبن مەسعود(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: دونیا خانوو ماڵی کەسێکە خانوو ماڵێکی نەبێ، سەروەتی کەسێکە هیچ سەروەتێکی نەبێ، کەسێك سەروەتی بۆ کۆدەکاتەوە کە عەقڵی نەبێ[1].

ئیبن ئەبی ئەلدونیا باسیکردووە: کە ئەلحەسەن نامەی بۆ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نووسیووە: پاشان، بزانە کە دونیا شوێنی کۆچ و بارە نەوەك شوێنی گیرسانەوەی هەمیشەیی، بێگومان ئادەم لەبری سزا دابەزێنرایە ئەم شوێنە، بۆیە وریای دونیا بە ئەی ئەمیری ئیمانداران، کەسێ تووێشووی قیامەت هەڵبگرێ وازی لێدەهێنێ، دەوڵەمەند تیایدا هەژارە، هەموو کات مرۆڤ تیایدا بەهیلاکدا چووەو کوژراوە، سەرشۆڕ ئەبێ ئەو کەسەی دونیای شکۆدار کردبێ و هەژار کەوتووە ئەو کەسەی کۆیکردبێتەوە، وەك ژەهر وایە، کەسێ ئەیخوات کە نایناسێ و بەهۆیەوە دەمرێ. تۆ لەدونیادا بەنمونەی کەسێك بە برینەکەی تیادا تیمار ئەکات، کەمێك خۆی دەپارێزێ لەترسی رووداني شتێك بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ خەفەتبارو بەئازاری بکات و ناچارە لەسەر سەختیی دەرمان ئارامبگرێ، بۆیە وریای ئەم شوێنە لەخشتەبەرە خەیاڵییە فریودەرە بە کە بەهەموو جوانییەك خۆی رازندووەتەوەو خەڵکانێکی بەلەخۆباییبوون و هیوا خەیاڵییەکانی لەخشتەبردووەو تامەزرۆیی بەخوازبێنیکارانی خۆی داوە، وەك بووکێکی خۆلووسکەری لێهاتووە، چاوەکان بۆی دەڕوانن و دڵەکان ئارەزووی ئەکەن و دەروونەکان بۆی عاشقن، بکوژی هەموو مێردەکانێتی، کەچی مێردەکانی ئێستای بەمێردەکانی رابردووی پەند وەرناگرن. مرۆڤەکان پەندی لێ وەرناگرن.

---

[1] - لاوازە، ئەحمەد لە الزهد(٢٠٠ل) و بەیهەقیی لە الشعب(١٠٦٣٧) ئیخراجیان کردووە.

لەعاشـقەکانی هەیـە پێداوێسـتیی خـۆی بـەدیهێناوەو پێیگەیشـتووە، بۆیـە لەخۆبایی ئـەبێ و سنوور دەبـەزێنێ و ئـاخیرەتی لـەبیر کردووە، ژیریـی خـۆی بەدونیاوە سەرقاڵ کردووە تاوەکو ئەو کاتـەی پێـی لـێ دەخـزێ و پەشـیمانی و حەسرەتی لەسەر گەورە ئەبێ و ئازارەکـانی سـەرەمەرگ و ئـازاری لەدەسـتدانی دونیای لەسەر کۆدەبێتەوە، بەپەستیی ئەچێ و بەهەموو داخوازییـەکانی ناگـات و لەماندوویـەتیی پشـوویەك نـادات، بۆیـە بـەبێ تووێشـووی قیامـەت لـەدونیا دەردەچێ و بەرەو رووی شـوێنێك دەچـێ شـوێنی حەوانـەو ئـارامیی ئـەو نییـە، بۆیە وریای بە ئـەی ئـەمیری ئیمانـداران. وریـای ئـەو شـتانە بـە کـە هـی ئـەون، چـونکە مرۆڤـی دونیاویسـت هـەرکات بـەدونیا ئـارام و خۆشـحاڵ بـوو، دونیـا بەناخۆشی و بەڵاکانی خۆی دەیگەیەنێ، خۆشییەکانی خـواردنێکی زیانبەخشـن، خۆشگوزەرانییەکانی مرۆڤ بەبـەڵا ئەگەیـەنێ، مانـەوەی بەنـەمان کۆتـایی دێـت، خۆشییەکانی خەم و خەفەت و لاوازیی بەدواوەیەو ئـەوەی رۆیشـت ناگەڕێتـەوە، نـازانرێ دوای ئـەوە چـی دێـت، خۆزگـە و هیواکـانی درۆینـەو ناڕەوان،سـافی و رووناکییەکەی لێڵی و بێزارییە، ژیانیش تیایدا تاڵییە.

گەر خوای گەورە هیچ هەواڵێکیشـی لـەبارەوە نەدابایـەو هـیچ نمونەیەکیشـی لەبارەوە نەهێنابایەتەوە، ئەوە مرۆڤی خـەوتوو هـەر بـەئاگا دەهـات و بـێ ئاگـا وریادەبوویەوە، لەکاتێکدا لەلایەن خوای گەورەشەوە پەیام هاتووە بۆ دوورگرتن لەدونیاو ئامۆژگارییکردنی ئێمـە. بێگومـان لای خـوای گـەورە، دونیـا هـیچ رێـزو سەنگێکی نییە، لەوەتەی دروستیکردووە تەماشای نەکردووە.

دونیا بەهەموو کلیل و گەنجینەکانییەوە خرایە بەردەم پەیامبەری خوا(صـلی الله علیه وسلم)، بەڵام پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) رەتیکردەوە، رەتیکردەوە

شتێکی خۆشبووی خوای خالقی رقی لێبێتەوە، یان شتێك بەرز رابگرێ کە خواکەی سووکی داناوە، ئەو خوایەی دونیای وەك سەرپشکییەك لەچاکەکارانی دوورخستووەتەوەو بۆ لەخشتەبردنیش خستوویەتییە بەردەم دوژمنەکانی خۆی، بۆیە مرۆڤی بەدونیا لەخشتەچووی بەتوانا بەرانبەر دونیا وەها دەزانێت بەوەی پێیدراوە رێزی لێ نراوە، ئەوەی لەبیربردووەتەوە کە خوای گەورە چی کردووە بەموحەممەد(صلی الله علیە وسلم) کاتێ بەردی لەسەر سکی توونـد کردبوو[1].

ئەلحەسەن ئەڵێ: ئەی نەوەی ئادەم، دڵت بەدونیا هەڵمەواسە دەنا دونیا دڵت بەخراپەوە هەڵدەواسێ، بۆیە پەت و گوریسی دونیا بپچڕێنەو دەرگاکانی دابخە. ئەی نەوەی ئادەم، ئەوەندە لەدونیا هەڵبگرە بتگەیەنێتە شوێنی مەبەست[2].

ئەیووت: قەومێك رێزیان لەدونیا گرت، ئەویش ئەوانی لەسەر تەختەو دار هەڵواسی. بۆیە دونیا سووك بکەن، سووك ئەبێ کاتێك سووکی ئەکەن، هەی هاوار هەی هاوار ئەو کاتەی کە دونیا دەڕوات و کردارە خراپەکانی دونیا لەگەردنەکاندا بەکۆت و پێوەند دەمێنێتەوە[3].

مەسیح(سەلامی خوای لەسەربێ)وتوویەتی: دونیا بەپەروەردگاری خۆتان مەکەن، ئەگینا ئەویش ئێوە دەکاتە بەندەو کۆیلەی خۆی، بەسەریدا بڕۆن و ئاوەدانی مەکەنەوە، بشزانن کە بنچینەی هەموو تاوانێك دونیا خۆشویستنە، روویداوە یەك شەهوەت، خەم و خەفەتێکی دوورودرێژی بەخاوەنەکەی دابێ.

---

[1] - ئەبو نەعیم لە الحلیة(٢/ ١٣٤- ١٤٢) ئیخراجی کردووە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(٤٠٥) ئیخراجی کردووە.

[3] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(٤٨٩) ئیخراجی کردووە.

دونیا لەدڵی هەر بەندەیەکدا نیشتەجێ بوو، ئەوە دڵی بەسێ شت گیرۆدە بووە: سەرقاڵییەك تاوەکو مردن ماندوبوونەکانی لێ نابێتەوە ، بەهەژارییەك گیرۆدە بووە دەوڵەمەندی و تێربوونی بۆ نابێ، هیواو ئاواتێکی بۆ دروست بووە هەرگیز بەکۆتاییەکەی ناگات.

دونیا داخوازیکارو داخوازیکراوە، ئەوەی داخوازیکاری ئاخیرەت بێ، ئەوە دونیا داخوازیکارێتی تاوەکو رزق و رۆزیی خۆی تیادا تەواو بکات، داخوازیکارێکی دونیاش کە ئاخیرەت داوای ئەکات تائەوکاتەی مردن دێت و یەخەی دەگرێت.

ئەی گرۆی حەوارییەکان، بەنزمییەکانی دونیاو سەلامەتیی ئایین رازیبن، هەروەك چۆن دونیاویستان بەنزمیی ئایین و سەلامەتیی دونیایان رازیین[1].

ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: هارونی کوڕی عبدالله بۆی باسکردین، سەییار بۆی باسکردین، جەعفەر بۆی باسکردین، مالیکی کوڕی دینار بۆی باسکردین وتی: ئەبو هورەیرە(خوای لێ رازیی بێ) وتی: لەوەتەی خوای گەورە دروستیکردووە تاوەکو رۆژی لەنێوچوونی، دونیا لەنێوان زەوی و ئاسماندا راگیراوەو بانگ لەپەروەردگاری دەکات:ئەی پەروەردگارا بۆ رقت لەمنە، خوای گەورەش ئەفەرمووێ: بێدەنگ بە ئەی هیچ شتێك نەبوو، بێدەنگ بە ئەی هیچ شتێك نەبوو[2].

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(٣١و ٣٥) ئیخراجی کردووە.

[2] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(٣٦٠) ئیخراجی کردووە،پچڕانی تێدایە.

فوزەیل ئەڵێ: لەرۆژی قیامەتتدا دونیا دەهێنرێت و لەزینەت و خۆڕازاندنەوەیدا خۆ هەڵدەکێشێ و ئەڵێ: خوایە گیان بهێڵە بۆ باشترین بەندەیەکت ببمە ماڵێ. خوای گەورە ئەفەرمووێ:رازیی نییم بۆی ببێت بەبێ هیچ شتێك، تۆ هیچ شتێك نیین، بەڵکو ببە تۆزێکی بەبادا رۆیشتوو[1].

## بەش

## لەباسکردنی نمونە گەلێکدا حەقیقەتی دونیا ڕووندەبێتەوە

**نمونەی یەکەم:** بەندە سێ حاڵ و باری هەیە:حاڵەتێك تیایدا هیچ شتێك نەبووە، حاڵەتی پێش بوونی ئەوە لەدونیادا، حاڵەتێکی تریش، کاتی مردنی تاوەکو مانەوەی سەرمەدییانەی کە کۆتایی بۆ نییە، جا کە دەروونی لەجەستەی دەرچوو، یان دەچێتە بەهەشت یان دەچێتە دۆزەخ، پاشان دەگەڕێنرێتەوە جەستەی تاوەکو پاداشتی کارەکانی وەربگرێتەوەو لەیەکێك لەو دوو شوێنەدا بەهەمیشەیی بگیرسێتەوە. لەنێوان حاڵەتی پێش بوونی لەدونیا و حاڵەت دوای مردنی، حاڵەتێکی ناوەند هەیە کە رۆژگاری ژیانی دونیایەتی، با بڕوانێتە ئەندازەی کاتی دونیاو گونجاوترینی بەهەردوو حاڵەتەکە، ئەوکات دەزانێ لەئەندازەی تەمەنی دونیادا خۆی کەمتر لەچاوتروکانێك تەمەنی هەیە، بۆیە گەر مرۆڤێك ئەو تەمەنی بینی، هەرگیز دڵی ناخاتەلای و خەمی نییە تەمەنی دونیای لەتەنگ و چەڵەمەیی تەواو دەکات یان لەخۆشی و دەوڵەمەندییدا.

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(١٢٥) ئیخراجی کردووە.

لەبەرئەمەیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) خشتێکی بەسەر خشتێکەوەو قامیشێکی بەسەر قامیشێکەوە نەناوەو فەرموویەتی:«ما لي وللدنيا إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ الدُّنْيَا كَرَاكِبٍ ظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا»[1]،واتا: من و دونیا لەکوێ، نمونەی من و دونیا وەك ڕێبوارێکە لەژێر سێبەری دارێکدا ڕۆژێك بەڕێدەخات و دەڕوات و بەجێیدەهێڵێ. هەروەها فەرموویەتی:« مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إلاَّ مِثْل مَا يَجْعَل أحَدُكُم أصْبُعَهُ فِي اليَمِّ، فَلْيَنْظُرْ بِمَ يَرْجِع »[2]،واتا: دونیا لەچاو ئاخیرەتدا، وەك ئەوەیە یەکێك لەئێوە پەنجە بکاتە ئاوی دەریادا و دواتر بڕوانێ چەندەی لێ هەڵگرتووە.

مەسیحیش(سەلامی خوای لەسەربێ) ئاماژەی بەمە داوەو فەرموویەتی:دونیا پردێکە، بەسەریدا بپەڕنەوەو ئاوەدانی مەکەنەوە. بێگومان ئەمە نمونەیەکی جوانە، ژیان پردی پەڕینەوە ئاخیرەتە، لانکەی منداڵیی گۆشەی یەکەمی پردەکەیەو گۆڕیش گۆشەی کۆتاییەتی.

لەنێو خەڵکیدا هەیە نیوەی پردەکەی تێپەڕ کردووە، هەیە یەك لەسەر سێی تێپەڕاندووە، هەیە یەك هەنگاوی ماوە تێیپەڕێنێ کەچی هەر لێی بێ ئاگایە،چۆن دەبێ وەهابێ لەکاتێکدا هەر دەبێ تێیپەڕێنێ. هەرکەسێ لەسەر پردەکە ڕاوەستێ و بەجۆرەها شێوە خەریکی ڕازاندنەوەی بێ، بێگومان لەوپەڕی نەزانی و گێلێتییدایە.

---

[1] - صەحیحە، ترمیزی(٢٣٧٧) و ئیبن ماجە(٤١٠٩) و ئەحمەد(١/ ٣٩١) ئیخراجیان کردووە، فەرموویەتی: نمونەی سەرخەوشکانێکی نیوە ڕۆژەیە(قەیلولە).

[2] - موسلیم(٢٨٥٨)ئیخراجی کردووە.

**نمونـەی دووەم**:شـەهوەت و ئارەزووەكـانی دونیـا لەدڵـدا، وەك شـەهوەتی خواردنە لەگەدەدا، لەكاتی مردندا بەندە لەدڵیدا بۆگەنی و قێزەونیـی شـەهوەتی دونیای دەبینیّ، هەروەك خۆشـترین خـواردن لەگـەدەدا ئەنجامەكـەی بۆگـەنی و قێزەونییـە، خۆشـترین خواردنێـك پاشـەڕۆكەی پیسـترە، شـەهوەتی دەروون لەسەرە مەرگدا لەوە قێزەونترە. هەروەك چۆن مرۆڤ خۆشەویستانی چەندە لای ئازیزبن، لەدەستدانیشیان بەئەندازەی ئەو خۆشەویستییە بەئازار ئەبیّ.

لەموسنەددا هاتووە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بـەزەحاكی كـوڕی سوفیانی فەرموو: "أَلَسْت تُؤْتَى بطعامـك وَقـد مُلـحَ وقُـزِّح ثـمَّ تشـربُ عَلَيْـهِ اللّـبن وَالْمَاء؟ قَالَ: بلَى، قَالَ « فإلام يصير؟» قَـالَ: إِلَى مَا علمت يَـا رَسُول الله، قَـالَ « فَإِن الله عز وَجل ضرب مثل الدُّنْيَا بِمَـا يصـير إِلَيْـهِ طَعَـام ابْـن آدم»[1]،واتا:ئـاخۆ خواردنت بۆ ناهێنریّ ترش و خویّ كراوەو پاشان ئاو و ماستاو ناخۆیتەوە ؟وتی: بەڵیّ. فـەرمووی: دواتـر ئەبێتەچـی؟ وتـی: ئەبێتـە ئـەوەی كـە خـۆت دەیزانـی. پەیامبەر فەرمووی: خواردنی نەوەی ئـادەم دواتـر ئەبێتەچـی، خـوای گـەورەش دونیای بەنمونەی ئەوە هێناوەتەوە.

پێشینێك بەهاوەڵانی خۆی وتووە: بەڕێكەون تاوەكو دونیاتان پیشـان بـدەم، بەڕێیخسـتوون بـۆ سـەر زبڵـدانێك و وتوویـەتی: بڕواننـە بـەرووبووم و مریشـك و هەنگوین و ڕۆنەكانیان.

**نمونەی سێیەم**: بۆ دونیاو خەڵكی دونیا سەرقاڵەو دونیای لەبیربردوونەتەوەو ئەو حەسرەت و ئاخهەڵكێشانەشی كە بەدوایدا دێت.

---

[1] - حسن لغيره، ئەحمەد(٣/ ٤٥٢) و تەبەرانیی لە المعجم الكبير(٨١٣٨) ئیخراجی كردووە.

نمونەی بێ ئاگایی ئەهلی دونیا، نمونەی کۆمەڵێکن سواری کەشتییەك بوونە، گەیاندوونی بەدوورگەیەك و کەشتییەوانەکە فەرمانی پێداون دەربچن سەرئاوێك بکەن، وریای کردوونەتەوە دوانەکەون و ترساندوونی کە کەشتییەکە زوو دەردەچێ، ئەوانیش بەدوورگەکەدا بلاوەیان لێکردووە، هەندێکیان سەرئاوی خۆی کردووەو گەڕاوەتەوە لای کەشتییەکە، ئەبینێ شوێنەکە چۆڵە، بۆیە خۆشترین شوێنی نێو کەشتییەکە بۆ خۆی دەگرێ، هەندێکی تریان لەدوورگەکەدا دەوەستێ و ئەڕوانێتە گوڵ و درەختە سرنجڕاکێشەکانی و گوێ لەئاوازی باڵندەکانی دەگرێ و جوانیی بەردو تاوێرەکانی سەرنجی رادەکێشن، پاشان بیری دەکەوێتەوە وا کەشتییەکەی لەدەستچووە، بەپەلە دەگەڕێتەوە شوێنی راوەستانی کەشتییەکە، دەبینێ شوێنێکی بەرتەسکی بۆ ماوەتەوە تیایدا دابنیشێ، هەندێکی تریان دەکەون بەسەر بەردە جوان و گوڵە دڵگیرەکاندا، هەندێکیان لێ هەڵدەگرن، کە دێنەلای کەشتییەکە دەبینن شوێنێکی بەرتەسك ماوەتەوە، ناچار ئەبن لەباوەشی خۆیاندا دایبنێن، شوێنی خۆی سەختە کەچی ئەو بارە قوورسەشی ئەکەوێتەسەر، ناتوانێ فڕێی بدات و شوێنی هەڵگرتنیشی لەسەر کەشتییەکە بۆ نەماوەتەوە، ناچار ئەبێ بیخاتە کۆڵ و سەرشانی خۆی و لەهەڵگرتی پەشیمانیی ئەکێشێ و پەشیمانییش سوودی بۆ نابێ.

پاشان گوڵەکان سیس ئەبن و بۆنیان دەگۆڕێ و بۆگەن ئەبن و ئەبنە مایەی سەرئێشە، هەندێکی تریان لەجوانییەکانی دوورگەدا دووردەکەونەوەو کەشتییەکەیان بیردەچێ، کەشتییەوان لەکاتی پاڵدانی کەشتییەکەدا بانگ دەکاتە خەڵکەکە، کەچی بەهۆی سەرقاڵبوونی بەدیمەنە لەخشتەبەرەکانەوە

دەنگی کەشتییەوانەکە نابیستێ، جارێك میوەیەك دەخوات و جارێك بۆنی گوڵێك دەکات، جارێك بەجوانیی درەختێ سەرسام ئەبێ، ئا لەمەدا ئەبێ ترسی بۆ دروست دەبێ درندەیەك بۆی دەرنەچێ و پەلاماری بدات، کەچی دڕکێك لەبەرگەکەی گیرهاتووەو دڕکێك بەپێیدا چووە، یان چڵە دارێك جەستەی بریندار ئەکات، یان تووڕکێك لەبەرگەکەی گیردەکات و داوێنی بەدەر دەکەوێ، یان دەنگێکی گەورە ئەیترسێنێ، پاشان کە دەگەڕێتەوە دەبینێ شوێنی نەماوەتەو لەکەنار ئاوەکەدا دەمرێت. هەر لەو خەڵکە کەسانێك دەبن سەرقاڵی حەزو ئارەزووەکانی خۆیانن و لەپڕ درندەیەك ئەیانخوات، یان مار پێوەیان ئەدات، لێیان هەیە وێڵ ئەبێ و ڕێگە نادۆزێتەوەو لەنێودەچێ. ئا ئەوە نمونەی ئەهلی دونیایە لەسەرقاڵبوونیان بەخۆشی و شانسە خێراکانی دونیاوەو سەرەتاو سەرەنجامی کاروکردەوەی خۆیانیان بیردەچێتەوە.

چەندە ناشیرینە بۆ مرۆڤێکی ژیر، لەو شوێنە سەختەدا بەردو ڕۆکێك کە دەبێتە پووش و بەبادا دەچێ، سەرقاڵی بکات و ڕزگاربوونی لەبیرببەاتەوە.

**نمونەی چوارەم:** بەهۆی لەخۆباییبوونی خەڵکیی بەدونیاو لاوازی باوەڕبوونیان بەئاخیرەت: ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: ئیسحاقی کوڕی ئیسماعیل بۆی باسکردین، ڕەوحی کوڕی عوبادە بۆی باسکردین، هیشامی کوڕی حەسسان بۆی باسکردین، ئەویش لە ئەلحەسەنەوە وتی: پێمگەیشتووە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) بەهاوەڵانی فەرموویەتی:" نمونەی من و ئێوەو نمونەی دونیا، نمونەی کۆمەڵێکە ڕێگەیەکی سەختیان گرتبێتەبەر کە نازانن ماوەکەی چەندە،ئاخۆ زۆریان بڕیووە یان ماوەی زۆرتری ماوە، توویشوویان لێ

دەبڕێ و خەم دایاندەگرێ، نە تووێشوو نە وشتر هیچی نەماوە، دڵنیا ئەبنەوە کە تیاچوونەو فەوتاون، ئا لەمەدا ئەبن پیاوێکی بەرگ جوانیان لێ دەردەکەوێ قژی سەری تەڕەو دڵۆپە ئاوی لێ دەتکێ، ئەڵێن: بێگومان ئەم کابرایە لەشوێنێکی نزیکەوە هاتووەو دێیەکی نزیك لێرەوە هەیە، کە دەگاتەلایان ئەڵێ: ئێوە چیتان بەسەر هاتووە؟ ئەڵێن: وا ئەبینی چیمان بەسەردا هاتووە. ئەڵێ: ئەگەر ئاوێکی سازگارو بێستانێکی سەوز و جوانتان پیشان بدەم چیم پێ دەدەن؟ ئەڵێ: هەر شتێکت بووێ پێتی دەدەین.

ئەیانباتە سەر ئاو و بێستانێکی خۆش، تاوەکو خوا بیەوێ تیایاندا دەمێنێتەوەو پاشان ئەڵێ: دەی بەڕێدەکەوین. ئەڵێن: بۆ کوێ؟ ئەڵێ: بۆ سەر ئاو و بێستانێکی تری جگە لەم ئاو و بێستانە. زۆربەیان ئەمەیان پێ گران ئەبێ و ئەڵێن: سوێند بەخوا ئێمە بەتەمای ئەمەش نەبووین، جگە لەم شوێنە چی لەشوێنێکی تر بکەین؟ تەنیا کەمینەیەکیان ئەڵێن: ئەی ئێوە بەڵێن و پەیمانتان بەم پیاوە نەداو سوێندتان بەخوا بۆی نەخوارد کە لەقسەی دەرنەچن، ئەو لەقسەی یەکەمی راستی کرد، سوێند بەخوا بۆ ئەم قسەیەی تریشی هەر راست دەکات، بۆیە کەسانێکی کەم شوێنی دەکەن و زۆرینەش لەشوێنی خۆیان دەمێننەوە، دوژمن بەسەریاندا ئەدات و هەندێکیان دیل دەکەون و هەندێکیان دەکوژرێن[1].

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(٨٨) و ئیبن ئەلموبارەك لە الزهد(٥٠٧) ئیخراجیان کردووە، پچران و ئیرسالی تێدایە.

**نمونـەی پێنجـەم بـۆ دونیـاو خەڵکەکـەی:** ئـەو نمونەیەیـە کـە پەیامبـەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بـۆی هێناویەتییـەوە، کـە نمونـەی سـێبەری دارێکـە، مرۆڤیش تیایـدا رێبوارێکـە بـۆ گەیشـتنە لای خـوای گـەورە، لـەرۆژێکی هـەتاودا لەسێبەریدا پشوویەك دەدات و دواتر بەجێیدەهێڵێ[1].

بڕوانـە و بیربکـەرەوە لـەجوانیی ئـەم نمونەیـەو رێـك گونجـاوبوونی بـەواقیع، لەسەوزی و جوانییدا دونیا وەك درەختێکە، لـەخێرا نـەمان و پووکانەوەیـدا وەك سێبەرە، بەندەش رێبوارێکە بۆ گەیشـتنە لای خـوای گـەورە، مرۆڤـی رێبـواریش گەر لەرۆژێکی هـەتاودا سـێبەرێك ببینێتـەوە نـاڕوا خانوویـەکی لـەژێردا دروسـت بکات و نایکاتە شـوێنی مانـەوە، بەئەنـدازەی پێویسـت لەژێریـدا پشـوو دەدات، چونکە گەر زیاتر بمێنێتەوە لەهاوڕێکانی دادەبڕێت.

**نمونەی شەشـەم:** پەیامبـەری خوا(صـلى الله عليـە وسـلم) نمونـەی دونیامـان پیشـان دەدات بەپەنجـە خسـتنە نێـو دەریـاوە[2] چـەندە ئـاو بـەو پەنجەیـە دەربهێنـی، دونیـاش هـەر ئەوەندەیـە بەنسـیبەت ئاخیرەتـەوە، بێگومـان ئـەوە جوانترینی نمونەکانە، دونیا دابڕاو و لەنێوچووە، گەر ماوەکەی زیاتر لەوەش بێ کـە هەیـە، بـەڵام ئـاخیرەت هەمیشـەییەو دابڕانـی نییـە، شـتی سـنووردارکراو بەناسنووردار کراو ناپێورێت، بەڵکو گەر گریمانە بکرێ ئاسمانەکان و زەویـی پـڕ بەخەرتەلە(گووڵــە زەردە)بــێ و دوای هــەر هــەزار ســاڵێك باڵندەیــەك بێتــو خەرتەلەیەکی لێ بگوازێتەوە، ئـەوە خەرتەلەکـە کۆتـایی دێـت و ئـاخیرەت هـەر

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

[2] - پێشتر تەخریج کرا.

کۆتـایی نایـەت. دونیـا بەنیسـبەت ئاخیرەتـەوە لـەو نمونەیـەدا،وەك دەنكـە خەرتەلەیەكـە لـەو هـەموو خەرتەلـەی نێـوان ئاسمانـەكان و زەوی. لەمـەدا گـەر دەریا حەوت دەریای تری بخرێتەسەرو هەموو دارو درختەكان بكرێنە پێنووس و فەرماشتی خوای گەورە بنووسنەوە، ئـەوە دەریـاو پێنووسـەكان تـەواو دەبـن و وشەو فەرمایشتی خوا تەواو نـابن، چـونكە فەرمایشـتی ئـەو سـەرەتاو كۆتاییـان نییە، بەڵام دەریاو پێنووسەكان كۆتاییەكیان هەیە.

پێشەوا ئەحمەدو كەسانی تریش وتوویانە: خـوای گـەورە كـەی بیـەوێ قسـە دەكـات و كـەمالی پـیرۆزی فەرمایشـت و قسـەكردنی پێویسـت كـردووە، كـەمالی لەپێویستییەكانی خودی خۆیەتی و دەبێ كامڵ بێ، قسەكەر لەو كەسە كـامڵترە كە قسە ناكات، خوای گەورەیە ماندووبوون و هیلاكی و بێزاربـوون لەقسـەكردنی بەسەردا نایەت، بەفەرمایشت و وتەی خۆی شتەكان دروست دەكـات و بـەڕێوەی دەبات، وتەكانێتی مەخلوقات و فەرمانەكانی هێناوەتەبوون،هەروەها حەقیقـەتی موڵك و پەروەردگارێتی و خوایـەتیی خـۆی. الله تاكـە پـەروەردگارو پادشـایەكەو جگە لەخۆی هیچ خوایەكی دیكەی بەحەق بوونی نییە.

**نمونـەی حەوتـەم:** ئـەوەی پەیامبەر(صـلى الله عليـه وسـلم) نمونـەی لەسـەر هێناوەتـەوە كـە یەكـدەنگیی هەیـە لەسـەر دروسـتیی فەرموودەكـەو لەئـەبو سەعیدی خودرییـەوە(خوای لـێ رازیـی بـێ) كـە ئەڵێ:پەیامبـەری خوا(صـلى الله عليه وسلم) هەڵساو بۆ خەڵكیی وتارێكی داو فەرمووی:"لا والله ما أخشـى علـيكم الا ما يخرج الله لكم مـن زهـرة الـدنيا" فقـال رجـل: يـا رسـول الله، أو يـأتي الخـيرُ بالشر؟ فصمت رسول الله ثم قـال:" كيـف قلـت؟" قـال: يـا رسـول الله، أو يـأتي الخير بالشر فقال رسول الله:إن الخير لا يأتي الا بالخير، وإن ممـا ينبـت الربيـع مـا

يقتل حبطاً أو يُلمّ، إلا آكلة الخضر أكلتْ حتى إذا امتلأت خاصرتاها، استقبلت الشمس فثطلت وبالت، ثم اجترت فعادت فأكلت،فمن أخذ مالا بحقه بورك له فيه، ومن أخذ مالا بغير حقه، فمثله كمثل الذي يأكل ولا يشبع"[1]،واتا: ئا سوێند بەخوا من جگە لەگوڵ و خونچەی دونیا لەشتێکی تر لەسەر ئێوە ناترسێم. پیاوێك هەڵساو وتی: ئەی پەیامبەری خوا، ئایە خێرو چاکە خراپە ئەهێنێ؟ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی:"چییت وت؟"وتی: ئەی پەیامبەری خوا، ئایە خراپە خێر ناهێنێ؟پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی: خێر تەنیا بەهۆی خێرەوە دێت، رەنگە ئەوەی بەهار دەیڕوێنێ سکێکی ئاوساوی باکردو بکوژێ و نزیکی مردنی بکاتەوە، تەنیا ئەو گیا خۆرە نەبێ کە بەگەرمیی خواردنەکەی سکی پڕ دەبێ و بۆ جاری سێیەم دەریدەهێنێ و ئەوەی کەلەکەی ناڕەحەت کردووە بەپیسی و میز بەتاڵی ئەکاتەوە، پاشان خۆی دەداتە خۆرو پشقل و میز ئەکات، پاشان کاوێژ ئەکات و ئەگەڕێتەوە لەوەڕ ئەخوات. بۆیە هەرکەسێ بەحەق و مافی خۆی سەروەتێکی وەرگرت بەرەکەتی بۆ تێدەکرێت، هەرکەسێکیش بەبێ حەقی خۆی وەرینەگرت، ئەوە نمونەی ئەو کەسەیە کە هەر دەخوات و تێرنابێت.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەواڵی داوە کە ترسی دونیای لەسەریان هەیە، بۆیە شوبهاندوویەتی بەو گوڵەی بۆنی خۆشەو شێوەی جوانەو کەم دەمێنێتەوە و لەپشتەوەی ئەوە بەروبوومێکی باشتر هەیە کە مانەوەی هەیە.

[1] - بوخاری(٦٤٢٧) و موسلیم(١٠٥٢) ئیخراجیان کردووە.

فەرمایشتی:" إن مما ينبت الربيع ما يقتل حبطاً أو يُلِمّ"، ئەمە جوانترین شوبهاندنێکە کە وریاییکردن لەدونیاو سەرقاڵبوون و رۆچوون و خۆشییکردن تیایدا لەخۆدەگرێ، ئەوەش ئەوەیە مەڕو ماڵات سەرسامە بەلەوەڕی رووای بەهارو بەچاوەکانی لێی ئەخوات، رەنگە بەهۆی سك ئاوساوییەوە مرداربێتەوە. الحبط:هەڵاوسانی سکی ئاژەڵە بەهۆی زۆر خواردن یان نەخۆشییەوە، ئەوترێ:حبط الرجل والدابة تحبطاً حبطاً، واتا:پیاو و وڵاخەکە سکیان ئاوسا بەئاوسانی. هەروەك ئەوترێ: (السُّلَمِيّ)،هەروەها خراپەی سەروەت و ماڵەکەشی ئەوەیە هەڵپەکردن و هەوڵ و پێداگریی زۆری ئەیکوژێت، ئەگەر نەیکوژێت ئەوە نزیکی کوشتنی ئەکاتەوە. فەرمایشتی:"أو يُلِمُّ"، ئەوە زۆربەی خاوەن سەروەتەکان، سەروەت و ماڵەکانیان ئەوان دەکوژن، خۆیان تاقەت پڕوکێن کردووە لەکۆکردنەوەیدا، کەسانی تر پێویستیان بەو سەروەتەی ژێر دەستی ئەوانەو بەبێ کوشتن و سەرشۆڕکردن و زۆرلێکردنیان ناتوانن نزیکی ئەو سەروەتە ببنەوە.

فەرمایشتی:" إلا آكلة الخضر"، ئەمە شوبهاندنە بۆ کەسێك بەپێی پێویستیی خۆی لەدونیا وەردەگرێ، شوبهاندنێتی بەشەك مەڕێك کە بەئەندازەی برسێتییەکەی گیا دەخوات، ئەوەندە دەخوات تاوەکو هەردوو کەلەکەی پڕ دەبێ.

لەفەرمایشتی:"استقبلت الشمس فثطلت وبالت" سێ سوود هەیە:

**یەکەم:** کە ئەندازەی پێویستی لەوەڕی وەرگرت، لەوەڕگاکە بەجێدەهێڵێ و روودەکاتە خۆر بۆ هەرسکردنی ئەوەی کە خواردوویەتی.

**دووەم:** دووری گرتووە لەخواردنی گژوگیای زیاتر کە لەوە زیاتر زیانی پێ دەدات، روویکردووەتە خۆر کە سوودی پێ دەگەیەنێ و بەگەرمیی هەتاو خواردنەکەی هەرس دەکات و بەپاشەڕۆ فڕێی دەدات.

**سێیەم:** ئەو لەوەڕەی لەسکیدا کۆیکردبووەوە بەپشقل و میز کردن سکی خاڵیی ئەکاتەوە، بەو فڕێدانە پشوو دەدات، چونکە گەر لەسکیدا بمێنێتەوە دەیکوژێت، بۆیە لەبەرژەوەندیی خاوەن سەروەت و ساماندایە هەمان کاری ئەو شەك مەڕە بکات.

سەرەتای فەرموودەکە: شوبهاندنی مرۆڤی چڵێسە لەسووربوون بۆ پەیداکردن و دەستخستنی دونیا، ئەوەی شوبهاندووە بەو وڵاخ و ئاژەڵەی حەزی خواردن و چڵێسییەکەی بەکوشتن و نزیکی کوشتنی گەیاندووە، سەرەنجامی چڵێسیی خاوەن سەروەتیش یان کوشتنە یان نزیك بەوەیە.

وەرزی بەهار جۆر گەلێکی پاقلەمەنی و گژوگیا دەڕوێنێ، ئاژەڵیش زۆری لێ دەخوات تاوەکو با دەیبات(سکی دەئاوسێ)،جا کە ئەو ئاوسانە زۆرو ئەگەری تێپەڕاند، ئەوە ریخۆڵەکانی دەتەقێ و مردار ئەبێتەوە، ئەو مرۆڤەیش هەمان سەرەنجامی هەیە، کە لەسنووری خۆیدا دونیا کۆناکاتەوەو لای خۆی گلی دەداتەوە یان بەناق خەرجی دەکات.

کۆتایی فەرموودەکەش: نمونە هێنانەوەیە بۆ کەسی مامناوەند، شوبهاندوویەتی بەو ئاژەڵەی ئەوەندە گیا دەخوات سکی بئاوسێ و چڵێسییەکەی بۆ خواردنی زیاتر هانی نادات زیاتر لەتوانای خۆی بخوات، بەڵکو بەئەندازەی برسیبوونەکەی ئەخوات، ئەو مرۆڤەش بەو شێوەیەیە کە بەپێی

پێویست لەدونیا وەردەگرێ و پاشان دەڕوات لەشتێکدا خەرجی دەکات سوودی پێ بگەیەنێ. میزو پشقلی ولآخی بەنمونە هێناوەتەوە بۆ ئەو مرۆڤەی لەڕێی حەقدا سەروەتەکەی خەرج دەکات، گلدانەوەشی زیانی پێ دەدات. وەرگرتنی بەئەندازەی پێویستییەکانی لەدەردی کۆکردنەوەی رزگاری دەکات، دەرکردن و خەرجکردنیشی لەدەردی گلدانەوەی رزگاری ئەکات، هەروەك چۆن ئاژەڵ بەفڕێدانی میزو پشپل رزگاری ئەبێ.

لەم فەرموودەیەدا ئامارە هەیە بۆ مامناوەندبوون لەنێوان چلێسیی نێو لەوەڕگا کە بەزۆر خواردن ئەیکوژێ و لەنێوان تەواو دوورگرتن لە لەوەڕگاکە، کە ئەوکات لەبرسێتییدا مردار ئەبێتەوە.

هەروەها رێنمایی و ئامۆژگاریی تێدایە بۆ ئەو کەسەی پارەو سەروەت زیاتر ئەکات تاوەکو هێزو لەشساغی و دڵساغیی خۆی بپارێزێ، ئەویش بەدەرکردنی بەشێك لەو سەروەتەو بەخشینی و با گلی نەداتەوەو هیچی لێ دەرنەهێنێ، چونکە گەر وەهای کرد زیانی لێ دەدات. سەرفرازییش بەخوای گەورەیە.

**نمونەی هەشتەم:** ئەوەی عەمری کوڕی شوعەیب گێڕاویەتییەوە،ئەویش لەباوکییەوە ئەویش لەسولەیمانی کوڕی یەسسارەوە، ئەویش لەمەیمونەوە وتی: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بە(عەمری کوڕی عاص)ی فەرموو: "الدنيا خضرة حلوة، فمن اتقى الله فيها وأصلح، والا فهو كالآكل ولا يشبع. وبين الناس في ذلك كبعد الكوكبين: أحدهما يطلع في المشرق، والأخر يغيب في المغرب"[1]،واتا:

[1] - لاوازە، ئەبو یەعلا لە موسنەدەکەیدا(٧٠٩٩) ئیخراجی کردووە، موسەنای کوڕی ئەلسەباحی تێدایە کەسێکی لاوازە.

دونیا سەوزایی و بەرووبوومێکی خۆشە، هەرکەسێ تیایدا لەخوا بترسێ خۆی چاك دەكات و بەئاگا دەبێ، ئەگەرنا نمونەی کەسێکە هەر دەخوات و تێرنابێ، نێوان خەڵکییش لەوەدا وەك دوورایی نێوان دوو هەسارەیە: یەکێکیان لەرۆژهەڵاتەوە هەڵدێ و ئەوی تر لەرۆژئاواوە ئاوا دەبێ.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)وریایی داوە کە بەهۆی سەوزاییەکەیەوە چاو کەمەندکێش ئەکات و بەهۆی شیرینیی و خۆشییەکەیەوە دڵڕادەکێشێ، وریایی داوە کە ئەوەیان لا خۆشەویست کراوە، بەتایبەت کە ئەوانیش لەودا دروستبوون و تیایدان، هەروەك وتراوە:

ونحنُ بنو الدنيا ومنها نباتُنا        وما أنتَ منه فهو شيءُ مُحَبَّبُ

واتا: ئێمە رۆڵەی دونیاین و رۆکمان لەوێدایە، تۆ کەی بەشێکی لە ئەو، ئەو شتێکی خۆشوویستکراوە.

خەڵکیی کردوەتە دوو بەشەوە: بەشێکیان: چاکەخوازو خواپەرست، لەخواترسی و چاکەخوازییان رێگرە لەوەی بەسەر دونیادا بکەون و چڵێسیی تێدا بکەن و بەناڕەوا پەیدای بکەن و بەناڕەواش خەرجی بکەن، بەڵام ئەگەر تەقواو چاکەخوازییان نەبێ، ئەوە هێزو تواناو پێداگرییان بۆ دەستخستنی دونیا ئەخەنەکار، جا ئەو مرۆڤانە وەك ئەوە وان هەر بخۆن و تێر نەبن، بەڕاستیی ئەمە جوانترین نمونەیەکە، چونکە مەبەست لەخواردن پارێزگاریکردنی هێزو تەندروستییە، بەئەندازەی پێویست بەکاردەهێنرێت، مەبەست خودی خواردنەکە نییە، بۆیە هەرکەسێ حەزی لەسەرووی مەبەستی بێ ئەوە هەرگیز تێرناخوات. لەمەدا پێشەوا ئەحمەد وتوویەتی:لەسەر کەمیی دونیا پاداشت هەیە،بۆ

زۆرییەکەشی پاداشت نییە. هەواڵی داوە لەبارەی جیاوازیی خەڵك لەهەردوو پلەدا، مەبەستم: پلەی لەخواترسی و چاکەخوازی و ،پلەی خواردن و چڵێسی، نێوان دوو کەسی لەو جۆرە، نمونەی نێوان دوو هەسارەن، هەسارەیەك لەرۆژهەڵاتەوە هەڵدێ و ئەوی تر لەرۆژئاواوە ئاوا دەبێ، دیارە نێوان ئەو دووانە زۆر جیاوازە.

**نمونەی نۆیەم**:لەوەی رابوورد لەفەرموودەکەی موستەوریدی کوڕی شەداد کە وتی: لەگەڵ ئەو سوارانەدا بووم کە لەگەڵ پەیامبەردا(صلی الله علیە وسلم) لای لاکێکی مردارەوە بوو(بەرخێکی تازە لەدایکبووی مردارەوە بوو)وەستابوون، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی: ئایە نابینن ئەمە سووك و بێ نرخ بووە بۆیە فڕێیان داوە؟ وتیان: بەڵێ لەبەر بێ نرخبوونی فڕێیان داوە ئەی پەیامبەری خوا، ئەویش فەرمووی: ئەمە چەندە بێ نرخە لای خاوەنەکەی، دونیاش لای خوای گەورە ئەوەندە بێ نرخە[1]. ترمیزیی ئەڵێ: فەرموودەیەکی(حسن صحیح)ە، پەیامبەری خواش(صلی الله علیە وسلم) دونیای بەئەندازەی ئەو مردارەوە بووە نەشوبهاند، بەڵکو لەوە سووکتری کرد لای خوای گەورە.

لەموسنەدی پێشەوا ئەحمەددا فەرموودەیەکی هەمان واتای ئەو فەرموودەیە هاتووە:"فو الذي نفسي بيده، للدنيا عند الله أهون عليه من تلك السخلة على أهلها"[2]،واتا: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەو مردارەوە بووە چەندە لای خاوەنەکەی بێ نرخە،دونیا بەلای خوای گەورەوە لەوە بێ نرخترە.

---

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

[2] - پێشتر تەخریج کرا.

ئەوەی بەسوێند دووپاتکردووەتەوە، جا کە ئەو مردارەوە بووە ئەوەنـدە لای خاوەنەکـەی بـێ نـرخ و دونیـاش لای خـوای گـەورە لـەوە بـێ نرختربـێ، ئـەوە خۆشویستن و عاشقبوون بەدونیا لای خوای گەورە سووك و بـێ نـرختره، ئـەوە لاکی بەرخێکی تازە لەدایکبووە، بۆیـە سـووکتر بـووە بەلایەنـەوە لـەلاکی شـەك مـەڕێك، چـونکە دەیـانتوانی لەشـەك مـەڕە کـە سـوودێك ببیـنن خوریەکـەی لـێ بکەنەوەو پێستەکەی خۆشە بکەن، بەلاَم کە مـردارەوە بووەکـە بـەرخێکی تـازە لەدایکبووبێ، هەر زۆر بێ نرخ بووە، خوای گەورەش پشت و پەنایە.

**نمونەی دەیەم:** نمونەی دونیا نمونەی دەریایەکە، کە تەواوی خـەڵکیی دەبـێ سـەریکەون تـاوەکو بەکەناراوەکـە بگـەن، کـە مـاڵ و نیشـتیمان و شـوێنی گیرسانەوەیان لەوێدایە، بڕینی دەریاکـەش تـەنیا بـەبوونی کەشتیی رزگـاربوون ئەنجام دەدرێ،خوای گەورەش پەیامبـەرانی خـۆی نـاردووە تـاوەکو نەتـەوەکان فێـر بکـەن کەشـتیی رزگـاربوون دروسـتبکەن و سـەرکەونە نـاوی، ئـەویش گوێڕایەڵیکردنی خۆی و پەیامبەرانی و بەتەنیا پەرستن و دڵسۆز بوونە بـۆ خـوای گەورەو هەوڵدانە بۆ ئاخیرەت.

کەسە سەرکەوتووەکان هەڵدەستن و سـەردەکەونە کەشـتییەکان و ئەیانـەوێ رۆبچنە دەریاو بەڕێبکەون، کە دەزانن بەبێ چـوونە دەریـاو مەلـەوانیی دەریاکـە تێپەڕ ناکرێت، بەلاَم گەمژەکان کاری دروستکردنی کەشتییەکەو کەرەستەکانی و سەرکەوتنە کەشتییەکە بەسەخت دادەنـێن و ئـەڵێن: بچـینە دەریـاوە، نـا ئـەوە ناکەین، گەر هەر توانامان نەبوو ئەوە بەمەلەوانێ ئەیبڕین، ئەمـە حـاڵی زۆربـەی ئـەهلی دونیایـە، ئـا بـەو شـێوەیە رۆچـوونەتە دونیـاوە، کـە سـەرناکەونە کەشـتییەکەو مەلـەوانێ ئەکـەن، ئـەخنکێن، بـەلاَم ئەوانـەی نـاو کەشـتییەکە

رزگاریـــان ئـــەبێ هـــەروەك چـــۆن ئەوانـــەی تـــەك نوح(ســـەلامی خـــوای لەسەربێ)رزگاریان بوو، خەڵکانی تری سەر رووی زەویی خنکان.

بڕوانە ئەم نمونەیەو حاڵی ئەهلی دونیا تیایدا، ئەوكات بـۆت دەردەكـەوێ كـە زۆر گونجاوە بەواقیع. ئەم نمونەیە هێنراوەتەوە بـۆ دونیـاو ئـاخیرەت و قـەدەرو فەرمانی خوا، قەدەر دەریایە، فەرمانی خـوا تیایـدا كەشـتییەو كەسـێك رزگـاری دەبێ كە سەركەوتبێتە ئەو كەشتییەوە.

**نمونەی یانزەیـەم:** نمونـەی دونیـا، نمونـەی قـاپێكی پـڕ بەهەنگوینـە، مـێش گـەلێك ببینـن و بـەڕەو رووی بـێن، هەنـدێكی لـەلێواری قاپەكـە ئەنیشـێتەوەو دەست دەكاتە خـواردنی تـاوەكو بـەپێی پێویسـتی خـۆی لێـی ئـەخوات پاشـان باڵدەگرێتەوە، هەندێكی تریان چڵێسیی پاڵیان پێوە دەنێت خۆیـان فـڕێ بدەنـە قـــووڵایی و ناوەڕاســـتی قاپەكـــە، زۆر چـــێژی لـــێ نـــابینن و لەناوەڕاســـتی هەنگوینەكەدا تیادەچن.

**نمونـەی دوانزەیـەم:** نمونـەی تۆوێكـە لـەڕووی زەویـدا پـەرش و بڵاوكرابـێ، داویان لەژێردا دانرابێ، هەندێك تـۆوی تـری نزیـك بـەوە هـەبن و داویـان لـەژێردا نەبێ، باڵندە گەلێك بێن، لەو باڵندانە هەیـە قەناعـەتی بـەتۆوێك و دووان هەیـە و خۆی ناخاتە ناوەڕاستی دانەوێڵەكانـەوە، بـەپێی پێویسـتیی خـۆی لـەو دەنكـە دەنكەی دەورووبەر دەخوات و ئەڕوات، بەڵام باڵندەی تر هەیە چڵێسـیی وەهـای لێدەكات خۆی بخاتە ناوەڕاستی دانەوێڵەكانەوە، تێرنـابێ و هـاواری تەڵـەگرتنی لێ بەرزدەبێتەوە.

**نموونەی سیانزەیەم:** نموونەی پیاوێکە ئاگرێکی گەورەی کردبێتەوە، کولەو پەپوولە ڕۆشناییەکەی ببینن و بۆی بێن و بەدەوریدا بسووڕێنەوە، ئەوەی شارەزایی بەئاگرەکە هەبێ هەر ڕۆشنایی لێ وەردەگرێ و لەدوورەوە سوود لەگەرمییەکەی ئەبینێ. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەفەرموودەیەکیدا ئامـاژەی بەمە کردووە، لەو فەرموودەیەی کە مالیکی کوڕی ئیسماعیل گێڕاویەتییەوە لەحەفصی کوڕی حەمیدەوە، ئەویش لەعیکرەمەوە، ئەویش لەئیبن عەباسەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی ڕازیی بێ)،ئەویش لەعومەرەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"إِنِّي مُمْسك بِحُجزِكُمْ عَن النَّار، وَأَنْتُم تغلبونني وتتقاحمون فِيهَا تَقَاحم الْفراش وَالْجَنَادِب، فَيوشك أن أرسل بِحُجُزِكُمْ "[1]،واتا: من ئێوە لەئاگر بەدووردەگرم، بەڵام ئێوە وەك پەپوولەو کوولە لەبەردەست و بن باڵمەوە دەردەچن و خۆتان دەخەنە ناویەوە. لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە: "مثلي ومثلكم كمثل رجل استوقد ناراً، فلما أضاءت ما حوله، جعلت الفراش والجنادب يتقحمن فيها، فأنا آخذ بحجزكم عن النار، وأنتم تغلبوني وتتقاحمون فيها"[2]،واتا: نموونەی من و نموونەی ئێوە، نموونەی پیاوێکە ئاگرێکی کردبێتەوە، کە دەوروبەری خۆی ڕووناك کردبێتەوە پەپوولەو کوولەی لەدەور کۆهاتبێتەوەو خۆیان فڕێ بدەنە ناو ئاگرەکەوە، من لەئاگرەکە دوورتان دەخەمەوەو ئێوەم

[1] - حسن، ئەلبەزار لە البحر الزخار(٢٠٤) و ئەلهەیسەمیی لەمجمع الزوائد(٣/ ٨٥) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٦٤٨٣) و موسلیم(٢٢٨٤) ئیخراجیان کردووە.

لەدەست دەردەچێ و ئەکەونە ناویەوە. ئەم نمونەیە دەچەسپێت بەسەر ئەهلی دونیادا کە تیایدا رۆچوونە، پەیامبەران ئەوان بۆ ئاخیرەت بانگەواز ئەکەن، کەچیی وەکو کولە پەلاماری دونیا دەدەن.

**نمونەی چواردەیەم:** نمونەی قەومێکن بەسەروەت و کەسوکارییانەوە بۆ گەشتێك دەرچووبن، بەدۆڵێکی پڕ گژوگیاو سەوزایی و ئاو و میوەی زۆردا تێپەڕن، دادەبەزنە ئەو شوێنەو دەوار هەڵدەدەن و کۆشك و خانوو دروست دەکەن، پیاوێك بەلایاندا تێپەڕدەبێ کە بەدڵسۆزی و ئامۆژگاری و سەرڕاستیی دەیناسن، پێیان ئەڵێ: بەچاوی خۆم سوپایەکم لەپشت ئەم دۆڵەوە بینی و نیازیان هەیە هەڵبکوتن بەسەرتاندا، بۆیە دوام بکەون بەرێگەیەکدا بتانبەم رێگەی دوژمن نەبێ و لێی رزگارتان بێ، کۆمەڵێکی کەم بەگوێی ئەکەن، بۆیە هاوار ئەکاتە قەومەکەو ئەڵێ: ئەی قەومەکە خۆتان رزگار بکەن خۆتان رزگار بکەن وا دوژمن هات وا دوژمن هات، ئەوانەی گوێیان لێی ئەبێ هاوار ئەکەنە کەسوکارو ژن و منداڵ و عەشیرەتیان، ئینجا ئەڵێن: ئەی ئێمە بڕۆین لەکاتێکدا مەڕو ماڵات و سەروەت و ماڵمان لەم دۆڵەدایە؟ دڵسۆزکە ئەڵێ: هەریەکەتان چی لەتوانادا بوو با رزگاری بکات، دەنا خۆی و سەروەتیشی تیادەچێ، ئەمە بەسەر خاوەن سەروەت و دەوڵەمەندەکانەوە گران ئەبێ، بۆیە مرۆڤی گەمژەو گێل ئەوکات ئەڵێ: باشتر وایە لەگەڵ ئەوانەی ئێرە چۆڵ ناکەن بمێنمەوە، ئەی ئەوان سەروەت و سامانیان لەمن زۆرترە، چی شتێك بەسەر ئەواندا هات با بەسەر منیشدا بێ، خەڵکانێکی زۆر کەم لەگەڵ ئەو کەسە دڵسۆزەدا رادەپەڕن و خۆیان رزگار دەکەن، لەبەیانییدا سوپا ئەداتە سەر خەڵکی دۆڵەکەداو ئەیانکوژن و سەروەتەکانیشیان ئەبەن.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەخۆی لەفەرموودەیەکدا ئاماژەی بەمە داوەو فەرموودەیەکە یەکدەنگیی لەدروستییەکەیدا هەیە، فەرموودەیەکی ئەبی بوردەیە لەئەبی موساوە، ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی:"إنما مثلي ومثل ما بعثني الله به كمثل رجل أتى قومه فقال: يا قوم إني رأيت الجيش بعيني وأنا النـذيرُ العريـانُ، فالنجـاة النجـاة. فأطاعـه طائفـةٌ مـن قومه، فأدلجوا وانطلقوا على مَهْلِهم فنجوا. وكذبت طائفة منهم فأصبحوا مكـانهم، فصبَّحهم الجيشُ فأهلكهم، واجتاحهم. فذلك مثلُ من أطاعني، واتبع ما جئـت بـه، ومثل من عصاني وكذب بما جئـت بـه مـن الحـق"[1]،واتـا: نمونـەی مـن و نمونـەی ئەوەی خوای گەورە منی پێ ناردووە، نمونـەی پیاوێکـە دێتـەلای قەومەکـەی و ئەڵێ: ئەی قەوم، من بەمدوو چاوانەی خۆم سـوپایەکم بینـی و وریاکـەرەوەم بـۆ ئێوە، خۆتان رزگار بکەن، خۆتان رزگار بکـەن، کۆمـەڵێك لەقەومەکـەی بـەگوێی ئەکەن و شەو بەهێواشییەوە خۆیـان رزگـار ئەکـەن، بـەڵام ئـەوانی تـر بەڕاسـتی نازانن و لەشوێنی خۆیاندا دەمێننەوەو بەیانیی زوو سوپاکە دەدات بەسـەریانداو هـەموویان دەکـوژن و سەروەتەکانیشـیان ئەبـەن، ئەوانـەی وا شـوێن پیاوەکـە کـەوتن، نمونـەی ئەوانـەن کـە گوێڕایـەڵی مـنن و شـوێن پەیامەکـەم کـەوتوون، ئەوانەشی بەڕاستیان نەزانی و دوای نەکەوتن، نمونـەی ئەوانـەن کـە سەرپێچیی فەرمانی منیان کردو شوێن ئەو پەیامە حەقە نەکەوتن کە من پێوەی نێردراوم.

**نمونـــەی پانزەیـــەم:** پیاوێـــك خانوویـــەك دروســـت دەکـــات و ئەیڕازێنێتەوە،لەهەموو کەرەستەو کەلوپەلێکی بـۆ دابین دەکـات و خـەڵکیی بـۆ بانگـەواز ئـەکات، هەرکەسـێ بچـێتە ژوورەوە لەسـەر جێگەیـەکی نـەرم

---

[1] – بوخاری(٧٢٨٣) و موسلیم(٢٢٨٣) ئیخراجیان کردووە.

دایدەنیشێنێ و دەفرێکی ئاڵتوونیی بۆ دەهێنێ گۆشتی لەسەرەو چی خواردن و خواردنەوەیەکی خۆش و پێویستی پێ هەبێ لەسەر سینییەك لەبەردەمیدا بۆی دادەنێت، کۆیلەو خزمەتکارەکانی خزمەتی ئەکەن، مرۆڤی ژیر دەزانێ هەموو ئەوانە لەخواردن و کەلوپەل و کۆیلەو خزمەتکارەکان مولکی خاوەن ماڵەکەن، بۆیە لەماوەی ئەو میوانداریيەدا چێژ لەو میوانداریيە ئەبینێ و دڵی پێوەی پەیوەست ناکات و لەدڵی خۆیدا ئەوە دروست ناکات مولکی ئەو بن، بەڵکو وەك میوانێك شوێن خاوەن ماڵ ئەکەوێ، لەکوێ داینیشاند لەوێ دادەنیشێ و کەی خواردنی خستەبەردەم ئەوکات خواردن ئەخوات، لەوە بەدەر پرسیار و داوای هیچ شتێك ناکات، ئەوەندەی بەسە کە دەزانێ خاوەن ماڵەکە رێزی لێ دەنێ، بەبەرێزییەوە چووەتە ماڵەکەو بەرێزەوە چێژی لێ بینیووەو بەرێزیشەوە لێی دەرچووەو ئەوکات خاوەن ماڵەکەش گللەییەکی لەسەر نییە، بەڵام مرۆڤی گەمژە وەها دەزانێ خۆی خاوەن خانووەکەیەو شتەکان بەمولکی خۆی دەزانێ و بەپێی ئارەزوو ویستی خۆی مامەڵەیان پێوە ئەکات، خۆی شوێنی دانیشتنی خۆی دەستنیشان ئەکات و شتەکان جێ گۆرکێ ئەکات، هەرکات خاوەن ماڵ شتێکی بخاتەبەردەم بەمولکی خۆی دەزانێ و وەها خەیاڵ ئەکات لەوانی تر تایبەتترە، خاوەن ماڵ ئەوە دەبینێ، بەڵام رێزو بەخشندەییەکەی دەبنە رێگر لەوەی کابرای گەمژە لەماڵ وەدەربنێ، تائەو کاتەی زانیی خۆی کرد بەخاوەن شتەکان و خانووەکە و وەك خاوەنی راستەقینەی مامەڵەی کردو تیایدا نیشتەجێ بوو،ئەوکات خاوەنی راستەقینە کۆیلەو خزمەتکارەکانی خۆی بۆی

دەنێرێ و بە پاڵ لەماڵەکە دەریدەکەن و هەموو شتێکی لێ وەردەگرنەوە، ئەوکات هەموو بەخششێکی خاوەن ماڵ لەدەست دەدات و لای ئەو خزمەتکارو خەڵکەش شەرمەزارو ریسوا ئەبێ.

با مرۆڤی ژێر لەم نمونەیە رابمێنێ و مافی رامانی پێ بدات، بێگومان نمونەیەکی گونجاوە بەحەقیقەت، خوای گەورە پشت و پەنایە.

عبداللەی کوڕی مەسعود(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: هەموو کەسێك لەم دونیایەدا میوانە، ماڵ و سامانەکەی ئەمانەت پێی دراوە، میوان شوێنەکە بەجێدەهێڵێ و ماڵی ئەمانەتیش دەدرێتەوە خاوەنی راستەقینەی[1].

لەصەحیحەیندا هاتووە لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ:ئەبو تەڵحە کوڕێکی مرد کە لەئوم سولەیم بوو، ئوم سولەیم بەکەسوکارەکەی وت: بۆ ئەبو تەڵحەی باس مەکەن، خۆم بۆی باس دەکەم، ئەبو تەڵحە هاتەوە، ئوم سولەیم نانی ئێوارەی خستەبەردەمی و چێشتی خواردو ئاوی خواردەوەو خزمەتی کردو سەرجێیان کرد، کە بینی نانی خواردووەو سەرجێی کردووە وتی: ئەی ئەبا تەڵحە، گەر قەومێك شتێکیان بەئەمانەت لای ماڵێك دانا، دواتر داوای ئەمانەتەکەی خۆیان کردەوە، ئایە دەکرێ ماڵەکە ئەمانەتەکەیان بۆ نەگەڕێننەوە؟ وتی: نابێ. وتی: وەهای دابنێ ئەو ئەمانەتە کوڕەکەی خۆتە. ئەبو تەڵحە تووڕە بوو وتی:وەهات کرد رابوێرم و پاشان هەواڵی کوڕەکەم پێ بدەی. دەرچوو تاوەکو هاتەلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و بۆی باسکرد چی روویداوە، پەیامبەری خواش(صلی

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

الله عليـه وسـلم) فـەرمووی:"خوای گـەورە بەرەکـەت بخاتـە شـەوەکەتانەوە" فەرموودەکەی باسکردووە[1].

نمونەی شانزەیەم: قەومێك رێگەیەکی چۆڵەوانیی وشکی بێ ئاو ئەگرنەبەر، تووێنووێتیی روویان لێ ئەکات و ئەگەنەسەر دەریا،ئاوی دەریاکە زۆر تاڵ و سوێرە، ئەوەندە تینوویان ئەبێ هەست بەتاڵی و سوێریی ئاوەکە ناکەن، هەر لێی دەخۆنەوەو تێرنابن، چەندەی لێ بخۆنەوەو ئەوەندەی تر تینوو ئەبن، تائەوەی ریخۆڵەکانیان دەپچڕێ و دەمرن. ژیرەکانیان دەزانن ئاوی دەریاکە تاڵ و سووێرە،چەندەی لێ بخۆنەوەو زیاتر تینووتر ئەبن، بۆیە لێی دووردەکەونەوە تاوەکو خاکێکی شیرین دەدۆزنەوەو بیرێکی لێ هەڵدەکەنن و ئاوێکی سازگارو خۆشی لێ دەردەهێنن، لێی دەخۆنەوەو هەویری لێ دەشێلن و چێشتی لێ دروست دەکەن و بانگدەکەنە براکانیان کە لەسەر لێواری دەریاکەن: وەرن بۆلای ئاوێکی سازگار، کەچی هەندێك لەوانەی لەسەر لێواری دەریاکەن گاڵتەجاڕیی ئەکەن و هەندێکی تریان پشتیان لێ دەکەن و بەئاوی دەریاکە رازیین، ئەوەی بەدەمیانەوە دەچێ تاك و تەرایە. خودی ئەم نمونەیە مەسیح(عليه السلام)هێناویەتییەوە و ئەفەرمووێت: نمونەی مرۆڤی دونیاویست، نمونەی کەسێکە ئاوی دەریا بخواتەوە، چەندە لێی بخواتەوە ئەوەندەی تر تینووتر ئەبێ تاوەکو ئەیکوژێ[2].

---

[1] - بوخاری(١٣٠١) و موسلیم(٢١٤٤) ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(٣٤٢) ئیخراجی کردووە.

**نمونەی حەڤدەیەم:** نمونەی مرۆڤ و نمونەی سەروەت و کارو عەشیرەتەکەی، نمونەی پیاوێکە سێ برای هەبێ، گەشتێکی ناچارانەی ماوە درێژی لەبەردەمدایە، بانگی سێ براکەی ئەکات و ئەڵێ: وەك دەبینن کاتی ئەو گەشتە دووروودرێژە هاتووە، ئێستا زیاتر پێویستم بەئێوە هەیە. یەکێکیان وتی:تاوەکو ئێستا برام بووی، لێرەوە ئیتر نە برامی و نە هاوڕێ و جگە لەو برایەم هیچ برایەکی ترم نییە. بەبراکەی تری ئەڵێ: تۆ چیت پێیە؟ ئەڵێ: تۆ تاوەکو ئێستا براو هاوڕێم بووی، لەگەڵتدا ئەبم تاوەکو ئامادەی گەشتەکەت ئەکەم و سەر ولأخەکەت ئەخەم،ئیتر لەوەو دوا هاوڕێ و کەسی من نییت، پێی ئەڵێ: لەگەشتەکەمدا پێویستم بەوەیە لەگەڵمدا بی. ئەڵێ: ئەوەت بۆ ناکەم و بەهیچ شتێك سوودی ئەوەم لێ نابینی. بەسێیەم ئەڵێ:تۆ چیت پێیە؟ ئەڵێ: من هاوەڵ و کەست بووم لەلەشساغی و نەخۆشییتدا و ئێستاش هاوڕێ و کەسی تۆم، لەگەڵتدا ئەبم لەبەڕێخستن و رۆیشتندا، بۆ کوێ بڕۆی لەگەڵتدام، لەکوێ دابەزی منیش لەوێدا دادەبەزم، کە گەیشتیتە ئەو شوێنەی خۆت منیش هەر لەگەڵتدا ئەبم و لێت جیانابمەوە. ئەویش ئەڵێ: تۆ نرخی وەهات لام نەبوو، ئەو دوو برایەی ترم بەلاوە گرنگتر بوو، بەسەر تۆدا ئەوانم پێشدەخست، خۆزگە نرخ و مافی تۆم دەزانی و تۆم بەسەر ئەواندا پێشدەخست.

یەکەم: سەروەتەکەیەتی. دووەم: خزم و عەشیرەت و هاوڕێکانێتی. سێیەم: کاروکردەوەکانێتی.

نمونـــەی ئـــەم پەنـــدو نمونەیـــە لەفەرموودەیـــەكی مرفوعـــدا هـــاتووە، بـــەلاَم دروســـتییەكەی نەســـەلماوە، ئـــەبو جەعفـــەر ئەلعوقـــەیلی[1] گێڕاویەتییـــەوە لەكتێبی(الضعفاء)دا لەفەرموودەیەكی ئیبن شیهاب ئـەویش لـەعوروەوە ئـەویش لەعائیشەوە، هەروەها فەرموودەیەك لەئیبن ئەلموسەیبەوە ئەویش لەعائیشـەوە بەمەرفوعی كە لەخودی خۆیدا نمونەیەكی دروست و گونجاوی واقیعە[2].

**نمونەی هەژدەیەم:** باشترین نمونەیەكە: پادشایەك خانوویەك دروست دەكات كـە كـەس هاوشـێوەی نـەبینیووەو نەبیسـتووە لـەجوانی و فراوانییـدا و هـیچ خانوویـەك هـەموو كەرەسـتەو كەلوپـەلی نمونـەی ئـەوی تێـدا نـەبووە. ڕێگەیـەك دەكاتەوە بۆ سەر ئەو كۆشك و خـانووەو جاڕدەرێك دادەنـێ خـەڵكیی بـۆ بـانگ بكات، لەسەر ڕێگاكەش ئافرەتێكی جوان دادەنێ كە بەهەموو خشڵ و جوانییەك ڕازێنراوەتـەوەو هـەموو خـەڵكیی بەسـەریدا تێپـەڕ ئـەبن و كۆمـەڵێ هاوكـارو دەستوپێوەندیشی بۆ داناوەو تووێشوویەكی خستووەتە دەسـتی ئـەو ئافرەتـەو دەست و پێوەندەكانی و بەوانەی دەدەن كە لەو ڕێگەیەدا بۆلای پادشا دەڕۆن و بەئافرەتەكـەش ئـەڵێ: هەركەسـێ چـاوی لەسـەر تـۆ وەرگێـڕاو لەگەیشـتنە مـن بەتۆوە سەرقاڵ نـەبوو، ئەوەنـدە تووێشـووی لـە تـۆ ویسـت بـەمن بگـات، ئـەوە لەگەشـتەكەی بـۆ لام كێشـەی بـۆ دروسـت مەكـە، بـەڵكو بەهـەموو ئـەوەی لـەم گەشـــتەیدا زوو بـــەمنی دەگەیـــەنێ هاوكـــاریی بكـــە. هەركەســـێكیش چـــاوی خستەسەرت و پێت ڕازیی بوو، تۆی بەسەر مندا پێشخست و داوای كـرد بـە تـۆ

---

[1] - موحەممەدی كوڕی عەمری كوڕی موسای كوڕی حەمادی ئەلعوقەیلیی ئەلمەككی، ئەبو جەعفەر: یەكێك بوو لەحافیزەكانی فەرموودە، ساڵی(٣٢٢ك)مردووە.

[2] - بڕوانە: ئەوەی بوخاری(٦٥١٤) و موسلیم(٢٩٦٠) ئیخراجیان كردووە.

بگات، ئەوە خراپترین ئازاری پێ بدەو تەواو سووکی بکەو بەکارییهێنەو بهێڵە وەك ئاژەڵێ درو کێویی بەدواتەوە رابکات. هەرکەس لە تۆی خوارد، بەو خواردنە کەمێك بیخەڵەتێنە، پاشان هەمووی لێ وەربگرەوەو شوێنکەوتەو خزمەتکارو کۆیلەکانی خۆتی بەسەردا زاڵبکە، هەرکاتێ لەخۆشویستن و گەورەو رێزگرتنی تۆدا زیادەڕۆیی کرد، تۆش بەرانبەر بەوە سووك و ریسوای بکەو لێی دووربکەوەرەوە تاوەکو لەحەسرەتدا لەسەر تۆ هەناسەی لێ دەبڕێت.

بڕوانەو لەم نمونەیە رابمێنە، ئەمە حاڵی داخوازیکارانی دونیاو ئاخیرەت خوازانە، خوای گەوەش پشت و پەنایە. ئەم نمونەیە لەو ئەسەرەوە وەرگیراوە کە لەخوای گەورەوە گێڕدراوەتەوە:"یا دنیا اخدمي مَنْ خدمني، واستخدمي مَنْ خدمك"[1]،واتا: ئەی دونیا خزمەتی هەرکەسێ بکە خزمەتی من دەکات و بیکەرە خزمەتکارو بەکارییهێنە ئەو کەسەی خزمەتی تۆ دەکات.

**نمونەی نۆزدەیەم:** پادشایەك نەخشەی شارێك دادەڕێژێ لەباشترین شوێندا، کە باشترین هەواو زۆرترین ئاو و رووبارو جۆگە و درەختی رووای تێدایە، بەخەڵکەکەی ئەڵێ: پێشبڕکێ بکەن و باشترین شوێنێکی بۆ خۆتان بگرن، هەرکەسێ زوو پێبگەیشت ئەوە شوێنی ئەوە،کێیش دواکەوت ئەوە شوێنەکەی بۆ ئەو کەسەیە پێشی کەوتووە، ئەوەی زوو فریای کەوتبێ شوێنی خۆی دیاریکردووەو چووەتە ماڵی خۆی، ئەوەی دەمێنێتەوە حەسرەت هەڵکێشەکانە. شوێن و گۆڕەپانی پێشبڕکێکەی داناوە، درەختێکی گەورەی لەوێدا داناوە کە سێبەرێکی مەودا درێژی لەسەر رێگەو گۆڕەپانەکە دروستکردووەو لەژێریشیدا ئاوێك هەیە رێ دەکات، جۆرەها میوە بەو دارەوە هەیەو جۆرەها باڵندەی دەنگ

---

[1] - هەڵبەستراوە(موضوع)ە، هەروەك لە(تذكرة الموضوعات)ی الفتني(لا١٧٥)دا هاتووە.

خۆش و سەیری بەسەرەوە هەیە، پێیانیش ئەڵێ: بەم درەخت و سێبەرەی بەخشتەدا نەچن، ئەمە بەم زووانە لەڕیشە دێت و سێبەرەکەی نامێنێ و بەرووبوومەکەشی نامێنێ و باڵندەکانیشی ئەمرن، بەلاّم شاری پادشا خواردنەکەی هەمیشەییە و سێبەرەکەی درێژەو خۆشییەکانی هەمیشەیی و بێ کۆتان، شتانێکی تێدایە نە چاوەکان بینیوویانە و نە گوێیەکان بیستوویانەو نە بەختوورەی دڵی هیچ مرۆڤێکیشدا هاتووە....خەڵکیی ئەمە ئەبیستن بۆی دەردەچن، بەڕێگەیاندا بەماندوویەتی و گەرمی و تینوویێتیی بەلای ئەو دارەدا تێدەپەڕن، بۆیە هەموویان دادەبەزنە سێبەرەکەی و چێژی بەرهەمە خۆشەکانی ئەکەن و گوێبیستی ئاوازی باڵندەکانی ئەبن، پێیان ئەوترێ:ئێوە دابەزینە ئەم سێبەرە بۆ پشوودان و دووبارە سواربوونەوە بۆ پێشبڕکێیەکە، بۆیە ئامادەی سەرکەوتنە سەر ولاّخەکانتان بن و ئامادەبن، کە جاڕدەر بانگی کرد گوریسی پێشبڕکێ توند بکەن و بۆی دەربچن، زۆرینە ئەڵێن: چۆن دەستبەرداری ئەم سێبەرە گەورەو ئاوە سازگارو میوە پێگەیشتووەو خۆشی و حەسانەوەیەی ئەم شوێنە ببین و بچینە گەرماو نێو تەپوتۆزو ماندوویەتییەکی زۆرو گەشتێکی دوورو چۆڵەوانییەکی تینووهێنەر کە ریخۆڵەکان لەتینوویێتییدا ئەپچڕێن؟ چۆن ئەم سەروەتە ئامادەیەی ئێستا بەشتێکی نادیار بفرۆشین، شتێك کە لەپێش چاومانە بەشتێك بگۆڕینەوە کە نایبینین؟ تۆزقاڵێك پارە لەدەست بێ باشترە لەگەوهەرێك بەڵێن بێ بەیانیی پێت بدرێت.

ئەوە هەڵبگرە کە دەیبینی و وازبهێنە لەشتێك بەس گوێت لێ بووە، ئێمە رۆڵەی ئەمڕۆین، ئەمە ژیانی ئێستایە چۆن دەکرێ دەستبەرداری بین بۆ ژیانێکی نادیار لەولاّتێکی دیاریکراودا کە نازانین کەی پێی دەگەین؟ لەهەر هەزار کەسێك

یەك کەس هەڵدەستێ بۆ بەڕێکەوتن و ئەڵێن: سوێند بەخوا شوێنی ئێمە ئەم سێبەرە هەڵوەریوە نییە، کاتی هەڵوەرین و نەمانی بەرو مردنی باڵندەکانی هاتووە، ئێمە لەپێشبڕکێیەکە بەردەوام ئەبین بۆ ژێر سێبەری هەمیشە بەردەوام و ژیانی خۆش، ئاخۆ شیاوە گەشتیار لەژێر سێبەرێکدا پشوویەکی کورتی دا خێوەتەکەی هەڵبدات و ئەو شوێنە بکاتە نیشتیمانی خۆی و لەترسی سەرماو گەرما خانووی تێدا دروست بکات؟ ئاخۆ ئەوە جگە لەوەی زۆر گێل و گەمژەیە شتێکی تر هەیە؟ بۆیە پێشبڕکێ بکەن پێشبڕکێ بکەن:

| | |
|---|---|
| حكم المنية في البرية جاري | ما هذه الدنيا بدار قرار |
| اقضوا مآربكم سراعا إنما | أعماركم سفر من الأسفار |
| وتراكضوا خيل السباق وبادروا | أن تسترد فإنهن عواري |
| ودعوا الإقامة تحت ظل زائل | أنتم على سفر بهذي الدار |
| من يرجو طيب العيش فيها إنما | يبني الرجاء على شفير هار |
| والعيش كل العيش بعد فراقها | في دار أهل السبق أكرم دار |

واتا: بڕیاری مردن بەسەر مرۆڤەکاندا بەردەوامەو ئەم دونیایە شوێنی گیرسانەوە نییە، خێرا کارو نیازی خۆتان ڕێکبخەن، بێگومان تەمەنی ئێوە هەر گەشتێکەو هیچی تر. ئەسپی پێشبڕکێتان ساز بدەن و خێرا بکەن، وازبهێنن لەمانەوە لەژێر سێبەرێکی هەڵوەریوودا، چونکە ئێوە لەم شوێنەدا ڕێبوارێکن.

هەرکەسێك تیایدا ئومێدی ژیانێکی خۆش بکات، ئەوە لەسەر لێواری هەرەس ئومێدی خۆی هەڵچنیووە، بێگومان ژیان ژیانی دوای بەجێهێشتنی دونیا لەبیری خەڵکانی پێشبڕکێکاردایە،کە بەرێزترین و خۆشترین شوێنە.

بۆیە پەتی پێشبڕکێ ئەگرن و لەکەمیی هاوڕێی گەشت ناترسێن، بەعەزیمەت و ورەوە بەرێدەکەون و لەسەرزەنشتی هیچ سەرزەنشتکارێك ناترسێن، ئەوانەشی لەژێر سێبەری دارەکەدا ماونەتەوە بۆ خۆیان خەوتوون، سوێند بەخوا زۆر ناخایەنێ چڵەکانی درەختەکە دەتوێنەوەو گەڵاکانی دەوەرن و بەروبومەکانی نامێنێ و لقەکانی وشك ئەکات و لەریشە دێت، خەڵکەکەی ژێریشی ئەکەونە بەر هەتاوێکی سەخت و ئەتلێنەوە لەخەفەتدا،ئاخۆ بۆچی لەژێر سێبەری ئەو دارەدا ژیانی خۆشیان لەدەستچوو. لەناکاو دارەکە گڕ دەگرێ و دەوروبەریان دەبێتە بڵێسەی ئاگر، کەسیان ناتوانێ لێی دەربچێ، ئەڵێن: ئەو سوارانە کوان کە لەگەڵماندا لەم سێبەرەدا پشوویان داو پاشان رۆیشتن و بەجێیانهێشت؟ پێیان ئەوترێ: سەرتان بەرزبکەنەوەو بڕوانن ماڵەکانیان دەبینن، دەڕوانن و لەدوورەوە کۆشك و ژوورەکانی شارەکەی پادشا ئەبینن و هاوڕێکانیان چێژ لەجۆر گەلێکی خۆشیەکانی ئەکەن، بەوە خەم و خەفەتیان زۆرتر ئەبێ ئاخۆ بۆ لەگەڵیاندا نەبوون، حەسرەت و پەشیمانیان زۆرتر ئەبێتەوە کە لەحەزو ئارەزووەکانیان ئەکرێن و ئەوترێ: ئەمە پاداشتی ئەوانەیە کە دواکەوتن: ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٨﴾﴾ النحل: ١١٨، واتا: ئێمە ستەممان لێ نەکردوون بەڵکو خۆیان ستەمیان لەخۆیان دەکرد.

**نمونەی بیستەم:** ئەوەیە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەبەرگێك نمونەی هێناوەتەوە، بەرگێکی دڕاو کە بەدەزوویەك لەخوارەوەی ماوەتەوە هەڵواسراوە، ئاخۆ مانەوەی ئەو دەزووە چی سوودێك دەگەیەنێ؟ ئیبن ئەبی ئەلدونیا ئەڵێ: فەزڵی کوڕی جەعفەر بۆی باسکردین، وەهبی کوڕی بەیان بۆی باسکردین، یەحیای کوڕی سەعیدی ئەلعەتار بۆی باسکردین، ئەبو سەعید خەلەفی کوڕی حەبیب بۆی باسکردین، ئەویش لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوای لێ رازیی بێ)وتی: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی: " مثل هذه الدنيا مثل ثوب شق من أوله إلى آخره، فبقي معلقا بخيط في آخره، فيوشك ذلك الخيط أن ينقطع"[1]،واتا:نمونەی ئەم دونیایە،نمونەی بەرگێکە لەم سەرەوە تاوەکو ئەوسەری دڕابێ و بەدەزوویەکی خوارەوەی هەڵواسرابێ و پچڕانی ئەو دەزووەش نزیك و ئەگەر کراوە.

بەم نمونەیە ویستم زیاتر روونبێتەوە، بڕوانە ئەوەی ئەحمەد لەموسنەدەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەی ئەبی نەضرەوە، ئەویش لەئەبی سەعیدەوە وتی: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەڕۆژدا نوێژی عەسری پێکردین، پاشان هەڵساو وتارێکی بۆ داین، لەو وتارەدا هیچ شتێکی بەجێنەهێشت لەپێش هاتنی قیامەت و هەمووی باسکرد، ئەوەی لەبەری کرد کە لەبەری کردو ئەوەشی لەبیری چووەوە کە لەبیری چووەوە، خەڵکی

---

[1] - لاوازە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنيا(٢٢١) و بەیهەقیی لە شعب الإيمان(١٠٢٤٠) ئیخراجی کردووە، یەحیای کوڕی سەعیدی ئەلعەتار(العطار)ی تێدایە کەسێکی لاوازە.

لایانکردەوە بەلای خۆردا ئاخۆ خۆر بەئاسمانەوە ماوە؟ ئەویش فەرمووی:«أَلَا إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا فِيمَا مَضَى مِنْهَا إِلَّا كَمَا بَقِّيَ مِنْ يَوْمِكُمْ هَذَا فِيمَا مَضَى مِنْهُ»[1]،واتا: لەکاتەکانی ئەم ڕۆژە چەندەتان ماوە بۆ خۆرئاوابوون، ماوەی دونیاش هەر ئەوەندەی ماوە.

حەفسی کوڕی غەییاس گێڕاویەتییەوە لە لەیسەوە، ئەویش لەموغیرەی کوڕی حەکیمەوە ئەویش لەئیبن عومەرەوە وتی: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)دەرچوو بۆ لامان و خۆریش لەنێو گەڵای دارخورماکانەوە دیاربوو، فەرمووی:"ما بقي من الدنيا إلا مثل ما بقي من يومنا هذا فيما مضى منه"[2]،واتا: بەئەندازەی ئەو ماوە کەمەی کە لەمڕۆماندا ماوەتەوە، ماوەی دونیاش هەر ئەوەندەی ماوە.

ئیبن ئەبی ئەلدونیا گێڕاویەتییەوە لەئیبراهیمی کوڕی سەعدەوە، موسای کوڕی ئیسماعیل بۆی باسکردین، موسای کوڕی خەڵەف بۆی باسکردین، ئەویش لەقەتادەوە، ئەویش لەئەنەسەوە: کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)لەکاتی خۆرئاوابووندا وتاری داو فەرمووی:«ما بَقِي مِنَ الدُّنْيَا فِيمَا مَضَى مِنْهَا إِلَّا كَمَا بَقِّيَ مِنْ يَوْمِكُمْ هَذَا فِيمَا مَضَى مِنْهُ»[3]، واتا:لەکاتەکانی ئەم ڕۆژە چەندەتان ماوە بۆ خۆرئاوابوون، ماوەی دونیاش هەر ئەوەندەی ماوە.

---

[1] - حسن، ترمیزی(٢١٩١) و ئەحمەد(٣/ ١٩) ئیخراجیان کردووە.

[2] - صەحیحە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە قصر الأمل(١٢٠) ئیخراجی کردووە.

[3] - حسن، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە قصر الأمل(١٢١) ئیخراجی کردووە.

دونیا هەمووی وەك یەك رۆژە، ناردنی پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) لەكۆتایی ئەو رۆژەدایە بە كەمێك لەپێش خۆرئاوابوونی.

جابرو ئەبو هورەیرە(خوای گەورە لەهەردووكیان رازیی بێ) ئەوانیش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:« بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ »[1] ،واتا: نێوان من و هاتنی قیامەت، وەك نێوان ئەم دوو پەنجەیەیە. ئاماژەی كردە پەنجەی شایەتوومان و زەرپەنەقووتە.

لەپێشین وتوویانە: ئارامبگرن، بێگومان دونیا چەند رۆژگارێكی كەمە، ئێوەش رێبوارێكی وەستاون، رەنگە یەكێكتان بانگ بكرێ و وەڵام بداتەوەو ئیتر لانەكاتەوە،بێگومان هەواڵی مردنی خۆتانتان پێ دراوە، مەرگ بەندیخانەیەكە ئەبێ بەسەرتاندا بێ، خوای گەورە لەبۆسەدایە بۆ مرۆڤ.

**نمونەی بیست و یەك:** نمونەی دونیا وەك حەوزێكی پڕ ئاوە، دانراوە بۆ ئاوخواردنەوەی مەڕو مالاّت و مرۆڤ، بەزۆر خواردنەوەی لەو ئاوە لێی كەمدەبێتەوە تائەوەی لەخوارەوەیدا ئاوێكی لێڵ ئەمێنێتەوە، ئاژەڵەكان میزیان تێ كردووەو خەڵك و مەڕومالاّت تیایدا گەوزاون، هەروەك موسلیم لەصەحیحەكەیدا لەعوتبەی كوڕی غەزانەوە ئەگێڕێتەوە: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەوتارێكیدا پێیانی فەرموو:"إِنَّ الدُّنْيَا قَدْ آذَنَتْ بِصَرْمٍ، وَوَلَّتْ حَذَّاءَ، وَلَمْ يَبْقَ إِلَّا صُبَابَةٌ كَصُبَابَةِ الْإِنَاءِ يَتَصَابُّهَا صَاحِبُهَا،وَأَنْتُمْ مُتَحَمَّلُونَ إِلَى دَارٍ ذِي مُقَامَةٍ، فَانْتَقِلُوا خَيْرَ مَا بِحَضْرَتِكُمْ"[2] ،واتا: دونیا جاڕی پچڕان و نەمانی پێ دراوەو خێرایە بۆ رۆیشتن، ئەوەی لێ ماوەتەوە نمونەی چۆڕە ئاوێكە لەدەمری

---

[1] - بوخاری(٦٥٠٥) و موسلیم(٨٦٧) ئیخراجیان كردووە.

[2] - موسلیم(٢٩٦٧) ئیخراجی كردووە.

خاوەنەکەیدا، ئێوە بەپێدەخرێن بۆ شوێنی گیرسانەوەی هەمیشەیی، ئێوەش تائەوکاتەی لەدونیادان بەباشترین شێوە سوودی لێ ببینن بۆ ئەو رۆژە.

عبداللەی کوڕی مەسعود ئەڵێ: خوای گەورە هەموو دونیای کەم داناوە، ئەوەشی لێ ماوەتەوە کەمێکی ئەو کەمەیە، ئەوەی لێ ماوەتەوە نمونەی ئاوێکی لێڵی گۆماوێکی بچووکە.

**نمونەی بیست و دوو:** قەومێك بۆ ماوەیەك لەشارێکدا نیشتەجێ دەبن، رووداو و ناخۆشیی زۆر لەو شارەدا روو دەدات، کوشتن و بڕینی تێدا ئەبێ، سەربازانی خراپ و تاڵانیی بەسەریدا دەدەن، بۆیە پادشاکەیان لەشوێنێکی تردا شارێکیان بۆ بوونیات دەنێ کە ناخۆشی و بەلاَ رووی لێ نەکات، پێداگریش ئەبێ بۆ رووخاندنی شاری یەکەم، نوێنەر دەنێرێتەلای دانیشتوانەکەی و جاڕ دەدات کە دوای سێ رۆژی تر شار چۆڵ دەکەن و کەس بەجێ نەمێنێ، فەرمانیان پێ دەکات چی شتێکی باشیان هەیە لەگەوهەرو ئاڵتوون و زیوو شتی گرانبەهاو بەنرخ بەلای پادشایانەوە هەڵبگرن و بۆ شاری نوێی ببەن، پادشا کەرەستەی گواستنەوەیان بۆ دەنێرێ و رێگەیان پیشان دەدات و نێردراوەکانیشی دەنێرێ هانیان بدەن و پەلە بکەن، کەچی دەبنە چەند کۆمەڵێکەوە، کەمترینیان بەکورتیی ماوەی مانەوەیان لەشارە کۆنەکە دەزانن، دڵنیا ئەبن گەر دەستپێشخەریی نەکەن و چاکترینی شتی شار بۆ شاری پادشا نەبەن،ئەوە کاتی تەواویان بۆ نابێ و ئیتر ناتوانن شتەکان بگوازنەوە، بۆیە بەنەزانیی ئەزانن ئەو ماوە کەمە بەکۆکردنەوەی شتە بێ بەهاو کەم نرخەکانەوە خەرج بکەن، پرسیار دەکەن چی شتێکی ئەو شارە بەلای پادشاوە باشترین و جوانترینەو سوودی بۆ خۆیشیان ئەبێ لەشاری نوێدا، کە زانیان چی باش و بەنرخە، ئیتر

تەماشای شتانی تر ناکەن، دەزانن گەر گەوهەرێکی گەورەو نرخداریان دەسکەوت، ئەوە بەلای پادشاوە باشترە لەبارە پارەو ئاسن، بۆیە خەم و پەژارەیان دەبێتە کۆکردنەوەی شتی گرانبەهاو بەنرخ بەلای پادشاوە با لەبینینی چاویشدا کەم دیاربێ.

کۆمەڵێکی تر پەلاماری کۆڵوباری قوورس دەدەن و پێشبڕکێی زۆرکردنی دەکەن، ئەوانە کۆمەڵە پلەو پایەیەکن، هەیانە کۆڵوبارەکانیان پارەیە، هەیانە شتانی ترە، هەریەکەو بەپێی خەم و شیاوێتیی خۆی کۆڵی هەڵگرتووە، بەڵام پەژارەیان کەوتووەتە سەر ئامادەکردنی کۆڵوبارەکان و گواستنەوەیان لەو شارەوە، کەچی کۆمەڵێکی تر رودەکەنە ئاوەدانکردنەوەی کۆشکەکانی شارو بەخۆشییەکانییەوە سەرقاڵ ئەبن شەڕی ئەوانە ئەکەن کە چۆڵی ئەکەن و ئەڵێن: ناهێڵین هیچ کەلوپەلێکی ئێمە ببەن، ئەگەر بەشدارمان بن لەئاوەدانکردنەوەی شارو نیشتەجێبوون تیایدا و لەگەڵ ئێمەدا بژین باشە، دەنا ناهێڵین هیچ شتێکی لێ بگوازنەوە، بۆیە شەڕوشۆڕ دەکەوێتە نێوانیانەوەو شەڕی ئەوانە ئەکەن کە بەرێکەوتوون و پەلامار دەدەن بۆ بردنی سەروەت و کەسوکارەکانیان، ئەوەی ئەوانی تووڕە کردووە، تەنیا بەرێکەوتنی ئەو خەڵکە بووە بۆ ماڵ و کۆشکی پادشاکەیان و بەدەم بانگەوازی بانگەوازکارەکەیەوە رۆیشتوون و ئارەزووی ئەو شوێنەیان نەماوە کە فەرمانیان پێکراوە بەجێیبهێڵن، کۆمەڵێکی تریش روودەکەنە خۆش رابواردن و تەمبەڵی و پشوودان و ئەڵێن: لەئاوەدانکردنەوەی ئەم شارەدا خۆمان ماندوو ناکەین و هیچی لێ ناگوازینەوەو رێگریی هیچ کەسێکیش ناکەین کە نیازی گواستنەوەی هەبێ، نە شەڕیان ئەکەین، نە هاوکاریشیان ئەبین.

لەو شارەدا پادشا کۆشکێکی هەیە خێزان و منداڵی خۆی تیایدایە، شورایەکی بەدەوردا لێ داوەو پاسەوانی لەسەر داناوە، ڕێگریی خەڵکی شاری کردووە لەو کۆشکە نزیکبنەوە، ئەوانەی بەڕێ نەکەوتوون و بۆ خۆیان لەشاردا ماونەتەوە بەدەوریدا دەسوڕێنەوەو دەرگایەك نابیننەوە لێیەوە بچنە ئەو کۆشکەوە، لەشەودا کونی ئەکەن و ئەگەنە خێزان و منداڵەکانی و دەستدرێژیی ئەکەنە سەریان و کارێك ئەکەن جێگەی تووڕەکردنی پادشا و گران بێ لەسەری، هەر بەوەندەشەوە نەوەستاون، بەڵکو خەڵکانی تریش بانگدەکەن دەستدرێژیی بکەنە سەر خێزانەکەی پادشاو منداڵەکانی، تا لەمەدا دەبن جارچەر جارپیان بەسەردا دەدات و خەڵکەکەی تر لەبەردەم پادشادا ئامادە دەبن، یەك یەك دێن و کەلوپەلی خۆیان ئەخەنەڕوو لەوەی لەو شارەوە هێناویانە، ئەوەی بۆ پادشا شیاوبێ قبوڵ دەکرێ و چەندان ئەوەندەی نرخی خۆی پاداشت دەدرێ و لەخانووەکانی نزیکی خۆی نیشتەجێیان ئەکات، ئەوەشی شیاوی خۆی نەبێ ڕەتی دەکاتەوەو دەیدات بەنێوچەوانی خاوەنەکەیدا، ئەوانەشی دەهێنرێنەبەردەم کە دەستدرێژییان کردووەتە سەر پیرۆزکانی، داوا دەکەن بگەڕێنرێنەوە شار تاوەکو شارەکە ئاوەدان بکەنەوەو خێزان و پیرۆزییەکانی بپارێزن و هەمان ئەو کەلوپەلانە بهێننەوە کە بازرگانەکان هێناویانە، بەڵام پادشا ئەڵێ: هەی هاوار، شار بەجۆرێك کاولبووە ئیتر ئاوەدان ناکرێتەوەو لەدوای ئەو تەنیا ئەم شارە هەیە کە هەرگیز وێران و کاول نابێ.

**نمونەی بیست و سێ:** دونیا بەنمونەی خەو و ژیانیش تیایدا بەنمونەی خەون و مـــردن بەنمونـــەی بەئاگاهاتنـــەوە هێنراوەتـــەوە. بەنمونـــەی کێڵگەیـــەك هێنراوەتەوە، کارکردن تیایدا بەنمونەی تۆو چاندن و ڕۆژی قیامەتیش بەنمونەی دروێنە کردن.

بەنمونەی خانوویەك هێنراوەتەوە کە دوو دەرگای هەیە: دەرگایـەك خـەڵکیی لێیەوەی دێنە ژوورەوەو دەرگایەکی تریش لێیەوەی دەردەچن.

بەنمونەی مارێکی لووسی شێوە جوان هێنراوەتەوە، کـە لێدانـەکانی مـەرگن، بەنمونـەی خـواردنێکی ژەهراویـی هێنراوەتـەوە، خـواردنێکی بەچـێژو بـۆنێکی خۆش، هەرکەسێ بەئەندازەی پێویستیی خـۆی لـێ بخـوات شـیفای بـۆ دەبـێ و زیاتریش بخوات ئەیکوژێ.

بەنمونەی خۆراکێك هێنراوەتەوە لەگەدەدا کە ئەندامەکان بەشی خۆیـانی لـێ وەربگرن، دەنا هەر لەگەدەدا بمێنێتەوە کەسەکە دەکوژێ یـان ئـازاری سـەختی دەدات و بەبێ دەرچوون و فرێـدانی بەپاشـەڕۆ مرۆڤەکـە ئـارام نابێـت، هـەروەك پەیامبـەری خـوا لەنمونـەی ئـەو گیـاو سـەوزە خـۆرەدا هێناوێتییـەوەو پێشـتر باسمان کرد[1].

بەنمونـەی ناشـیرینترین ئـافرەت هێنراوەتـەوە کـە شـتێکی بەسـەر هـەردوو چاویدا داوەو خەڵکیی بەچـاوەکانی بەفیتنـەدا چـوون، خـەڵکیی بـۆ مـاڵی خـۆی بانگهێشت دەکات، کە بەدەمییـەوە ڕۆیشـتن دیمـەنی خـۆی پیشـانیان ئـەدات و بەچـەقۆکانی خـۆی سـەریاندەبڕێ و ئەیانخاتـە چـاڵەوە، زاڵهـاتووە بەسـەر عاشقەکانییداو لەکۆن و نوێدا وەهایـان بەسـەردا دەهێنـێ، کەچـی زۆر سـەیرە، عاشقەکانی ئەبینن براکانی پێشـوویان چـی دەردو بەڵایـەکیان بەسـەردا هـاتووە

[1] - بوخاری(٢٩٦٤) نزیك بەوە هێناویەتییەوە

کەچی بۆ لەنێوچوونی خۆیانیش پێشبڕکێ و هەرا ئەکەن:﴿ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ ﴾ إبراهيم: ٤٥، واتا: هەر لەجێ و شوێنی ئەوانە نیشتەجێ بوون کە ستەمیا ن لە خۆیان کرد و بەڕوونی بۆتان دەرکەوت کە چیمان بەسەر هێنان نموونەی زۆریشمان بۆتان هێنایەوە.

ئەم چواندنەی خوای گەورەی بۆ بەسە، نمونەیەکە بەسەریدا دەچەسپێت.

وتوویانە: ئەگەر ئەمە کارو پایەی دونیابێ، ئەوە کەمکردنەوە و نەویستنی باشترە لەکۆکردنەوەی زۆری و ئارەزوو لێکردنی.

وتوویانە: روونە هەرگیز حەز کردن بەدونیا لەگەڵ خواویستی و ئاخیرەت ویستیی پێکەوە کۆنابنەوە، ئەبێ یەکێکیان ئامادەیی هەبێ و ئەوی تر وەدەرنرابێ، هەرگیز کچی پەیامبەری خواو کچی دوژمنی خوا لای خوای گەورە پێکەوە کۆنابنەوە.

وتوویانە:ئەوە بەسە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کلیلی گەنجینەکانی دونیای خرایەبەردەم، گەر هەڵیگرتنابایە ئەوە سوپاسگوزارترین بەندەی خوا ئەبوو لەسەری و هیچ پاداشتێکی خوایی بۆ خۆی کەم نەدەکردەوە، کەچی برسیبوونی ڕۆژێك و تێربوونی ڕۆژێکی هەڵبژارد[1]، کۆچی دوایی کردو زرێکەی لەڕەهنی خواردنێکدا بوو بۆ خێزانەکانی هێنابووی، پێشتر ئەمە باسکرا[2].

---

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

[2] - پێشتر تەخریج کرا.

وتوویانە:خەڵکیی لەدوای پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)ەوە بوونەتە چوار بەشەوە: بەشێکیان نە ئەوان دونیایان ویست نە دونیاش ئەوانی ویست، نمونەی ئەبو بەکری سدیق و ئەوانەی ڕێگەی ئەویان گرتەبەر. بەشێکی تر: دونیا ئەوانی ویست، بەڵام ئەوان دونیایان نەویست، نمونەی عومەری کوڕی خەتاب و ئەوانەی ڕێگەی ئەویان گرتەبەر. بەشێکی تر: هەم ئەوان دونیایان ویست هەم دونیاش ئەوانی ویست، نمونەی خەلیفە ئەمەوییەکان و ئەوانەی شوێنی ئەوان کەوتن، بەدەر لەعومەری کوڕی عەبدولعەزیز، دونیا ئەوی ویست، بەڵام ئەو دونیای نەویست. بەشێکی تر: دونیایان ویست، بەڵام دونیا ئەوانی نەویست، نمونەی ئەوانەی خوای گەورە لەدونیادا دەستیانی هەژار کردووە، دونیای خستووەتە دڵیان و بەکۆکردنەوەی دونیا تاقیان دەکاتەوە.

شتێکی شاراوە نییە کە باشترینی ئەو بەشانە بەشی یەکەمە، دووەمیش فەزڵ و گەورەییە، چونکە دونیایان نەویستووەو لەگەڵ بەشی یەکەمدان.

وتوویانە:پیاوێك داوای لەپەیامبەری خوا کردووە باشترین کارێکی پیشان بدات، کە ئەنجامی دا خوای گەورەو خەڵکییش خۆشیان بووێ، ئەویش پێی ئەفەرمووێ:«ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبَّكَ اللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا فِي أَيْدِي النَّاسِ يُحِبُّكَ النَّاسُ»[1]،واتا: بێ نیاز بە بەرانبەر دونیا خوای گەورە خۆشتیدەوێ، بێ نیاز بە لەوەی لەدەستی خەڵکدایە خەڵکیی خۆشتیاندەوێ. بۆیە گەر دەوڵەمەندیی باشتر بووایە، ئەوە دەوڵەمەندبوونی پیشان دەدا.

---

[1] - صەحیحە، ئیبن ماجە(٤١٠٢) ئیخراجی کردووە.

وتوویانه:خوای گەورە لەتەشریعی خۆیدا فرمانی داوە بەکوشتنی بێباوەڕ، فرمانیشی داوە دەست نەبردرێتە رێگەی ئەوانەی لەدونیا دابڕاون و دونیانەویستن، سوونەتیش ئەوەی جێکردووەتەوەو لەسەر ئەوەیە نەکوژرێن و جیزیەیان نەخرێتەسەر، ئەمەو ئەوانە دوژمنی خواو پەیامبەرو ئایینەکەین، دەزانرێ دونیا نەویستیی لای خوای گەورە شوێن و پایەی هەیە.

وتوویانە: حیکمەتی خۆی لەشەرعەکەیدا شوێنی خۆی گرتووە کە سزای ژندارو شووکردوو بدرێ و شوو نەکردو و ژن نەهاوەر نەدرێ، سزای شووکردو ژندار رەجمکردنە، سزای ئەو کچەی شوویەکی نەکردبێ و ئەو کوڕەی جارێك بەشەرعیی ژنی نەهێنابێ جەڵدکردن و دوورخستنەوەیە. پاداشتەکانیشیان جیاوازە، ئەوەی حەلاڵی نەبێ و خۆڕاگربێ زۆرترە لەو کەسەی حەلاڵی خۆی هەیە.

وتوویانە:چۆن لای خوای گەورە ئەم دووانە یەکسان ئەبێ: سەرکزی و شکان و تاڵی چەشتنی مرۆڤی هەژار بەهەڵگرتنی ناخۆشی و نارەحەتییەکانەوە، لەگەڵ شکۆمەندی و چێژو خۆشیی بینینی مرۆڤی دەوڵەمەند؟! خۆڕاگربوونی هەژاران لەبەردەم تاڵیی و سەختیی هەژاریان و رازیبوونیان بەرانبەر بەخوای گەورە بەهاوکاریی خوای گەورەیە. ئەی پاداشتی نارەحەتیی موجاهیدان لەبەرانبەر پاداشتی پەرستشی ئەوانەدا چۆنە کە لەئارامی و ئاسایشی و کەیفکردندا لەماڵی خۆیاندا ماونەتەوە و خەریکی پەرستشکردنن؟

وتوویانە: چۆن ئەو دوو شتە یەکسان ئەبێ: یەکێکیان: بەهەشت دەورەی داوە، ئەوی تریان: دۆزەخ دەورەی داوە؟ سەروەت و سامان بنچینەی شەهوەتەکان و هەژارییش بناغەی ناخۆشییەکانە.

وتوویانە: مرۆڤی هەژار لەوەی تایبەت بەخۆی بێ و پێی بژێ، هەر لەتەنگو چەڵەمەیی هەژاری و برسێتی و رەشوڕووتی و ئازاری هەژارییدایە، هەموو ئەوانەش لەهەڵەو تاوانەکانی دەسڕنەوە، ئەوە زیادەیەکە لەپاڵ کارە چاکەکاندا کە ئەوانەش تاوان دەسڕنەوە، بەڵام دەوڵەمەندەکان کاری چاکە تاوانیان بۆ دەسڕێتەوەو هەژاری و ئازاری نەبوونەییان نییە تاوەکو لەهەڵەکانیان بۆ بسڕێتەوە، لەبەخشین و خێرو سوودگەیاندنی ئەوانیشدا هەر بەشدار ئەبێ و وەکو ئەوان پاداشت وەردەگرێ، ئەویش بەوەی خوای گەورە لەنییەتی ئەو دەزانێ گەر لەڕیزی دەوڵەمەندەکاندا بووایە هەمان کاری ئەوانی دەکرد، چونکە ئەڵێ: گەر سەروەت و سامانێکم هەبووایە منیش کاری ئەوانم دەکرد، مرۆڤە هەژارەکە بەڕازو نییەتی خۆی پاداشتی کەسە دەوڵەمەندەکەشی بۆ ئەبێ، هەروەك راستگۆی بەڕاستخراو موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) لەفەرموودەی صەحیحدا هەواڵی لەو بارەیەوە داوەو پێشەوا ئەحمەدو ترمیزیی گێڕاویانەتەوە لەفەرموودەی ئەبی کەبشەی ئەنمارییەوە[1].

وتوویانە: مرۆڤی هەژار لەدونیادا بەنمونەی مرۆڤی بەندکراوە، رێگریی ئەکرێ لەگەیشتنە چێژ خۆشییەکانی، مرۆڤی دەوڵەمەندیش لەو بەندیخانەیە رزگاری بووە. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ، وَجَنَّةُ الْكَافِرِ"[2]،واتا: دونیا بەندیخانەی باوەڕدارو بەهەشتی بێباوەڕە.

---

[1] - صەحیحە، ترمیزی(٢٣٢٥) و ئیبن ماجە(٤٢٢٨) و ئەحمەد(٤/ ٢٣٠) ئیخراجیان کردووە.

[2] - موسلیم(٢٩٥٦) ئیخراجی کردووە.

مرۆڤی دەوڵەمەند گەر دەروونی خۆی لەپاڵنـەرەکانی دەوڵەمەنـدی و لادان و ستەمکاریی ڕێگریی نـەکات و بینێرێتـە شـوێنەکانی شـەهوەت و ئارەزووەکـانی، ئەوکات دونیا بۆی دەبێتە بەهەشت، بەڵام لێرەدا بەشـوبهاندنی بەهـەژار فـەزڵی هەژاری داو دونیای بەبەندیخانەی هەژار شوبهاندووە.

وتوویانە:خوای گەورەو پەیامبەرەکەشی سەرزەنشتی ئەو کەسەیان کـردووە، چاکەکانی لـەدونیادا خێـرا پـێ بدرێتـەوە، کـە لەچاکەکانی ئـاخیرەتن یـان بـێ گومـان لەچاکەکانی ئـاخیرەتی بـۆ کـەم دەکەنـەوە وەك پێشـتر باسـکرا، ئەمـە پێچەوانەی ئەو کەسەیە کە بەهۆی ڕێگرییکردنی لەدونیادا هـەموو چاکەکانی بـۆ ئاخیرەت ماوەتەوە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)هاڕاوەی ئاردی گەنم و جۆو بادەمی(سویق)ی بۆ هێنرا، ڕەتیکردەوە بیخواتەوەو فەرمووی:"هـذا شـرابُ المترفین"[1]،واتا:ئەمە خواردنەوەی ئاسوودەکانە.

وتوویانــە: پرســیار لەحەســەنی بەســریی کــراوە: دوو پیــاو یــەکێکیان دەسـتبەرداری دونیـا بـووەو ئـەوی تـر هـەوڵی تێـدا ئـەدات و لێـی ئەبەخشـێ، کامەیانت پێ باشـترە؟ ئـەڵێ: ئـەوەم بـەلاوە خۆشەویسـترە کـە دەسـتبەرداری دونیا بووە.

وتوویانـە: پـێش ئـەو لـەم بابەتـەدا پرسـیار لەمەسـیح کـراوە: دوو پیـاو، یەکێکیان بەلای خشتێك ئاڵتووندا تێپەڕ ئەبێ و بەسەریدا باز دەدات و لای بەلادا ناکاتەوە، ئەوی تر بەلایدا تێدەپـەڕێ و هەڵیـدەگرێ و خێـری پـێ ئـەکات، ئایـە کامەیان باشترن؟ ئەویش ئەڵێ: ئـەوەی بەلایـدا تێدەپـەڕێ و بەلایـدا لاناکاتـەوە باشترە. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)بەلایدا

---

[1] - لاوازە، ئەحمەد لە الزهد(٦) ئیخراجی کردووە، پچڕانی تێدایە.

تێپەڕبووەو تەماشای نەکردووە، گەر هەڵیشی بگرتبایە ئەوە لەپێناو خوای گەورەدا دەیبەخشی.

وتوویانە: ئەو هەژارەی شارەزابێ بەهەژارییەکەی، ئەوە دەتوانێ لەهەموو ئەو خێرو پاداشتەی مرۆڤی دەوڵەمەند لەدەوڵەمەندییەکەی بەدەستیدەهێنێ ئەمیش بەدەستیبهێنێ، ئەوکات لەپاداشتدا لەگەڵ دەوڵەمەندەکەدا یەکسان ئەبێ، لەو تایبەتمەندتر ئەبێ کە بەهۆی نەبوونی سەروەت و سامانەوە لێپرسینەوە ناکرێت. لەپاداشتدا لەگەڵیدا یەکسانەو لەلێپرسینەوەشدا رزگاری ئەبێ، هەروەك لەو تایبەمەندتر ئەبێ بەوەی بەپێنجسەد ساڵ پێش دەوڵەمەندەکە ئەچێتە بەهەشتەوە، بەپاداشتی ئارامگرتن لەسەر ئازارەکانی هەژاری و نەبوونییە سەختەکەی بەسەر دەوڵەمەندەکەدا تایبەتمەندتر ئەبێ.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ:عوبادەی کوڕی موسلیم بۆی باسکردین، یونسی کوڕی خەباب بۆی باسکردین، ئەویش لەئەبی ئەلبەختەریی ئەلتائییەوە، ئەویش لەئەبی کەبشەوە وتی: گوێم لێبوو پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەیفەرموو:"ثَلاَثٌ أُقْسِمُ عَلَيْهِنَّ وَأُحَدِّثُكُمْ حَدِيثاً فاحفظوه، قال: مَا نَقَصَ مَالُ عَبْدٍ مِنْ صَدَقَةٍ، وَلاَ ظُلِمَ عَبْدٌ مَظْلَمَةً صَبَرَ عَلَيْهَا إلاَّ زَادَهُ اللهُ عِزّاً، وَلاَ فَتَحَ عَبْدٌ بَابَ مَسْأَلَة إلاَّ فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِ بَابَ فَقْرٍ، أو كَلِمَةً نَحْوَهَا.

وأمَّا الذي وَأُحَدِّثُكُمْ حَدِيثا فاحفظوه: إِنَّمَا الدُّنْيَا لأربعة نفر: عبد رزقه الله مَالا وعلماً فَهُوَ يَتَّقِي فِيهِ ربه ويصل فِيهِ رَحمَه وَيعلم لله فِيهِ حَقًا فَهَذَا بِأَفْضَل الْمنَازل وَعبد رزقه الله علما وَلم يرزقه مَالا فَهُوَ صَادِق النِّيَّة يَقُول: لَو أن لي مَالا لعملت بِعَمَل فلَان فَهُوَ بنيته فأجرهما سَوَاء وَعبد رزقه الله مَالا وَلم يرزقه علما فَهُوَ يخبط

فِي مَاله بِغَيْر علم وَلَا يَتَّقِي فِيهِ ربه وَلَا يصل فِيهِ رَحمَه وَلَا يعلم فِيهِ لله حقاً فَهَذَا باخبث الْمنَازل وَعبد لم يرزقه الله مَالا وَلَا علما فَهُوَ يَقُول: لَو أَن لي مَالا لعملت فِيهِ بِعَمَل فلَان فَهُوَ بنيته فوزرهما سَوَاء"[1]،واتا: سێ شت هەیە سوێندیان لەسەر ئەخۆم و باسێکتان بۆ دەگێڕمەوە ئێوەش لەبەری بکەن(ئەزبەردەی بکەن)، هەرچی ئەو سێ دانەیە کە سوێندیان لەسەر دەخۆم ئەوەیە: سەروەتی هیچ بەندەیەك بە بەخشین کەم نابێتەوە، هەربەندەیەك ستەمی لێ کراو ئارامی گرت، ئەوە خوای گەورە شکۆی زیاتری پێ ئەدات، هەرکەسێ سواڵی کرد، ئەوە خوای گەورە دەرگای هەژاریی بەڕوودا ئەکاتەوە.

ئەوەشی وتم: شتێکتان بۆ باسدەکەم ئێوەش باش ئەزبەردەی بکەن، ئەوەیە دونیا بۆ چوار کەس ئەبێ: بەندەیەك خوای گەورە سەروەت و زانستێکی پێ دابێ و لەو سەروەت و زانستەیدا ترسی خوای هەبێ و بەزەیی خۆی تیایاندا بەجێبهێنێ و مافی خوایان تیادا بزانێ، ئەمە لەبەرزترین و باشترین پێگەدایە لای خوای گەورە. بەندەیەکیش خوای گەورە زانستێکی پێ بەخشیووەو سەروەتی پێ نەبەخشیووەو ئەڵێ:گەر منیش سەروەتێکم هەبووایە هەمان کاری فلانم دەکرد، ئەوەش پاداشتەکەیان وەك یەکە. بەندەیەکیش خوای گەورە سەروەتێکی پێ بەخشیووەو زانستی پێ نەبەخشیووە، بەبێ زانست ماڵەکەی تێکەڵ و پێکەڵ ئەکات و ترسی خوای تیادا نییەو سۆزو بەزەیی تیایدا بەجێناهێنێ و مافی خوای گەورەی تیادا ناناسێ، ئەمە پیسترین و خراپترین شوێنی هەیە لای خوای گەورە، بەندەیەکی تریش خوای گەورە سەروەت و

[1] - کەمێك پێشتر تەخریج کرا.

زانستی پێ نەبەخشیووەو ئەڵێ: گەر سەروەتێکم دەبوو منیش هەمان کاری فلأنە کەسم دەکرد، بەنییەتی خۆی لەتەك خراپەکارەکەدا یەکسان ئەبێ.

کە کابرای دەوڵەمەند بەکردار فەزڵی پەیدا کرد، ئەوە هەژارەکە بەنییەت پێی گەیشتەوە. دەوڵەمەندەکەی تر بەدواکەوتنی لەکاری چاکە تاوانبار بوو، هەژارەکەش بەنییەت خراپییەکەی خراپەکار بوو، بۆیە مرۆڤی دەوڵەمەند دەوڵەمەندییەکی سوودی پێ ناگەیەنێ ئەگەر چاکەی پێ نەکات و هەژارەکەش هەژارییەکەی زیانی لێ نادات ئەگەر نییەتێکی جوانی هەبێ، هەژارییەکەشی سوودی پێ ناگەیەنێ گەر نییەتێکی خراپی هەبێ.

وتوویانە: ئەمەی باسکرا روونکردنەوەیەکی گشتگیرو تێروتەسەلی بابەتەکەیەو بڕیاردەری نێوان هەردوو کۆمەڵەکەیە، سەرکەوتنیش بەخوای گەورەیە.

***

# تەوەری بیست و چوار

## لەباسکردنی ئەوەی دەوڵەمەندان لەقورئان و سوونەت و ئاسارو ئیعتیباردا بەبەڵگەی دەهێننەوە

دەوڵەمەندەکان وتوویانە:ئەی هەژارەکان ئێوە دونیایەك بەڵگەتان دژ بەئێمە هێنایەوە، ئەزانین لەوە زیاترتان هەیە، بەلأم بابەتەکەتان مامناوەندانە هێشتەوە، نە درێژەتان پێ دا نە کورتتان کردەوەو وەهاتان گومان بردووە کە فەزڵەکە بۆ ئێوەیە نەك ئەوانەی دەوڵەمەندن، ئێمەش هەر ئەوەتان بۆ ئەکەینە بڕیاردەر کە ئێوە کردتان و بەهەمان تەرازووی ئێوە شتی خۆمان کێشانەو پێوانە ئەکەین و بەڵگەی ئێوەو خۆشمان ئەخەینە تای تەرازووی شەرع و عەقڵ، ئەوکات ڕووندەبێتەوە خاوەن فەزڵ کێیە، بەلأم پێشتر ئەوانەمان لەنێواندا دەربکەن، کە خۆیان بەهەژارە ڕاستگۆو ئارمگرەکان شوبهاندووەو بەرگی ئەوانیان بەسەر دڵ گەلێکدا داوە،کە لەخەڵکانی تر پێداگرترن بۆ دەستخستنی دونیا، چلێسترو چرووکترو دوورترین کەسێکن لەهەژاری و ئارامگرتن...بەڕواڵەت هەژاریی دەردەخەن و لەناخەوە پێداگرترن بۆ دونیاو بێ ئاگان لەپەروەردگاریان و شوێنی هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتوون و خەمساردن لەبابەت قیامەت، بەرگی هەژارییان کردووەتە بازرگانی و سەنعەت، یان حاڵ هەژارێکی ناچارانەیە نەك سەرپشکانە، دونیا بەکەمگرتنەکەی دونیا بەکەمگرتنێکی دۆڕانەیە نەك خواو ئاخیرەت ویستی، بەزمانی حاڵ گلەیی لەخوا دەکات و لەخوا ڕازیی نییە،

کە سەروەتی پێ بدرێ رازییەو کە لێیشی بگێردرێتەوە تووڕە ئەبێ، هەڵپەو تەقەلاو حەسرەتی زۆری بۆ دونیا هەیە، هەژارترین خەڵکییە لەدونیاداو ئارەزوومەندترین مرۆڤێکیشە بۆی.

ئەوانەشمان لەنێوان دەربکەن کە سەروەتێکی کۆکراوەی زۆری هەیەو هەر کۆیدەکاتەوەو پێی کاریگەرەو بەدانەکانی گرتوویەتی و خۆی داوە بەسەریداو بەزیاتربوونی خۆشحاڵ و بەکەمبوونەوەشی بەداخە،دڵی پێوەی نووساوە، بۆ دەستخستنی تەقەلا ئەکات، گەر بازارێکی بەخشینی بخرێتە بەردەم کەمترین شتێکی لێ دەبەخشێ، گەر داواشی لێ بکەی لەخۆی بگرێتەوە بۆ هەژاران، ئەوە لەگەڵتدا ئەکەوێتە جەنگەوە.

بۆیە ئێمەو ئەو برایانەمان لەپێشبڕکێی هەردوو کۆمەڵەکە دووربخەنەوە، گەورەکانی ئەو دوو کۆمەڵەی کە بەئیمان و حاڵی خۆیانەوە پێشبڕکێیان ئەکرد بۆلای خواو رۆژی ئاخیرەت و بەکردارو سەروەتیان کێبڕکێیان کرد، دڵیان بەخواوە پەیوەست و هیممەت و پەژارەیان پێشبڕکێکردن بوو بۆ گەیشتنە لای خوای گەورە، دەوڵەمەندەکانیان سەیری هەژارەکانیان ئەکرد، کە بیانبینایە بەکردارێك پێش ئەوان کەوتوون، ئەمانیش هەمان کاریان ئەنجام دەدا، هەژارەکانیش تەماشای دەوڵەمەندەکانیان ئەکرد، کە دەیانبینیی بەخشینیان لەپێناو خوای گەورە لەدەست نایەت، ئەوە هەوڵیان دەدا بەکرداری ترو قسەو ئارامگرتن، ئەوە قەرەبوو بکەنەوە، بۆیە دونیانەویستییەکەی هاوشانی ئەوە و زیاتر بوو.

ئا ئەوە ئەو برایانەمانن کە خەڵکیی لەبارەیانەوە قسەیان کردووە، ئاخۆ کامەیان فەزڵی زیاترو پلەی زیاتریان هەیە،بەڵام ئەمانەی تر، دەبێ تەماشای ئەوە بکەین کە کامەیان لەشوێنی سەختتری سزاو ئازاردان، خوای گەورە پشت و پەنامان بێ.

گەر ئەمە زانراو لێی تێگەیشتین، ئەوە دەبێ بزانین کە خوای گەورە لەقورئانەکەیدا پیاهەڵدانی هەندێ کاروکردەوەو ستایشی ئەنجامدەرانی کردووە، کارو کردەوە گەلێك کە تەنیا بەدەوڵەمەندیی دێنەدی: وەکو زەکات، بەخشین لەچاکەکارییدا، جیهادکردن بەسەروەت و سامان لەپێناو خوای گەورەو ئامادە سازکردنی جەنگاوەران و فریاکەوتنی خاوەن پێداویستییەکان و ئازادکردنی کۆیلەو خواردن پێشکەشکردن لەسەردەمی برسێتییدا.

ئاخۆ پاداشتی ئەو هەژارە ناچارەی نزیکە بەهۆی برسێتییەوە بمرێ، کەی بەرانبەرە بەهاوکاریی دەوڵەمەندێك بۆی، کە لەهەژاری و برسێتییەکەی رزگاری دەکات؟ ئاخۆ پاداشتی ئارامگرتنەکەی کەی بەرانبەرە بەسوودی کابرای دەوڵەمەند کە سەروەتی خۆی ئەخاتە خزمەت سەرخستنی ئایینی خواو شکۆدارکردنی ئایینەکەی و شکانی هێزی دوژمنانی خوا؟

ئارامگرتنی ئەبو زەڕ لەسەر هەژارییەکەی لەکوێی سوپاسگوزاریی ئەبو بەکردایە بەرانبەر پەروەردگاری و کڕینی ئەشکەنجەدراوان و رزگارکردنیان،هەروەها بەخشینەکانی لەپێناو سەرخستنی ئیسلام، لەکاتێکدا پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"ما نفعني مالُ أحدٍ ما نفعني

مالُ أبي بكر"[1]، واتا: سەروتی هیچ كەسێك بەنمونەی سەروەتی ئەبو بەكر سوودی بە من نەگەیاند[2]؟

كەی پاداشتی ئەهلی صوفە بەرانبەر بەبەخشینە گەورەكانی عوسمانی كوڕی عەفانە، كە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی هەندێ لەبەخشینەكانییەوە فەرموویەتی:"ما ضَرَّ عثمان ما فعل بعد اليوم"[3]،واتا: لەدوای ئەمڕۆ، عوسمان هەر شتێك بكات زیانی لێ نادات. پاشان فەرمووی:" غفر الله لك يا عثمان ما أسررتَ وما أعلنتَ وما أخفيتَ وما أبديتَ"،واتا: ئەی عوسمان خوای گەورە لێت خۆشبووە لەسەر هەر شتێ بەئاشكرا كردبێتت یان بەنهێنی، چیت شاردبێتەوە یان دەرتخستبێ.

ئەگەر لەقورئان رامانتان كردبێ، ئەبینن ستایش و پیاهەڵدانی بەخشەران چەندان ئەوەندەی پیاهەڵدانی هەژارە خۆڕاگرەكانە، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) شایەتیی داوە كە دەستی بالا لەدەستی نزم باشترە، دەستی بالای بەبەخشەرو دەستی نزمی بەسواڵكەرو داواكار راڤە كردووە[4].

خوای گەورە نیعمەتی خۆی بەسەر پەیامبەرەكەیدا ژماردووە كە دوای هەژاربوونی دەوڵەمەندی كردووە، دەوڵەمەندبوونی ئەو حاڵەتەیە كە بۆی

[1] - صەحیحە، ئیبن ماجە(٩٤) و نەسائیی لە السنن الكبرى(٥/ ٣٧) و ئیبن ئەبی شەیبە لە المصنف(١٢/ ٦) و ئیبن حیبان(٦٨٥٨) ئیخراجیان كردووە.

[2] - صەحیحە، ئیبن ماجە(٩٤) و نەسائیی لە السنن الكبرى(٥/ ٣٧) و ئیبن ئەبی شەیبە لە المصنف(١٢/ ٦) و ئیبن حیبان(٦٨٥٨) ئیخراجیان كردووە.

[3] - صحیح لغیره، ترمیزی(٣٧٠١) و ئەحمەد(٥/ ٦٣) و حكم(٥/ ٢٠٥) و ئەبو نەعیم لە الحلیة(١/ ٥٩) ئیخراجیان كردووە.

[4] - بڕوانە ئەوەی بوخاری(١٤٢٩) و موسلیم(١٠٣٣) ئیخراجیان كردووە.

گواستوویەتییەوە، هەژارییەکەشی ئەو حاڵەتەیە کە لێیەوە گواستوویەتییەوە، خوای گەورە لـەشتێکەوە بۆ شتێکی بـاشتر گواستوویەتییەوەو ئەفەرمووێ: ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ۝ ﴾ الضحى: ٥، واتا: سوێند بەخوا لەمەولا پەروەردگارت ئەوەندەت پێ دەبەخشێ کە ڕازی ببیت.

بەخشینی خوای گەورە لەدونیاو ئاخیرەتیش ئەچێتە ئەو خانەیەوە.

وتوویـانە: دەوڵەمەندیی بەسوپـاسگوزارییەوە، فـەزڵ و بـەزەیی زیـاترە: ﴿ وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ۝ ﴾ البقـرة: ١٠٥، واتـا: خـواش بەخششـی خـۆی بـۆ کەسێك کـە بیـەوێ تـەرخان دەکـات و خـوا خاوەنی چاکەی گەورەیە.

وتوویانە: دەوڵەمەنـدە سوپاسـگوزارەکان هۆکـارن بـۆ خواپەرسـتیی هـەژارە خۆڕاگرەکـان، چـونکە بـەخێرو چـاکەکارییان هـەژارەکانیان بـەهێز کـردووەو هاوکاریانن بۆ خواپەرستی، بۆیە لەپاداشتی هەژارانـدا پاداشـتی زۆریـان هەیـە سـەرباری پاداشـتی بەخشـین و خواپەرسـتیی تایبـەت بـەخۆیان، هـەروەك لەصەحیحی ئیبن خوزەیمەدا هاتووە لەگێڕانەوەی سەلمانی فارسییدا(خوای لـێ ڕازیی بێ) ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کـە باسـی مـانگی ڕەمەزانی کردووەو فەرموویەتی:"مَنْ فَطَّر صـائماً كـان مغفـرة لذنوبـه وعتـق مـن النار، وكان له مثل أجره من غير أن ينقص من أجره"[1]،واتا:هەرکەسێ خـواردنی ڕۆژووەوانێـك دابـین بکـات، ئـەوە ئەبێتـە مایـەی لێخۆشـبوونی تاوانـەکانی و بەدووری دەگرێ لەدۆزەخ و بەئەندازەی پاداشتی ڕۆژووەوانەکە پاداشـتی هەیـە بێ ئەوەی هیچ لەپاداشـتی کـەم ببێتـەوە. دەوڵەمـەندی سوپاسـگوزار پاداشـتی

[1] - لاوازە، ئیبن خوزەیمە(١٨٨٧) و ئەصبەهانیی لە الترغيب والترهيب(١٧٣٥) ئیخراجیان کردووە.

ڕۆژووی خۆی و ئەندازەی پاداشتی ڕۆژووگرە هەژارەکەی بۆ هەیە کە خۆی خواردنی ئێوارەکردنەوەی پێ داوە.

وتوویانە: گەر دەوڵەمەندی سوپاسگوزار تەنیا فەزڵی سەدەقەکەشی بۆ هەبێ، ئەوەی بۆ بەسە کە ئەو سەدەقەیە بەسەر چاکەکانی تردا شانازیی ئەکات، هەروەك نەزری کوڕی شەمیل ئەویش لەقورەوە ئەویش لەسەعیدی کوڕی موسەیبەوە ئەڵێ: باسی لەعومەری کوڕی خەتابەوە کردووەو وتوویەتی: باسکراوە کە کارە چاکەکان بەخۆیانەوە شانازیی ئەکەن، سەدەقەش ئەڵێ: من لەگشتتان بەفەزڵترم.

وتوویانە:سەدەقە بەندە لەدۆزەخ دەپارێزێ، ئەو کەسە دڵسۆزەی بەنهێنیی سەدەقەی کردووە لەڕۆژی قیامەتدا لەژێر سێبەری عەرشی خوای گەورەدایە.

عەمری کوڕی ئەلحاریثیش ئەگێڕێتەو لەیەزیدی کوڕی ئەبی حەبیبەوە، ئەویش لەئەبی ئەلخەیرەوە، ئەویش لەعوقبەی کوڕی عامرەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیە وسلم) کە فەرموویەتی:"إن الصدقة لتطفئ على أهلها حَرَّ القبور، وإنما يستظلُّ المؤمن يوم القيامة في ظِلِّ صدقته"[1]،واتا: سەدەقە(خێرکردن) گڕو گەرمیی گۆڕ بۆ خاوەنەکەی فێنك دەکاتەوەو مرۆڤی باوەڕدار لەڕۆژی قیامەتدا لەژێر سێبەری سەدەقەکەیدا ئەبێ.

یەزیدی کوڕی ئەبی حەبیب ئەویش لەئەبی ئەلخەیرەوە ئەویش لەعوقبەوە بەمەرفوعیی ئەڵێ:"هەموو مرۆڤێك لەژێر سێبەری سەدەقەی خۆیدایە تاوەکو

---

[1] - لاوازە، تەبەرانیی لە الكبير(١٧/ ٢٤٨) ئیخراجی کردووەو ئەلهەیسەمییش لە مجمع الزوائد(٣/ ١١٠) باسیکردووە.

بڕیاری نێوان خەڵك یەكلایی دەكرێتەوە"[1]. یەزید ئەڵێ: ئەبو ئەلخەیر هەموو ڕۆژێك سەدەقەیەكی ئەكرد ئەگەر چۆرەكێك یان بەبەخشینی پیازێكیش بووایە.

لەفەرموودەیەكی موعازەوە ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم):"والصدقة تطفئ الخطيئة كما يطفئ الماء النار"[2]، واتا: سەدەقە تاوان دەكوژێنێتەوە، هەروەك چۆن ئاو ئاگر دەكوژێنێتەوە.

بەیهەقیی گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەیەكی ئەبی یوسفی ئەلقاضییەوە، ئەویش لەئەلموختاری كوڕی فلفلەوە، ئەویش لەئەنەسەوە بەمەرفوعیی:"باكِرُوا بالصدقة، فإن البلاء لا يتخطّى الصَّدقة"[3]،واتا: سەدەقە بكەن، چونكە تەنیا سەدەقەیە بەلاّ دووردەخاتەوە.

لەصەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەكی ئەبو هورەیرەوە، ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) كە فەرموویەتی:"إذا تصدق العبدُ من كسب طيب- ولا يقبل الله إلا طيباً- أخذها الله بيمينه فيربِّيها لأحدهم، كما يربي أحدكم فلوّه أو فَصِيْلَهُ، حتى تكون مثل الجبل العظيم"[4]،واتا: ئەگەر بەندە لەماڵی حەلاڵ و چاك سەدەقەیەكی كرد- خوای گەورە چاكەو تەنیا چاكی قبوڵە- خوای گەورە بەدەستی راستی قبوڵی دەكات و بۆی بەخێوی ئەكات هەروەك چۆن یەكێك لەئێوە منداڵە شیرەخۆرەكەی بەخێو ئەكات، تاوەكو چیایەكی گەورەی لێ دێت.

---

[1] - صەحیحە، ئەحمەد(٤/ ١٤٧) و ئەبو یەعلا(١٧٦٦) و ئیبن حیبان(٣٣١٠) و ئیبن خوزەیمە(٢٤٣١) ئیخراجیان كردووە.

[2] - بەشێكە لەفەرموودەیەكی دووروودرێژی موعاز، بڕوانە: ترمیزی(٢٦١٦) و ئیبن ماجە(٣٩٧٣).

[3] - زۆر لاوازە، بەیهەقیی لە السنن الكبرى(٤/ ١٨٩) ئیخراجی كردووە.

[4] - بوخاری(٧٤٣٠) و موسلیم(١٠١٤) ئیخراجیان كردووە.

لەلەفزێکی بەیهەقییدا لەم فەرموودەیەدا هـاتووە:" حَتَّـى إِنَّ التَّمْـرَةَ أَوِ اللُّقْمَـةَ لَتَكُـونَ أَعْظَـمَ مِـنْ أُحُـدٍ"[1]،واتـا: رەنگـە خورمایـەك یـان پارووییـەك گـەورەتر بـێ لەئوحود[2].

موحەممەدی کوڕی ئەلمونکەدیر ئەڵێ: یەکێك لەوانەی لێخۆشبوون بـۆ بەنـدە دەهێنێ و پێویست دەکات، خواردن دانە بەکەسی برسـی. بـەجۆرێکی جیـاوازتر لەمە بەمەرفوعیی گێڕدراوەتەوە[3].

گەر خوای گەورە لەکەسێك خۆشبووبێ بەهۆی ئەوەی ئـاوی بەسـەگێکی زۆر تینوو دابێ[4]، ئەی چۆن لەو کەسـە خۆشـنابێ کـە ئـاو بـەمرۆڤی تینـوو دەدات و برسیی تێر ئەکات و بـەرگ ئەکاتەبـەری رەشـوڕووتانی موسـڵمانان؟ پەیامبـەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویـەتی:"اتَّقُـوا النَّـارَ، وَلَـوْ بِشِـقَّةِ تَمْـرَةٍ، فَإِنْ لَـمْ تجدوا فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ"[5]،واتا:خۆتان لەدۆزەخ بپارێزن ئەگەر بە لەتە خورمایـەکیش ئەبێ، ئەگەر ئەوەشتان نەبوو بەقسەیەکی باش.

ئەبینین قسەی باشی کردووەتە جێگرەوەو قەرەبوو بـۆ کەسـێك توانـای ئـەو لەتە خورمایەی نەبێ.

وتوویانە: چێژی بەخشین و چاکەکاری و دڵخۆشـکردنیان و بـەهێزکردنیان بـۆ دڵی بەندەو ئەو خۆشی و گەورەڕاگرتنەی خوای گەورە بەهۆیـەوە ئەیخاتـە دڵـی بەندەکانی و پاڕانـەوە بۆیـان و خۆشیخسـتنە نێویانـەوە، ئەوانـە چـۆن بـەراورد

[1] - صەحیحە، بەیهەقیی لە الشعب(٣٢٠١) ئیخراجی کردووە.
[2] - صەحیحە، بەیهەقیی لە الشعب(٣٢٠١) ئیخراجی کردووە.
[3] - ئەبو نەعیم لە الحلیة(٧/ ٩٠) ئیخراجی کردووە.
[4] - بوخاری(٦٠٠٩) و موسلیم(٢٢٤٤) ئیخراجیان کردووە.
[5] - بوخاری(٦٥٦٣) و موسلیم(١٠١٦) (٦٨)ئیخراجیان کردووە.

دەكرێن بەپاداشتی ئارامگرتنی هەزار؟ بەڵێ ئارامگرتنی بەندە پاداشتی گەورەی بۆ هەیە، بەڵام چێژی بەخشین و چاكەكارییەكانی تر پلەو پایەی زۆرتریان لای خوای گەورە هەیە.

وتوویانە: بەخشین و چاكەكاری و سەدەقە وەسفن بۆ پەروەردگار، خۆشەویسترین بەندەش بەلای خوای گەورەوە، ئەوانەن كە لەوەسفی خوای گەورە هەڵدەگرن، هەروەك پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "الخَلْقُ عِيالُ الله فأحبُ الخَلْقِ إليه أنفعهم لعياله"[1]،واتا: دروستكراوان بەندەی خوان، خۆشەویسترین مەخلوقێك بەلای خوای گەورەوە، ئەوەیانن كە بەسوودترین بۆ بەندەكانی.

وتوویانە: خوای گەورە جۆر گەلێكی بەختەوەرانی باسكردووە، سەرەتا باسی سەدەقەكارانی كردووەو فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٩﴾ ﴾ ( الحديد: ١٨ — ١٩)

واتا: بێگومان پیاوان و ژنانی خێرخواز ئەوانەش قەرز بدەن بەخوا بەقەرزێكی چاك(یارمەتی هەژاران دەدەن) چەند بەرانبەر دەیاندرێتەوە وە بۆ ئەوان هەیە پاداشتی زۆر چاك. وە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە بەخواو بە پێغەمبەرانی ئەوانە خۆیانن ڕاست گۆیان وە شەهیدان لەلای پەروەردگاریان

---

[1] - زۆر لاوازە، ئەبو یەعلا(٣٣١٥) و ئەلبەزار(١٩٤٩) و بەیهەقیی لە الشعب(٧٤٤٧) ئیخراجیان كردووە.

خاوەن پاداشت و نورو ڕووناکی خۆیانن وە ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون و بەڵگەو نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانی ئەوانە هاوەڵی ئاگری دۆزەخن.

ئەوانە جۆر گەلێکی بەختەوەرن، لەپێشەوەی هەموویانەوە سەدەقەکارانن.

وتوویانە: لەبەخشیندا سوود گەلێك هەیە کە تەنیا خوای گەورە ژمارەی دەزانێ،هەندێکیان مرۆڤ دەپارێزن لەمردنی خراپ و بەلاو ناخۆشی و تەنانەت بەرگریی لەمرۆڤی ستەمکاریش ئەکات.

ئیبراهیمی نەخەعیی ئەڵێ: وەهایان دەبینی کە سەدەقە بەرگریی لەمرۆڤی زۆر ستەمکاریش ئەکات و تاوان دەسڕێتەوەو سەروەت و سامان دەپارێزێ و ڕزق و ڕۆزیی دەهێنێ و دڵ خۆش دەکات و متمانە بەخوای گەورە و گومانبردنی باش بەخوا دەهێنێ، هەروەك چرووكیی گومانبردنی خراپ بەخوا دەهێنێ. بەخشین لووتی شەیتان دەشکێنێ و دەروون پاکدەکاتەوەو گەشەی پێ دەدات و بەندە لای خواو بەندەکانی تر خۆشەویست ئەکات و هەموو عەیب و ناتەواوییەکی بۆ دادەپۆشێ، تەمەن زیاتر ئەکات و پاڕانەوەو خۆشەویستیی خەڵکیش بۆ بەندە دەهێنێ و سزای نێوگۆڕ لەبەردەم بەندە لادەبات و لەڕۆژی قیامەتیشدا بۆی دەبێتە سێبەر و لای خوای گەورە تکای بۆ دەکات و سەختییەکانی دونیاو قیامەتی لەسەر سووك دەکاتەوەو هەموو کارە چاکەکانی لا ئاسان ئەکات، بۆیە سوودەکانی بەخشین چەندان ئەوەندەیە.

وتوویانە: گەر لەبەخشین و چاکەکارییدا هەر ئەوەندە سوودی هەبێ کە سیفەتی خوای گەورەن، ئەوە بەسە کە خوای گەورە ئەوانەی خۆشبووێ کە سیفەتی ئەو هەڵدەگرن، خوای گەورە زاناو بەخشندەو زیندوو داپۆشەری عەیبی خۆشدەوێ، باوەڕداری بەهێزی بەلاوە خۆشەویسترە لەباوەڕداری لاواز،

دادگەری و لێبووردن و بەزەیی و چاکەو بەخشندەی خۆشدەوێ، دەوڵەمەنـدی و بەخشندەیی سیفەتی خۆیەتی، بۆیە دەوڵەمەندو بەخشندەی خۆشدەوێ.

وتوویانە: لەفەزڵی سوودگەیاندن بەسەروەت و ماڵ، ئەوەیـە لـەجۆری خۆیـدا پاداشـت دەدرێتـەوە، هەرکەسـێ موسـڵمانێك دابپۆشـێ، ئـەوە خـوای گـەورە بەبەرگی گرانبەهای بەهەشت دایدەپۆشێ، هەرکەسێ برسییەك تێربکـات، خـوای گـەورە بەبـەرووبوومی بەهەشـت تێـری ئـەکات، هەرکەسـێ تینوویـیـەك تێـر ئـاو بکـات، ئـەوە خـوای گـەورە لەخواردنـەوەی بەهەشـت تینـوێتیی دەشـکێنێ، هەرکەسـێ بەندەیـەك رزگـار بکـات، بەئەنـدازەی ئەنـدامی جەسـتەی بەندەکـە ئەویش لەدۆزەخ رزگاری دەبێ، هەرکەسێ حاڵی بار گرانێك بـاش بکـات، خـوای گـەرە دونیـاو ئـاخیرەتی بـۆ ئاسـان دەکـات، هەرکەسـێ ناخۆشـییەکی دونیـا لەبەردەم باوەڕدارێك لابدات، ئـەوە خـوای گـەورە ناخۆشـییەکی رۆژی قیامـەتی لەبەردەم لادەبات، خوای گەورە لـەهاوکاریی بەنـدە دایـە تائەوکاتـەی بەندەکـە لەهوکاریی براکەیدابێ.

وتوویانە:ئێمـە فـەزڵی ئـارامگریی هـەزار رەتناکەینـەوە، بـەڵام ئـەو فەزڵـەی ئارامگرتن لەکوێ و ئەمانە لەکوێ کـە باسمـان کـردن، خـوای گـەورە بـۆ هـەموو شتێك ئەندازەو رێزێکی داناوە.

وتوویانە: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) چێشتدەرێکی سوپاسـگوزاری لەپێگـەی رۆژوگرێکـی ئـارامگر دانـاوە: "الطَّـاعِمُ الشَّـاكِرُ بِمَنْزِلَـةِ الصَّـائِمِ الصَّابِرِ"[1]،واتا: ناندەرێکی سوپاسگوزار وەك کەسێکی بەڕۆژووی ئارامگرە.

---

[1] - صەحیحە، ترمیزی(٢٤٨٦) و ئەبو یەعلا(٦٥٨٢) و حاکم(٤/ ١٣٦)ئیخراجیان کردووە.

روونه کە سوپاسگوزاربوونی بەهۆی چاکەکارییەکەوە کە بەکەسی تری بدات پلەیەکی تری بۆ زیاتر ئەبێ، پاداشتی سوپاسگوزاریی ئەوەندە زیاتر ئەکات کۆتایی نەیەت، پێچەوانەی ئارامگرتن کە ئاستێکی هەیەو لەوێدا پاداشتەکەی دەوەستێ.

ئەوەی باسمانکرد بەڵگەیەکی سەربەخۆی ئەم بابەتە بوو، روونی دەکاتەوە کە مرۆڤی سوپاسگوزار باشترە لەمرۆڤی رازیبوو کە پلەی لەئارامگر باشترە.

ئەگەر سوپاسگوزار باشتربێ لەڕازییبوو، ئەو رازیبووەی کە باشترە لە ئارامگر، کەوابوو سوپاسگوزار بەدوو پلە لەئارامگر بەفەزڵترە.

لەصەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی زوهەرییەوە ئەویش لەسالمەوە ئەویش لەباوکییەوە وتی: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَيْنِ: رَجُلٍ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ فَهُوَ يَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ النَّهَارِ، وَرَجُلٍ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَهُوَ يُنْفِقُ مِنْهُ آنَاءَ اللَّيْلِ النَّهَارِ"[1]،واتا:ئیرەیی لەهیچ شتێکدا رەوا نییە تەنیا لەدوو شتدا نەبێ: کەسێك خوای گەورە قورئانی پێ داوەو لەکۆتایی شەو و رۆژ دەیخوێنێ، کەسێکیش خوای گەورە سەروەتێکی پێ داوە لەکۆتایی شەو و رۆژ دەیبەخشێ. دەوڵەمەندی بەخشەری هاوتای قورئانخوێندنی شەوان و شەونوێژ داناوە.

وتوویانە:لەفەرموودەکەی ئەبی کەبشەی ئەنمارییدا بەڕاشکاویی هاتووە: کە خاوەن سەروەت و پارە گەر بەزانستی خۆی لەسەروەتی خۆی کاربکات و ترسی خوای تێدا هەبێ و بەزەیی بگەیەنێ و مافی خوای تیادا دەربکات، ئەوە

---

[1] - بوخاری(٥٧٢٩) و موسلیم(٨١٥) ئیخراجیان کردووە.

لەبەرزترین پلەدایە لای خوای گەورە، ئەوەش راشكاوانەیە لەبابەتی فەزڵی ئەودا.

هەژاری راستگۆش گەر نییەتی هەبوو كاری دەوڵەمەندی بەخشەرو سەخیی بكات و بەزمان ئەوەی وت و نییەتیشی لەگەڵدا راستگۆیانە بوو، ئەوە پاداشتی خۆی و دەوڵەمەندەكە وەك یەكە، چونكە هەردووكیان نیازی چاكەیان هەبووەو بەپێی توانای خۆیان كاریان كردووە، دەوڵەمەندەكە نییەتی هەبووەو بەزانستی خۆی بەجێیگەیاندووە، هەژارەكەش نییەتی هەبووە و بەزمانی بەجێیگەیاندووە، بۆیە لەو رووەوە لەپاداشتدا یەكسانن، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ لەبنچینەی پاداشتدا یەكسان بن، بەڵكو یەكسانبوونیان لەچۆنێتی و وردو درشتی كارەكەدایە.

پاداشتدانەوەی كارو نییەت بەكردارەوە زیاترە بەسەر پاداشتی شتێك كە تەنیا نییەت و قسەی لەسەر هەبووە. كەسێك نییەتی حەجی هەبێ و پارەو سەروەتێكی نەبێ حەجی پێ بكات، گەرچی لەسەر ئەو نییەتە پاداشت بدرێتەوە، ئەوە پاداشتی زیاتر هەیە بۆ ئەو كەسەی حەج ئەكات و نییەتی حەجكردنی لەگەڵدا هەبووە.

تۆش گەر دەتەوێ لەمە تێبگەی، ئەوە لەم فەرمایشتەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)رابمێنە كە دەفەرموێت:"من سأل الله الشهادة صادقاً من قلبه بلّغه الله منازل الشهداء وإن مات على فراشه"[1]،واتا: هەركەسێ لەدڵەوە راستگۆیانە داوای شەهیدبوون لەخوای گەورە بكات، ئەوە خوای گەورە بەمەنزڵ و پێگەی شەهیدانی دەگەیەنێ گەر لەسەر جێگەكەشی بمرێ.

---

[1] - موسلیم(١٩٠٩) ئیخراجی كردووە.

گومان لەوەدا نییە، ئەو کەسەی لەپێناو خوای گەورە کوژراوە، پاداشتی شەهیدبوونی هەیە کە چۆنێتی و سیفەتەکەی زیاترە لەو کەسەی نییەتی شەهیدبوونی هەبووە و لەسەر جێگە خەوەکەی مردووە، گەرچی بەپلەی شەهیدییش گەیشتووە.

ئا لێرەدا دوو پاداشت هەیە:پاداشت و نزیکێتی، ئەگەرچی لەبناغەی پاداشتەکەدا وەك یەکن، بەڵام ئەو کارەی کە ئەنجامدەرەکەی پێی هەڵساوە پاداشت و شوێنەوارێکی زیاتر و نزیکبوونەوەیەکی تایبەت پێویست دەکات، ئەوەش فەزڵی خوایە بەهەرکەسێکی دەدات کە خۆی بیەوێ ، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی:« إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا، فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ » ، واتا:ئەگەر دوو موسڵمان بەشمشێرەکانیان روویان لەیەکتر کرد، ئەوە بکوژو کوژراویش لەئاگردان، وتیان: ئەی پەیامبەری خوا دەزانین ئەوە بکوژە، ئەی کوژراو چی تاوانێکی هەیە تاوەکو بخرێتە دۆزەخەوە؟ ئەویش فەرمووی:«إِنَّهُ كَانَ حَرِيصًا عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ»[1]،واتا:ئەویش پێداگربووەو ویستوویەتی بەرانبەرەکەی بکوژێ. لەچوونە دۆزەخەوە وەك یەکن، بەڵام ئەمە ئەوە ناچەسپێنێ پلەو ئەندازەی سزادانیان وەك یەك بێ، بۆیە مافی خۆی بەفەرموودەکەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)بدەو لەشوێنی خۆی دایبنێ، ئەوجار مەبەستت بۆ روون دەبێتەوە.

روونکردنەوەی ئەم باسە،ئەوەیە کاتێ کۆمەڵێ هەژار هاتنە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) گازندەی ئەوەیان کرد کە دەوڵەمەندەکان بەهۆی

---

[1] - بوخاری(٣١) و موسلیم(٢٨٨٨) ئیخراجیان کردووە.

رزگارکردنی کۆیلەو خێرکردنەوە پاداشتی زۆرتریان بەسەر ئەواندا هەیە،وەك ئەوان نوێژ دەکەن و بەڕۆژوو دەبن، سەروەتی زیاتریان هەیە بەهۆیەوە حەج دەکەن و عومرە ئەنجام دەدەن و جیهاد دەکەن، پەیامبەری خواش(صلی الله علیە وسلم)فەرمووی:"ألا أدلکم علی شيء اذا فعلتموە أدرکتم بە من سبقکم"،واتا: ئایە شتێکتان پیشان بدەم گەر ئەنجامی بدەن بەخێرو پاداشتی ئەواندا بگەنەوە. پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)ئامۆژگارییکردن دوا بەدوای هەموو نوێژێك(سبحان الله والحمد لله والله أکبر)بکەن، کە دەوڵەمەندەکان ئەوەیان گوێ لێبووەوە ئەوانیش دوای هەموو نوێژێك ئەوەیان کرد، جارێکی تر هاتنەوە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)کە دەوڵەمەندەکان هەم پێشیان کەوتوون، ئەویش فەرمووی:﴿ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ﴾ الحدید: ٢١،[1]واتا: بەخششێکی خواییە دەیدات بە هەرکەس کە خۆی بیەوێت.

ئەگەر تەنیا بەنییەت بەواندا بگەیشتبایانەوە، ئەوە پێیانی دەفەرموو: نییەتی ئەوەتان هەبێ کاری ئەوان بکەن، ئەوە هەمان پاداشتی ئەوان وەردەگرن، بەڵکو پێیانی فەرموو ئەوەی دەوڵەمەندەکان پێشی ئێوە دەکەونەوە فەزڵێکەو خوای گەورە بەکێی بووێ ئەیبەخشێ.

هەژارەکان وتوویانە:ئەگەر لەحەقیقەت بگەن، ئەوە ئەم فەرموودەیە بەڵگەو بیانووی ئێمەیە، واتای فەرموودەکە ئەوەیە: ئەگەرچی لەئیمان و ئیسلام و نوێژو ڕۆژوو لەگەڵتاندا یەکسانن، پاشان لەڕێی بەخشیندا بەسەرتاندا فەزڵداربوونە، ئەوە ئێوە بەالله أکبر و سبحان الله و لا إله إلا الله وتن بەوان

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

دەگەنەوە، هەروەها بەنییەتی جوان و باشیش بەوان یەکسان بوونە، چونکە نییەتی ئەوەتان هەیە گەر ئێوەش دەسترۆیشتوو بوونایە ئەوە وەك ئەوان دەتانبەخشی. لەفەرموودەیەکیشدا هاتووە:"إن أخذتم به سبقتم من قبلكم ولم يلحقكم من بعدكم"،ئەوە ئەگەیەنێ کە دەوڵەمەندەکان بەهەژارەکاندا ناگەنەوە گەر هەمان خۆزگەی هەژارەکانیان هەبێ. خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ﴾ الحديد: ٢١، واتا: فەزڵی خوای گەورە تەنیا بۆ ئێوە کورت نەهاتووەتەوە، هەروەك چۆن بەزیکرو یادی خۆی فەزڵی بەئێوە داوە، ئەوە بەوانیشی دەدات گەر وەك ئێوە ئەنجامی بدەن، ئێوە وەها تێگەیشتوون ئەم فەزڵە تایبەتکراوەو، لەجێی خۆیدا داتان نەناوە. واتای ئایەتەکە گشتییە، فەزڵی خوای گەورە گشتگیرە بۆ دەوڵەمەندو هەژار و تەنیا بۆ خۆتانی دامەنێن، ئایە لەم فەرموودەیەی هێنامانەوە فەزڵی ئێوە بەسەر ئێمەدا لەکوێیە؟

وتوویانە:فەرمایشتی﴿ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ ﴾سێ حاڵەت ئەگەر ئەکات: **یەکەم:** بەبەخشین پێش ئێوە کەوتوون. **دووەم:** لەفەزڵی یادی خوای گەورەدا بەئێوە یەکسانن و تەنیا تایبەت بەئێوە نییە. **سێیەم:** بەنیو رۆژ پێش ئێوەی دەوڵەمەند ئەچنە بەهەشتەوە، ئەمە ئەگەرچی لەم گێڕانەوەیەدا باس نەکراوە، بەڵام لەهەندێ گێڕانەوەی دیکەدا باسکراوە.

ئەلبەزار لەموسنەدەکەیدا ئەڵێ: ئەلوەلیدی کوڕی عەمر بۆی باسکردین، موحەممەدی کوڕی زەبرقان بۆی باسکردین، موسای کوڕی عوبەیدە بۆی باسکردین، ئەویش لەعبداللەی کوڕی دینارەوە ئەویش لەئیبن عومەرەوە وتی:

هەژارانی موهاجیرین هاتنە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)گازندەی ئەوەیان کرد کە دەوڵەمەندەکانیان فەزڵیان بەسەریاندا هەیەو وتیان: ئەی پەیامبەری خوا، براکانمان وەك ئێمە پەیامی ئیسلامیان بەڕاستخستەوەو وەك ئێمە باوەڕیان هێناوەو وەك ئێمە بەڕۆژوو ئەبن، ئەوان پارەیان هەیە خێری پێ دەکەن و پەیوەندیی خزمایەتیی پێ بەجێدەگەیەنن و لەپێناو خوای گەورەدا دەیبەخشن، ئێمەش هەژارین و توانای ئەوەمان نییە.

پەیامبەریش فەرمووی: "ئاخۆ کارێکتان پێ پێشان بدەم گەر ئەنجامی بدەن بەفەزڵی ئەواندا بگەنەوە؟ لەدوای هەموو نوێژێك ئەمانە بخوێنن: دە جار(الله أكبر)، دە جار(الحمد لله)، دە جار(لا إله إلا الله) و دە جار(سبحان الله) کردن بەفەزڵی ئەوان دەگەنەوە.

هەژارەکان ئەوەیان کرد، ئەو باسە بەدەوڵەمەندەکان گەیشتەوەو ئەوانیش هەمان کاریان کرد، بۆیە هەژارەکان گەڕانەوە بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) و ئەوەیان بۆ باسکرد و وتیان: براکانمان ئەوەی ئێمە ئەنجام دەدەنەوە، ئەویش فەرمووی: ئەوە فەزڵی خوایە بەهەرکەسێکی بووێ ئەیبەخشێ. ئەی گرۆی هەژاران موژدەیەکتان پێ بدەم کە هەژارانی موسڵمانان پێش دەوڵەمەندەکانیان بەنیو ڕۆژ کە پێنجسەد ساڵی دونیا دەکات ئەچنە بەهەشتەوە". موسای کوڕی عوبەیدە ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿ وَإِنَّ يَوۡمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلۡفِ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الحج: ٤٧،[1]واتا: بێگومان ڕۆژێك لای پەروەردگارت وەك هەزار ساڵ وایە لەو ساڵانەی ئێوە دەیژمێرن.

---

[1] - لاوازە، ئەلبەزار(٣٠٩٤- کشف الأستار) تەخریجی کردووە، موسای کوڕی عوبەیدەی ئەلزوبەیدیی تێدایە کەسێکی لاوازە.

وتوویانە:ئەمـە یـەك فەرموودەیـە(خبر واحـد) و نەپچـڕاوە، وەك موژدەیـەك بۆیانی باسکردووە کاتێك وتوویانە لەخوێندنی ئەو زیکرانـەدا دەوڵەمەنـدەکانیش بەئێمە یەکسـان بوونـە، بـەم موژدەیـە تایبـەتکراون و بەنییـەتی خۆیـان لەگـەڵ دەوڵەمەندەکان یەکسان بوونە و تایبەتمەندێتیی هەژارییان بۆ هاتووەتەدی.

دەوڵەمەندەکان وتوویانـە:بۆ ئـەوەی فەرموودەکـە بـەلای خۆتانـدا ببـەن زۆر زیادەڕۆییتان کـرد، لـەم باسـەدا فـەزڵ بـۆ کەسـێکە دادپـەروەربێ، فەرمایشـتی خـوای گـەورە:﴿ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ ﴾ لـەوەڵامی ئـەو هەژارانـەدا هاتووە کـە وتوویانـە: دەوڵەمەنـدەکان لـەو زیکرانەشـدا هاوبەشـی ئێمـە بـوون، هەروەك چۆن لەنوێژو ڕۆژوو ئیماندا یەکسـان بوونـە، تایبەتمەنـدیی بەخشـینیان زیاترەو ئەوەیان وت کە ئەوان بەو سـەروەتەی لای دەوڵەمەنـدەکان هەیـەو لێـی دەبەخشـن بەوانـدا ناگەنـەوە، بـەڵام بـەو زیکـرەی فێـری ئـەوان کـرا دەوڵەمەندەکـانیش تیایدا بەوان گەیشتنەوە، ئەوکـات خوای گـەورە فـەرمووی: ﴿ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ ﴾ (الحدید:٢١).

بێگومان ئەمە مەبەسـتێکی روون و ئاشـکرایە، کاتێـك هـەژارەکان نـەیانتوانی بەهۆی بەخشینی دەوڵەمەندەکانەوە بەدەوڵەمەندەکان بگـەن، مـوژدەی ئـەوەی پێدان کە بەنیو ڕۆژ پێش دەوڵەمەندەکان دەچـنە بەهەشـتەوە، ئـەوەش لـەبری لەدەستچوونی فەزڵی دەوڵەمەندی و بەخشین، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ لەپلـەو مەقامـدا بـەرزترین، چـونکە حـەفتا هـەزار کـەس بـەبێ لێپرسـینەوە دەچـنە بەهەشتەوە[١]، لەکاتێکدا لەوانەی بۆ لێپرسینەوە رادەگیردرێن کەسـانێکیان تیـادا

[١] - بڕوانە: ئەوەی بوخاری(٦٤٧٢) و موسلیم(٢٢٠) ئیخراجیان کردووە.

هەیە لەفەزڵ و پایەدا زۆر لەوانە بەرزترن کە بێ لێپرسینەوە چوونەتە بەهەشتەوە.

وتوویانە: خوای گەورە لەزیاتر لەشوێنێکی کتێبەکەیدا سەروەت و سامانی بەخێر ناوبردووە، وەك دەفەرمووێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ﴾ البقرة: ١٨٠، واتا: پێویست کراوە لەسەرتان کاتێك یەکێکتان لەسەرەمەرگ بوو ئەگەر ماڵی لەپاش بەجێما وەسێت کردن.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ۝٨﴾ العادیات: ٨، واتا: بەڕاستی ئینسان بۆ خۆشەویستی ماڵی دنیا زۆر بەگیرە.

پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) هەواڵی داوە کە خێرو چاکە هەر بەخێرو چاکە دێتەبوون[1]، کاتێك دەبێتە خراپە کە لەچاکەدا بەکارنەهێنرێت نەك ئەوەی خودی پارەو سامان خراپ بێ.

بزانە خوای گەورە سەروەت و سامانی کردووەتە هۆکاری ڕاگرتنی گیان و دەروونەکان و پارێزگارییکردنیان، ڕێگریی کردووە بدرێتە دەست نەزانەکانەوە لەنمونەی ژنان و منداڵ و ئەوانی تر، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم)پیاهەڵدانی کردووەو فەرموویەتی: "نِعْمَ المالُ الصالحُ مع المرء الصَّالح"[2]،واتا: باشترین ماڵ و سەروەتێك،ماڵ و سەروەتێکی چاکە لەگەڵ مرۆڤێکی چاکدا.

---

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

[2] - صەحیحە، ئەحمەد لە المسند(٤/ ١٩٧، ٢٠٢) و ئیبن حیبان(٣٢١٠) و حاکم(٢/ ٢٣٦) ئیخراجیان کردووە.

سەعیدی کوڕی موسەیب ئەڵێ: خێر لەکەسێکدا نییە لەڕێگەی حەلاڵدا سەروەت و ماڵ کۆنەکاتەوە تاوەکو پێویستی بەخەڵك نەبێ روویان لێ بنێ و سۆزو بەزەیی پێ بەجێبگەیەنێ و مافی خۆی بدات[1]. ئەبو ئیسحاق ئەلسەبیعیی ئەڵێ:ئەوانی پێشوو دەوڵەمەندییان بەهاوکاریی ئاین دەزانی[2].

موحەممەدی کوڕی ئەلمونکەدیر[3] ئەڵێ:دەوڵەمەندیی، باشترین یارمەتیدەری لەخواترسانە[4]. سوفیانی سەوریی وتوویەتی:سەروەت و سامان لەم سەردەمەی ئێمەدا چەکی ئیمانداره[5]. یوسفی کوڕی ئەسباط ئەڵێ:لەوەتەی سەروەت و سامان دروستکراوە، بەقەد ئەم سەردەمەی ئێمە ئەوەندە بەسوود نەبووە، خێرو چاکە وەك ئەسپ وایە، بۆ یەکێك پاداشتەو بۆ یەکێکی تر داپۆشەرو بۆ یەکێکی تر تاوانە.

وتوویانە: خوای گەورە سەروەت و سامانی گێڕاوە بە هۆکارێك بۆ پاراستنی جەستەو گیان(دەروون)، ئەو دەروونەی کە شوێنی ناسینی خوای گەورەو باوەڕ پێهێنان و راستخستنەوەی پەیامبەرانی و خۆشویستن و گەڕانەوە بۆ لایەتی، سەروەت و سامان هۆکاری ئاوەدانکردنەوەی دونیاو قیامەتە.

---

[1] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە إصلاح المال(٥٥) و ئەبو نەعیم لە الحلية(٢/ ١٧٣) ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئەبو نەعیم لە الحلية(٤/ ٣٤٠) ئیخراجی کردووە.

[3] - موحەممەدی کوڕی ئەلمونکەدیری کوڕی عبداللەی کوڕی ئەلهودەیری کوڕی عەبدولعوزای ئەلقورەیشیی ئەلتەمیمی(لەنەوەی تەیمی کوڕی مورەیە)ئەلمەدەنی(ساڵی٥٤ك لەدایکبووە، ١٣٠ك مردووە): یەکێك بوو لەپیاوانی فەرموودەو خەڵکی مەدینە بوو، بەهەندێ لەهاوەڵان گەیشتووەو لێیانەوە نزیکەی دوو سەد فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

[4] - ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە إصلاح المال(٥٨) ئیخراجی کردووە.

[5] - ئەبو نەعیم لە الحلية(٦/ ٣٨١) ئیخراجی کردووە.

ئەوە لەسەروەت و سامان نابووت و تاوان و جێی سەرزەنشتکراوییە، ئەوەیە کە لەڕێگەی خۆیدا پەیدانەکرێ و لەناهەق و تاواندا خەرج بکرێ و خاوەنەکەی بۆی ببێتە کۆیلە و دڵی داگیربکات و لەخواو قیامەت بێ ئاگای بکات. ئەوەی لێ نابووت و قێزەونە، کە خاوەنەکەی بەمەبەستی خراپ بگەیەنێ یان لەمەبەستی چاك دووریبخاتەوە، مرۆڤەکە سەرزەنشتکراوە نەك پارەو سامانەکە، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:«تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ، وَعَبْدُ الدِّرْهَمِ »[1]،واتا:بەدبەخت و زیانمەند بوو بەندەی دینارو درهەم. بەندەی دینارو درهەمی سەرزەنشتکردووە نەك خودی دینارو درهەم.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: ئەبو ئەلموغیرە بۆی باسکردین، صەفوان بۆی باسکردین، ئەویش لەیەزیدی کوڕی مەیسەرەوە وتی:لەکۆندا کابرایەك هەبووە، سەروەتێکی زۆری کۆکردبووەوە،لەنێو کەسوکاری خۆیدا ئەبێ و دەوڵەمەند، روودەکاتە دەروونی خۆی و ئەڵێ: بۆ خۆت ساڵانێکی خۆش بژی. فریشتەی گیانکێشان دێتەلای و لەوێنەی هەژارێکدا لەدەرگا دەدات، خزمەتکارەکان دەچن بۆلای و ئەڵێ: خاوەن ماڵم بۆ بانگ بکەن. ئەوانیش ئەڵێن: ئەو بێتەدەرەوە بۆ لای تۆ! پاشان کەمێك دەمێنێتەوەو دووبارە لەدەرگا دەداتەوەو هەمان شتی پێشوو دووبارە دەبێتەوە، ئینجا ئەڵێ: پێی بڵێن من فریشتەی گیانکێشانم، کە گەورەکەیان ئەمەی گوێ لێ دەبێ لەترسدا راستدەبێتەوەو دادەنیشێ و ئەڵێ: بەنەرمیی قسەی لەگەڵدا بکەن. ئەڵێن: خوای گەورە بەرەکەتدارت بکات کێت دەوێ بەس با گەورەمان نەبێ. ئەڵێ: نە، دەچێتە لای و ئەڵێ: گەر وەسێتێکت هەیە وەسێتی خۆت بکە، بەر لەوەی دەربچم لەم ماڵەت دەبێ گیانت بکێشم.

---

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

کەسوکاری دەست دەکەنە هاوارو گریان، پاشان ئەڵێ: سندوقەکان بکەنەوەو توورەکەی پارەکانیش بکەنەوە، ئەوانیش هەموویان کردەوە، رووی کردە پارەو سەروەتەکەی و دەستیکردە نەفرەتکردن و جنێودان پێی و ئەیووت: نەفرەتت لێ بێ، تۆ بووی پەروەردگارمت لەبیربردەوەو لەکارکردن بۆ ئاخیرەت منت دوورخستەوە تائەوەی کاتی مردنم هات، پارەو سەروەتەکەی بەقسە هات و وتی:قسەو جنێو بەمن مەدە، ئاخۆ تۆ لەنێو خەڵکدا ئاست نزم نەبووی من تۆم بەرزکردەوە؟ ئایە شوێنەواری من بەسەرتەوە دیار نەبوو؟ بەهۆی منەوە دەچوویتە کۆشکی پادشاو گەورەکانەوەو کەس رێی لێت نەدەگرت، لەکاتێکدا بەندەکانی خواش دەچوونە ئەو شوێنانە رێگە نەدەدرا بچنە ژوورەوە تۆ بەهۆی منەوە دەچوویتە ژوورەوە؟ ئاخۆ تۆ داوای کچانی پادشاو گەورەکانت نەدەکرد بەهۆی منەوە لێت مارە دەکران،لەکاتێکدا لەخواپەرستان ئەوانیان داوا دەکرد پێیان نەدەدران؟ تۆ لەرێگەی خراپدا منت خەرج دەکردو سەرپێچییم نەدەکرد، ئەی گەر لەرێگەی خوادا منت خەرج بکردبایە سەرپێچییم دەکرد؟ تۆ لەمن سەرزەنشتکراوتری، بێگومان من و ئێوە لەخۆڵ دروستکراین ئەی نەوەی ئادەم، هەندێکتان بەچاکە دەڕۆنەوەو هەندێکیشتان بەتاوان....دونیا ئاوەها ئەڵێ، بۆیە وریای بن[1].

لەئەسەرێکدا هاتووە کە خوای گەورە فەرموویەتی:"أموالنا رجعت إلينا، سَعِدَ بها من سعد، وشَقِيَ بها من شقي"،واتا: سەروەتی خۆمان بۆ خۆمان گەڕایەوە، پێی بەختەوەر بوو ئەو کەسەی بەختەوەرانە ژیاو بەدبەخت بوو ئەو کەسەی بەدبەختانەو خراپ پێی ژیا".

---

[1] - ئەبو نەعیم لە الحلية(٥/ ٢٤٠) ئیخراجی کردووە.

وتوویانــە: لەســوودەکانی ســەروەت و ســامان، پارمەتیــدان و بــەهێزکردنی خواپەرستیی و ئامادەکردنی کەلوپــەل و کارئاســانییە بـۆ حــەج و جیهــادکردن و پێیەوە زەکات و سەدەقە دەدرێ و کۆیلە رزگـار دەکـرێ و وەقـف و مزگـەوت و پـردو شـتانی تـر دروسـت دەکـرێ، بەسـەروەت و پـارە هاوسـەرگیریی ئـەنجام دەدرێ کە باشترە لەپەرستشە سوونەتەکان، بەسەروەت و سامانەوە پیاوەتیی ئەکرێ و سیفەتی دەستکراوەیی و بەخشندەیی دەردەکەوێ و قـەرزو پێـزانین و پیاوەتی و برایەتیی و هاورێ دەستدەخرێت.

بەســەروەت و ســامان چـاکەکاران ئەگەنــە پلـە بـەرزەکان و ئەبنـە هــاورێی ئەوانــەی خـوای گـەورە نیعمــەتی خـۆی بەســەریاندا داوە، پەیژەیەکـە پێیــەوە بەرزدەبێتەوە بۆ بەرزترین خانووەکانی بەهەشت، هەر بـەهۆی پارەشـەوە مـرۆڤ دادەبەزێ بۆ خوارترین و ریسواترین شوێنی دۆزەخ.

سەروەت و سامان راگری شکۆی مرۆڤی شکۆدارە، وەك پێشینێك وتوویـەتی: بــەبێ کــارکردنی زۆر هــیچ شــکۆدارییەك بــوونی نییــە، کــارکردنی زۆریــش بەسەروەتو سامان دەکرێ. یەکێکی تریان وتوویەتی: خوایە گیـان مـن یـەکێکم لەو بەندانەی تۆ کە تەنیا دەوڵەمەندییان بۆ شیاوەو چاکیان دەکات.

یەکێکە لـەهۆکارەکانی رازیبـوونی خـوای گـەورە لەبەنـدە، هـەروەك یەکێکـە لەهۆکارەکانی تووڕەکردنیشی، ئەو سێ کەسەی کە خوای گـەورە بەسـەروەت و سـامانی تاقیکردنـەوە: بەڵـەك و کەچـەڵ و نابینـاك، کـابرای نابینـا رەزامەنـدیی خــوای دەستخســت، بــەلام بەڵــەك و کەچــەڵەکە تــووڕەیی خــوای گــەورەیان کەوتەسەر[1].

---

[1] - بڕوانە ئەوەی بوخاری(٣٤٦٤) و موسلیم(٢٩٦٤) ئیخراجیان کردووە.

جیهـادکردن لووتکـەی کارکردنـە، جارێـك بـەگیان ئـەنجام دەدرێ و جارێـك بەسـەروەت و سـامان، رەنگـە جیهـادکردن بەسـەروەت و سـامان باشـترو بەسوودتربێ هەندێجار، ئـاخۆ عوسمـان بەچـی شـتێك فـەزڵی زۆرتـری بەسـەر عەلییدا هەبوو، خـۆ عـەلیی جیهـادی جەسـتەو گیـانی لـەعوسمان زۆرتـرو پـێش ئەویش موسڵمان بووبـوو؟ ئـەوە زوبـەیرو عەبـدولڕەحمانی کـوڕی عـەوف باشـتر بوون لەکۆی هاوەڵان، لەکاتێکدا زۆر دەوڵەمەنـدیش بوون،چـونکە کاریگـەرییان لەڕووی ئایینەوە زۆر زۆرتربوو لەکاریگەریی ئەهلی صوفە.

پەیامبەری خوا نەهیکردووە سـەروەت و سـامان لـەنێوببردرێت[1] هـەواڵی داوە مـرۆڤ گـەر میراتبـەرانی بەدەوڵەمەنـدیی بـەجێبهێڵێ باشـترە لـەوەی بەهـەژاریی بـەجێیانبهێڵێ[2]. هـەواڵی داوە هـەر خـاوەن سـەروەتێك تـەنیا بـۆ خـوا پـارەو سامانێك خەرج بکات، ئەوە پلەو مەقامێك پێی بەرز دەبێتەوە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پەنای بەخوا گرتووە لەهەژاری و لەگەڵ بێباوەڕییدا کـۆی کردووەتـەوەو فەرموویـەتی:«اللَّهُـمَّ إِنِّـي أَعُـوذُ بِـكَ مِـنَ الْكُفْـرِ وَالْفَقْرِ»،واتا: خوایە گیان پەنات پێ دەگرم لەبێباوەڕی و هەژاری[3].

چاکە(خێر) دوو جۆرە:چاکەی ئاخیرەت کە بێبـاوەڕیی دوژمنێتـی... چـاکەی دونیا کە هەژاریی دوژمنێتی، هەژاریی هۆی ئەشـکەنجەی دونیایـە، بێبـاوەڕییش هۆکاری ئەشکەنجەو ئازاری ئاخیرەتە.

---

[1] - هەروەك لەو فەرموودەیەدا هاتووە کە موسلیم(١٧١٥) ئیخراجی کردووە.

[2] - بڕوانە ئەوەی بوخاری(٢٧٤٣) و موسلیم(١٦٢٨) ئیخراجیان کردووە.

[3] - صـەحیحە، حـاکم لـە المسـتدرك(١/ ٢٥٢) و نەسـائی لـە عمـل الیـوم واللیلـة(٢٢) و ئەحمـەد(٥/ ٤٢) ئیخراجیان کردووە.

خـوای گـەورە، زەکـات دەرکردنـی گێـڕاوە بەئـەرکی دەوڵەمەنـدەکان و وەرگرتنیشی بۆ هەژارەکان، لەڕووی شەرع و ڕێزەوە جیاوازیی لـەنێوان هـەردوو دەستەکەدا هەیە، دەستی بەخشەری بەرزتر داناوە لەدەستی وەرگر، زەکاتی داناوە بەپیسیی سەروەت و سامان، بۆیە بەدووری گرتووە لەباشترین مـەخلوقی خۆی و بنەماڵەکەی، ئەوەش لەبەر گەورەیی و بەرزڕاگرتنی ڕێزیان.

ئێمە ئەوە ڕەتناکەینـەوە کـە پەیامبـەری خوا(صـلی الله علیـە وسـلم) پێشـتر هەژار بوو خوای گەورە دەوڵەمەندی کرد، فەتحی شوێنەکانی بۆ کـردو خـواردنی ساڵێکی بـۆ خێزانـەکانی پاشـەکەوت دەکـرد، بـەجۆرێك دیـاریی ئـەدا کـەس لەپێشتردا دیاریی وەهای نەدابوو، بەجۆرێ دەیبەخشی کە لەهـەژاریی نەترسـێ، کۆچی دوایی کرد فدك و نەزیرو سەروەت و سامانێکی هەبوو خـوای گـەورە بـۆی تایبـەت کردبـوو، پـەروەردگار ئەفـەرموویێت:﴿ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ ﴾ الحشـر: ٧، واتـا: ئـەوەی خـوا دەسـت پێغەمبـەری خست(سەروەت و سامانی)دێهاتی یەکان ئەوە بۆ خـوا و بـۆ پێغەمبەر(صـلی الله علیە وسلم).

خـوای گـەورە بـەدووری گـرت لەهەژارییـەك سـەدەقەی بـۆ پێویسـت بکـات و بەباشـترین و پـاکترین سـەروەتێك بـۆی قـەرەبوو کـردەوە، بەسـێبەری شمشێرەکەی لەو دوژمنانەی وەردەگرت کە پارەو سـامانی خوایـان لەدەسـتبوو ستەمکارانە بەکاریاندەهێنا.

خـوای گـەورە سـەروەت و سـامانی دروسـتکردووە تـاوەکو یارمەتیـدەری لەخواترسـان بـێ، کەچـی بـۆ سـتەم و سـتەمکاریی لەدەسـتی بێباوەڕانـدا بـەکاردەهێنرا، بـەڵام کـە بگەڕێتـەوە دەسـت دۆسـتەکانی خـۆی، ئـەوە لـەوەدا

بەکاردەهێنرێ کە بۆی دروستکراوە، بەلاّم دەوڵەمەندیی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەهەمان دەوڵەمەندیی و موڵکی رۆڵەکانی دونیا نەبوو، ئەوان بەسەروەتەکانیان دەوڵەمەندبوون، بەلاّم پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)بەرانبەر سەروەتەکەی دەوڵەمەندبوو، دەوڵەمەندی بەرزو بالاّ بوو، موڵکی ئەوان موڵکێك بوو بەویستی خۆیان مامەڵەیان پێوە دەکرد، بەلاّم پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەموڵکی خۆیدا وەك بەندەیەك بوو بەفەرمانی گەورەکەی مامەڵەی پێوە دەکرد.

شەرعناسان لەبابەت فەیئدا[1] جیاوازن: ئاخۆ موڵکی پەیامبەری خوا بووە، بۆ ئەمە دوو بۆچوون هەیە: هەردووکی گێڕانەوەی ئەحمەدن، بەلاّم دروست و سەلماوە کە موڵکی ئەون بەجۆرێکی تری خاوەندارێتییکردن، موڵکێکە بەفەرمانی خوای گەورە مامەڵەی پێوە کردووە، هەروەك پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەفەرمووێ:"والله لا أعطي أحداً، ولا أمنع أحداً، إنما أنا قاسم أضعُ حيث أُمرت"[2] ،واتا: سوێند بەخوای گەورە نە هیچ بەکەس دەدەم و نە کەسیشی لێ بێ بەش ئەکەم، چی فەرمانێکم پێ بکرێ بەو جۆرەی دابەش ئەکەم. ئەوەش کەماڵی پلەی بەندایەتیی ئەو بوو، هەر بۆ ئەوەش بوو میراتی بەجێنەهێشت، لەهەموو روویەکەوە بەندەیەکی تەواو بوو بۆ خوای گەورە، بەندەیەك بوو سەروەت و سامانێکی نەبوو بەمیرات لەدوای بەجێبمێنێ.

[1] - فەیئ: ئەو سەروەتەیە کە موسڵمانەکان بەبێ شەڕ لەدوژمنەکانیان وەریدەگرن.

[2] - بوخاری(٣١١٧) ئیخراجی کردووە لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ).

خوای گەورە لەبەرزترین جۆری دەوڵەمەندیی و بەرێزترین جۆری هەژاریی بۆ کۆکۆدەوەو بەوە پلەکانی کەماڵی بۆ تەواو کرد، بۆیە دەوڵەمەندو هەژار لەیەکتر مافدارتر نیین.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەهەژارییەکەیدا ئارامگرترین مەخلوقی خوای گەورە بوو، لەدەوڵەمەندییەکەشیدا هەر بەو جۆرە بوو، خوای گەورە کردیە پێشەنگ بۆ دەوڵەمەندو هەژارەکان، ئاخۆ چی دەوڵەمەندێك لەو کەسە دەوڵەمەندترە کلیلی گەنجینەکانی زەویی پێ بدرێت و پێشنیاری بۆ بکرێ کێوی صەفای بۆ بکرێتە ئاڵتوون[1]، سەرپشککرا لەنێوان ئەوەی پادشایەکی پەیامبەربێ یان بەندەیەکی پەیامبەر، بەلام ئەوەی هەڵبژارد بەندەیەکی پەیامبەربێ[2]. لەگەڵ ئەوەشدا سەروەتی دوورگەی عەرەب و یەمەنیشی بۆ هێنرا، بەلام هەمووی بەخشییەوەو هیچ شتێکی بۆ خۆی هەڵنەگرت، ناخۆشیی قەرزی ماڵ و منداڵی موسڵمانانی گرتە ئەستۆ و فەرمووی: "مَنْ ترك مالاً فلورثته، ومَنْ ترك كلاً فإلي وعليّ"[3]،واتا: هەرکەسێ میراتێکی بەجێهێشت ئەوە بۆ میراتبەرەکانێتی، هەرکەسێکیش دوای خۆی قەرزێکی بەجێهێشت، ئەوە دانەوەی لەسەر منە.

خوای گەورە پایەبەرزی کرد لەوەی لەڕیزی هەژاراندا بێ و سەدەقەی پێ بشێ، هەروەك بەدووریشی گرت لەوەی لەڕیزی ئەو دەوڵەمەندانەدا بێ سەروەتی

---

[1] - بڕوانە ئەوەی ئەحمەد(١/ ٢٤٢) و حاکم(٤/ ٢٤٠) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بڕوانە ئەوەی ئەحمەد(٢/٢٣١) و ئەلبەزار(٢٤٦٢) و ئەبو یەعلا(٦١٠٥) و ئیبن حیبان(٦٣٦٥) ئیخراجیان کردووە.

[3] - صەحیحە، ئەبو داوود(٢٩٠٠) و ئیبن ماجە(٢٧٣٨) و ئەحمەد(٤/١٣١) و ئیبن حیبان(١٢٢٥) ئیخراجیان کردووە.

میراتی لەدوا بەجێبمێنێ، بەڵکو لەهەموو کەسێ تر دەوڵەمەندتری کرد، دڵی زۆر دەوڵەمەندو فراوانکرد، ئەوپەڕی بەخشینی ئەکردو هیچ بۆ خۆی هەڵنەدەگرت،خانوو زەوی و مەڕو وشتر و کۆیلەو جاریەو دینارو درهەمێکی بۆ خۆی هەڵنەگرت.

ئەگەر دەوڵەمەندێکی سوپاسگوزار حاڵی پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) بەبەڵگە بهێنێتەوە، ئەوە ناتوانێ، تەنیا ئەوکاتە نەبێ کە کاری پەیامبەری خوا بکات، هەروەك هەژاری خۆڕاگریش کاتێ دەتوانێ حاڵی پەیامبەری خوا بۆ خۆی بەڵگە بکات کە هەمان ئارامگریی ئەوی هەبێ، سەربەستانە دەستبەرداری دونیابێ نەك ناچارانە. پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) لەهەژاری و دەوڵەمەندییدا مافی خۆی و پەرستشی دابوو، خوای گەورەش هەژارەکانی پێ دەوڵەمەند کرد، ئوممەتەکەشی بەو دەوڵەمەندبوون، دەوڵەمەندترینی خەڵك کەسێکە، خەڵکی تر بەهۆی ئەوەوە دەوڵەمەندبن.

عەلیی کوڕی ئەبی رەباحی ئەللەخمیی ئەڵێ:لای مەسلەمەی کوڕی موخلیدی ئەنصاریی دانیشتبووم ئەوکات والیی میسر بوو،عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاصیشی لەگەڵدا دانیشتوو، مەسلەمە دێڕە شیعرێکی ئەبی تالیبی هێنایەوەو وتی: گەر ئەبو تالیب ئەیبینیی ئەمڕۆ ئێمە لەچی خۆشییەکی نیعمەت و رێزو بەخشندەیی خوای گەورە داین، ئەوکات دەیزانیی برازاکەی گەورەیەکی بەرێزو بەخشندەبووە کە ئەم خێرو خۆشییە زۆرەی هێناوە، عبداللەی کوڕی عەمر وتی: ئەوکاتیش هەر گەورەیەکی بەرێز بوو خێروخۆشیی زۆری هێنا، مەسلەمە وتی: ئەی خوای گەورە نەیفەرمووە:﴿ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ ۝٦ وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَىٰ ۝٧ وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَىٰ ۝٨ ﴾ الضحی: ٦ – ٨، واتا: ئایا تۆی نەدیی

بەهەتیوو حەوانیتیەوە. وە تۆی نەدیی بەسەر لێ شێواو ڕێنموونیی کردیت. وە تۆی نەدی بەهەژار و دەوڵەمەندی کردیت.

عبداللەی کوڕی عەمر ئەڵێ: هەرچی هەتیوییەکەی بووە، ئەوە لەدەستدانی دایك و باوکی بووە، رەش و رووتی و نەبوونەییش، ئەوە خەڵکانێکی زۆر کەمی عەرەب دەسترۆیشتوو بوون، ئەڵێ:کەمینەیەکی زۆر کەمی عەرەب پارەدار بوون تائەوەی خوای گەورە فەتحی شوێنەکانی بۆ کردن و بەسەر ئەو عەرەبانەی تریشدا کە پۆل پۆل دەهاتنە نێو ئیسلامەوە، پاشان پێش ئەوەی شتێکی بۆ خۆی لێ هەڵبگرێ کۆچی دوایی کردو وازی لێهێناو وریایی دا لەسەروەت و سامان و فیتنەکانی،ئەوەیە واتای:﴿ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴿٨﴾ ﴾، هەرچی واتای: ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴿٥﴾ ﴾ الضحی: ٥، مەبەست پێدانی شتێك نییە پێی تاوەکو لەدونیادا پێی رازیی بێ، بەڵکو بەتەواوی دونیا بۆ ئوممەتەکەی رازیی نەبووەو وریایی لێ داوە، دونیای بۆ پێشنیار کراوە رەتیکردووەتەوە، بەڵکو پێدانی پاداشت و ئەو فەتحەیە کە بۆ خۆی و ئوممەتەکەی دێتەدی لەفەتحکردنی دەسەڵاتی کیسراو قەیسەرو هاتنی خەڵك بۆ نێو ئیسلام و دەرکەوتن و سەرکەوتنی ئیسلام، ئەوە جێی رەزامەندیی و خۆشەویستی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)بوو[1].

سوفیانی سەوریی گێڕاویەتییەوە، ئەویش لەئەوزاعییەوە، ئەویش لەئیسماعیلی کوڕی عوبەیدواللەوە، ئەویش لەعەلیی کوڕی عبداللەوە، ئەویش لەئیبن عەباسەوە، ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"رأيتُ ما هو مفتوح بعدي كَفْراً كَفْراً فسرَّني ذلك، فنزلت والضحى

[1] - بەیهەقیی لە دلائل النبوة(٧/ ٦٢) ئیخراجی کردووە.

والليل الى قوله ولسوف يعطيك ربك فترضى" قال: أعطاني ألف قصر من لؤلؤ، ترابها المسك، في كل قصر ما ينبغي له"[1]،واتا: بينييم لەدوای خۆم دێی بچووك بچووك فەتح دەكرێ، ئەوە خۆشحاڵیكردم، بۆیە ئەم ئایەتانە دابەزی: ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ۝١ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ۝٢ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ۝٣ وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ ۝٤ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ۝٥ ﴾ الضحى: ١ – ٥، ئەفەرمووێ: هەزار كۆشكم پێدام لەگەوهەر دروستكرابوو، خۆڵەكەی میسك بوو، لەهەموو كۆشكێكدا شتی پێویست بەخۆی هەبوو.

وتوویانە:ئەوەی باستان كرد لەدونیانەویستی و كەمكردنەوەی دونیا، ئەوە دیارە دونیانەویستیی دژ بەدەوڵەمەندیی نییە، بەڵكو زوهدی مرۆڤی دەوڵەمەند كاملتره لەزوهدی مرۆڤی هەژار، دەوڵەمەندەكە توانای خۆشی و كەیفكردنی هەیە و خۆی ئەوە ناكات، بەلام هەژارەكە ناچارانە دونیا نەویستیی ئەكات، بۆیە نێوان ئەو دوو حاڵەتە دوورابیەكی زۆر هەیە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەكاتی دەوڵەمەندییدا دونیانەویستترین مەخلوق بوو، ئیبراهیمی خۆشەویستیش سەروەتی زۆری هەبووە، لەهەمانكاتدا دونیا نەویسترین مرۆڤ بووە.

ترمیزیی لەجامیعەكەیدا لەئەبو زەڕەوە فەرموودەیەكی هێناوەتەوە، ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) كە فەرموویەتی:"الزهادةُ في الدنيا ليست بتحريم الحلال ولا إضاعته، ولكن الزهادة فى الدنيا أن لا تكون بما في يديك أوثق بما في يد الله، وأن تكون في ثواب المصيبة إذا أنت أصبت بها أرغبَ في ثوابها

[1] - بەیهەقیی لە دلائل النبوة(٧/ ٦١) ئیخراجی كردووه.

لـو أنهـا بقيـت لـك"[1]،واتا:دونيـا نەويسـتيی ئـەوە نييـە حـەلاڵ حـەرام بكـەيت و لەنێوی بدەی، بەڵكو دونيا نەويستيی ئەوەیە، ئەوەی لەدەستە بەلاتەوە گرنگتر نەبێ لەوەی لای خوای گەورە هەیە، لەكۆست و بەلاو ناخۆشييشدا كە بەسەرتدا هات، زياتر لەوەی حەز بەمانەوەی شت و كەسـەكە بكـەی كـە لەدەسـتت داوە، ئارەزووی پاداشتت هەبێ.

پرسيار لەپێشەوا ئەحمەد كراوە لەبارەی كابرايەكـەوە هـەزار دينـاری هەيـە، ئاخۆ ئەكرێ دونيا نەويستيش بێ؟

ئەڵێ: بەڵێ، بەمەرجێ بەزياتر بوونی خۆشحاڵ و بەكەمبوونەوەشی خەفەتبار نەبێ.

پێشێنيك وتوويەتی:مرۆڤی دونيا نەويست، كەسێك نييە مـاڵی حـەلاڵ بەسـەر سوپاسگوزاربوونيدا زاڵ و حەراميش بەسەر ئارامگرتنيدا زاڵبێ.

ئەمـــەش باشـــترين ســـنوورێكە:حەقيقەتێكی ئاوێتـــەكراوە لـــەئارامگری و سوپاسگوزاريی، هەركەسێ هەڵگری ئەو دوو سـيفەتە نـەبێ شـياوی نـاوی دونيـا نەويسـتيی نييـە. هەركەسـێ لـەكاتی دەوڵەمەندبوونيـدا لەڕێگـەی حەلاڵـەوە سوپاسگوزاريی زاڵ و لەكاتی ڕێپێگرتنـی حەراميشـدا ئـارامگرتنی زاڵبـوو، ئـەوە بەڕاستيی مرۆڤێكی دونيا نەويستە، پێچەوانەی ئەو كەسەی كە حەلاڵی زۆرتر بێ سوپاسگوزاريی لاواز ئەبێ و كە حەراميشی بێتەڕێ خۆڕاگرتنی نـامێنێ، كەسـێك بەو جۆرە بوو ئەوە دونيا نەويست نييە.

---

[1] - زۆر لاوازە، ترميزی(٢٣٤٠) و ئيبن ماجە(٤١٠٠) و بەيهەقيی لە الشعب(١٠٧٧٥) ئيخراجيان كردووە.

گوێم لێبوو شێخی ئیسلام ئەیووت:زوهد(دونیا نەویستی): واتا وازهێنان لەشتێك سوودی بۆت نییە، وەرعیش وازهێنانە لەشتێك زیانت لیٚ بدات.

دونیا نەویستی، خاڵیکردنی دڵە لەشتە دونیاییەکان نەك خاڵیکردنی دەست، بەرانبەرو پێچەوانە بەوە چروکی و دەست قرچۆکییە، ئەوەش سیٚ جۆرە: حەرام نەویستی، گومان و مەکروه نەویستی، زیادە نەویستی. یەکەم فەرزە، دووەم رێزو فەزڵە، سێیەم لەنێوان هەردووکیاندایە بەپێی پلەی گومانەکەیە، ئەگەر بەهێزبووی ئەوە بەیەکەم ئەگەیت، ئەگەرنا ئەوە لەجۆری سێیەمدای، دەبیٚ لەسێیەمدا بمێنیتەوەو دانەبەزی، ئەوەش بۆ کەسێك خواو ئاخیرەتی بوویٚ، زوهدی فەزیڵەت پێویستە، چونکە ویستی دونیا زیان بەویستی ئاخیرەت دەدات، مرۆڤیش بەمەقامی ویست ناگات تاوەکو داواو ویست و داواکراوی خۆی یەکلانەکاتەوە.

یەکتاپەرستیی داواکراو: ئەوەیە کە داواو ویستی بەغەیری خوای گەورەوە نەبەستێتەوەو لەو شتانەش کە لەخوای نزیك دەخاتەوە تەنیا تایبەت بەخوای گەورە بیٚ.

یەکتاپەرستیی لەداواکردندا: ئەوەیە داواکردن و ویست، شەهوەت و راکێشەرو پاڵنەرەکانی هەواو ئارەزوو لەرِیشە بکێشن و ویست تەواوی دەروون بگرێتەوەو تیایدا دابمەزریٚ و جگە لەرِۆیشتنە پالٚ حەق و راستیی، رێگەی هیچ شتێکی تر نەدات و تەواوی ویستی خۆی بۆ خوای گەورە یەکلابکاتەوە.

ئەوکاتەی بۆ خوا یەکلابوویەوە، ئیتر دونیانەویستیی بۆ کەسەکە دەبێتە شتێکی پێویست، چونکە یەکلای دەکاتەوە بۆ ئاوەدانکردنەوەی کاتەکانی و کۆکردنەوەی دڵی بۆ ئەو شتەی بووەتە پەژارەی، ئامرازو ماددەکانی تەماحی

دەپچڕێنێت کە خراپترین شتێکە بۆ خراپکردن و کاولکردنی دڵ، بێگومان بناغەی هەموو تاوان و خراپەو سەرپێچییەك لەتەماحەوەیە، بۆیە دونیانەویستیی کەرەستەی تەماح دەپچڕێنێ و دڵ پڕ دەکات و ئەندامەکانی جەستە هان دەدات بۆ چاکەکاری،دوورکەوتنەوەی نێوان بەندەو خوای گەورە ناهێڵێ و دڵئارامیی بۆ دەهێنێ و حەزی پاداشتیی خواییش بەهێز دەکات.

کەسی دونیانەویست لەڕووی جەستەو دڵەوە دڵئارامترین خەڵکییە، چونکە دونیانەویستی و لێبوونەوەی لەدونیا واتا قبوڵکردنی ویستی خواو ئاخیرەت، دڵی بۆ خوا خاڵی دەکات و پێداگر ئەبێ بۆ نزیکبوونەوە لەخوای گەورەو چرووك ئەبێ لەوەی کەمترین کاتی لەشتێکدا خەرج بکات جێی ڕەزامەندیی خوای گەورە نەبێ و لای خوای گەورە خۆشەویست نەبێ. کەسی دونیانەویست ئەوکات لەخەڵکیی تر زیاتر ژیانی خۆشترو دڵئارامترو خۆشحاڵترە.

بێگومان ئارەزووکردنی دونیا دڵ پارچە پارچە ئەکات و ریزەکان ناهێڵێ و خەم و پەژارەو خەفەت درێژە پێ دەدات، سزاو ئازارێکی ئێستاییە ئەبێتە مایەی ئازارێکی چاوەڕوانکراوی سەختترو ئەو نیعمەتانە لەدەست بەندە دەدات، کە زیاترو چەند جارەی ئەوەیە لەدونیادا حەزی پێ دەکات.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: هەیسەمی کوڕی جەمیل بۆی باسکردین، موحەممەد بۆی باسکردین–واتا:ئیبن موسلیم– ئەویش لەئیبراهیمەوە–واتا: ئیبن مەیسەرە– ئەویش لەتاووسەوە وتی: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"إن الزهدَ في الدنيا يريحُ القلب والبدن، والرغبةَ في الدنيا تطيل الهمَّ والحزن"[1]، واتا: دونیانەویستیی دڵ و جەستە دەحەسێنێتەوە، دونیاویستییش پەژارەو خەفەت زۆرتر ئەکات.

---

[1] - لاوازە، ئەحمەد لە الزهد(لا١٦) و ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە ذم الدنیا(١٣١) و بەیهەقیی لە الشعب(١٠٥٣٦) ئیخراجیان کردووە، پچڕانی تێدایە.

خەم و خەفەت و پەژارە لەدوو رووەوە دروست ئەبن: یەکەم: دونیاویستی و پێداگریکردن لەسەری، دووەم: کەمتەرخەمییکردن لەکاری چاکەو خواپەرستییدا.

عبداللەی کوڕی ئەحمەد ئەڵێ: بەیانی کوڕی ئەلحەکەم بۆی باسکردم، موحەممەدی کوڕی حاتەم بۆی باسکردین، ئەویش لەبیشری کوڕی ئەلحاریثەوە، ئەویش لە لەیسەوە، ئەویش لەئەلحەکەمەوە وتی:پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)فەرموویەتی:"إذا قصَّر العبدُ بالعمل ابتلاه الله عز وجل بالهمِّ"[1]،واتا: گەر بەندە لەکاری خواپەرستییدا کەمتەرخەمیی کرد، ئەوە خوای گەورە بەپەژارە تاقییدەکاتەوە.

ئارەزووکردنی دونیا بناغەو بنچینەی تاوانە ئاشکراکانە، بناغەی تاوانەکانی دڵ لەڕووی تووڕەبوون و رقوکینەو ئیرەیی و خۆبەزلزانی و خۆهەڵکێشان و کۆکردنەوەی زۆری دونیا، هەموو ئەوانە دڵیان پێ پڕ دەکرێ نەك ئەوەی لەدەست بێ، دڵ پڕ بوون بەوانە دژە بەسوپاسگوزاریی، لوتکەی سوپاسگوزاریی واتا خاڵیکردنەوەی دڵ لەو شتانە، سەرکەوتن و سەرفرازییش بەخوای گەورەیە.

درێژبوونەوەو زۆربوونەوەی سەروەت و سامان وەك درێژبوونەوەی تەمەن و ناوبانگییە، بۆیە باشترینی ئێوە لەدونیادا، ئەوەتانە کە تەمەنی درێژەو کارەکانی جوان و باشە، درێژبوونەوەز زۆربوونەوەی سەروەت و سامانیش بەو جۆرەیە گەر خێرو چاکەی لەگەڵدا زۆربێ.

---

[1] - زۆر لاوازە، ئەحمەد لە الزهد(٦٧ل) ئیخراجی کردووە، ئیسنادەکەشی(معضل)ەو پڕە بەکەسی لاواز و نەناسراو.

تەمەن و سەروەت و ناوبانگیی مرۆڤ: یان پلە گەلێك بەرزی دەكەنەوە، یان پلە گەلێك نزمی دەكەنەوە.

نهێنیی بابەتەكە: رێگەی هەژاری و كەمكردنەوەی دونیا بەبوونی ئارامگرییەوە رێگەیەكی سەلامەتییە، دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانییش بەزۆریی رێگەیەی سەخت و قووڕاوییە، گەر مرۆڤی دەوڵەمەند لەسەروەتەكەیدا ترسی خوای هەبوو، پەیوەندیی خزمایەتی و سۆزو بەزەیی پێیگەیاند و مافی خوای تیادا دەركرد بەدەر لەزەكات، كە برسییەكی تێركرد و رەشورووتێكی پۆشتە كردەوەو بەدەم كەسێكی لێقەوماوو خاوەن پێداویستی و ناچارەوە رۆیشت، ئەوە رێگەكەی رێگەی دەسكەوتە كە لەسەرووی سەلامەتییەوەیە.

نمونەی مرۆڤی هەژاریش، نمونەی نەخۆشێكە بەهۆی نەخۆشییەكەیەوە ناتوانێ كارو نیازی خۆی بەجێبگەیەنێ، ئەوكات لەسەر ئارامگرتن و خۆڕاگرتنی پاداشت دەدرێ.

مەترسیی مرۆڤی دەوڵەمەند زۆر گەورەیە لەكۆكردنەوەو دەستخستن و خەرجكردنی سەروەتەكەیدا. گەر دەستخستنەكەی لەڕێگەی حەڵاڵەوە بوو، لەحەقی خۆیدا خەرجی كرد، ئەوە بەسوودترین شتێكە بۆی.

مرۆڤی هەژار وەك كەسێكی خواپەرستی لەخەڵك دابڕاوە، دەوڵەمەندی بەخشەر لەڕێگەی چاكەدا وەك یارمەتیدەرو مامۆستاو موجاهیدكارە، لەمەدا پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)كردوویەتییە هاوڕێ و هاوشانی ئەو كەسەی خوای گەورە دانایيەكی پێ داوەو كاری پێ دەكات و خەڵكیی پێ فێر دەكات[1].

یەكێكە لەو دوو كەسەی حەسوودییان پێ دەبردرێت. كەسە نەفامەكانیش

---

[1] - پێشتر تەخریج كرا.

ئیرەیی بەو کەسە دەبەن کە هەموو سوودو کەڵکێکی بۆ خودی خۆی دابڕیووەو لەپێشتری دادەنێن لەئیرەیی بردن بەدەوڵەمەندی بەخشەرو زانای فێرکاری خەڵك.

ئەگەر وترا: کامەیان باشترە: ئەوەی دەوڵەمەندیی هەڵدەبژێرێ بۆ بەخشین و چاکەکردن لەڕووە چاکەکارییەکاندا، یان ئەو کەسەی هەژاریی و کەمگرتنی دونیا هەڵدەبژێرێ تاوەکو لەفیتنەو بەلاّ رزگاری بێ و دڵی ئامادەبێ بۆ ئاخیرەت و دونیا سەرقاڵی نەکات؟ یان ئەو کەسەی نە ئەمەو نە ئەو هەڵنابژێرێ، ئەوە هەڵدەبژێرێ کە خوای گەورە بۆی هەڵبژاردووەو بەخۆی هیچ یەك لەو دووانە هەڵنابژێرێ؟

لەوەلاّمدا ئەوترێ: ئەمە بابەتێکە پێشینی چاکەکار تیایدا جیاواز بوونە، هەندێکیان سەروەت و سامانیان هەڵبژاردووە تاوەکو جیهادی پێ بکرێ و ببەخشرێ و لەچاکەدا خەرج بکرێ، نمونەی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و دەوڵەمەندەکانی دیکەی هاوەڵان، ئەوە قەیسی کوڕی سەعدە[1] ئەیووت: خوایە گیان من یەکێکم لەو بەندانەی خۆت کە دەوڵەمەندیی چاکی دەکات و بۆی شیاوە. هەندێکی تریان هەژاریی و کەمگرتنی دونیای هەڵبژارد، نمونەی ئەبو زەڕو کۆمەڵێکی دیکەی هاوەڵانیش لەگەڵیدا، ئەوان تەماشای نەهامەتییەکانی دونیایا کردو لەفیتنەکانی ترسان و تەماشای سوودو بەرژەوەندییەکانی بەخشین

---

[1] - قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی دولەیم ئەلئەنصاری: والی و هاوەڵ و یەکێك بوو لەزیرو لێهاتووەکانی عەرەب، خاوەن بۆچوون و پیلانی جەنگ و فریاکەوتن بوو، یەکێك بوو لەسەخییە بەناوبانگەکان، گەورەی قەومەکەی بوو، لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم)ئالاّی ئەنصاری هەڵدەگرت و سەرپەرشتیی ئەنصاری ئەکرد. لەبوخارییدا هاتووە کە قەیس لەبەردەستی پەیامبەری خوادا وەك ئەمیری پۆلیس بوو، ساڵی٦٠کۆچیی لەمەدینەدا مرد.

و بەرهەمە دونیایی و ئاخیرەتییەکەیان نەکرد، کۆمەڵی سێیەمیش خۆیان هیچ شتێکیان هەڵنەبژارد، ئەوەیان هەڵبژارد کە خوای گەورە بۆیانی هەڵبژاردبوو.

هەروەها هەڵبژاردنی زۆر مانەوە لەدونیادا بۆ راپەڕاندنی ئایینی خواو خواپەرستی، کۆمەڵێك: تەمەن درێژیان دەخوازی، کۆمەڵێکی تر حەزیان بەمردن و گەیشتنەوە لای خوای گەورەو رزگاربوون لەدونیایان دەخوازی، کۆمەڵی سێیەمیش حەزو خۆزگەی ئەو دوو کۆمەڵەیەیان نەبوو، بەڵکو ئەوەیان هەڵبژارد کە خوای گەورە بۆیانی هەڵبژاردبوو، هەڵبژاردنیان پەیوەست بوو بەویستی خوای گەورەوە نەوەك ویستی خۆیان، ئەمە حاڵەتی ئەبو بەکری سدیق بوو(خوای لێ رازیی بێ)، لەسەرەمەرگدا پێیان وت: ئایە داوای پزیشکت بۆ بکەین؟ وتی: پزیشك بینیمی، وتیان: ئەی چی پێت وت؟ وتی: پێی وتم: من ئەوە دەکەم کە خۆم دەمەوێ[1].

لەپێشترین حاڵەت: حاڵەتی موسایە(سەلامی خوای لەسەربێ)، کە فریشتەی گیانکێشان هاتەلای زللەیەکی لێدا چاوێکی کوێرکرد، ئەوەش نەك لەبەر خۆشویستنی دونیاو ژیانی دونیا،بەڵکو بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی پەروەردگاری و راپەڕاندنی ئایینەکەی و شەڕکردنی دوژمنەکانی خوای گەورە، وەك ئەوەی بەفریشتەی گیانکێشان بڵێ: تۆ بەندەیەکی فەرمانپێکراو و منیش بەندەیەکی فەرمانپێکراوم، منیش وا سەرقاڵی فەرمانەکانی پەروەرگارو راپەڕاندن و سەقامگیرکردنی ئایینەکەیم. دواتر کە ژیانی دوورودرێژی بۆ پێشنیار کراو زانیی لەدوای ئەوەش هەر مردن هەیە، رازیی بوو بەوەی خوای گەورە بۆی هەڵدەبژێرێت[2].

---

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

[2] - بوخاری(٣٤٠٧) و موسلیم(٢٣٧٢) ئیخراجیان کردووە لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ).

هەرچی پەیامبەری خۆمانە(سەلات و سەلامی خوای لەسەربێ)، ئەوە خوای گەورە پەیامی بۆ نارد و سەرپشکی کرد، زاناترین مەخلوق بوو بەخوای گەورە، زانیی کە خوای گەورە حەز بەلیقای ئەکات و گەڕانەوە بۆلای خۆی هەڵدەبژێرێ، بۆیە گەڕانەوە لای خوای گەورەی هەڵبژارد.

گەر بیزانیبایە خوای گەورە حەز دەکات لەدونیادا بمێنێتەوە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و راپەڕاندنی ئایینەکەی، ئەوە هەر هەڵبژاردەو حەزی خوای گەورەی هەڵدەبژارد، هەڵبژاردنەکەی شوێن هەڵبژاردەی خوای گەورە گەوتبوو. خوای گەورە سەرپشکی کرد کە پادشایەکی پەیامبەربێ یان بەندەیەکی پەیامبەر، زانیی کە خوای گەورە ئەوەی بۆ هەڵدەبژێرێ بەندەیەکی پەیامبەر بێ، هەڵبژاردەی خوای گەورەی هەڵبژارد، بۆیە لەهەموو شتێکدا هەڵبژاردەکانی شوێن هەڵبژاردەکانی خوای گەورە دەکەوت.

لەڕۆژی حودەیبیەدا لەو حاڵەتەدا ئەو مەرج گەلە قورەسەشی قبوڵکردو حەقی خۆی پێدا، حاڵەتێك بوو تەنیا ئەبو بەکری سدیق پێی قبوڵ بوو، ئەوەش تەنیا هەڵبژاردنی خوای گەورەبوو بۆ خۆی و هاوەڵانی، پەیامبەر پێی رازیبوو، ئەوەی هەڵبژاردو ئەیبینیی خوای گەورە چی بۆ هەڵبژاردووە.

ئەوە ئامانج و ئەوپەڕی بەندایەتییە، سوپاسی خوای گەورەی لەسەر کرد، سوپاسگوزارییەکەی لەوەدا بوو کە خوای گەورە لەسەرەتای سورەتی فەتحدا مزگێنی و موژدەی پێدا، ئەوەندە سوپاسگوزار و دڵخۆش بوو کە هاوەڵانیش پیرۆزباییان لێکردو وتیان: پیرۆزترت بێ ئەی پەیامبەری خوا. بێگومان مافی ئەوەی هەبوو گەورەتر لەوە پیرۆزبایی لێ بکرێ کە پیرۆزبایی و مزگێنیی بەمرۆڤی تر دراوە.

ئەوەی دەبێ بزانرێ: هەموو تایبەتمەندییەکی ڕێزو فەزڵدارییی، خوای گەورە بۆ پەیامبەری خۆی(صلی الله علیه وسلم) حەلاڵ و ڕەوای داناوە، ئەگەر بەحاڵێك لەحاڵەکانی کۆمەڵێکی ئوممەت بۆ خۆیان بەبەڵگەی بکەن، ئەوە فەزڵەکانی بەسەر کۆمەڵەکانی تریشدا دابەش دەبێ.

ئەگەر جەنگاوەرو موجاهیدکارەکان بەپەیامبەر بەڵگە بهێننەوە بەوەی باشترینی نێو موسڵمانن، ئەوە زاناو شەرعناسانیش نمونەی بەڵگەی ئەوانیان پێیە.

ئەگەر دونیانەویستان بەڵگەی فەزڵی دونیانەویستیی خۆیان بهێننەوە، ئەوە ئەوانەش کە تێکەڵی دونیاو بەڕێوەبردن و سەرپەرشتیکردنی خەڵکن، بەڵگە دەهێننەوە کە ئەوانیش سەرقاڵی ڕاپەڕاندنی ئایینی خواو جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوای گەورە بوونە.

گەر هەژاری خۆڕاگر بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)بۆ خۆی بەڵگە بهێنێتەوە، ئەوە دەوڵەمەندی سوپاسگوزاریش بەڵگەی خۆی پێیە.

ئەگەر خواپەرستان لەسەر فەزڵ و بارسەنگکردنی سوونەتەکان بەڵگەیان پێهێناوەتەوە، ئەوە عاریفانیش لەفەزڵی مەعریفەدا بەڵگەیان پێهێناوەتەوە.

ئەگەر مرۆڤە خاکەراو نەرمونیانەکان بەڵگەیان ئەویان بەبەڵگە کردووە، ئەوە شکۆمەندان و لەنێوبەری ناڕەواکاران و زبربوو بەرانبەریان ئەویان بەبەڵگە هێناوەتەوە.

ئەگەر کەسە بەرزو بەڕێزەکان ئەویان بەبەڵگە کردووە بۆ خۆیان، ئەوە نەرمونیان و کەسە هاوسەنگەکان و ڕەوشت سادەکان لەمامەڵەکردن لەتەك کەسوکارو هاوڕێیاندا ئەویان بەبەڵگەهێناوەتەوە.

ئەگەر خەڵکانێك بەڵگەیان پێ هێناوەتەوە لەوتنی حەق و باسکردنی بەبوون و نەبوونی کەسەکە، ئەوە خەڵکانی بەشەرم و ڕێزیش بەڵگەیان پێهێناوەتەوە کە قسە بەڕووی هەڵەکاردا نەدەنەوە.

ئەگەر خاکەراو لەدونیا خۆ بەدوورگران ئەویان بەبەڵگە هێناوەتەوە لەخۆبەدوورگرتن لەهەندێ شت گەرچی حەلاڵ و ئاساییش بن، ئەوە کەسانی ئاسانکاری دەرنەچوو لەشەریعەتیش بەڵگەیان پێهێناوەتەوە.

ئەگەرچی ئەوەی سەرقاڵی چاککردنی دونیاو دڵی خۆیەتی بەڵگەی بەو هێناوەتەوە، ئەو کەسەش هەر بەڵگەی بەو هێناوەتەوە کە سەرقاڵی چاککردنی جەستەو بژێوی و دونیای خۆیەتی، چونکە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)بۆ چاکسازیکردنی ئاین و دونیا نێردراوە.

ئەگەر ئەوانە بەڵگەیان پێهێناوەتەوە کە دڵیان بەهۆکارەکانی دونیاوە نەبەستووەتەوەو خۆیان نەداوەتە پاڵی،ئەوە ئەوانەش بەڵگەیان بەو هێناوەتەوە کە هۆکارەکانی دونیایان وەرگرتووەو خستوویانەتە شوێنی خۆی و مافی خۆیان پێ داوە.

ئەگەر ئەوانەی برسیی بوونەو لەسەر ئارامگرتنی برسێتییش بەڵگەیان پێهێناوەتەوە، ئەوە ئەوانەش بەڵگەیان بەو هێناوەتەوە، کە تێربوونەو لەسەر ئەو تێربوونە سوپاس و ستایشی خوای گەورەیان کردووە.

ئەگەر ئەوانە بەڵگەیان پێهێناوەتەوە کە لێبووردەو لێخۆشبوون، ئەوە ئەوانەش ئەویان بەبەڵگەهێناوەتەوە کە لەشوێن و کاتی تۆڵەکردنەوەدا تۆڵەیان کردووەتەوە.

ئەگەر کەسێك ئەوی بەبەڵگە هێناوەتەوە کە لەبەر خوای گەورە بەخشیوێتی و دۆستایەتیی کردووە، ئەوە ئەو کەسەش ئەوی بەبەڵگەهێناوەتەوە کە لەبەر خوا نەیبەخشیووەو دوژمنایەتیی کردووە.

ئەگەر کەسێك ئەوی بەبەڵگەکردبێ کە خواردنی زبرو بێ تامی خواردووە لەنانی جۆ و گەنم و خەڵ، ئەوە ئەو کەسەش ئەوی بەبەڵگەهێناوەتەوە کە خواردنی خۆش و بەچێژی خواردووە لەنمونەی گۆشتی برژاو و حەلواو میوەو شتە خۆشەکانی تر.

ئەگەر ئەو کەسەی بەردەوام لەڕۆژووگرتندا بووەو بەڵگەی بەو هێناوەتەوە، ئەوە ئەو کەسەش بەڵگەی بەو هێناوەتەوە کە ئەوەندە بەڕۆژوو دەبوو ئەوترا ئەمە رۆژێك رۆژوو ناشکێنێ، ئەوەندە رۆژیش بەڕۆژوو نەدەبوو تادەوترا: بەڕۆژوو نابێ.

ئەگەر کەسێك ئەوی بەبەڵگەهێنابێتەوە کە ئارەزووی خۆشییەکانی نەکردبێ،ئەوە ئەو کەسەش ئەوی بەبەڵگەهێناوەتەوە کە حەزی لەخۆشییەکانی دونیا کردووە لەژن و بۆنی خۆش.

ئەگەر کەسێك ئەوی بەبەڵگەکردبێ لەنەرموونیان و ناسکبوونی بەرانبەر ژنەکانی، ئەوە ئەو کەسەش ئەوی بە بەڵگە هێناوەتەوە کە تەمبێیکردوون و تەڵاقی داوون و دووری لێگرتوون و سەرپشکی کردوون لەمانەوە یان تەڵاق.

ئەگەر کەسێك بەڵگەی بە ئەو هێنابێتەوە بەوەی خۆی راستەوخۆ هۆکاری بژێویی خۆی دابین نەکردبێ، ئەوە ئەو کەسەش ئەوی بەبەڵگەهێناوەتەوە کە بەخۆی کاری کردووەو کرێی وەرگرتووەو کرێی داوەو کڕین و فرۆشتنی ئەنجامداوە و سلفەی وەرگرتووەو قەرزی کردووەو شتی خستووەتە رەهنەوە.

ئەگەر کەسێك لەحەیزو ڕۆژوودا لەژنەکانی تەواو دووریگرتبێ و لێیان نزیك نەهاتبێتەوە، ئەوە ئەو کەسەش بەڵگەی بەو هێناوەتەوە کە لەحەیزدا بەبێ جووتبوون لەژنەکەی نزیکبووەتەوەو بەڕۆژووش بووە ژنەکەی ماچکردووە.

ئەگەر کەسانێك بەڵگەیان هێناوەتەوە بەقامچیی لەمرۆڤی تاوانبار بدرێ، ئەوە ئەو کەسانەش بەڵگەیان بەو هێناوەتەوە کە ئەوە بەسەر ئەو کەسانەدا جێبەجێ دەکرێ کە سنووری خوای گەورەیان بەزاندووە، نمونەی بڕینی دەستی دزو ڕەجمکردنی ژن و پیاوی داوێنپیس و جەڵدکردنی عەرەقخۆر.

ئەگەرچی ئەوانەی خاوەن بۆچوونی بڕیاردانن بەحوکمی دیار بەڵگەیان بەو هێناوەتەوە، ئەوە خاوەن سیاسەتی دادپەروەرو کارکەر بەبەڵگەی دیاریش بەڵگەیان بەو هێناوەتەوە، بەبۆنی تۆمەت کەس دەستگیر دەکەن و بەبەڵگەی تاوانەوە سزا دەدەن.

باس دەکرێ لەسولەیمانی پەیامبەری خواوە(سەلامی خوای لەسەربێ) بەبەڵگەی دیار بڕیاری داوە منداڵێك بەئافرەتێك بدرێ گەرچی ئافرەتەکە دانی بەوەدا نابوو منداڵی ئەوی ترە، ئەو دانپێدانانە بەڵگەی دەرکەوتووی پووچەڵ نەکردەوە[1].

ئەبو عەبدولڕەحمان لەسەر ئەم فەرموودەیە دوو شت ئەڵێ: یەکەم: فراوانکردن و بوارکردنەوەی زۆری دادوەرە کە پێی ئەڵێ ئەو شتە بکە کە نەیکردووە، ئەمە بۆ ئەوەی ڕاستییەکەی پێ دەرکەوێ، پاشان پێچەوانەی دانپێدانانی تاوانبارکراو بڕیار دەدات، گەر بۆی دەرکەوت ڕاستییەکە ئەوە نییە کە ئەو دانپێداناوە.

---

[1] - بوخاری(٦٧٦٩) و موسلیم(١٧٢٠) ئیخراجیان کردووە.

هـاوەڵانیش لـەژیانی پەیامبـەری خوا(صـلی الله علیـە وسـلم) و دواتریشـیدا بەبەڵگەکان کاریان کردووە، ئەوە عەلییە(خوای لێ رازیی بێ) بەو ئافرەتە ئـەڵێ کە نامەکەی حاتەبی هەڵگرتبوو: یان نامەکە دەردەهێنیّ یان خۆم دەریدەهێنم[1].

عومـــەری کـــوڕی خـــەتابیش بەســـکپڕ بـــوون، داوێنپیســـی و، بـــەبۆن عەرەقخواردنەوەی دیاریی کردووە.

خوای گەورە لەبارەی شایەتی یوسفەوە ئەگێڕێتەوە، کە بینیوێتی لەپشتەوە کراسی یوسف دڕاوە بێتاوانیی یوسفی داوە.

پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) بەئەبی ئەلحوقەیق کە وەهای دانابوو نەفەقـەو خـەرجکردن گەنجینـەی حویەیـەی کـوڕی ئەختـەبی لـەنێوبردووە، ئەفەرمووێ:"العهد قريب، والمال أكثر من ذلك"[2]،واتـا: کـاتی دەرکـەوتنی ئـەوە نزیکەو پارە و سامەنەکە لەوە زۆرترە.

دوو بەڵگەی لەبەرچاوگرتووە لەمانەوەی ئەو سـەروەتەو سـزای داوە تـاوەکو دانیپێـدناوە، رێگەشـی داوە بەکەسـواری کوژراوکـە سـوێند بخـۆن، ئـەوە ئـەو کەسەیە کوژراوەکەی ئـەوانی کووشـتووەو لـەبری ئـەودا بیکوژنـەوە، بەبەڵگـەی ئەوەی، بەڵگەی ئەوان بەجێ و تەواو و بارسەنگ بووە.

خـوای گـەورە رێگـەی داوە رەجمـی ئـەو ئافرەتـە بکـرێ، کـە مێردەکـەی شـایەتیی داوێنپیسـیی لەسـەر داو بەڵگـەکانی راسـت و تـەواو بـوون و ژنەکـەش دانیپێدانا.

---

[1] - بوخاری(٤٢٧٤) ئیخراجی کردووە.

[2] - صەحیحە، ئیبن حیبان(٥١٩٩) و بەیهەقیی لە السنن الكبرى(٩/ ١٣٧) ئیخراجیان کردووە.

شەریعەتەکەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)روونه بۆ کەسێك لێی رابمێنێ، بڕیاردان بە بەڵگەی دیارو روون شەریعەتی ئەوە، بەڵگەی بڕیار دادوەری سەرڕاست و دەسەلأتدارانی دادپەروەرە، هەروەك بەڵگەی دژ بەدادوەرانی خراپ و دەسەلأتدارانی ستەمکارە، خوای گەورەش پشت و پەنامان بێ[1].

مەبەست بەم بەشە، ئەوەیە کە هەزارە خۆڕاگرەکان لەدەوڵەمەندە سوپاسگوزارەکان مافدارترو لەپێشتر نیین بەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، بەڵکو مافدارترین خەڵك بەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)،ئەوانەن کە شوێنی رێبازەکەی ئەکەون، سەرکەوتن و سەرفرازییش بەخوای گەورەیە.

***

---

[1] - بڕوانە کتێبی(الطرق الحکمیة)ی دانەر.

## تەوەری بیست و پێنج

## لەڕوونکردنەوەی شتە دژەکانی ئارامگرتن

لەبەرئەوەی ئارامگرتن جڵەگیرکردنی زمانە لەگازندە کردن بۆلای غەیری خواو جڵەوکردنی دڵە لەتووڕەبوون و رق و ئەندامەکانی جەستە لە لەدەمووچاودان و سنگ دادڕین و هاوشێوەکانی تری، ئەوە شتە پێچەوانەکانی ئەوانە دژە ئارامگریین.

لەوانە: گازندەکردن لای بەندەکان، گەر بەندە لای مرۆڤێکی تر گلەیی لەخوای پەروەردگاری کرد، ئەوە گازندەو شکایەتی لەخوایەکی بەبەزەیی کردووە لای مرۆڤێك کە بەزەیی و سۆزی نییە. ئەو گازندەو شەکوایەی یەعقوب لای خوای گەورە کردی ناچێتە ئەو چوارچێوەیەوە، چونکە شەکوای حاڵی خۆی بردەوە لای خوای گەورەو وتی:﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ﴾ یوسف: ١٨، واتا:ووتی جا ئارام دەگرم بەئارام گرتنێکی چاك و پەسەند.

هەرچی باسکردنی حاڵی خۆتە لای بەندەکانی خوا، وەك داوای ئامۆژگاری و هاوکارییکردن و یارمەتیدانت لەلابردنی زیانێك، ئەوە ناچێتە خانەی دژە ئارامگرییەوە: وەك ئەوەی نەخۆش حاڵی خۆی بۆ پزیشك باس بکات، کەسی ستەملێکراو بڕواتە لای کەسێك ستەمی لەسەر لابدات، کەسی کۆست و مەینەتبار حاڵی خۆی لای کەسێك باس بکات کەسەکە چارەسەری لەدەست بێ.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ڕۆیشتەلای نەخۆشێك و لەحاڵی پرسی و فەرمووی:"کیف تجدك؟"[١]،واتا:چۆن دەبینرێی(حاڵت چۆنە)؟، ئەوە بۆ خۆی هەواڵپرسینی نەخۆشەکەیە لەبارەی حاڵی نەخۆشییەکەیەوە.

---

[١] - صەحیحە، ترمیزی(٩٨٣) و ئیبن ماجە(٤٢٦١) ئیخراجیان کردووە.

هەرچی ناڵە ناڵە، ئاخۆ ئەمە دژو زیانـدەرە بـەئارامگری؟ لـەم بارەیـەوە دوو گێرانەوە لەپێشـەوا ئەحمـەدەوە هـاتووە، ئـەبو ئەلحوسـەین ئـەڵێ: دروسـتترین هەردوو بۆچوونەکە ئەوەیە کەراهەتی هەیە، لـەوەی لەتاووسـەوە گێڕدراوەتـەوە کە حەزی بەناڵەی نەخۆشیی نەکردووەو پێی مەکروھ بووە.

موجاهید ئەڵێ: هەموو شتێك لەسەر نەوەی ئادەم دەنووسرێت کـە بەزمانیـدا دێت، تەنانەت نرکەو ناڵەی نەخۆشییەکەشی.

وتوویانە: نرکەو ناڵـە بـەزمانی حـاڵ گازندەیـەو دژە بـەئارامگریی. عبداللـەی کوڕی پێشەوا ئەحمەد وتوویەتی:باوکم لەو نەخۆشییەی کە تیایدا مـرد پێیـوتم: کتێبەکەی عبداللەی کوڕی ئیدریسـم بـۆ دەربهێنـە، منـیش کتێبەکـەم دەرهێنـا، ئینجا وتی: فەرموودەکانی لەیسی کـوڕی ئـەبی سـولەیم بـۆ دەربهێنـە، منـیش فەرموودەکانی لەیسم دەرهێنا، ئینجا وتی: فەرموودەکانی لەیسم بۆ بخوێنـەوە، وتـی: بەتەڵحـەم وت: تـاووس نرکـەو ناڵـەی نەخۆشـیی بەمـەکروھ دانـاوە، ئـیتر تاوەکو مرد نرکەو ناڵەیەکی لێ نەبیسترا. باوکیشم تاوەکو مرد لەو نەخۆشییەیدا نرکەو ناڵەیم گوێ لێ نەبوو.

گێڕانـەوەی دووەم:مـەکروھ نییـەو زیـان لـەئارامگریی نـادات. بـەکری کـوڕی موحەممـەد ئـەویش لەباوکییـەوە ئـەڵێ: ئەحمـەد پرسـیاری کـرد لـەبارەی نەخۆشـێکەوە بـەهۆی ئـازاری زۆریـەوە نرکـەو ناڵـەی دێ. وتـی: هـیچ شـتێکی لـەبارەوە دەزانیـی لەپەیامبـەری خواوە(صـلی الله علیـه وسـلم)؟ وتـی: بـەڵێ، فەرموودەکەی عائیشـە(خوای لـێ رازیـی بـێ): :"وا رأسـاه"[1]،واتـا: ئـای ئێشـی سەرم. ئەویش ئەمەی باش دانا.

---

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

ئەلمەروەزیی ئەڵێ: هاتمە لای ئەبی عبدالله کە نەخۆش بوو، لەحاڵیم پرسی، ئەویش هەردوو چاوی پڕ فرمێسك بوو، هەواڵی پێدام کە ئەو شەوە چی ئازارێکی هەبووە.

رووی سەلماندن و یەکلابوونەوە: نرکەو ناڵە دوو جۆرە: نرکەی شەکواو گلەییە، ئەمە مەکروهە، نرکەی حەسانەوەو ئارامبوونەوە ئەمە مەکروه نییە، خواش زاناترە.

لەئەسەردا گێڕدراوەتەوە: نەخۆش گەر بەسوپاسکردنی خوای گەورە(الحمد لله) دەستپێکردو پاشان حاڵی خۆی باسکرد، ئەوە گلەیی و شەکوا نییە. شەقیقی بەلخیی ئەڵێ:هەرکەسێ شەکواو گلەیی کۆست و بەڵایەکی بۆلای غەیری خوای گەورە بردەوە، ئەوە هەرگیز چێژی پەرستشی خوای لەدڵدا نەکردووە.

شەکواو گلەیی دوو جۆرە: گلەییکردن بەزمانی وتن، گلەییکردن بەزمانی حاڵ، لەمەدا خوای گەورە فەرمانی داوە هەرکەسێك خوای گەورە نیعمەتێکی پێ داوە با دەریبخات، گەورەترو لەوە مەترسیتر، کەسێکە لەخێرو خۆشییدا بێ گلەیی لەپەروەردگاری بکات، ئەمە بێ بەشترین و بەدبەختترین مەخلوقە لای خوای گەورە.

پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: عبداللەی کوڕی یەزید بۆی باسکردین، کەهمەس بۆی باسکردین، ئەویش لەعبداللەی کوڕی شەقیقەوە وتی: کەعبی ئەحبار وتی:(سبحان الله والحمدلله) کردن لەکاتی قسە کردندا یەکێکە لەکارە جوانەکان، خۆدەرخستن بەحاڵی خراپیش یەکێك لەکارە خراپەکان.

بەعبدالله وترا: دەستپێکردن بەقسەی جوان چییە؟ وتی: وتنی(سبحان الله و الحمد لله)یە لەکاتی قسەکردندا، وترا:ئەی(التحذیف)چییە؟ وتی: خەڵکانێك

لەخێرو خۆشییدان، بەڵام کە پرسیاریان لێ دەکرێ وەهای دەردەخەن حاڵیان خراپە.

ئەوەی دژو پێچەوانەی ئارامگریی بێ: سنگ دادڕین لەکاتی بەڵاو ناخۆشییدا، هەروەها روومەت رنین و دەست بەسەر یەکدادان و قژ رنین و هاوارو واوەیلا کردن، بۆیە پەیامبەری خوا خۆی بەریی کردووە لەو کەسەی لەکاتی کۆست و مەینەتییدا دەنگی بەرزدەکاتەوەو قژی دەڕنێ و سنگی دادەڕێ[1]، بەڵام گریان و خەفەت دژ بەئارامگریی نین، پەروەردگار لەبارەی یەعقوبەوە ئەفەرمووێ: ﴿ وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ ٨٤ ﴾ یوسف: ٨٤، لە قەتادەوە لەبارەی ئەم ئایەتەوە ئەڵێ: خەفەتی خۆی خواردەوەو جگە لەخێرو چاکە هیچی تری نەوتەوە.

حەممادی کوڕی سەلەمە ئەڵێ، ئەویش لەعەلیی کوڕی زەیدەوە، ئەویش لەیوسفی کوڕی میهرانەوە، ئەویش لەئیبن عەباسەوە، ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی:"ما كان من العين ومن القلب فمن الله و الرحمة، وما كان من اليد ومن اللسان فمن الشيطان "[2]،واتا: تاوەکو بەفرمێسکی چاو و خەفەتباریی دڵ بێ ئەوە لەلایەن خواوەیەو رەحمەتە، کە بووە لەخۆدان و قسەکردن، ئەوە لەلایەن شەیتانەوەیە.

---

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

[2] - حسن لغيره، ئەحمەد(١/ ٢٣٧)ئیخراجی کردووە.

هەشیم، ئەویش لەعەبدولڕەحمانی کوڕی یەحیاوە، ئەویش لەحیبانی کوڕی ئەبی جەبەلەوە ئەڵێ، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی:"من بَثَّ لم يصبر"[1] ،واتا: هەرکەسێ خەم و ئازاری بلاوە پێکرد لەنێو خەڵکدا، ئەوە ئارامی نەگرتووە.

خالیدی کوڕی ئەبی عوسمان ئەڵێ: کوڕێکم مرد، سەعیدی کوڕی جوبەیر بینیمیی مێزەرێکم بەسەر سەرمدا شۆڕکردبووەوە، وتی:ئەم مێزەر بەسەردا شۆڕکردنەوەیە سەرکزی و کزۆڵییە.

بەکری کوڕی عبداللەی ئەلموزەنیی وتی:ئەوترا: دانیشتن لەماڵ لەدوای کۆست و مەینەتیی، کزۆڵییە.

عوبەیدی کوڕی عومەیر ئەڵێ:فرمێسك رشتن و خەفەتباریی دڵ کڕوزانەوە نییە، بەڵکو قسەی خراپ و گومانی خراپ کڕوزانەوەیە.

لەئەلقاسمی کوڕی موحەممەد پرسیار کرا لەبارەی کڕوزانەوەو ئارام نەگرتنەوە، وتی: قسەی خراپ و گومانی خراپە.

کوڕی دادوەرێکی بەسرە مرد، زاناو شەرعناسان لای دادوەرەکە کۆبوونەوەو باسی ئەوەیان بۆ کرد کە جیاوازیی کڕوزانەوەو ئارامگریی چییە، یەکدەنگ بوون گەر شتێکی لەدەستهات بیکات خۆی پێ رابگرێ و نەیکرد، ئەوە کڕوزانەوەو رازیی نەبوونە.

حەسەنی کوڕی عەبدولعەزیزی ئەلجەرەویی وتی: کوڕێکی زۆر نرخدارم مرد، بەدایکیم وت: لەخوا بترسەو چاوەڕێی پاداشتی خوا بکەو ئارامبگرە، ئەویش

[1] - پێشتر تەخریج کرا.

وتی: مەینەتییەکەم لەوە گەورەترە بەکرووزانەو ناڕەزایی پاداشتەکەی پووچەڵ بکەمەوە.

عبداللەی کوڕی موبارەك ئەڵێ: پیاوێك هاتەلای یەزیدی کوڕی یەزید، یەزید نوێژی ئەکردو کوڕەکەشی لەگیانداندا بوو، پیاوەکە وتی: کوڕەکەت وا خەریکە دەمرێ و تۆیش نوێژ دەکەی؟! یەزید وتی: گەر کەسێك کارێکی هەبێ و ڕۆژانە ئەنجامی بدات و بۆ یەك ڕۆژ وازی لێبهێنێ، ئەوە ئەبێتە ناتەواوییەك لەکارەکەیدا.

ثابت ئەڵێ: عبداللەی کوڕی موتەڕیف تووشی کۆست و ناخۆشییەك هات، بەجوانترین قژ داهێنان و خۆشترین بۆن بینینم، ئەوەم بۆ باسکرد، ئەویش وتی: ئەی ئەبا موحەممەد فەرمانم پێ دەدەی بۆ شەیتان سەرکزیم و پیشانی بدەن چی ناخۆشییەکم تووشهاتووە؟! سوێند بەخوا گەر دونیا هەموو هی من بێ و پاشان لێمی وەربگرێتەوەو قوومە ئاوێکم پێ بدات لەڕۆژی قیامەتدا، ئەوە هەموو دونیا بەنرخی ئەو قوومە ئاوە دانانێم.

ئەوەی زیان لەئارامگریی دەدات: دەرخستنی کۆست و بەلآیەکەو باسکردنێتی و ئارامگریی نەکردنە. حەسەنی کوڕی سەباح لەموسنەدەکەیدا ئەڵێ: خەڵەفی کوڕی تەمیم بۆی باسکردین، زافری کوڕی سولەیمان بۆی باسکردین، ئەویش لەعەبدولعەزیزی کوڕی ئەبی رەوادەوە، ئەویش لەنافیعەوە، ئەویش لەئیبن عومەرەوە وتی: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"من البِّرِ کتمان المصائب، والأمراض، والصدقة"،واتا: شاردنەوەو دەرنەخستنی کۆست و ناخۆشییەکان و نەخۆشی و سەدەقە کردن یەکێکن

لەچاکەکارییەکان. باسدەکات کە فەرموویەتی:"من بَثَّ الصبر لم يصبر"[1]،واتا: هەرکەسێ وەهای دەرخست ئارامی گرتووە، ئەوە ئارامی نەگرتووە.

بەشێوەیەکی تر گێڕدراوەتەوە لە ئەلحەسەنەوە بەمەرفوعیی:"مِنَ البِرِ كتمان المصائب، وما صبر مَنْ بث"[2]،واتا:شاردنەوەی کۆست و بەڵاکان یەکێکە لەچاکەکارییەکان، ئەو کەسەی خەم و خەفەتی بڵاوکردبێتەوە ئارامگر نەبووە.

کە ئاو دابەزیبووە چاوێکی عەتائەوە، بیست ساڵ بەو جۆرە مایەوەو کەسوکاری بەوەیان نەدەزانی، تائەوەی رۆژێك کوڕەکەی بەرەو رووی هات و زانیی چاوی ئەو باوکە زانایەی نابینابووە.

پیاوێکە رۆیشتەلای داوودی تائیی کە لەنێو جێگەدا بوو بینیی دەلەرزێ، وتی: إنا لله وإنا إليه راجعون، بەپیاوەکەی وت: کەس بەمە ئاگادار مەکەرەوە. دوای چوار مانگ هەڵسایەوەو کەس بەو حاڵەی نەزانی.

موغیرە ئەڵێ: ئەحنەف لای مامەی گازندەی ئازاری دانی کرد، ئەمەی بۆ دووبارە کردەوە، ئەویش وتی: بۆ دووبارە بۆم دەیڵێیتەوە، من چل ساڵە نابینابوومەو لای کەس گازندەو شەکوام نەکردووە.

شپرزو شڵەژان دژ بەئارامگرییە، ترس و شڵەژانی کاتی کۆست و مەینەتی، چرووکیی لەکاتی بوونی نازونیعمەت، پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿ ۞إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ۝١٩ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ۝٢٠ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ۝٢١ ﴾ المعارج: ١٩ – ٢١، واتا: بێگومان ئادەمی دروست کراوە بە چاو چنۆکێکی تەنگەتیلکە. کە

[1] – پێشتر تەخریج کرا.

[2] - بەهۆی ئیرسالەوە لاوازە.

ناخۆشی یەکی تووش ببێ هاوارو ناڵە دەست پێ دەکات. کە سامانیش ڕووی تێ بکات ئەی گرێتەوە لە خەڵکی.

ئەلجەوهەریی ئەڵێ:الهلع: لەترس و تۆقین خراپترە.

لەفەرموودەشدا هاتووە:"شرّ ما في العبد شحٌ هالع، وجبنٌ خالِع"[1]،واتا: چرووکییەکی تۆقیوو ترسێك کە ئاگاو دڵی لەشوێنی خۆی نەهێشتبێ، خراپترین شتێکن لەبەندەدا.

منیش ئەڵێم: لێرەدا دوو شت هەیە: یەکێکی بێژەیی(لەفزی)، ئەوی تر مەعنەوی.

**هەرچی بێژەییەکەیە**:چرووکیی بەشپرزو ترس وەسفکردووە، کەسەکە تۆقیووە، ئەمە لەخاوەنەکەی زیاتر کەسی تر ناگرێتەوە، هەر فرمانەکە لەعەرەبییدا تێنەپەڕەو بە(هلوعاً)ناودەبرێت و ناوترێت(هالع لە)، دوو رووی تێدایە:

**یەکەم**: ئەمە بەنەسەبدانە، وەك دەوترێت: ليل نائم، وسرّ كاتم،ونهار صائم، ونوع عاصف، بەلای سیوەیهییەوە هەمووی بەنەسەبدانە، واتا: شەوێکە مرۆڤ دەخەوێنێ.

**دووەم**: لەبەر تێکەڵبوونی لەگەڵ خالع(واتا شەرم نەمان) وشەکە لەواتای خۆی لایداوەو هاوشێوەی هەیە.

**هەرچی مەعنەوییە**:چرووکی و ترسنۆکیی دوو سیفەتی پیس و خراپن لەبەندەدا، بەتایبەت گەر چرووکییەکە ئەوەندە بێ کەسەکە بتۆقێنی و شپرزی

---

[1] - صەحیحە، ئەبو داوود(٢٥١١) و ئەحمەد(٢/ ٣٠٢) و ئیبن حیبان(٣٢٥٠) و ئەبو نەعیم لە الحلية(٩/ ٥٠) ئیخراجیان کردووە.

بکات و دڵی لەشوێنی خۆیدا نەهێڵێ، بـەماڵ و جەسـتەی لێبـووردن و ئازایـەتیی نەهێشتبێ، وەك دەوترێ: تانەو توانج و دەرکردن کـاری تـێ نـەکات و بچـووك و ترس و تۆقین دایگرتووە.

گەر بتەوێ تۆقین و شپرزبوون بناسیتەوە، ئەوە بڕوانە ئەو کەسەی بۆ نمونـە برسیی ئەبێ و برسیبوونی دەردەخات و خێرا دەکات بۆ خـواردن، کـە ئـازارێکی تووش دەبێ یەکسەر دەریدەخات، کە ناخۆشییەکی تووشـهات یەکسـەر سـەرکز دەکات، کە برسیی بوو یەکسەر لەسەر لا پان دەبێتەوەو گازنـدەی حـاڵی خـۆی دەکات، کە دەروازەی تـەماحی بـۆ دەرکـەوت یەکسـەر بـۆی باڵدەگرێتـەوە، کـە شتەکەی دەسکەوت لەڕوحی خۆی گرنگتری دەزانێ، هـەموو ئـەوەش لـەدەروون نزمی و پیسی و سووکییەتی لەجەستەدا سەرچاوە دەگرێ...خوای گەورە پشت و پەنامان بێ.

***

# تەوەری بیست و شەش

## ڕوونکردنەوەی ئەوەی ئارامگری و سوپاسگوزاریی بەشێکن لەسیفەتەکانی خوای پەروەردگار و خۆی ناوی لێناوە( الصبور والشكور )،گەر ئارامگری سوپاسگوزاریی فەزڵدار نەبوونایە بۆ خۆی نەیدەکردنە وەسف

ئـارامگریی، موحەممەد(صـلى الله عليـه وسـلم) کـە شـارەزاترین مەخلوقـە بـەخوای گـەورەو لەهـەموو بونـەوەران باشـتر خـوای گـەورەی ناسـیووەو زیادەڕۆییش لەوەدا نییـە، کـە لەهـەموویان زیـاتر خـوای گـەورەی پـاك و مـەزن ڕاگرتووە،ئەوە بەئارامگر ناوی خوای گەورەی هێنـاوە، لەصـەحیحەیندا هـاتووە لەئەعمەشـەوە ئـەویش لەسـەعیدی کـوڕی جوبـەیرەوە، ئـەویش لەئـەبی عەبدولڕەحمانی ئەلسولەمییەوە ئـەویش لەئـەبی موسـاوە ئـەویش لەپەیامبـەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی:"ما أحدٌ أصبر على أذى سمعه من الله عز وجل، يدعون له ولداً وهو يعافيهم، ويرزقهم"[1]،واتـا: هـیچ کەسـێکم نـەبینیووە بەقـەد خـوای گـەورە لەسـەر قسـەو کـرداری ناخۆشـی بەنـدەکان بەئارامتربێ، کوڕی دەدەنە پـاڵ کەچـی لەشسـاغیان ئـەکات و ڕزق و ڕۆزیشـیان دەدات.

یـەکێك لـەناوە پیرۆزەکانیشی(الصـبور)ە[2]، نمونەی(موبالەغەیـە)، گـرنگترە لە(الصابر) و (الصَّبَّار)،ئارامگریی خوای گەورە گـەورەترەو سـنووری ئـارامگریی مەخلوقات تێدەپـەڕێنێ، لـەڕوو گـەلێکی زۆرەوە بـێ وێنـەو هاوشـێوەیە، خـوای

---

[1] - بوخاری(٧٣٧٨) و موسلیم(٢٨٠٤) ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئەمە لەفەرموودەیەکی لاوازدا هاتووە لەئەبی هورەیرەوە.

گـەورە بەوپـەڕی توانـاوە لەبەنـدەكانی ئـارام دەگرێ،لـەهاوكاری و فریاكـەوتن ناترسێ، ئـەوە بەنـدەكانن بـەهۆی ترسـەوە خێـرا داوای هاوكـاریی و فریاكـەوتن دەكـەن، لــەهیچ ڕوویەكــەوە خــوای گــەورە بــەهۆی ئارامگرتنییــەوە ئــازارو ناڕەحەتیی ڕووی لێناكات، وەك ناوی(الحليم)ی لەجیهاندا زۆر دەركەوتووە.

جیاوازیی نێوان ئارامگری(الصبر) و نـەرمونیانی(الحلم):ئارامگرتن بەرهـەم و ئەنجامی نەرمونیانییە، بەندە بەپێی نەرمونیانییەكەی ئـارامگریی بۆ دروست دەبێ، نـەرمونیانیی خـوای گـەورەش لەئارامگرییەكـەی فـراوانترە، بۆیـە زیـاتر لەشـوێنێكی قورئانـدا نـاوی(الحليم)ی هـاتووە، بـەهۆی فراوانییەكەیـەوە خـوای گـەورە لەگـەڵ نـاوی(العليم)ی هێناویەتییـەوەو ئەفـەرمووێ:﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ۝٥١ ﴾ الأحزاب: ٥١، واتا: خوا زانـای كـار لەسـەر خۆیـە. هـەروەها ئەفـەرمووێ:﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ۝١٢ ﴾ النسـاء: ١٢، واتـا:خواش زانـای كـار لەسەر خۆیە.

لەئەسـەردا هاتووە:"هـەڵگرانی عـەرش چـوار فریشـتەن: دووانیـان ئـەڵێن: سبحانك اللهم وبحمدك، لك الحمد علـى حلمـك بعـد علمـك. دووانەكـەی تـر ئـەڵێن: سبحانك اللهم وبحمدك، لك الحمد على عفوك بعـد قـدرتك. واتـا: دووانیـان ئـەڵێن: خوایە گیان پاك و بێگەردیی و سـوپاس و سـتایش بـۆ تـۆ، سـوپاس بـۆ تـۆ كـە نـەرمونیانییت كەوتووەتـە دوای زانسـتتەوە، دووانـی تریشـیان ئـەڵێن: پـاك و بێگەردیی و سوپاس و ستایش بـۆ تـۆ خوایـە گیـان كـە لـەدوای ئـەوەی توانـای تۆڵەكردنەوەو سزادانت هەیە هەر لێبووردەی.

مەخلوقەکان بەنەزانییەوە نەرموونیانیی ئەکەن، لەبێتواناییان لێبووردەن، بەلاّم خوای گەورە بەکەماڵی زانستی خۆی نەرموونیانیی ئەکات و بەتەواوی تواناشەوە لێبووردەیە، هیچ شتێك نەخراوەتە پاڵ شتێك جوانتربێ لەبوونی نەرموونیانیی لەپاڵ زانست و لێبووردن لەگەڵ توانادا، بۆیە لەپاڕانەوەی ناخۆشی و نارەحەتییدا، خوای گەورە نەرموونیانیی لەگەڵ مەزنیی وەسفکردووە، نەرموونیانبوون(حەلیم)لەپێویستییەکانی زاتی پیرۆزی خوای گەورەیە.

ئارامگرتنی خوای گەورە، پەیوەستە بە بێباوەڕیی و هاوبەش پەیداکردنی بەندەکانی و جنێودانیان بەخوای گەورەو جۆر گەلێکی زۆری تاوان و خراپەکارییانەوە، هەموو ئەوانەی بەندەکانی دەیکەن تووڕەی ناکات تاوەکو لەسزادانیان پەلە بکات، بەڵکو ئارام دەگرێ و مۆڵەت ئەدات و داوای چاککردن ئەکات و بەرانبەر بەندەی تاوانباری بەبەزەیی و نەرموونیانە، تائەو کاتەی هیچ لەوانە سودیان نابێ و نە لەڕووی چاکەو نیعمەت و نە لەڕێگەی بەلاّو تۆڵە لێکردنەوە ناگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورە، ئەوکاتە خوای گەورە تۆڵەی لێ دەکاتەوە، واتا دوای مۆڵەت و بیانوو پێدان و بانگەوازکردنی، هەموو ئەوانە لەپێویستییەکانی نەرموونیانیی خوای گەورەن، سیفەتێکی خۆییە بۆی و لێی نابێتەوە.

گەر ئەوە نەما کە ئارامگریی پێوەی پەیوەستە، وەك تەواوی ئەو کاروکردەوانەی تر کە حیکمەتیان پێویستە، ئەوە ئارامگرییش نامێنێ، کەم کەس هەیە ئاگای لەمە بووبێ، بۆیە زۆرێك کەس ئەم ناوەی لێ تێکچووەو

وتوویانــه: لەقورئانــدا ئەمــە نــەهاتووە، بۆیــە خســتوویانەتە لاوەو لەبابــەت جۆرەکانی ئارامگریی بەندەوە قسەیان کردووە.

گەر مافی خۆیان بەو ناوە بدابایە، ئەوکات دەیانزانی کە خوای گەورە لەتــەواوی مــەخلوقات لەپێشــترە پێــی، هــەروەك چــۆن لەپێشــترو شــیاوترە بەناوی(العليم و الرحيم و القديرو السميع و البصير و الحي) و تەواوی ناوە پیرۆزەکانی تری.

جیــاوازیی نێــوان ئــارامگریی خــوای گــەورەو ئــارامگریی بەنــدەکانی، وەك جیاوازیی نێوان ژیانی خۆی و ژیانی ئەوانە، وەك جیاوازیی زانستی خۆی و زانستی ئەوان و بیستنی خۆی و بیستنی ئەوانە، تەواوی سیفەتەکانی تریش هەر بەو جۆرەیە. کە ئەوەی زانی، ئەوکات زانیی مرۆڤەکان بەرانبەر خوای گەورە چۆنن و فەرمووی: هیچ کەسێك نییە بەقەد خوای گەورە بەرانبەر بیستنی قسەو کرداری خراپ ئارامتربێ.

خەڵکانی بەرچاوڕوون وەك چۆن شارەزان بەسۆزو بەزەیی و لێخۆشبوون و داپۆشینی خوای گەورە بەرانبەر بەندەکانی، ئاوەهاش زانست و شارەزاییان بەئارامگریی خوای گەورە هەیە. خوای گەورە ئارامگرە لەکاتێکدا تەواوی زانست و تواناو مەزنی و شکۆدارییشی هەیە، ئارامگرییەکی گەورەی بەرانبەر بەندەکانی هەیە.

بێگومــان خراپــە کــردن بەرانبــەر پادشــای پادشــایان و مــەزنی مەزنــەکان و بەڕێزی بەڕێزەکان کە چاکەی لەوپەڕیدایە، کارێکە خاوەن ئارامگرییەکی زۆر دەتوانێ خۆی بەرانبەر رابگرێت. خراپەی بەرانبەر بکەیت و تانە بدەی لەکەماڵ و نــاو و ســیفەتەکانی و خراپــەی زۆر قێــزەون ئــەنجام بــدەی و پەیامبــەرانی

بەدرۆزن دابنێی، جنێو ئازارت بۆیان هەبێ و دۆستەکانی بسووتێنی و بیانکوژی و سووکایەتییان پێ بکەی،ئەوە هیچ کەسێك قبوڵی ناکات، لەمەدا دەبینین کە ئارامگریی هیچ مەخلوقێك لەسەرەتایانەوە تاوەکو کۆتاییان بەئارامگریی خوای گەورە بەراورد ناکرێت.

گەر دەتەوێ ئارامگریی و نەرمونیانیی خوای گەورە و جیاوازیی نێوانیان بزانی، ئەوە لەم فەرمایشتەی خوای گەورە رابمێنە:﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ٤١ ﴾ فاطر: ٤١، واتا: بەڕاستی خوا ئاسمانەکان و زەوی ڕاگیر دەکات بۆ ئەوەی لەڕێڕەوی خۆیان لانەدەن بەڕاستی ئەگەر لە ڕێڕەوی(خۆیان)لابدەن کێ هەیە جگە خوا ڕایان بگرێت بێگومان ئەو(خوا)لەسەر خۆی لێبوردەیە.

هەروەها دەفەرموێت:﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا ٨٨ لَّقَدۡ جِئۡتُمۡ شَيۡـًٔا إِدّٗا ٨٩ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ وَتَخِرُّ ٱلۡجِبَالُ هَدًّا ٩٠ أَن دَعَوۡاْ لِلرَّحۡمَٰنِ وَلَدٗا ٩١ ﴾ مریم: ٨٨ – ٩١، واتا: گاوورو جوولەکەکان دەیان وت خوا منداڵی بۆ خۆی داناوە. سوێند بەخوا بەڕاستی زۆر نابەجێ و سەیر دەڵێن. نزیکە ئاسمانەکان لەت لەت و پارە پارە ببن لەبەر ئەو(قسەیە) و (نزیکە) زەویش شەق بەرێت و بقڵێشێ و (نزیکە)شاخ و چیاکان بەیەك جار برووخێن. لەبەر ئەوەی(بێ باوەڕان)منداڵ دەدەنە پاڵ خوای میهرەبان.

هەروەها فەرمایشتی:﴿ وَإِن كَانَ مَكۡرُهُمۡ لِتَزُولَ مِنۡهُ ٱلۡجِبَالُ ٤٦ ﴾ إبراهیم: ٤٦، واتا: هەر چەندە پیلانەکانیان شاخەکانی پێ بترازێ و لەبن بێ.

خـوای گـەورە هـەواڵی داوە، بـەوەی نـەرموونیانی و لێخۆشـبوونی ئـەون نەیانهێشتووە ئاسمانەکان و زەویی بتوێنەوە، ئەوەش ئارامگرییە، خوای گەورە بەنەرموونیانیی خۆی ئارامی گرتووە لەوەی دوژمنەکانی لەنێونەبات.

لەو ئایەتـەدا هـەواڵ هەیە بـەوەی، ئاسمانـەکان و زەویـی وەختـە بتوێنـەوە لەسەر ئەو کاروکردەوانەی کە مرۆڤەکان ئـەنجامی دەدەن، بـەڵام خـوای گـەورە بەنەرموونیانی و لێخۆشبوونی خۆی ئـەوەی رێگریـی کـردووە. گلدانـەوەی سـزاو ئازاردانیـان، حەقیقـەتی ئـارامگریی خـوای گەورەیـە، ئـەوەی بووەتـە رێگریـی تۆڵەکردنەوەی خێرای لە مرۆڤەکان هەر سیفەتی نەرموونیانییە.

لەموسنەدی پێشەوا ئەحمەددا بەمەرفوعیی هاتووە[1]: "ما من يوم إلا والبحر يستأذنُ ربه أن يُغْرِق بني آدم"،واتـا: هـەموو رۆژێـك دەریـا داوای مۆڵـەت لەپەروەردگاری دەکات تاوەکو نەوەی ئادەم نقووم بکات.

ئەمە پێویستییەکانی سرووشتە، چونکە بەپێی سرووشـت ئـاو بەسـەر خۆڵـدا بەرزدەبێتەوە، بەڵام خوای گەورە بەتواناو نەرموونیانی و ئارامگریی خۆی ئـەوی راگرتووە.

هەروەك تواناوەو خواربوونـەوەی چـیاکان و توانـەوەی ئاسمانـەکانیش، هـەر خوای گەورە بەنەرموونیانی و ئارامگریی خۆی رایگرتوون.

ئـەوەی بێبـاوەڕان و هاوبـەش پەیداکـەران و خراپـەکاران ئەیکـەن بەرانبـەر بەمەزنی و گەورەیی و رێزی خوای گەورە، هەر ئەوەیان لەسەر پێویست دەکات، بەڵام خوای گەورە بەرانبەر بەو هۆکارانە، هۆکار گەلێکی تری هێناوەتە بوون کە

---

[1] - لاوازە، ئەحمەد لە المسند(١/ ٤٣) ئیخراجی کردووە.

خۆشی دەوێ و پێی رازییەو تەواو پێی خۆشحاڵە، هەر ئەو هۆکارانەیە هێشتوویەتیی ئاسمانەکان و زەویی نەتوێنەوە.

ئەوە شوێنەواری ئەوەیە کە بەزەیی خۆی توورەبییەکەی پاڵداوە، بۆیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)پەنای بەسیفەتی رازیبوونی خوا بەستووە بەرانبەر سیفەتی توورەبوونی، بەڵخۆشبوون بەرانبەر سزاکانی، پاشان هەردووکی کۆکردووەتەوە، چونکە سیفەتی زاتیی خوای گەورەن و ئەفەرمووێ: "اللَّهُمَّ، أعوذ برضاك من سخطك، وَأَعُوذ بعفوك من عُقُوبَتك، وَأَعُوذ بك منْك"[1]،واتا:خوایە گیان لەبەرانبەر تووڕبوونت پەنا بەڕازیبوونت دەگرم، لەسزات پەنا بەلێبووردنت دەگرم، لەخۆت پەنا بەخۆت دەگرم.

ئەوەی پێیەوە پەنای پێ دەگیردرێت، هەر لەویست و بڕیاری خۆیەوە سەرچاوە دەگرێ، خۆیەتی لەڕووی دروستبوون و هاتنەبوونەوە ڕێگەی بەڕوودانی ئەو هۆکارانە داوە کە پەنایان پێ دەگیردرێت، هۆو هۆکارکراو هەر لەخوای گەورەوەیە، خۆیەتی دەروون و جەستەکانی بەجووڵە هێناوەو هێزی کاریگەریی پێداوون و ئامادەو یارمەتیی داوون و زاڵیکردوون بەسەر هەر شتێکدا خۆی بیەوێ و چی کاتێکیش بیەوێ لەکاریگەری و هێزی خۆیان دایاندەبڕێ.

تۆ رابمێنە لەفەرمایشتی:" وَأَعُوذ بك منْك"،واتا: پەنا دەگرم بەخۆت لەخۆت. ئەمە یەکتاپەرستیی پووختە، لاکردنەوە بەلای غەیری خوای گەورە دەبڕێت و هەموو پشت بەستنێکی دەخاتەسەر خوای گەورە، ترس و ئومێدی هەر بەخوای گەورەو لادانی خراپەو هێنانی خێرو خۆشیی هەر بەخوای گەورە

[1] - موسلیم(٤٨٦) ئیخراجی کردووە لەفەرموودەیەکی عائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ).

دەبەستێتەوە، هەر خوایە بەویستی خۆی خراپ دەهێنێ و بەویستی خۆیشی لایدەدات، هەر خۆیەتی شتانێکی دروست کردووە ئارامیان لەسەر دەگرێ و شتانێکیشی دروستکردووە پێی رازییە.

گەر تاوان و بێباوەڕی و هاوبەش پەیداکردن و ستەمی مرۆڤەکان تووڕەی بکەن، ئەوە تەسبیحاتی فریشتان و بەندە باوەڕدارەکانی و ستایشیان و گوێڕایەڵییان بۆی، جێی رازیبوونێتی و تووڕەییەکانی دەگرێتەوە.

عبداللەی کوڕی مەسعود(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: لای پەروەردگارتان شەو و رۆژ نییە، رووناکیی ئاسمانەکان و زەویی لەرووناکیی(نوری)رووی خۆیەتی، ئەندازەی رۆژێکی ئێوە لای خوای گەورە دوانزە کاتژمێرە، کاروکردەوەکانی دوێنێتان لەیەکەم کاتی ئەمڕۆتان دەخرێتە بەردەمی و سێ کاتژمێر تەماشای دەکات، ئەوانە دەبینێ کە خۆی حەزیان پێ ناکات و تووڕە دەبێ، یەکەمین ئەوانەی دەزانن خوای گەورە تووڕەیە، هەڵگرانی عەرشن، هەست بەقورسیی ئەکەن لەسەریان، بۆیە دەچنە کڕنۆش، هەروەها فریشتە نزیکەکان و تەواوی فریشتەکان، تائەوەی جبریل فوو دەکاتە شاخ و هەموو شتێك گوێی لەو دەنگە دەبێ و سێ کاتژمێر تەسبیحی خوای گەورە دەکەن تاوەکو بەزەیی خوای گەورە پڕ دەبێت، ئەوەش شەش کاتژمێرە، پاشان رەحمەکان دەهێنرێن و سێ کاتژمێر تەماشایان دەکات، ئەوەش فەرمایشتی خوای گەورەیە کە دەفەرمووێت:﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُصَوِّرُكُمْ فِى ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ ﴾ آل عمران: ٦، واتا: ئەو خوایە زاتێکە شێوەتان ئەکێشێ لە منداڵدانەکاندا چۆنی بووێ.

هەروەها دەفەرموویت:﴿ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثٗا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوۡ يُزَوِّجُهُمۡ ذُكۡرَانٗا وَإِنَٰثٗاۖ وَيَجۡعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًاۚ ﴾ الشورى: ٤٩ – ٥٠، واتا: بۆ هەر کەسێ بیەوێ کچی پێ دەبەخشێت وە بۆ هەر کەس بیەوێ کوڕی پێ دەبەخشێت. یان کوڕو کچی بەیەکەوە پێ دەبەخشێت وە هەر کەسی بۆی نەزۆکی دەکات.

ئەوەش نۆ کاتژمێر.

پاشان رزق و رۆزییەکان دەهێنرێن و سێ کاتژمێر تەماشایان دەکات، ئەوەش واتای ئەو فەرمایشتەی کە دەفەرموویت:﴿ ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ ﴾ الرعد: ٢٦، واتا: خوا ڕۆزی فراوان دەکات بۆ هەر کەسێك خۆی بیەوێ وەکەمی دەکات(بۆ هەرکەسێ بیەوێ). هەروەها:﴿ كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ ﴿٢٩﴾ ﴾ الرحمن: ٢٩، واتا: هەموو رۆژێ خوا لەکردنی کارێکدایە.

ئەڵێ: ئەمە کاری ئێوەو کاری پەروەردگارتانە[١]. ئەمە ئەبو ئەلقاسمی ئەلتەبەرانیی لە(السُنة) و عوسمانی کوڕی سەعیدی ئەلدارمی و شێخ ئەلئیسلامی ئەلئەنصاریی و ئیبن مەندەه و ئیبن خوزەیمەو کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە.

خوای گەورە کە لەسورەتی ئەنعامدا باسی دژمنەکانی خۆی و بێباوەڕیی و هاوبەش دانان و بەدرۆخستنەی پەیامبەرانیانی کردووە، بەدوایدا باسی ئیبراهیمی خۆشەویستی خۆیشی کردووەو ئەوەی ئیبراهیم لەمەلەکوتی

---

[١] - لاوازە، تەبەرانیی لە المعجم الكبير(٨٨٨٦) و ئەلدارمی لە: الرد على بشر المريسي(٩١) و ئیبن مەندەه لە: الرد على الجهمية(٩٩) ئیخراجیان کردووە، زوبەیر ئەبو عەبولسەلامی تێدایە نەناسراوەو ئەیوبی کوڕی عبداللەش کەسێکی لاوازە.

ئاسمانەکان و زەوییدا بینیوێتی و ئەوەی کە کردوویەتییە بەڵگە بۆ قەومەکەی لەدەرخستنی ئایینی خواو یەکتاپەرستییدا، پاشان باسی ئەوە دەکات کە پەیامبەران لەوەچەی ئەون، هەر خۆی هیدایەتی داون و پەرتووك و دانایی و پەیامبەرێتیی پێ داون، پاشان ئەفەرمووێ: ﴿ فَإِن يَكۡفُرۡ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدۡ وَكَّلۡنَا بِهَا قَوۡمٗا لَّيۡسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾ الأنعام: ٨٩، خوای گەورە هەواڵی داوە، هەروەك چۆن لەسەر زەوییدا کەسانێك هەن بێباوەڕیی بەرانبەر دەکەن و یەکتاپەرستیی ئەو رەتدەکەنەوەو پەیامبەرانی بەدرۆ دەخەنەوە، ئەوە کەسانێکیشی لەبەندەکانی داناوە باوەڕیان بەخوای گەورە هەبێ کە بێباوەڕان پێی بێباوەڕن و پەیامبەرانی بەڕاستبخەنەوەو پیرۆزییەکانی بپارێزن، ئەو پیرۆزییەی بێباوەڕان لەدەستیان داوە.

ئا بەو جۆرە جیهانی باڵاو جیهانی نزم یەکیانگرتووە، ئەگەرنا گەر حەق و راستیی شوێن هەواو ئارەزووی دوژمنانی خوا بکەوتبایە، ئەوە ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی لەنێوانیاندایە خراپ و جیهان کاول و وێران دەبوو، بۆیە خوای گەورە هۆیەکی بۆ کاولکردنی زەویی داناوە، ئەویش لابردنی هۆیەکانی خۆیەتی لەبەستنەوەی زەویی تاوەکو کاول نەبێ، کە وتەو فەرمایشتەکانی خۆی و ماڵ و ئایینی خۆی و باوەڕدارانێتی، هیچ یەك لەو هۆکارانە لەزەوییدا ناهێڵێتەوەو بەوەش جیهان و هۆکارەکانی بەرگری و رێگرییەکانی نامێنن و کاول دەبێ.

لەبەر ئەوەی ناوی(الحليم)چووەتە ریزی وەسفەکانەوەو ناوی(الصبور)یش لەکردارەکاندا، ئەوە نەرموونیان(الحلم)بووەتە بنچینەی ئارامگری(الصبر) و بەهاتنی لەقورئاندا جێگەی(الصبور)یشی گرتووەتەوە، خوای گەورەش زاناترە.

هەرچی ناوبردنی خوای گەورەیە بە(الشكور)ئەوە لەفەرموودەیەكی ئەبو هوورەیرەدا هاتووە، لەقورئانیشدا بە(شاكراً)هاتووە، هەروەك پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾ ﴾ النساء: ١٤٧، واتا:خوا هەمیشە پێزانی سوپاسە و زانایە، هەروەها دەفەرمووێت:﴿ وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٧﴾ ﴾ التغابن: ١٧، واتا: خوا سوپاس گوزاری لەسەر خۆیە. هەروەها دەفەرمووێت:﴿ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَآءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ﴿٢٢﴾ ﴾ الإنسان: ٢٢، واتا:ئەم بەهەشتە پاداشتی ئێوەیە وە هەموو كۆششێكتان سوپاس كراوە.

خوای گەورە دوو شتی بۆ كۆكردوونەتەوە: سوپاسی هەوڵ و تێكۆشانی كردوون و لەسەری پاداشتی داون. خوای گەورە سوپاسی بەندەی خۆی ئەكات گەر بەجوانیی گوێڕایەڵیی كردبێت، سوپاسی بەندە دەكات بەهۆی چاكەكانی و لێیشی خۆشدەبێ بەهۆی هەڵەكانییەوە، بێگومان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

لەتەوەری بیستدا باسی حەقیقەتی سوپاسگوزاریی بەندەو هۆكارو رووەكانمان كرد، هەرچی سوپاسگوزاریی خوای گەورەیە، ئەوە وەكو ئارامگرتنەكەی ئەمەش شتێكی ترە، سوپاسگوزاریی سیفەتێكی هەمیشەیی خۆیەتی، بەبەندە دەبەخشێ و لەسەر سوپاسگوزارییەكەی سەركەوتووی ئەكات، سوپاسی كەمترین كارو بەخششێك ئەكات، بەدە ئەوەندەی كاری بەندە سوپاسی بەندە دەكات و لەنێو فریشتەكانییدا سوپاسی دەكات، ئەو سوپاسگوزارییەی ئەخاتە نێوان بەندەكانیشەوەو بەكردارەكانی بەندە سوپاسی دەكات، گەر بەندە لەبەر خوا وازی لەشتێك هێنا، ئەوە خوای گەورە باشتر لەوەی پێ دەبەخشێت و بەچەندان ئەوەندە بۆی دەگەڕێنێتەوە، ئەوە خوایە

لەسەر وازهێنان و هەوڵدان ئەو بەندەیەی سەرکەوتوو کردووەو لەسەر هەردوو کارەکەش سوپاسی دەکات.

کە سولەیمان(سەلامی خوای لەسەربێ)ئەسپەکەی خۆی سەربڕی بەتووڕەبوونەوە بەهۆی ئەوەی لەیادی خوای گەورە سەرقاڵی کردبوو، بەو سەربڕینە ویستی جارێکی تر سەرقاڵ نەبێتەوە، بۆیە خوای گەورە بەکەشتیی با گوازەرەوە قەرەبووی کردەوە.

کە هاوەڵان لەبەر خوای گەورە وڵاتی خۆیانیان بەجێهێشت، خوای گەورە قەرەبوویکردنەوە بەوەی دەسەڵاتی دونیای پێدان و فەتحی وڵاتانی بۆ ئاسانکردن. یوسفی راستگۆ کە لەبەردەم ناخۆشیی بەندەیخانەدا خۆڕاگربوو، خوای گەورە سوپاسی کردو بەو هۆیەوە لەزەوییدا کردیە دەسەڵاتدارو چۆنی بووێ ئاوەها تیایدا بسووڕێتەوە.

کە شەهیدان جەستەی خۆیانیان بەختکردو دوژمنەکانی جەستەی ئەوانیان لەت و پەت کرد، خوای گەورە سوپاسیکردن و قەرەبووی کردنەوە بەباڵندەیەکی سەوز و روحی ئەوانی تیادا داناو بەڕووبارەکانی بەهەشتدا بیانسوڕێنێتەوەو تاوەکو رۆژی زیندووبوونەوە لەبەرووبوومی بەهەشت بخۆن و بەجوانترو خۆشترو کامڵتر بۆیان بیگێڕێتەوە.

لەبەرئەوەی پەیامبەرانی، ناوبانگی و نامووسیان کەوتەبەردەم مەترسیی دوژمنەکانی و جنێو و قسەی خراپیان پێیان دەوتەوە، قەربووی بۆ کردنەوە بەسلاّواتدانی خۆی و فریشتەکانی لەسەریان و لەنێو ئەهلی ئاسمان و زەوییدا

باشترین ستایشێکی بۆ دانان و بەباشترین یادو پاداشتی قیامەتیی تایبەتی کردن.

یەکێك لەسوپاسگوزارییەکانی خوای گەورە: پاداشتدانەوەی ئەو کارە چاکانەیە کە دوژمنەکانی لەدونیادا ئەنجامی دەدەن، لەڕۆژی قیامەتدا سزایان لەسەر سووك دەکاتەوە، هیچ کارێکی چاکی ئەو مرۆڤە نافەوتێنێ با بێزراوترین بەندە بێ بەلایەوە.

یەکێکی تر لەسوپاسگوزارییەکانی: لێخۆشبوونی بوو لەو ئافرەتە بەدڕەوشتەی کە بینیی سەگێك زۆر تینووە، ئاوی بۆ هەڵکێشا تاوەکو تینوێتییەکەی نەما[1]، لەیەکێکی تر خۆشبوو لەبەر ئەوەی دڕکێکی لەسەر ڕێگەی موسڵمانان لابردبوو[2].

بەندە کە بەرانبەر بەخۆی چاکە دەکات، خوای گەورە سوپاسی ئەکات، بەڵام دروستکراوان کاتێك سوپاسگوزاریی ئەکەن کە چاکەیان بەرانبەر بکرێت.

زۆرترو گرنگتر لەوەش، بەندە کە چاکە بەرانبەر بەخۆی دەکات، خوای گەورە شتی پێ دەبەخشێ، بەندە کە لەماڵی پێ بەخشراویدا کەمترین شتێك دەبەخشێت کە لەبنەڕەتدا موڵکی خوایە نەك هی خۆی، ئەوە خوای گەورە سوپاسی ئەکات، بەپێدانی چاکە و سوپاس چاکەکارە، ئاخۆ کێ لەخوای گەورە شیاوترو مافدارترە بەناوی(الشکور).

---

[1] - هەروەك لەفەرموودەی ئیخراجکراوی بوخاری(٣٤٦٧) و موسلیم(٢٢٤٥) لەفەرموودەی ئەبو هورەیرە(خوای لێ رازیی بێ).

[2] - هەروەك لەفەرموودەی ئیخراجکراوی بوخاری(٣٤٧٢) و موسلیم(١٩١٤) لەفەرموودەی ئەبو هورەیرە(خوای لێ رازیی بێ).

لـەم فەرمایشـتـەی خـوای گـەورە رابمێنـە:﴿ مَّا يَفۡعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمۡ إِن شَكَرۡتُمۡ وَءَامَنتُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾ ﴾ النسـاء: ١٤٧، واتا:ئایا خوا چ ئیشێکی هەیە بە سزادانتان ئەگەر سوپاسی بکەن وە باوەڕی پـێ بێنن وە خوا هەمیشە پێزانی سوپاسەو زانایە.

لەنێو ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا ئەوە دەبینی، کە سوپاس و ستایشـی خوای گەورە رەتیدەکاتەوە بەبێ تاوان و لەخۆڕا سزاو ئەشکەنجەی بەندەکانی بدات، هـەروەك بـەخۆڕایی هـەوڵ و تێکۆشـانی ئـەوان پـووچ ناکاتـەوە، چـونکە سوپاسگوزار(الشکور) پاداشتی چاکەکار بەزایە نادات و جگە لەخراپەکار کەسـی تر سزا نادات.

ئەمـە وەڵام و بەرپەرچـدانەوەی ئـەو کەسـانەیە کـە وەهـای دادەنـێن زیـاد لەتوانای بەندە، خوای گەورە بەندە ئەرکدار دەکات و زیـاتر لـەتوانای خۆیشـی سزای دەدات، بەڕاستیی خوای گەورە بەرزو بڵندترە بەرانبەر ئەو گومانـە درۆیـن و ناڕەوایە.

سـوپاس و ستایشـی خـوای گـەورە ئـەوەی پێویسـت کـردووە کـە سـزای بـاوەڕداری سوپاسـگوزار نـەدات و کارەکـەی بەزایـە نـەدات. یـەکێکی تـر لەپێویستییەکانی ئەو سیفەتە، ئەوەیە کە پـاك و بـەدوورە لەپێچـەوانەی ئـەوە، هەروەك پاك و بێگەردو بەدووریشە لەتەواوی عەیب و ناتەواوییەکان، ئەوانەی کە دژ بەکەماڵ و دەوڵەمەندیی و ستایشی ئەون.

یەکێکی تر لەسوپاسگوزارییەکانی خـوای گەورە:بەکـەمتر لـەتۆزقاڵێك چـاکە، بەندە لەدۆزەخ دەردەهێنێ و ئەو بچووکترین کارەی بەزایە نادات.

یەکێکی تر لەسوپاسگوزارییەکانی خوای گەورە: بەندەیەك كارێك بۆ خوای گەورە دەكات و ئەبێتە جێی رەزامەندیی خەڵك، خوای گەورە سوپاسی دەکات و یادی زۆرتر ئەكات و فریشتەو بەندە باوەڕدارەکانی پێ ئاگادار دەکاتەوە، هەروەك ستایشی بەندە باوەڕدارەکەی نەتەوەو بنەماڵەی فیرعەونی کردووەو لەنێو بەندەکانیدا یادی بەرز گێڕاوە، هەروەك ستایشی هاوڕێکەی(یس)ی کردووە، کەسێك لەنێو دەچێ کە بەهیچ كارێك سوودی لەسوپاس و لێخۆشبوونی خوای گەورەی نەکردبێ، بێگومان خوای گەورە لێخۆشبووی سوپاسگوزارە، لەزۆرێك هەڵە دەبووریّ و لەسەر کەمترین کارێکی چاك سوپاس ئەکات.

لەبەر ئەوەی خوای گەورە هەمیشەو بەردەوام هەر سوپاسگوزار بووەو سیفەتێکیشەو لێی نابێتەوە، ئەوە زیاتر ئەو بەندانەی خۆشدەویّ کە هەڵگری سیفەتی سوپاسگوزارین، بێزراوترین کەسێکیش بەلایەوە، ئەوانەن کە ئەو سیفەتەیان لەکارخستووەو هەڵگری سیفەتی دژن.

ئا ئەوەیە کاری ناوە پیرۆزەکانی: خۆشەویسترین بەندەی، ئەوانەن کە هەڵگری ئەو سیفەتانەن، بوغزێنراوترینیشیان ئەوانەن هەڵگری سیفەتی دژن، لەوەدایە خوای گەورە رقی دەبێتەوە لەمرۆڤی بێباوەڕو ستەمکارو نەزان و دڵڕەق و چرووك و ترسنۆك و خۆسەپێن و هیچ و پووچ.

خوای بەرزو مەزن جوانەو جوانی خۆشدەویّ، زانایەو زانایانی خۆشدەویّ، بەبەزەییە و بە بەزەییانی خۆشدەویّ، چاکەکارەو چاکەکارانی خۆشدەویّ، سوپاسگوزارەو سوپاسگوزارانی خۆشدەویّ، ئارامگرەو ئارامگرانی خۆشدەویّ،

بەخشندەیەو بەخشندەکارانی خۆشدەویٚ، عەیب داپۆشەرەو عەیبداپۆشەرانی خۆشدەویٚ، بەتوانایەو سەرزەنشتی دەستەوەستان ئەکات، باوەڕداری بەهێزی بەلاوە خۆشەویسترە لەباوەڕداری لاواز، لێبووردەیەو لێبووردەی خۆشدەویٚ، تاکەو تاکی خۆشدەویٚ، بۆیە هەرشتێك خوای گەورە خۆشیبوویٚ، ئەوە شوێنەوارێکە لەشوێنەوارەکانی ناو و سیفەتەکانی و گونجاون بەسیفەتەکانی، رقی لەهەرشتێکیش بێتەوە، ئەوە دژو پێچەوانەن بەناو و سیفەتەکانی.

## کۆتایی

ئەی ئەو کەسەی کە پێداگری بۆ گەشتکردن بۆ لای خوای گەورەو ئاخیرەت، بزانە ئاڵاو نیشانەی ڕۆیشتنت بۆ هەڵکراوەو تاوەکو لەتواناتدا هەیە خۆتی بۆ ئامادەساز بکە، ڕۆیشتن و بەڕێکەوتنت با ڕوانینە منەتی خواو بینینی ناتەواویی دەروون و کارو کەمتەرخەمییەکانت بێ.

بۆ کەسێك نرخی چاکە بزانێ، گەر نیعمەت و تاوانێکی لەخۆیدا بینیی ئەڵێ: بێگومان ئەمە من لەئاگری دۆزەخ دەپارێزێ گەرچی ڕزگاربوونیش بەلێبووردن و لێخۆشبوونی خوای گەورەیە، هەموو کەسێك بۆ ئەو دوو سیفەتەی خوای گەورە هەژارە، خوایە گیان منیش دان بەتاوانی خۆمدا دەنێم و تۆش لێم ببورێ، من تاوانبارێکی هەژارو بێ کەسم و تۆش بەبەزەیی و لێخۆشبووی.

تۆ گەر کارێکی پێچەوانەو دژت کرد، ئەوە هەموو کارەکانت بەیەکێك لەنیعمەتەکانی خوا بەسەرتەوە یەکسان نابێ، تۆ لەوەتەی نیعمەتی بۆ ناردووی لەڕەهنی سوپاسکردنی ئەودای، ئاخۆ باش ئەو نیعمەتەی خوات پاراست و مافی خۆیت پێ دا؟ بۆیە دڵت بەئومێدەوە ببەستەوەو بچۆرە دەرگای تەوبەو کاری چاکەوە، بێگومان خوای گەورە لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

خوای گەورە ڕێگای ڕزگاربوونی بۆ بەندە ئامادەساز کردووەو دەرگاکانیشی بۆ کردووەتەوەو ڕێگەی دەستخستنی بەختەوەرییشی پێ ئاشنا کردووە، هۆکارەکانیشی پێ داوەو ورياشی کردووەتەوە لەدەردی سەرپێچیکردنی و سزاو ئەنجامی خراپیشی پیشانی خۆی و ئەوانی تر داوەو فەرموویەتی: ئەگەر گوێڕایەڵم بووی، ئەوە بەفەزڵی خۆم لێت دەبوورێم، ئەگەر سەرپێچیتیش کرد،

ئەوە بڕیاری خۆمە چی سزایەکت بدەم و لێبووردەشم، بێگومان پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

خوای گەورە دەردەو نالەباریی لەبەردەم بەندەدا لابردووەو فەرمانی پێ داوە لەبێ توانایی و تەمبەڵیی پشت بە ئەو ببەستێ، بەڵێنیشی پێ داوە کە لەبەرانبەر کەمترین کارێکیدا سوپاسگوزاربێ و لەزۆرێك هەڵەشی ببووریێ، بێگومان پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

ئەوەی پێ داوە کە لەسەری سوپاسی دەکات، پاشان لەسەر چاکەکردنی بەندە بۆ خودی خۆی، خوای گەورە سوپاسی دەکات و بەڵێنی پێ داوە باشترین پاداشتی بداتەوەو لەخۆی نزیکبخاتەوەو لەهەڵەکانی ببووریێ گەر تەوبەی کردو لەبەردەم خۆیدا ریسوای نەکات، بەراستیی پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

بەلێبووردەیی خۆی لەهەڵەو ساتەی تاوانباران دەبووریێ و بەڕێزو بەخشندەیی خۆیشی ئومێدی چاکەکارانی بەبادا نەبردووە، پاڕانەوەی تەوبەکاران و تکاکاران حەوت چینەی ئاسمانیی بڕیووەو خوای گەورە گوێبیستی بووە، بەلێبووردەیی و لێخۆشبوون و رزق و رۆزیی خۆی دەستگرۆی مەخلوقاتی کردووە، هەرچی بەڕووی زەوییدا بەڕێوە بڕوات رزق و رۆزیی لەسەر خوای گەورەیە، شوێنی دەرچوون و ژیان و سەقامگیربوونی دەزانێ، بێگومان پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

بەسوونەتەکان بەخشندەیی بەرانبەر بەندە دەکات پێش ئەوەی بەندەی داوای لێ بکات، لەسەرووی ئومێدەوە دەبەخشێتە داواکارو ئومێدکارەکانی،

دەبووریَ لەو كەسەی داوای تەوبە بكات گەر تاوانەكانی بەئەندازەی شەپۆلەكان و بەردو خۆڵ و لمەكانیش بیَ، بێگومان پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

دایك چەندە بەبەزەییە بۆ كۆرپەكەی، خوای گەورە لەوە زۆرتر بەبەزەییە بەرانبەر بەندەكانی[1]، زیاتر بەتەوبەی مرۆڤی تەوبەكار خۆشحاڵە زیاتر لەخۆشحاڵیی ئەو مرۆڤەی بەخواردن و كەلوپەل و ئاویەوە لەدەشتێكی چۆڵەوانییدا وشترەكەی لیَ ون دەبیَ و بەكۆڵوبارەكەیەوە وشترەكەی دەدۆزێتەوە[2]، بەكەمترین كارێكی تەواوی مەخلوقاتی سوپاسگوزارترینە، هەركەسیَ بەتۆزقاڵێك كاری باش خۆی لیَ نزیكبخاتەوە،ئەوە سوپاس و ستایشی دەكات، بێگومان پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

بەناو سیفەتەكانی خۆی، خۆی بەبەندەكانی ناساندووە، بەنەرموونیانی و چاكەكانی خۆی لایان خۆشەویست كردووە، تاوانەكانیان نەبووەتە رێگر تاوەكو چاكەیان بەرانبەر نەكات، بەڵێنی داوە هەركەسێك تەوبە بكات و پەرستشێكی جوانی پەروەردگار بكات، ئەوە لێیخۆش بیَ لەو رۆژەی بەپەروەردگاری ئەگاتەوە، بێگومان پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

تەواوی بەختەوەریی لەگوێڕایەڵیی خوای گەورەدایە، تەواوی قازانجەكان لەمامەڵەی ئەودایە، تەواوی ناخۆشی و بەڵاو مەینەتییش لەتاوان و سەرپێچیكردنی فەرمانەكانی خوای گەورەدایە، هیچ شتێك بۆ بەندە لەسوپاس و

---

[1] - بوخاری(٥٩٩) و موسلیم(٢٧٥٤) ئیخراجیان كردووە لەفەرموودەیەكی عومەری كوڕی خەتابەوە(خوای لیَ رازیی بیَ).

[2] - بوخاری(٦٣٠٨) و موسلیم(٢٧٤٤) ئیخراجیان كردووە.

تەوبــەکردنی بــۆی بەســوودتر نییــە، بێگومــان پــەروەردگارمان لێخۆشــبووی سوپاسگوزارە.

نیعمەتی بەسەر بەندەکاندا رژاندووەو بەزەیی لەسەر خۆی واجیب کردووە، لـەنێو قورئانەکـەی خۆیدا جێـی کردووەتـەوە کـە سـۆزو بـەزەیی خـۆی هـەموو شتێکی گرتووەتـەوە: ﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ﴾ الأعراف: ١٥٦، بێگومـان پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

گـەر گوێڕایــەڵیی بکـریٚ سـوپاس ئـەکات، گوێڕایەڵییکردنیشــی بەفــەزڵ و هاوکاریی خۆیەتی، سەرپێچیی دەکریٚ نەرموونیانیی دەنوێنیٚ، تـاوانی بەنـدەش لەسـتەم و نـەزانیی خـودی بەندەکەدایـە، تاوانبـار داوای لێخۆشـبوون و تەوبـەی لێدەکات لێیدەبووریٚ وەك ئەوەی هەرگیز لەڕیزی تاوانباراندا نەبووبیٚ، بێگومـان پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

هـەر چـاکەیەك لای پـەروەردگار دە چـاکەی بەرانبـەر هەیـە، یـان ئەوەنـدە زیاتری دەکات تـەنیا خـۆی ژمـارەی بزانـیٚ، بـەڵام خراپـەو تـاوان زیـاد ناکـات و بەلێبووردن و لێخۆشبوون دەیسڕێتەوە.

لەو رۆژەوەی ئاسمانـەکان و زەویـی دروسـتکردووە تـاوەکو رۆژی ئـاخیرەت، دەرگای تەوبەی کراوەیە، بێگومان پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

دەرگای پیرۆزی ئەو، شوێنی ئومێدو وێستگەی تاوانبارانە، ئاسمانێکە بـارانی لیٚ نابڕێت، هەمیشە باران و پیرۆزییەکـەو شـەو و رۆژ خێـرو بێـری لـیٚ دەبـاریٚ، بێگومان پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

تــــەنیا ئــــارامگران ئامۆژگارییــــەکانی وەردەگــــرن و ئــــەپارێزن و تــــەنیا سوپاسگوزارانیش بـە بەخششـەکانی بـراوەن، تـەنیا لەنێوچـوان لەنێودەچـن و

تەنیا هەڵگەڕاوان سزاو ئازاری دەچێژن، بێگومان پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

ئەی مرۆڤی یاخیی وریابە خوای گەورە لەناکاوێکدا بتگرێ و سزات بدات، بێگومان خوای گەورە بەغیرەتە، گەر لەسەر تاوانی خۆت مایتەوە، خواش بەنیعمەتی خۆی بۆت بەردەوام بوو، ئەوە وریابە و بزانە خوای گەورە تۆی لەبیر نەکردووە، بەڵکو ئارامی گرتووەو بەئارامە.

ئەی مرۆڤی تەوبەکار، بزانە خوای گەورە بەلێخۆشبوون و بەزەیی خۆی موژدەی پێ داوی، بێگومان پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

هەرکەسێ بزانێ پەروەردگار سوپاسگوزارە،ئەوە هەمەجۆر مامەڵەی ئەکات، هەرکەسێکیش بزانێ لێخۆشبوونی خوایی فراوانە،ئەوە خۆی بەلێخۆشبوونییەوە هەڵدەواسێ، هەرکەسێکیش بزانێ کە سۆزو بەزەیی خوا پێش سزاو تووڕەیی کەوتووە، ئەوکات لەسۆزو میهری خودا بێئومێد نابێ، بێگومان پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

هەرکەسێ خۆی بەسیفەتێکی خوای گەورەوە پەیوەست کردبێ، ئەوە خوای گەورە دەستیدەگرێ تاوەکو دەیگەیەنێتەوەلای خۆی. هەرکەسێکیش بەناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە بۆلای خوای گەورە بەڕێبکەوێ، ئەوە بەخوای گەورە دەگاتەوە. هەرکەسێ خوای گەورەی خۆشبووێ، ئەوە ناو و سیفەتەکانیشی خۆشدەوێ و گرنگترین شتێك ئەبن بەلایەوە.

ژیانی دڵەکان لەناسین و خۆشویستنی خوای گەورەدایە، کەماڵی ئەندامەکانی جەستەش لەنزیکبوونەوەدایە لەخوای گەورە بەگوێڕایەڵیکردن و پەرستشی و

خزمەتکردن و یادکردنی بەزمان و ستایشکردن و پیاهەڵدانی بەجوانترین وەسف و پیاهەڵدان.

سوپاسگوزاران زیادەو نزیکانی ئەون، زیکرکارانی خەڵکانی مەجلیسی ئەون، گوێڕایەڵانی خەڵکانی بەڕێزی ئەون، تاوانبارانیش لەسۆزو میهری ئەو بێ بەش نین، گەر تەوبە بکەن بۆیان ئەبێتە خۆشەویست، گەر تەوبەش نەکەن بۆیان دەبێتە پزیشك و چارەسەرکار، بەجۆرەها کۆست و بەلاَ تاقییان دەکاتەوە تاوەکو لەهەڵەو تاوانەکانیان خۆشبێ و لەعەیب و ناتەواوییەکان پاکیان بکاتەوە، بێگومان پەروەردگارمان لێخۆشبووی سوپاسگوزارە.

سوپاس و ستایش تەنیا بۆ پەروەردگاری جیهانیان، سوپاس و ستایشێکی زۆرو پاك و بەرەکەتدار وەك ئەوەی پەروەردگارمان پێی خۆشەو پێی رازییە و شیاو بەڕووی پیرۆزی خۆیەتی، ستایشێك ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی لەنێوانیاندایە پڕ بکات، سوپاس بۆ خۆی لەسەر هەر شتێك پێی داوین و ئەیزانین و ئەوەی نایزانین، بەئەندازەی ستایشی ستایشکاران و ئەوەی بێ ئاگایان خۆیان لێ بێ ئاگاو نەزان کردووەو ژمارەی ئەوەی پێنووسەکەی نووسیوێتی و پەرتووکەکەی ژماردوویەتی و زانستی پێ هەبووەو هەیە.

وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وآله وصحبه أجمعين وعلى سائر الأنبياء والمرسلين ورضي الله عن التابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين. ولا حول ولا قوة إلا بالله العزيز الحكيم، وحَسْبُنا الله ونِعْمَ الوكيل.

***

# پێرستی بابەتەکان

